وەزارەتی ڕۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتی ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
زنجیرە (٦٠٩)



# هەورازەڕێ

## بیرەوەریەکانی عەلی بچکۆل

## پێشمەرگەی هەردوو شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێ

عەلی بچکۆل

سلێمانی - ٢٠٠٨

# هەورازەڕێ

بابەت: یادەوەری
نووسەر: عەلی بچکۆل
پێداچوونەوەو هەڵەبڕی: جەبار سابیر
نەخشەسازی: مەهدی ئەحمەد
نەخشەسازی بەرگ: جەبار سابیر
سەرپەرشتیاری چاپ: کەنعان خەلیل
تیراژ: (٥٠٠) دانە
ژمارەی سپاردنی(٢٠٥٧)ی ساڵی ٢٠٠٨ ی وەزارەتی رۆشنبیری دراوەتێ
سلێمانی (٢٠٠٨)– چاپخانەی پەیوەند

ناونیشان
بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
سلێمانی- گردی ئەندازیاران، ١٠٥ کۆڵانی: ٣٤ ژمارەی خانوو: ١٠
ژمارەی تەلەفۆن: ٣١٨٠٩٩٤

# پێشەکی

خوێنەری بەڕێز لەگەڵ ئەوەی سەرقاڵت دەکەم بە خوێندنەوەی ئەم کتێبەوە، بەڵام دڵنیاشت دەکەم لەوەی دەمەوێ هاوڕێو برام بیت بەم هەورازە ڕێگایەدا بۆ دۆزینەوەی ڕاستی کارەساتەکانی کە بەسەر گەلی کوردماندا هاتووە، ڕۆژێ لەڕۆژان لەگەڵ کۆمەڵێك تێکۆشەری ڕاستەقینەی گەلەکەمان زۆر بە دڵسۆزی لەدامێنی ئەم هەورازە هەنگاومان ناو شانس بۆ ئێمەی هێناو گەیشتینە ترۆپکی سەرەوە، پێش لەمەش پۆل پۆل لە تێکۆشەرانی گەلەکەمان ئەم هەورازە ڕێگایەیان بڕی، بەڵام مخابن کرمی ناو خۆمانو گەلە کۆمەی نەیارەکانمان ڕێگایان لێبەستین و لە زەلکاوی نەزانیندا خنکاندیانین بە فرمێسکی دایكو باوکمان کۆتای هەرەسیان پێهێناوە.

ڕاستیان وتووە بڕوات بەخۆت بێت سەرکەوتن مسۆگەر دەکەیت، گەلی ئێمەش قوربانییەکی بێوێنەیان داوە تا گەیشتۆتە ئەم قۆناغەی خەباتی ئێستامان هێشتاش زۆری دەوێ تا بینای سیستمێکی ڕێکوپێك دادەمەزرێنین، پشووی درێژی دەوێ. ئەوەی من لەبیرمەو بیستوومە لە کارەساتی لەناوبردنی سمایل ئاغای سمکۆو شێخ ڕەزاو بزووتنەوەی شێخ سەعیدی پیرانو بزووتنەوەی بارزانییەکانو شۆڕشی مهاباتو ڕاپەڕینو شۆڕشەکانی شێخی نەمرو شۆڕشی ئەیلولی خۆمان ئەم شۆڕشەش کە ئێستا پێمان ناوەتە سەردەمی دامەزراندنی حکومەتو ئەمانەوێ ئیدارەی خۆمان بکەین. ئەم قۆناغەش قۆناغێکی نوێی خەباتە نووسینی وردی دەوێ گێڕانەوەی بە ویژدانی دەوێ سەر ڕاستیو پشوو درێژیو هەنگاوی وردی دەوێ. سەبارەت بەم بۆچوونەشمان من لێرەدا گۆچانی قەڵەمەکەم دەگرمە دەستو وەك چیرۆکێکی بەر ئاگردان دەست دەکەم بە گێڕانەوەی چیرۆکەکانو لەمن مێشك گوشینو لەتۆش هیمەتو ویژدانو ماندووبوون بۆ خوێندنەوەیان تا ئەو کاتەی فرمێسکی قەڵەمەکەم وشك دەبێت.

ئەگەر نەکەوم بەدەماو هێزی ئێوەم لەپشت بێت بەنیازی چەند بەرگێکی جۆراوجۆرم، نووسراوەکانم بخەمە بەردەستی ئێوەی خۆشەویستو بەو نیازەش شوێنێك بگرێت لە کتێبخانەی کوردیدا.

## بنەماڵەکەمان

باوکم ناوی محەمەد قادر ئەحمەد بەگە، هاوسەرەکەی خەڵکی گوندی گەڕاوە لەناوچەی قەڵاسێوکەو کچی سەید ئەحمەدە. محەمەد خۆشی پێدەچێ لەناوچەی قەڵاسێوکە هەر لەو دەوروبەرە هاتبێتە دنیاوە، بەڵام قادر ئەحمەد لە بنەماڵەی جافەر سوڵتانی هەورامانەو کارەساتی رۆژگار هەڵی بریوەو لە کانی مارانی کوێرەوەبووی کەڵەشێرەو گەورەدێ خۆی جێگیر کردووە. بەپێی قسەی هەندێ خزمی هەمانن لە گوندی بلوکین وەکو مەلا سەعیدو حەمە ئەمینی برای‌و حەمە سەعیدو براکانی.

محەمەد پاش ماوەیەك باوکی کۆچی دوایی کردووەو ئایشەی دایکی‌و، پاشانیش کە ژنی هێناوە ئەویش ناوی ئایشە بووە، بۆیە لای دەرو دراوسێ بووە بەحەمەی ئایشان واتە حەمەی دوو ئایشە.

ماوەیەك ژیانیان چاکبووە، بەڵام وردە وردە باری ئابوورییان گۆڕاوە. محەمەد منداڵێکی زۆری بووە هەرچەند زۆریش بێ دەرامەت بووە، بەڵام زۆر ئیشکەرو بەدەسەڵات بووەو هەرگیز لەوە نەترساوە خێزانەکەی چەند زۆر ببێ. منداڵەکانی هەندێکیان کۆچیان کردووەو ئەوەی مابوون لەژنی یەکەمی عەبدوڵاو عەبدولڕەحمان‌و عەلی‌و ئامین بووە.

لە ژنی دووەمیشی تەنها کوڕێك هەبووە بەناوی عوسمان‌و لە تەمەنی دە ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە. دایکی عوسمان ناوی خەجە سابلاخی بووە. عەبدوڵا محەمەد هاوسەرەکەی ناوی بەحری کچی ئەسعەدەو خەڵکی کارێزەی ناو شوانەو، بەکرو سیروان‌و شوان‌و قومری‌و مەریوانی هەبووە، قومری کۆچی کردو مەریوانیش شەهید بوو بە قومبلەیەکی دەستی کە بەدەستی خۆیدا تەقیوەتەوە.

بەکر هاوسەرەکەی ناوی پەروینەو کچی رەشە قەمەرەی کەرکوکەو سێ کچی هەیە، تافان‌و کۆژان‌و هەنسك‌و کوڕێکی هەیە بەناوی هەستیار.

سیروان عەبدوڵا ژنەکەی ناوی سەبرییەو دوو منداڵی هەیە، ئاڤێستاو محەمەد پاشان دوو ژنی تریش دەهێنێ.

شوان عەبدوڵا ژنەکەی خەڵکی شێخانی سوورقاوشانەو کچی شێخ قادری شێخ مستەفایە، سێ منداڵی هەیە بەناوی سەیوان‌و کەسان‌و باوان، پاشان کۆمەڵێك

منداڵی تری بووە.

عەبدولڕەحمان محەمەد ژنەکەی ناوی زەهۆ ئەحمەدەو خەڵکی گوندی کلێسەی بەری کۆیەیە، سێ منداڵی هەبوو عومەرو عوسمانو دڵشاد. عوسمان پێشمەرگە بوو لەلایەن زۆڵە کوردێکەوە ئیخباری کراو دەستگیر کراو پاش ئازاردانێکی زۆر لەموسڵ لەسێدارە درا. عومەریش ماوەیەکی زۆر پێشمەرگەبوو، پاشان لەپاش هەرەس بۆتەوە بەپێشمەرگەو پلەی فەرماندەی کەرتی پێدراو لەبەر سەختی بارودۆخەکەی ئەوسا دووچاری نەخۆشی هاتو بە نهێنی برایە سلێمانیو لە ئەنجامدا کۆچی دوایی کرد. سێ کچی لەپاش بەجێماون، بەناوەکانی پرشنگو مەشخەڵو پەیمانو ئەوانیش لە ئەنفالە بەدناوەکەی بەعسیەکانی صدامدا بێسەرو شوێن کران. لەگەڵ زۆربەی زۆری خەڵکی گوندەکەیان لەگەڵ خاوەری دایکیان کە ئەویش خەڵکی عەسکەر بوو کچی سەید کەریمی نالبەندبووە. عەلی محەمەد قادر ژنەکەی ناوی روناکو کچی شێخ مەحمودی شێخ مستەفای شێخانەو، شەش کوڕی هەیە بەناوەکانی کاروانو کارزانو کاراو هەژانو کورەو کۆڤان. تێبینی: مەریوان عەبدولا پاش شەهیدبوونی کچێکی هەیە بەناوی مەردینو ژنەکەشی ناوی (سەبری)یە.

بە پێی یاسای ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەوەی لەڕۆژی لەدایك بوونی نەزاندرابێ زۆر ئاساییە لە یەکی حەوتی ساڵدا بنووسرێ، منیش سەبارەت بە هەژاریو کەم دەرامەتی باری ئابووری بنەماڵەکەمان مێژووی (١٩٤٣/٧/١)م بەرکەوتووە. بەمەرجێ ئەمەشیان دروستنییە چونکە برایەکی لەخۆم گەورەترم بووە بەناوی عەلی چەند ساڵێك ژیاوە پاشان کۆچی کردووەو دوابەدوای ئەوە منیش سەرەم بەرکەوتووە بێمە دنیای نائارامەوەو هەر لەسەر کۆنە ناوەکەی کاکە عەلیم ناونووس کراوم. خواو خۆشم ئەزانم لەو رۆژەدا هەردووکمان لەدایك نەبووین. کاتێ هۆشم کردەوە لە کراسێکی خامی چڵکنی پینەپیناویداو بەبێ شەڕواڵو لە ژوورێکی تاریکی پڕ لە کولەکەی گێڕو گەواڵو لەسەر راخەرێکی حەسیری دەستکردی خۆماڵیو لە ئاگردانێکی بچووکی حەوجۆش لەسەردا خۆم ناسیوەتەوە. هێشتا نەببووم بە هەشت ساڵ هەر وەکو بەرخۆڵەی لەشیر دابڕاو چۆن لەشیر دەیبڕنەوەو بەخۆیدا دەشکێتەوە، منیش ئا ئەوها بەخۆمدا شکامەوە بەکۆچی دوایی دایکی خۆشەویستم. لە کاتێکا لەسەرە مەرگدابوو تاکە وەسێتی

بۆ زەهۆی براژنم ئەوە بوو پارێزگاری لە من بکات.

بـە مردنـی دایکـم شـیرازەی رێـكو پێکـی ماڵمـان پسـاو تەنانـەت شـۆربای ساوەریشمان بە باشی بۆ لێنەدەنراو جلو بەرگمان بۆ نەدەشۆرا، چونکە وەکو ئێستا تایتو سابوون نەهاتبووە بازاڕی لادێکانەوەو منیش توانام نەبوو، کاکیشم ماڵیان جیابوو خوشکێکی دەست گۆچو فێداریشم هەبوو، ئەویش کارەکانی پێ هەڵنەدەسوڕاو هەموو ئەرکەکە دەکەوت بەسەر باوکمداو ئەویش لەبەر کۆششی بەدەست هێنانی ژیان بۆی نەدەکرا هەر بەدەوری ئێمەدابێ، بۆیە ژیانێکی نوێی زۆر ئاڵۆز رووی تێکردبووین. نـان کـردن یـەکێك بـوو لـە کـارە گرنگـەکانی ئێمـە، چونکە لە لادێدا تەنووری نان کردن نییەو جل شتن نییەو ئەگەر یەکێك نەبێ نانت بۆ بکات ژیانت ئاسان ناڕواتە رێ، هـەر بۆیـە هـەر رۆژە روومـان لـە ماڵـێ ئەنا نـانی چەند رۆژێکمان بۆ بکات، ئەوەش هـەموو جارێ لـەڕوومان نـەدەهاتو زۆرجاریش بـەبێ نـان دەمـاینـەوە. ماوەیـەك بـە هیلکـەی مریشـکەکانی خۆمـان رۆژمـان دەبـردە سەرو، نەمان ئەزانی چۆن بۆشایی دایکم پڕ بکەینەوە. پارەو پوولێکی وەهامان نەبوو تاڕۆنو شەکرو چای پێبکڕین، بەڵکو جارجار بە ئەلیدەرمو ئیـزرەم رۆژمـان پێیبەڕێوە دەبرد.

سەرچـاوەی دەرامـەتمان بـازووی بـاوکمو کـوڵی دوو گوێدرێژەکـەمان بـوو، کەمانگانە بارێ دووان خەڵوزیان پێ دەبرا بۆ شارو لەوێ دەیان فرۆشت، بۆ تـەواو کردنی ژیانێکی مەمرەو مەژی.

لەسـاڵی ١٩٥٣ جـارێکی تـر پـرۆژەی کـارکردنی مـن نـوێ کرایـەوە، هەمیشـە دەوڵەمەندەکانی گوند پێویستییان بە وەرزێرێك هەیە بۆ بەخێوکردنی بەرخو کـارو گـاو گۆتاڵیـان، جگـە لـەوەی ماڵـە مـەڕدارەکان دووجـۆر شـوانیان دەوێ یـەکیان بـۆ شـوانی مـەڕ کە زۆربـەی کـات بەشـاخەوەیە لـەڕۆژێکا یـەکجار ئـەبێ رانـە مەڕەکـەی بهێنێتەوە بۆ دەوری گوند. یان ناو ماڵان بۆ دۆشینو بەرخو کار مژانـدن، هـەر بۆیـە زۆرجار دەهاتنە لای باوکمو براکانم بۆ ئەوەی بە نرخێکی زۆر کەم من وەربگـرن بـۆ لای مـەڕەکان یـان بەرخۆلەکـەیان، ئێمـەش خێزانێکـی زۆر بـێ دەرامـەت بـووین، کارکردنیش بـەرزترین پلـە شـەرەف مەندییـە لەچاو تەمبـەڵی کـاری تـری خراپـەوە. بۆیــە رازی دەبــوونو ســاڵ بــە ســاڵ بەرخــەوانی یــان شــوانییەکەیان بــۆ نــوێ دەکردمەوە. وەهای لێهاتبوو ناوبانگم دەرکردبوو، لەباش پارێزگاریو لەوەڕانـدنی

مەڕەكان یان بەرخەكان، ساڵ لە ساڵ چەند ئابووری دەگۆڕاو بەرز دەبوو ئەوەندەش مانگانەی منیش زیادی دەكرد، تەنها حەفتەیەك لەماڵ نەدەبووم.

ساڵی ١٩٥٤ لە گوندی مایلەوە كە نیو كاتژمێرێ لە گوندەكەی خۆمانە دوورە، هاتن داوایان كردم و بەڵێنی ئەوەیان دا (١٥) قەزناخ گەنمو جۆ بدەن لە كرێكاری سێ مانگدا واتە سێ (٣) مانگ بەرخەوانیان بۆ بكەم (١٥) قەزناخ گەنمو جۆ بدەن بە باوكم. لەسەری رێككەوتن، سێ مانگ بەو منداڵییە زووخاوی ئاوارەییم چێژا، بەوەی باش بوو دایكم نەمابوو ئەگینا لەو تەمەنەدا بێ دایكو نازی منداڵ ناتوانێ بە ئاسانی بەڕێ بكات. لەگەڵ ئەوەشدا كە لوتكەی شاخێكی گوندەكەی خۆمانم لێدەردەكەوت لە كاتێ بەرخەلەكەم دەلەوەڕاند، شتێكی بێ وێنە دڵی دەگوشیمو هەستم دەكرد لە خۆشییەكی بێ وێنە دابڕاوم، كە ئەویش خۆشی ئەو شاخو دەشتو گردۆڵكانەكە یەكەمجار چاوم پێیان ئاشنابووە لە كاتی ساوایمدا. هەر سێ مانگەكە تەواو بوو، داوای گەڕانەوەم كرد بەڵام خاوەن بەرخەلەكە زۆر شیرینی پێمداچووبوو هەستی ئەكرد بەرخەلەكەی چاك بەخێوكراوە، ئەیویست دڵم راكێشی بۆ ئەوەی سێ مانگی تر لەوێ بم، مەڕی بۆ بلەوەڕێنم، بەڵام سۆزی دووری گوندەكەمان بەهێزتر بوو، رازی نەبوومو چوومەوە گوندی خۆم.

لە پێنجەمی پەنجاكاندا لە گوندی خۆمان بووم بە شوانو لەو لوتكانە مەڕەكانم دەلەوەڕاند، كە سۆزی دووری رایان كێشامەوە بۆلایان لە شوانییەكەمدا شەونخونییەكی زۆرم دەبینی، لەبەهاراندا شەوان مەڕ لە دەرەوەی گوند دەمێنێتەوە، منیش بە تەنها بە گۆچانێكو كەپەنكێكەوە بە دوو سەگی كەللە زلی خاوەن مەڕەكەمانەوە دەمامەوە هەتا بەیانی، ئەو شەوانەی باران دەباری لە گیارەشی بەهاردا، چەخماخەی هەورو گرمە گرمەكەی لەپاڵ بارانی بە باوە هاتووی وزە وز دارەوە مەڕەكان جێگایان بە خۆیا نەدەگرت. سەگەكان دەوەڕین بەجۆرێ دز یان گورگ لە سەرمان بێ، دڵیان دەهەژاندم خۆم لێ هەڵدەكرد هەتا پشتی ئەژنۆم بە هەر چوار دەوری مێگەلە مەڕەكەدا بەوپەڕی دڵسۆزییەوە دەسوڕامەوە، بە گورگە لۆقە تا شەوم رۆژ دەكردەوە نەمدەتوانی چاوەكانم بۆ تاكە چركەیەكیش لێك بنێم. لەنێوانی گرمە گرمی هەورو حەپە حەپی سەگو رەوینەوەی مەڕەكانو ساردی بارانی بەباوە هاتوو وەتەری لەشمدا، ددانەكانم قرچە قرچیان لێ دەهاتو بە هەموویان دەیان خافڵاندم، ئاگام لەوە نەدەما

منداڵێکی وەکو من دەبێ چی لێ بەسەر بێ.؟ تەنها هۆشم لای ئەوە بوو گەلە گورگێ لێم پەیدا نەبن و خۆیان بکەن بەناو مەڕەکەداو هەندێکی لێ کەلە پارچە بکەن و ئابڕووم بڕوات. لە وڵاتانی ئازادو میللەتانی خوا پێداودا منداڵی لەو تەمەنە بە رۆژ قوتابخانەو بە شەویش پاش تەواوکردنی وانەکانی بەدیار هۆکانی خۆش گوزەرانیدا خەویان لێ دەکەوێ، منیش سەرماو ترس نەیان دەهێشت خەم لە ژیان و مەرگی خۆم بخۆم.

ماوەی دوو سێ ساڵ ژیانم بە بەرخەوانی و شوانی بردە سەر، لە هاویناندا لە دەوری گوندەکە مەڕەکەم رادەگرت کاتێ دەمویست بخەوم دەست بینم لە بەرانە گەورەکە یان لە بزنێکی زۆر بە خۆی قسر دەگرت بۆ ئەوەی ئەگەر مەڕەکە رایدا واتە رۆیشت لەگەڵ خۆی رام بکێشێ و خەبەرم بێتەوە. دەست بێن لەپەتێکی درێژی ئەستوور دەکرێ، سەرێکی لە قاچی حەیوانەکە دەبەستی توندو سەرەکەی تریش لە دەستی خۆتی دەبەستی، کاتێ مێگەلە مەڕەکە گورگ راوی دەنێ یان خۆی رادەدا لە برسان ئەو بەرانە یان حەیوانەی دەست بینی لێدەکرێ رات دەکێشێ و خەبەر دەبیتەوەو فریا دەکەوی تا مەڕەکان لێتدا نەبڕاون. لە حەوتەم و هەشتەمی پەنجاکاندا وازم لە شوانی و بەرخەوانی هێناو هاتمەوە ناو ئاوەدانی. لە زستانا بەپشتی گوێدرێژ دارم دەهێنا بۆ فرۆشتن، باری دار بە (٢٥٠) فلس بوو ئەگەر بارە دارەکە زۆر چاك بوایە، ئەویش دار زۆر کەم هەبوو تەنها چەند ماڵێك دەیکڕی، باقی گوندەکە خۆیان داریان دەهێنا، بۆیە دارەکەشم کڕیاری زۆر لەسەر نەبوو، بەڵام هەر چار نەبوو رۆژانە ئەڕۆیشتم بۆ خۆشمانم دەهێنا.

لەهەشتەمی پەنجاکانداو لەکاتێ رژێمی پاشایی رووخاو عەبدولکەریم قاسم عێراقی بە جمهوری ناوبرد، راچڵەکینێکی گەورەبوو، خەڵکی راپەڕین و قسەو باسی ئازادی دێ و دیموکراتی هاتە ئاراوە، جوتیار وەکو مێشهەنگ پورەیداو کەوتنە ویزە ویز، خەڵکی گوندەکان توندڕەوانە دژی خاوەن زەوییەکان کەوتنە کارو لەزۆر گونددا شەڕە تفەنگ دروست بوو لە نێوانی جوتیارو خاوەن زەوییەکاندا. لەو ساڵانەدابوو کە پرۆژەی (سەد)ی ئاوی دوکان کاری دەکردو خەڵکێکی زۆری لادێ لەوێ دامەزرابوون، پارە پەیدا ببوو، خەڵکی بەرچاویان روونتر ببوو. هەردوو براکەی منیش لەگەڵ کۆمەڵێ خەڵکی گوندەکەمان لەو پرۆژەیە کاریان دەکردو بە تەواوەتی بارودۆخی ئابووری گوندەکەمان گۆڕا.

منیش رزگارم بوو له شوانیو بەرخەوانیو له هاوینی ئەو ساڵە بووم به سەپان بۆ یەکەمجارو گەنمو جۆیەکی چاکم وەرگرتو پارەکەیم دایە دوو سێ سەر حەیوانو خستمە ناو مێگەلی ماڵێکەوە. زۆرم حەز لەخوێندن دەکرد، ئەمویست بەرنامەی بۆ دابنێم، رێکەوت لەگەڵ ئەوەدابوو کەماموٚستای گوندەکەمان پیاوێکی نیشتمان پەروەرو کوردێکی دڵسۆزو نەترس بوو. ناوی ئیبراهیم صالح ئەفەندی بوو، خەڵکی شاری کۆیە بوو ، شاری حاجی قادری نەمر، ناوە ناوە خەڵکی کۆدەکردەوە لەسەر تەختایی قەڵاکەی داوێنی گوندەکەمانو هەر جارە لەسەر شتێ قسەی بۆ دەکردین. هەر لەو ساڵانەدابوو قوتابخانەی شەوی بۆ کردینەوە، دە پانزە رۆژێ قوتابخانەکە درێژەی کێشا، توانیم کەڵکی باشی لێوەربگرم، بۆ ناساندنی وشە سەرەتاییەکانو لێك دانیان بەحنجە، لە پاڵ ئەوەدا کاکی بەرێزم کاکە عەبدولرەحمان هاوکاری چاکی کردم بۆ ئەوەی فێری خوێندنو نووسین ببم، زۆری هان دەدام شەوو رۆژ بەدوای وشەدا دەگەڕام خێرا خێرا نیشانی کاکەم دەداو ئەویش بۆی راست دەکردمەوە.

لەنۆهەمی پەنجاکاندا سەپانیو توتنەوانیم بەیەکەوە ئەنجام دەدا، ئەو ساڵەش شان بە شانی کارکردن دەستم کرد بە خوێندنەوەی کتابە کوردییەکانی (ئەمیر ئەرسەلان)ی رۆمیو (شیرینو فەرهاد)و (خورشیدو خاوەر)و (میعراج نامە)و (قەڵای خەیبەرو قەڵای دم دم)و ئەو بابەتەی کە شەوانە لە پاڵ شەوچەرەی جستانی لادێدا دەخوێندرانەوەو کۆڕی ماڵە لادێی بۆ دەگێردرا. کۆڵکە خوێندەوارو فەقێ مزگەوتەکان بۆیان دەخوێندنەوەو ژنو پیاوو منداڵ سەریان بەسەردا دەژاندو هەندێ جار فرمێسکی بە گوڕیشیان بۆ دەڕشت، بەڕاستی ئەوەش خۆی لەخۆیدا هۆیەکی چاك بوو بۆ ئەوەی خوێندنەوە فێرببمو گەشەش بدەم بە نووسین لەڕێی نامە ناردن بۆ ئەو کوڕە گەنجانەی لادێکەمان کە لەسەربازی بوون لەخوارووو ناوەڕاستی عێراقداو نامەم بۆ دەنووسین. هەرچەندە زۆرجار داوایان لێدەکردم لای خەت خۆشێ بۆیان بنووسم، گوایە نازانن من چییان بۆ ئەنووسم بەڵام من گوێم پێ نەبوو، جار لە جار باشتر نامەم دەنوسیو هەندێ جار پاش نووسین دەمدا بە کاکە عەبدولرەحمانی برام، بۆی تەماشا دەکردمو هەڵەکانی راست دەکردەوە. ساڵی نۆهەمی پەنجاکان بوو، وردە وردە ناکۆکییەکانی نێوانی جوتیارانو خاوەن زەوییەکان روو لەتەقینەوە بوو، جار جارە شەڕیش دەستی

پێدەکرد. خاوەن زەوییەکان جار جار سەریان بەرز دەکردەوەو ئەیانویست تۆڵەی راپەڕینی ساڵی پێشوو لەجوتیاران بکەنەوە. کاکە عەبدولڕەحمانم بە تەواوەتی تێکیدابوو لەگەڵ نۆکەرەکانی خاوەن زەوی گوندەکەمان. وای لێهاتبوو مەترسی لەناوچوونی کەوتبووە سەر، بۆیە هەوڵیدا تفەنگێکی قەسەلی کۆنی کڕی و پارێزگاری خۆی پێ دەکرد، منیش چوومە ماڵی خزمێکمان لەگوندی گۆزە بۆرە تفەنگێکی سێ (٣) تیری کۆنەی هەبوو، بە ئەمانەت هێنام بۆ ماوەی ساڵێك لە پاڵ کاکەمدا بۆ پارێزگاری لەو دوور نەکەوتمەوە. هەر ئەو ساڵانەبوو یەکێتی جوتیاران دروست ببوو، لە گوندێکا کۆمەڵێك جوتیار هەڵدەبژێردران بۆ پارێزگاری لە بەرژەوەندی جوتیاران، کاکە عەبدولڕەحمانم کرابوو بە سکرتێری جوتیاران لەگوندەکەی خۆمان و ئەوەش ئەوەندەی تر ناکۆکییەکەی نێوان خاوەن زەوی و کاکەمی توندتر کردبوو.

ساڵی یەکەمی شەستەکان بوو، پارتی دیموکراتی کوردستان زیاتر لە ماڵە دەوڵەمەندو خاوەن زەوییەکانی لادێکان نزیك دەکەوتەوەو رێکخستنەکەی خۆی باشتر دەجووڵاند، لەناو جوتیاراندا دیاربوو وردە وردە ناو نووسینی چەك و تەقەمەنی ناو گوندەکانی دەکرد بۆ کاتی دەست پێکردنی شۆڕش، بەم بۆنەیەوە خاوەن زەوییەکان جارێکی تر گڤ ببوونەوە، وردە وردە یەکێتی جوتیاران باوو برەوی نەما. لەو لایشەوە پارتی کۆمۆنیستی عێراقی لەناو جوتیاراندا کەوتبووە هەلاو هەلاوی تەلەفونی درۆ لە لادێوە بۆ بەغدا، کادرێکی پارتی کۆمۆنیست لە لادێوە قسەی لەگەڵ سەرۆك کۆمار عەبدولکەریم قاسم دەکردو ئەیوت چەند دەڕاسەو چەند تەراکتۆرو چەند سەفقە پارە بنێرن دابەشی بکەین بەسەر جوتیاراندا. ئەمە بۆ ئەوەی جوتیارەکان بەلای خۆیاندا بەرن و ببن بە هاوڕێی رێکخستنی خۆیان و لە بۆربۆڕێنیشدا سەرکەون بەسەر پارتیدا لە لادێکاندا.

لە ئەیلولی یەکەمی شەستەکاندا پارتی و خاوەن زەوییەکان کەوتنە ناو جوتیاران و داوایان کرد هەر ماڵێك نەفەرێك ئامادە بکات بۆ شەڕی دەوڵەتی قاسم، ئەو ماڵانەی چەکیان هەیە نەفەرێك و چەکەکەی ئامادە بکەن، ئەگەر چەکیان نییە چەکی ئەدەنێ و نۆبە بکات لە گەڵ خەڵکی بۆ چوونە سەنگەری دژی رژێمی قاسم. ئێمەش ئەوسا سێ برا بووین و دوو تفەنگمان هەبوو، بەناو هەرچەندە بە هەردوو تفەنگەکە بیست فیشەکی چاکمان هەبوو ئەوەی تری لامان بوو خۆمان دامان

گرتبۆوه، كه زۆریان هی ئەوه نەبوون بتەقێن. سەرەتا كاكه عەبدولڕەحمانم خۆی دەست نیشان كرد بۆ چوونه سەنگەر، مەسەلەكه وەهای لێهاتبوو ئەبوو ماڵی نەفەرێ بۆ نۆبەرداری ئامادە بكات، لە ماڵی ئێمه كاكەم عەبدولڕەحمان خۆی سازداو لە هەشت و نۆی ئەیلوولدا بەڕێ كەوت، لەگەڵ خەڵكی گوندەكەمان بۆ دەربەندی بازیان. هەرچەندە ئەوسا ناحیەی ئاغجەلەر مدیری ناحیەو پۆلیسی ڕژێمی تێدابوو، ئەوان بە پشتی ئاغجەلەردا ڕۆیشتبوون و لەو ڕۆژانەوە ڕێگای سلێمانی- كەركوك بە حیساب گیراو ڕاگەیەندرا كه یاداشتێ درا بە ڕژێم و ئەگەر وەڵامەكەی زۆر باش نەبێ لە كاتێكا هێزی ڕژێم لەو ڕێیەوە هات لێی بدرێ و لەو ڕۆژانەشدا هاتوچۆی ڕژێم ڕاگیرابوو.

یەك دوو ڕۆژ كاكەم لەناوماندا نەبوو، ماڵ و منداڵەكەی بۆی بێ تاقەت ببوون، منیش هەراش ببووم، حەزم دەكرد من بڕۆمە شوێنی و ئەو بنێرمەوە بۆ ناو منداڵەكانی و لە ڕۆژی (١٠)ی ئەیلوولی ١٩٦١ ڕۆیشتم بۆ دەربەندی بازیان كاتێ گەیشتمە ئەوێ عەسرێكی درەنگ بوو، بەسەر دابەش كردنی نان و كاڵەك و شووتیدا ڕۆیشتم. چوومە سەر لوتكەی شاخەكه بەرێی كارگەی چیمەنتۆكه، لەوێ پێشمەرگەكان زۆریان ناسیار بوون، كاكەم لە ناویاندا دیار بوو. پاش پشوودان ئاگاداری كاكەمكرد بڕواتەوەو خۆم لەوێ مامەوە، هەر ئەوەندە وتم: دەمێنمەوەو لە هەموویان منداڵ تر بوو ناردیانم بەشی ئەو گرووپە ئازوقە وەربگرم و بۆیان بهێنمە سەر شاخ، دابەش كردنەكه لە بەرامبەر بەردە قارەمان لەناو دارەكاندا تاكە هودەیەك هەبوو، بارەگای ئیدارە داندرابوو، بەڵام بە لۆری نان لە شارەكانەوە هاتبوو، خەڵكی وەكو ئێمە لادێیی نانی سپی شاری و ئەو هەموو میوەیەی دەدی بەخۆڕایی و بەبرایانە دابەش دەكرا بە تەواوەتی ورەی پێ بەرز دەبۆوەو هەندێك پێی وابوو تازە دوژمن نەماوە. خەڵكەكەی سەنگەرەكەمان جۆرەها دەموچاوی تێكەوتبوو، هەمووشی خۆی بەوە دەزانی دوژمن تێك دەشكێنێ، چونكە شوێنەكەی چڕو بەرزو خواردنیشی بێ خەرج و بە تەبایی پێ دەدرا بە تەواوەتی میزانی هێزی لێ تێك چووبوو، خۆی بە مەلیكی باخ دەزانی. منی منداڵی دنیا نەدیدە هەر ئەوەندەم پێ دەكرا چا تێبكەم، ئاو بگێڕم، ئازوقە سەربخەم، تەماشایان بكەم و وزەیان لێوەربگرم.

دیمەنێكی زۆر نامۆبوو دەمبینی، پێشووتر شتی وەهام نەبینی بوو، ئەوەش

بوونی جۆرەها دەموچاو بە جۆرەها چەکی بچووکەوە، بەهاربوو، لای هەندێکمان وەهابوو دەست نوێژی خۆیانو گونی ئەشپەکانیان لە ئاوی بەغدادا دەشۆرنو دوژمن لە کون فەیەکونێکا لە کوردستان رادەماڵن. منی منالّی دەم رووت تەنها ئاوم بۆ دەبردنو ئاگرم پێش دەکردو چام بۆ تێدەکردنو فریای فشو هوڕیان نەدەکەوتم. تاوە تاوە هۆرەی جافی، حەیران، لاوك، بەستەیان دەوتو بە قوولە بۆ یەکتریان دەسەندەوە، لەمبەر بۆ ئەوبەری دەربەندی بازیان. هەرچۆنێ بوو دیمەنەکە هێندی دڵرفێن بوو نەمزانی چۆن شەو رۆیشت، هەرچەندە گەلاوێژ کەوتبوو دنیا بە شەوان زۆر سارد ببوو، خۆمان گەرم داپۆشیبوو، سەرو پاڵتۆمان لەبەردابوو، ئاگرێکی نێڵە نێڵ مان کردبۆوە، هیچ حیسابمان بۆ کاری سەربازی نەکردبۆوە کە شوێنەکانمان بۆ کاتی شەڕ دەست نیشان دەکرێ ئەوەی لای ئێمە حیسابی بۆ نەدەکرا دوژمنو هێزەکەی بوو. بەیانی رۆژی ٩/١١ بوو هێشتا خۆر دەرنەکەوتبوو، پیاوە ئازاکانی لە سەردەمی کۆندا ناویان دەرکردبوو بە دزی گاو گوتاڵی خەڵکی، ئەو سەردەمە شاهیدی ئازاییان بۆ دەدرا، وەکو کەو لەم بەرو بەری دەربەندەکەوە لەسەر بەرزی شاخەکەوە دەیان خوێندو هەر یەکەیان لە ئاوازێکیان دەوتو بە کۆمەڵ ورەیان بڵاودەکردەوە، سام خۆی دەنواند لە ئازایەتی ئەواندا.

لەملاولاوە لەسەر بەردە پانەکان روویان کردە قیبلەو نوێژەکانیان خوێند، پاش لێبوونەوە، بزەی نادروستیان دەکرد، پیاوی شارەزا ترسنۆکی تێدا دەدۆزییەوە.

هەر ئەو رۆژەبوو، خۆر گزنگی خستە سەر بەرزایی لوتکەی دەربەند لە هەردوو بەرەوە، لەو کاتەدا دابەش بووین لە سەنگەرەکانمانو بەرزی لوتکەی دەربەند، دەنگی فڕۆکەی مێکی (٢١) دەهات بەسەرماندا، دوو مێك تیژ تێپەڕین روو لە شاری سلێمانیو خێرا لەولاوە گەڕانەوە سەرمانو دەستیان کرد بە بۆردومان. لە پێشەوەو لەو لۆریە زلە پڕ لەتەماتەیەیدا کە لەسەر چەقی شەقامەکە بە نیازی ئەوەی رێگە بگرێ لە تێپەڕبوونی دەبابەو ناقیلەو سەیارەکانی سوپای دوژمن. لە کەرکوکەوە بۆ سلێمانی بڕوات داندرا بوو هەر ئەوەندە ویزەو شڵپە پەیدابوو تەماتەبوو بە دۆشاوو خەنەو لە دەستو پێی شەقامەکە گیراو لۆری شەهیدبوو.

ئەو هاتو هاوارو دەنگە دەنگە نەما، سەڵاوات لێدان نەماو پیاوە ئازاکان جووڵەیان لە خۆبڕی، مەترسی ئەوە هەبوو شەهید بن، بەڵام واش نەبوو بەڵکە

ئەوانە ئازابوون جووت جووت بەرەو دوا هەڵهاتن‌و مەیدانی جەنگەکەیان چۆڵکرد.

هەندێ خەڵك کە مەرکەزی عەشایەری بوون‌و پێیان شوورەیی بوو هەڵ بێن‌و مابوونەوە ئەوانەی دەمناسین حاجی قادری سوتکەو براو دەوروبەری‌و شێخ رەوفی شێخ عبداللە عەسکەری خۆی‌و پیاوەکانی، هەندێ لە عەشایەرەکانی دۆڵی سورداش‌و لەبەری هەمەوەندیشەوە هەندێ مابوونەوە کە من ناسیاویم نەبوو لەگەڵیان، کۆی هەموو ئەوانەی مابوونەوە ناگاتە بەشێك لە چواری ئەو هێزەی ئێوارە لەوێ بوون بۆ گەیشتن بە بەغدا. حاجی صالح پیاوێکی بەسالا چووی گوندێکی دوو سێ مالیی شۆریجە لە پێش منەوە لە کەڵەکە بەردێکدا بوو بە خۆی‌و تفەنگە بڕنەوە درێژەکەیەوە، ورەی ئەدایە بەرم‌و هاواری دەکرد عەلی مەترسیت نەبێ، شەرت لەسەر دەکەم هەتا دەربازمان دەبێ شەو ئەوەشمان لە یاد نەچێ سەرپەرشتی ئەم خەڵکە هەندێ کادری پارتی دەیکردو لە کاتی هەڵهاتنی خەڵکەکە ئەوان هەر مابوونەوەو دەوری سەرپەرشتی خۆیان دەبینی کەم‌و کورت.

هەموو ئەوانەی مابووینەوە هەتا تاریکی ئێوارە تاکە تاکە تفەنگمان دەتەقاند لە وەلامی ئەو تۆپانەی لە مەعەسکەری تەکیۆوە بۆمان دەهات، کە زوربەیان تۆپی دووکەڵ بوون، ئێمە ئەوسا شتی وەهامان نەبینیبوو، بەیانی کاتێ دابەشیان کردین، شوێنێکیان دابووبە من‌و کوڕێکی خزمم روو بەرووی مەعەسکەرەکە بوو، نەمدەزانی کە رۆژ بۆوە هەر بجوولێمەوە دەردەکەوتین سەرەڕای ئەوەش هەموو تۆپ‌و گوللەکان ئەوێیان دەگرتەوەو تەق تەقە شاخێکە ئەڕوانێتە سەر ماڵەکانی تەکێ بەلای قشلاخدا، شەڕی دوور دەستی پێکرد، ئەو هێزانەی داندرابوون‌و کەمین بوون کە لە هەندێ عەشایەری دنیا دیدە پیکهاتبوون شکان، پاش شەڕێکی پاڵەوانانەو چەند کەسێکیان لێ بەدیل گیراو هەندێکیان شەهید بوون کە هەرە ناودارو ئازاکەیان شێخ عەبدولای سەیدەو شێخ محەمەدی برای حاجی شێخ قادرو دووەم کاکە حەمەی تەلانی برای کوێخا سمایلی تەلان‌و مەحمودی حاجی شەریفی سردی‌و هەندێکی تر شەهید بوون ناوەکانیانم لەیاد نییە.

کاتی پاشەکشەمان هات حاجی سالح بانگی کردو دوو سێ گوللەی گرداری بە تفەنگە بڕنەوەکەی سرەواندە ناقیلەکان‌و هاواری کرد "عەلی وەرە، مەترسە" منیش تەنها مابوومەوە، کوڕەکەی لە گەڵمدابوو، بەیانی زوو هەڵهات منیش دوو تفەنگم پێ بوو یەکێکیان هی پیاوێکی خەڵکی گوندەکەمان بوو، ئێوارە چووبوو بۆ

سەردانی ماڵی برای لەچەمچەماڵو تفەنگەکەی لای من دانابوو. قەمسەڵەیەکی سەربازی گەورەم پێبوو لەگەڵ نانێکی زۆرو کترییەکی گەورەو مەتارەیەکی ئاو، ئەم دەویست هیچ یەکێك لەمانە بەجێ بهێڵم، ئەش ترسام تا دەگەمە سەر شاخەکە بەدی بکرێمو بم پێکن بە گوللە یان بە تۆپ. هەر چۆنێك بوو ورەی حاجی ساڵح بەکێشی کردمو گەیشتمە بن رازەکەی دیوی بەردەقارەمانو لە مەترسی دەرباز بووم، پاشان

دوو دوو سێ سێ سەنگەرمان بەجێ هێشت هەر کەسە بەلایەکدا، منو حاجی بەرەو ماڵی خۆمان ئەو سەردەم توتنمان کردبوو لە نێوانی گوندی هەیدەر بەگو گۆپتەپە بە ناوی نارنج کوژراو، بە پشتی ئاغجەلەردا رۆیشتینو بەیانی دنیا رۆشن خۆمان کردە ناو ماڵانی داڵەوای سەروو. خەڵکی گوندەکە مەترسییان لێنیشتبوو رژێم هێرشیان بۆ بهێنێ، بۆیە هەموو چاڵیان هەڵکەندبوو بۆ شاردنەوەی گەنمو دانەوێڵەکانیانو کەلوپەلی زیادەیان سڵاومان کرد، ئەمانویست نانێك بخۆین ئەوسا بڕۆین رۆژی دووهەم بوو، فڕۆکە بۆ پشکنین دەسووڕایەوە خەڵکی ناوچەکە ترس لێیان میوان بوو، هەر یەکە بەدوای چارەسەرێکی ماڵو حاڵەکەیدا دەگەڕا ئەگەر دوژمن هێرشی بۆ هێنان خەڵکەکە فەرموویان کردین، چووینە ماڵێك نانو چایەکمان خوارد، ئێمە چەند بە پەلە بووین ئەوانیش لە ئێمە بەپەلە تر بوون بۆ ئەوەی ئێمە بەڕێ بکەنو بکەونە ماڵ شاردنەوە. وردە وردەو بە وشیاری بەرەو نارنج کوژراو رۆیشتین، لەڕێ لەگەڵ حاجی لێك جیا بووینەوە، من بۆ هەواری تووتنانو ئەویش بۆ شۆڕیجە.

کاتێ چوومە سەر زەرعاتەکە کەسێکی ئێمە لەوێ نەبوون، هەمووی بەبۆنەی شکانی ئێمەوە چووبوونەوە ناو گوندەکەمان، منیش بەرەو گوند بەو ماندوویەتیە هەنگاوەکانم خێراتر کرد، کاتێ گەیشتمە بەر ماڵان، تووشی دوو سێ پیاوی لای خۆمان بووم زۆریان لا سەیر بوو کە منیان بینی وتیان: "دوێنێ ئەوانەی خۆمان هاتنەوە وتیان بە بەرچاومانەوە عەلی تۆپ لێی داو کوژرا، ئێستا براکانت هەر لە هەواڵ پرسین دان" هەر چۆنێك بوو چوومەوە ماڵەوەو بە یەکتری شاد بووینەوە، ئەو جارەیان نەکوژرا بووین. دوا بەدوای ئەوەی خەڵکی لە دەربەندەکان سەرکەوتوو نەبوون، بەوە رژێمی قاسم زیاتر هار بوو، دەوری دیکتاتۆریەتی خۆی دەست پێ کردو مەسەلەی داواو یاداشتی کوردی خستە پشت گوێو دەستی کرد

بە راونانی کەسانی کوردپەروەرو بیانوو گرتن بە خەڵکی کورد.

لەم لاشەوە پارتی و سەرکردایەتی سیاسی کورد کەوتنە مقۆمقۆی ئەوەی بەرگری بکەن یان پاشەکشە بکەن، دیکتاتۆرێتی قاسم زیاتر بوارێکی وەهای دەخوڵقاند بڕیاری بەرگری بدرێ، ئەوەبوو یەکەم کۆبوونەوەی ئەندامانی سەرکردایەتیی پارتی لە عەودەڵان کراو بڕیاری دروستکردنی دەستەی چەکداری درا. من ئەو کاتە هۆشی سیاسیم کزو نزم بوو لە مەسەلەکان نەدەگەیشتم، هەر بۆیەش نەم دەزانی شۆڕش یانی چی و ئەبێ کەی دەست پێ بکاو مەرجەکانی دەست پێکردنی چییەو مەرجەکانی سەرکەوتنی کامانەن و ئەو شۆڕشە ئێمە لە کام جۆرە شۆڕشەیە، چەکدارییە؟ بۆ چەکە؟ لە کام ئاستی ئابووری و کۆمەڵایەتیدایەو دژی کێیەو کێ دۆست و پشتیوانێتی و هێزی بنچینەی کامەیەو بەرنامەی بەڕێوەبردنی و دوورو نزیکی شۆڕشەکە کامانەن و هێزی ئێمە لەگەڵ ئەو هێزەی دەجەنگێ هاوسەنگی چۆنەو چەند ئەتوانرێ رووبەڕووی بوەستین.؟ هەرچەند ئەمانەم نەدەزانی بەلام پاك و دڵسۆزو خوێن گەرم بووم، ئارەزووی تێگەیشتنی بارە ئاڵۆزەکەم دەکرد، پاش گەڕانەوەم لەو شەڕە دۆڕاوە نا بەرامبەرەی دەربەند، جارێکی تر دەستمکردەوە بە کارو کاسبی جوتیارانە. باوکیشم لەکار کەوتبوو، کابانێکی واشمان نەبوو تۆزێ چێژی لێ وەربگرین، ئەو کارەی دەشمان کرد بریتی بوو لەدار هێنان و سەپانی و توتنەوانی، چونکە خۆمان پارەمان نەبوو خاوەن زەوی زەوی بۆ دەکێلاین و تۆوی ئەداینێ و هەندێ خەرجی تێدا دەکرد لەهاویندا و لە سەرەوەختی کۆکردنەوەی بەروبوومدا لەدوو سێ بەش بەشێکی دەبڕا پێمان، ئێمەش بەو بەشە ژیانێکی مەمرەو مەژیمان پێ دەبردە سەر. لەو جارانەی ئەچووم بۆ دار هێنان لەناو چەمی رەزان لە کاتی هاموشۆمدا دانە دانە پێشمەرگەم دەبینی، ئەوسا ناویان (کۆمەڵە) بوو، هێشتا ناوی پێشمەرگە باش نەبڕابوو بە سەریانداو مەترسی دەکرا ئەگەر دوژمن بزانێ لەو ناوەن بدات بە سەریانداو دووچاری زیان ببن، لەبەر ئەوەی زوربەیان بێ چەك بوون.

زۆرجار خۆیان لا ئەداو ئەیانویست نەیان ناسم و شوێن و رێیان نەزانم، جارێکیان وەها رێکەوت دوانیان هاتنە لام و داوایان کرد کە هەندێ ئاردو هەندێ شەکرو چایان بۆ بکڕم لەگەڵ دوو جووت پێڵاو، بەڵام ئاگاداریان کردم بەهیچ شێوەیەك ناویان نەبەم. پارەشیان دامێ بۆ کڕینی پێویستییەکان، وتیان: "بەر

گوێمان بکەوێتەوە لەناو خەڵکا باست کردووین بۆ خۆت چاك نییە" ئەم قسەیەم زۆر لا سەیربوو بۆچی دەبێ من ناویان بەرم؟! پاشان ئەوان بۆ هەڕەشەم لێ دەکەن؟ زۆر لە دڵمدا گرێ بوو بەڵام لەبەر ئەوەی نوێ بوو دۆستایەتییەکەمان و ئەو ئارەزووە دێرینەی هەم بوو بۆ تێکەڵاو بوونم بە کۆڕو کۆمەڵی سیاسی پشت گوێم خست و سبەینێ شتەکانم کڕی. بەیانی لە ڕۆژان زووتر پێش ئەوەی خەڵکی تر بەڕێ بکەون من گوندم بەجێ هێشت و ڕوو لە چەم ڕۆیشتم تا شوێنی دیاریکراو، لەوێ ئەشیاکانم داناو دەستم کرد بەداربڕین هێشتا بارە دارەکەم تەواو نەکردبوو یەکێکیان هاتە لام و پاش چاك و چۆنی وتی "ئەشیاکانت هێناوە؟" وتم "بەڵێ" و شتەکانم دایە و ڕۆیشت بەڵام ئاگام لێ بوو خۆی دەشاردەوە بۆ ئەوەی من نەزانم بۆ کوێ دەچێ، تۆزێ دوورکەوتەوە برادەرەکەی تریشی گەیشتە لای و بە یەکەوە ئەشیاکانیان بردو ڕۆیشتن. چەند جاری تر ناو بەناو دەهاتنە سەر ڕێگام و فەرمانیان دەدامێ، منیش ئەوەندەی دەکرا بۆم هەڵدەسووڕاندن، تا دەهات خۆشم زیاتر ئارەزووی ئەو جۆرە ژیانەم دەکرد، بەڕاستی لام شتێکی جوان و خۆش بوو لەو شاخۆ چۆڵانەدا بە چەکەوە و ئازایانە دەهاتن و دەچوون، من خولیای ئەوەیان بووم زیاتر پیم وابوو ئەگەر مرۆڤ ئازا نەبێ ناتوانێ کەڵکی هەبێ بۆ خۆشی نەك بۆ کۆمەڵگا.

وردە وردە خولیای شاخ و ناو (کۆمەڵە) کەوتە سەرم، زۆر زوو دەچووم بۆ چەم و خۆم دوا دەخست لە گەڕانەوەمدا بۆ ئەوەی هاوڕێکانم ببینم، تا جارێکیان پێم بە جەرگمدا ناو لێم پرسین " ئەگەر منیش بێم بۆ لاتان چەك هەڵگرم ئەڵێن چی؟ چەکم دەدەنێ و دەمکەن بە (کۆمەڵە)؟" لە وەڵامدا هانیان ئەدام نەبم بە چەکدار بەڵکو پەیوەندی سیاسیان لەگەڵ بکەم و کاری نهێنییان بۆ ئەنجام بدەم، جوابەکانیانم بەدڵ نەبوو، تا ڕۆژی ١٩٦٢/٣/٣ پەتی ئارەزووم پساندو چوومەوە ئەشکەوت دوو کون، ئەوساکە وردە وردە دەرکەوتبوون ئەزاندرا لەو ئەشکەوتە ئەژین و دەردەکەوتن و لە گوندەکاندا شەوان خەڵکیان کۆ دەکردەوە و خۆیان ئاشنا دەکرد بە خەڵکی و لەسەر دیکتاتۆریەتی قاسم قسەیان دەکرد. ژمارەی ئەو پێشمەرگانەی لەوێ بوون بە چەکدارو بێ چەکەوە خۆی ئەدا لە بیست کەس و باشترین چەکی تفەنگێکی یانزە تیری دەستی شەهید حەسەن کەوەڵە و تفەنگێکی ئوردونی دەستی ئەحمەد عەبدوڵا کەلوری بوو.

# بووم بە پێشمەرگە

پاش سڵاوو ماندوو نەبوونی، کەمێ پشوومدا، چایەکیان دامێ لە کوپێکی چینکۆی زەردا، هەموو دەمی سوتاندم، وتیان "خێرە وا هاتووی؟"، وتم " ئەمەوێ ببم بە کۆمەڵە لەگەڵتان" بە زەردەخەنەوە وتیان " ئەمەی تۆ دەیڵێی بۆ تۆ جارێ ماویەتی چونکە ئەم کارەی ئێمەی پێ هەڵدەستین ئەرکێکی زۆر قورسەو بە تۆ جێبەجێ ناکرێ، چونکە کارێکی دژوارەو لەوانەیە چەندان ساڵ لەسەر یەك بخایەنێ و مرۆڤ دووچاری گیران، کوژران، زامداری، برسێتی دەبێ. باشتر وایە بڕۆیتەوەماڵەوەو لە کاری نهێنیدا لەگەڵمان کار بکەیت، ئەویش بەشێکە لە خزمەتی شۆڕش و شۆڕشگێڕێتی". قسەکانیانم زۆر بەدڵ نەبوو، هەرچی ئەوان وتیان من نەم دەبیستو هەر بە زۆری زۆرداری پێم داگرتو وتم: "هەرچی پێم بکرێ دەیکەم بەڵام ڕۆیشتنەوە مومکین نییە" کە زانیان سوورم لەسەر راو بۆچوونی خۆم وتیانك "باشە بەڵام ئەبێ هەرچی پێمان وتی: ئەنجامی بدەی" وتم: "بەڵێ"،لێم گەڕان و وەکو بەردەستێك لایان مامەوە.

ماوەیەکی زۆر لەو چەمە چۆڵو چڕەی چەمی ڕەزاندا بەبێ چەك مامەوە، چام لێ دەنا، نانم دەبرژاند، چیلکەو دارم دەهێنا، بەڕۆژ بێ چەك ئێشکیان پێ دەگرتم، ئەوسا تەمەنم خۆی ئەدا لە ١٤-١٦ ساڵ، لەناو ئەشکەوتی دوو کوندا هەندێ زەل و حەسیرو پوش و پەلاش و گەلای وەریوی دار راخرا بوو لەجیاتی راخەر، شەوان لەسەری دەخەوتین و دەرگای ئەشکەوتەکە بە کەڵەکە بەرد هەڵچنرابوو بۆ ئەوەی سەرما کەمتر خۆی پێدا بکات. ئەو سەردەمە خەڵکی گوندەکانی دەوروبەر ماستو دۆو نان و پێویستی چاکیان بۆ دەهێنایـن، وردە وردە خۆشەویست دەبووین چونکە کادرەکانی ئەو سەردەمە وتوو وریاو قسەزان بوون لە مزگەوتەکاندا دوو سێ سەعات باسی مەغدوری کوردیان دەگێڕایەوەو فرمێسکیان لە چاوی جوتیاران دەهێنا، بەڕاستی بۆ ڕاپەڕاندنی خەڵکی توانایەکی هونەریی سیاسی چاکیان هەبوو، ئەوسا هەرچەندە شۆڕش ساوا بوو، لاواز بوو بەڵام شۆڕشگێڕان بەبڕوا بوون، دڵخۆش بوون، براو تەبا بوون، خاوەنی دیسبلینی بەهێز بوون، هەر بڕیارێکی سەرەوە دەدەرچوو گورج جێبەجێ دەکراو کەس سەرپێچی لێ نەدەکرد. وردە ووردە دەچووینە ناو گوندەکان، خۆمان نیشانی

خـەڵكی دەدا, چـەكەكانمان هـەرە باشـەكانیان ئەوانـە بـوون تـۆزیٚ گوڵـەی دەهێشتەوە, وەكو وتم: دوو تفەنگی ناوداری تێدابوو كە دوو سەربازی ڕاكردوو هێنابوویانن, ئەو دوو تفەنگە ببوون بە بووكی ناوچەكەكانو هەموو هاوڕێكانیان هەناسەیان بو سەرو چەكی ئاوا نویٚ هەڵدەكێشا شتێكی سەیرو دڵخۆشكەر بوو پێشمەرگەكان دڵسۆز وڕاست وپاك بوون. ڕۆژ لە ڕۆژ زیاتر خەڵكی بە شۆڕش ئاشنا دەبوون ولە دەوری كۆدەبونەوە وشالاٌوی دڕندانەی ڕژێمی قاسم هاوكاری گەشە كردنی ئەدا, گرتنو ڕاونانی خەڵكی شارەكان ببوو بە هۆی ئەوەی كوڕە شارییەكی زۆر روو بكەنە بنكەی چەمی ڕێزان.

شۆڕش روو لە گەشـە كـردن ڕۆی, سـەرەتا لـە دۆڵـی خەربەنـدە لـوو لەیـەك ئۆتۆمبیلی پۆلیس درا, ئەوەش سام وهەیبەتی بۆ كۆمەڵەكان پەیدا كرد, لە پڕێكا وبە نەخشـە هەنـدیٚ پـۆلیس ڕۆیـان كـردە نـاو شـۆڕش بە چەكەكانیانەوە, هـەر لـەو كاتەداو لە یەك نەخشەدا هێزێكی ڕێكخراو نێردرایە دەوروبەری مەركەزی ناوچەی ئاغجەلەر كە مەركـەزی پـۆلیس لـە هەنـدیٚ لـەو گوندانـەی لـە ناوچـە شـاخاوییەكە بـوون ئابلۆقە دران وداوای خۆ دانـە دەستەوەیان لێكـرا, لـە هەندێكیانـدا بـەرگری خۆبەدەستەوە نەدانیان كردو هەندێكیشیان بیٚ ماندوو بوون خۆیانو چەكەكانیان هاتنە پالٚ شۆڕشو بوون بـە كۆمەڵـە. تـا دەهـات پـۆلیس ژمـارەی لـە شۆڕشـدا زۆر دەبوو, هەنـدیٚ لـەو پۆلیسـانە پلـەی سوپایان هـەبوو هـەر كە دەهاتنـە نـاو شـۆڕش دەكران بە لێپرسراوی ئەو پۆلیسانەو وردە وردە ئەبوون بەلێپرسراوی گەورە لە لق وبەتالیونـەكانیش وردە وردە ئەفسـەری سـوپاش لێیـان هاتنـە دەریٚ و ئـەوانیش دەوری مەكتەبی عەسكەری و لێپرسراوی هێزە كۆماندۆكانیان دەبینی.

بەبەشداری و گێڕانـی پـۆلیس و هـاتنی ئەفسـەر وسـەرباز بونـاو شـۆڕش چەكی سـووك جۆرەهـا پەیـدا بـوو, هێزەكـان ڕێـك خـران و كۆمەڵـە لـەو وردیـەوە بـوو بـە"پێشـمەرگە"و(پ.م) دەسـتەو كـەرتو لـق و بـەتالیۆن و هێـز پەیـدا بـوون و ناوچـەكانی بـە فراوانـی گرتـەوەو هێزەكـان لـەم سـەرەوە بـۆ هاوكـاری ئەوسـەر ئەڕۆیشتن. سـالاٌنەو لـەكاتی بەروبوم كۆكردنـەوەدا شۆڕش لـە گونـدەكان خـەرمان لوغەی دەسەند، لەهەموو دانەوێڵـە دارێكو لـە ئـاژەلٚ دارەكـانیش, خێـری سـالاٌنەی وەردەگرت بۆ ئەوەی بەسەر بنكەی پێشمەرگەدا دابەش بكریٚ, پێشمەرگە ناوێكی نـویٚ بـوو, لای خـەڵكیو لای پێشـمەرگە زۆر خۆشەویسـتو پـیرۆز بـوو, لـەلای

دوژمنیش زۆر سامدار بوو. لە ڕێگای تەنزیمی شارو لادێ کانەوە هەواڵی جموجۆڵی دوژمن بە ڕێکوپێکی دەگەی پێش ئەوەی کارەکەی ئەنجام دابێ. دەستەو کەرتو لقەکان کەوتنە جەولەو ناوچەو گوندو ماڵ بەماڵ دەچوون و یاسای پێشمەرگە دابەش کردنی بۆ نان خواردن لە ماڵاندا داهات. لەڕێی دانانی جوتیارێ یان چەند جوتیارێکی خەڵکی گوندەکە بۆ ئەوەی هەر کۆمەڵە پێشمەرگەیەك چووە هەر گوندێ داوا لەو بکەن دایان بمەزرێنن و نەهێڵن پێشمەرگە لەپاڵ مزگەوتەکاندا بێ شێوو سەر بنێتەوە.

کادری ڕێکخراوی سیاسی ناوچە بە ناوچە دابەش کران و هەر کادری بەر پرسیار بوو لەکاری ڕێکخستنو کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر جموجۆڵی دوژمنو سیخوڕەکانی, هەروەها دەوری وشیاریو ڕێکخستنی جوتیارانیان دەبینی و دەنگوباسی چالاکی هێزی پێشمەرگەیان دەگەیاند بەجەماوەری ناوچەکەیان. لەگەرمەی ئەم ڕووداوانە دا من پێشمەرگەیەکی بێ چەك بووم لە چەمی ڕێزان و لەوبوارەدا خەریکی خۆ باشتر خوێندەوار کردن و فێری لەبەر کردنی ڕستەی ڕامیاری و چۆنێتی قسەکردنی سیاسی دەبووم. لەو کاتانەدا کادرو سەرکردەکان لەبابەت درێژەدانی شۆڕش و ئابلۆقەی ئابورییەوە ئەدوان, لای هەندێ خەڵك وەها بوو لەماوەی دوو سێ ساڵدا شۆڕش دەگاتە بەرهەم و مافی خەڵکی کورد وەردەگیرێ, لای هەندێکی تر وەهابوو دوورنییە شۆڕشەکە درێژە بخایەنێ لە پێنج ساڵ زیاتریشو لە هیچ دەروازەیەکەوە ئازووقە نەگات، نموونەیان بۆ شۆڕشگێڕانی گەلی جەزائیر دەهێنایەوە کە ریخۆڵەی وشکەوە بووی حەیوانیان خواردووە، هەندێ کە گوێی لەم گفوگۆیە بوایە هەرەسی دەهێناو دەیوت: "ئێمە تا پێنج ساڵی تر ئاوا بە شاخەوە ئەژین".

ئەو سەردەمە پێشمەرگە یارمەتی پێنەئەدرا، هەرکەس دەبوو بە پێشمەرگە ئەبوو ئەوە بزانێ یارمەتی مادی نییە، هەندێ جار لە سێ چوار مانگا (٥) دینار ئەدرا بە هەندێ لە خێزاندارەکانی باری ئابووریان زۆر نزم بوو من ئەوسا جار هەبووە بە شەش مانگیش پەنجا فلسم سەرف نەکردووەو نەشم بوو بۆیە ڕاهاتبووم، دەست نەکەم بە گیرفانمدا. پێڵاوو بەرگە بۆرەکە لە بنکە ئەیاندامێ و خواردنیشیان لە بنکە یان لە ماڵان ئەمان خوارد. ئەوسا کە هەر لە بنکە بووم زۆرم حەز دەکرد ڕێگەم بدەن بچمە دەستەیەكو جەولە بکەم لەناو گوندەکانو

ناوچەکان، چونکە ئەوەی لەجەولە بوایە لەژیانێکی دەروونی خۆشدا ئەژیاو بەڕاستی هەر ئەوانیش بە پێشمەرگە ئەژمێردران.

هێشتا (٣٠) هەزار دینارەکەی رێگای هەولێر- کۆیە نەکەوتبووە دەست شۆڕش، بنکەکانیش‌و سەرکردایەتیش خاوەنی دەرامەتێکی مادی ئەوتۆ نەبوون، بەڵام کاتێ ئەوە گیرا جگە لەوەی بوو بەهۆی بەرزکردنەوەی ورەی خەڵکی‌و دەرامەتێکی کاتی چاکیش بۆ شۆڕش هەندێ پینەو پەڕۆی باری ئابووری شۆڕشی پێکرا.

شۆڕش روو لە گەشە دەڕۆی، هێزێکی پەنجا شەست چەکداری کە بۆ ئەوسا زۆر بوو لە ناوچەی بێتواتەوە هاتبوون بۆ چەمی رەزان، هاتنی هێزەکە جێگای سەرنج بوو، هەمووی ئەوانەی لە چەم بووین هەستمان دەکرد شتێ بە دەستەوەیە بەڵام رێك نەمان دەزانی چییە، زۆرم گوێی هەڵخست نەمزانی، پاشان برادەرێکی نزیك لە لێپرسراوان پێی وتم: "ئەمشەو بەرێ دەکەوین بەرەو دۆڵی ئاغجەلەر بەنیازی دەور گرتنی شاری ئاغجەلەرو گرتنی" لەگەڵ غەریب سەعید کە هاورێ‌و هاوتەمەن‌و هاوگوندی بووین کەوتینە کۆششی ئەوەی بمانبەن لەگەڵ خۆیان، کاتێ هێزەکە عەسرێکی درەنگ کەوتەرێ هەرچی ئێمە کردمان بەرپرسیاری چەم‌و هی هێزەکەش رێگایان نەداین وتیان: "ئێوە منداڵن‌و تەمەنتان ناشێ، ئەبێ لێرە لە بنکە خزمەت بکەن، لەکاتێکا شەهیدو بریندایان هێنایەوە ئێوە بەردەستییان بکەن" هەوڵی زۆرماندا پێمان وتن "نان، ئاو، کۆڵە پشت، گوللەی (ئار پی جی) قازیفە، فیشەکی زیادە هەلدەگرین بەس بمان بەن" هەرچی ئێمەش وتمان ئەوان گوێیان لێ نەگرتین‌و دەستمان کرد بەگریان کاتێ دڵنیا بووین نامان بەن، ئەوان رۆیشتن من‌و غەریب بەجووت بەدوایاندا رۆیشتین بۆ بەشداری‌و لە شەڕیشدا دەوری خۆمان بینی.

ورده ورده خەڵکی دەگەیشتە ئەو بڕوایەی ئەمەی ئێستا بەرپابووە شۆڕشە نەك کۆمەڵە چەکدارێکی بێ بەرنامە دەست بکا بەڕێگرتن‌و شەڕو کوشت‌و کوشتار. ورەو پەروەردەی شۆڕشگێڕێتی‌و دڵسۆزی‌و پووڕەدانی هەنگی جەماوەری وەهای کردبوو کە هەموو تێکۆشەرێکی چەکداری پێشمەرگە ئارەزووی لە شەهید بوون بکردایە، پێشمەرگە ئەوەندە بە دڵسۆزی کاری دەکردو ئەوەی سڵی لێ نەدەکردەوە شەهید بوون بوو، بەڵکە ئاواتیان دەخواست شەهیدبن‌و بنکەیەکیان بەناوەوە

بندریٚ، تازە پێشمەرگەیەکی مۆرد خوادەی سەروو شەهید ببوو، ناوی صدیق بوو، بنکەی خاڵخالان لە کارێزە بەوە ناوی نرا بنکەی شەهید صدیق، پێشمەرگە زۆریان لا پیرۆز بوو شەهید بن.

خەڵکی گوندەکانیش وەها هاتبوونە جۆش و خرۆش کێ ئەیوێرا لە گوندێکەوە بۆ گوندێکی تر بێ پسوولەی هاموشۆ بڕوات، خێرا لەلایەن لێپرسراوی گوندەوە دەگیراو بە دوو سێ جوتیاردا ئەنێردرا بۆ نزیك ترین بنکەی پێشمەرگە.

ئەوسا تەمەن و شێوەی من هی ئەوە نەبوو بڕوام پێ بکەن بۆ بەشداری شەڕ دەشێم چونکە لە پێشووتر وەها هاتبوو شەڕ بە سمێڵی گەورەو قەدو باڵای بەرزو زمانی درێژو زەبەلاح دەبێ نەك بە بڕواو مێشك. زۆر هەوڵمدا لەو حەوزەی چەمی ڕەزان دەرباز ببم و بڕۆم، ڕێگایان نەدام و نەش دەکرا سەربەخۆ بڕۆم چونکە ئەو سەردەمە لێپرسینەوە هەبوو، زەبت و ڕەبت ئەوەندە توند بوو یەکێك هەڵەیەکی بکردایە وەهایان لێ دەکرد جارێکی تر نەچیتەوە سەر هەڵەکردن. هێزەکانی لۆلان و دەوروبەری دژی بنەماڵەی بارزانییەکان بوون و ناکۆکیەکانیان زۆر توند ببوو، کاك عومەر دەبابەی ڕەحمەتی لێپرسراوی ناوچەی بێتواتە بوو دانرابوو هێزی بەرێ و بڕوات بۆ ئەو ناوچەیەی گرتك و حەسار ڕۆست بۆ هاوکاری بارزانییەکان، من خرامە ناو ئەو (٤٠)(پ.م)ەی بەرێکرا بۆ ئەو ناوچەیەو تفەنگێکی نهایەت جانداریان دامێ و هەندێ فیشەکی ئینگلیزییان دامێ، کە ئەبوو بە برپەند دواکەی برنم بۆ ئەوەی لە جیاتی فیشەکی خۆی بەکاری بهێنم، بەڕاستی هەرچیم کرد بۆم خۆش نەئەکرا.

لەکاتێکدا کەئێمە لەچەم بەرێ کەوتین مانگی پێنج بوو، هەوا بەرەو گەرمێ دەڕۆی، بۆیە هیچ حیسابی ئەوەمان نەکردبوو کەناوچەی باڵەکایەتی و دەوروبەری حەسارۆست فێنکە، بەکراسێکەوە ڕۆیشتین، گەیشتینە بێتواتە، پاشان لەوێوە بەرەو ناوچەی باڵەکایەتی بەرێکەوتین، چووینە گوندی گولان، پاشان بۆ گرتك و ڕۆستی. پێشمەرگەکان بەلاشانی پشتی گولان و حەسارۆستدا دابەش بوون. شەوان زۆر سارد بوو، باش لەیادم ماوە مانگی حەوت بوو لەڕۆژی (١٩٦٢/٧/١٤) لەگەڵ ئەوەی شەڕێکی گەرم بوو بەفرێکی چاك باری و هەموو سەرما کەسیرەی کردبووین. زۆرمان دووچاری نەخۆشی سکچوون ببووین. لەو کاتەدا نەخۆشخانەیەکی گەڕۆکی شۆڕش لەگوندی گولان دانرابوو بۆ سارێژ کردنی

برینـی زامـدارانی جەنگەکـە، وردە وردە نەخۆشـەکان دەبرانـە ئـەوێ. ئـەو تاعونـە منیشی گرتەوەو بردمیان بۆ ئەوێو چەند ڕۆژێ لەوێ بووم. ئێوارەیەك فەرماندەی کەرتەکەم لەگەڵ سەردەسـتەکەمو هەنـدێ پێشـمەرگەی تـر هـاتنو وتیـان: بـابڕۆین، لێم پرسین "بۆ کوێ.؟" وتیان: "بڕیارمان وەرگرتووە دەگەڕێینەوە، ئێستا شۆڕش لەوێ چاك گەشەی کردووەو پێویستییان پێمانـە" من ئاگـام لـەوە نـەبوو بـێ پـرس شوێنەکەیان بەجێ هێشتووەو هاتوونـەوە. کەوتینـەڕێ، بەچـەند ڕۆژێـك گەیشـتینە گوندی گرێتەپەی مامە عەبدوڵلا لەسەر زێیەکەو لەڕەندی خاندا سەوزەواتێکی زۆر کرابـوو، پێشـمەرگەیەکی زۆر بەبازنـەیی دانیشـتبوونو مـام جـەلال قسـەی بـۆ دەکردن. دیمەنێکی زۆر دڵخۆشکەرانەی هەبوو، خۆمان کرد بەناو کۆبوونەوەکەدا، مام جـەلال بـەهاری هێنـابووە ئـەژنۆ، لـەپاش تـەواو بـوونی کۆبوونەوەکـە کوێخـا شـەریفی سـەیدانو مـەلا صـدیقی تلیـانو حـاجی محەمـەد داڵـەوا چوونە لای مـام جەلالو بۆیان گێڕایەوە کەهاتوونەتەوە، ئیجازەی دابوونێو هەرچی فیشـەکی کـەم ببوو بۆی بژاردبوون، منو مەجیدی مرە شەکر خوری کانی بی روتەڵـە بووین، ئـەو چـووەوە کـانی بـیو منـیش بـۆ عەسـکەر، لـەوێ نەمامـەوە، چـووم بـۆ شـێخانی سوورقاوشـان ڕۆژی دوایـی پێشـمەرگەیەك هـاتو وتـی: مـام جـەلال ئـەڵێ بـە پەلـە بگەڕێتەوە چەم، منیش مام جەلالم چاك نەدەناسی، شارەزای جۆری تـووڕە بـوونی نەبووم کە لەکاتێکدا لەگەڵ یەکێك تووڕە دەبـێو بیلبیلـەی چاوی دەسـووڕێو ڕوو دەکاتە یەکێکی تر پێدەکەنێ. بە تەتەرەکەم وت: تۆ بڕۆ سبەی خۆم دێم، هـەر ئـەو ڕۆژە شەو دوو سێ پێشمەرگەی تر هاتنو وتیان: یان ئێستا پێشمان دەکەوی یـان چەکەکەت دەبەین، تووڕە بوومو چەکەکەم دانێ.

سبەی زوو پێشمەرگەیەکی تر هـاتو وتـی: لـە چەم داوات دەکـەن، نەمدەتوانی نەچم ناچار پێش پێشمەرگەکە کەوتمو چووم بۆ چەم، لە کاتێکدا چوومە باڤڵەکە هەوایـەکی خـۆش لەتاڤگـەی ئاوەکـەی جۆگـای پشـت باڤڵەکـەوە بـەردەبووە وبـارو دۆخێکی دروسـت کردبـوو لەهـەوای ئێـر کۆندێشـن خۆشـتر بـوو، مەنجـەڵی زلـە زلـە لەگۆشـتی گـا لەسـەر ئـاگر بـوو، مـام جـەلال ئـەتوت دەبابەیـە دەهـات ودەچـوو، لەنێوانی ڕیزە پێشمەرگە دانیشتووەکانی ئەم بەروبەری سەکۆکانی باڤڵەکە قسـەی دەکـرد، ئـەتوت بـەڕووی لـە دەمـدا دەتـەقێ، سـڵاومان کـرد، پێشـمەرگەکە وتـی: لەشێخان. مام جەلال وتی: بۆ نەهاتووی بـۆ ئێرە یەکسـەر؟" وتم:"مەسئولەکانمان

لەگۆپتەپە لەگەڵ بەڕێزت قسەیان کردووە و من ئیجازەم لەوان وەرگرتووە بۆ یەك هەفتە" وتی:"ئەی بۆچی لە ناوچەی بادینان گەڕایتەوە؟" ئەم دەزانی زمان لووسانەو بەفێڵ جوابی بدەمەوە پێموابوو مەسئولەکان نەیان وێراوە باسی ڕاستی ڕووداوەکە بکەن بۆیە وتم:"زۆرمان سەرما بوو" تووڕە تر بوو، منیش وام دەزانی بەزەیی پێمان دێتەوە وتم:"کاتێ ئێمە ڕۆیشتین سەرو کراسمان لەبەر بوو لەویش کەس هیچی بۆ نەکردین، پێڵاومان نەبوو، جل وبەرگمان نەبوو، سەر بەرگمان نەبوو" نەی هێشت قسەکەم تەواو بکەم چاوەکانی کەوتنە فڕین ونەڕاندی"بڕۆن زیندانی بکەن و هەتا من لێرەم هەر کەسێ بەری بدات ئەویش زیندان دەکەم" خێرا وەکو تاوانبار ڕەفتار کرام، خرامە ئەشکەوتێکەوە پڕی بوو لە سیخوڕ وجاش وخەڵکی خراپ، ئێوارە بوو لێپرسراوەکەیان تەنەکەیەکیدا بەدەستم ئاو بهێنم لە ڕووبارەکە زۆرم پێ ناخۆش بوو، تووڕە بووم و وتم"مومکین نییە ئاو بهێنم" باش بوو پێشمەرگەیەکی هاوڕێی کۆنم لەوێ بوو لەسەری کردمەوەو ئاویان پێ نەهێنام. ئەسپێ تینی بۆ هێنام، داوام کرد لەگۆشەکانم دانێن کە کەمێ دوور بم لەزیندانییەکانی تر، ئەویش برادەرێکم هاوکاری کردم و لەپەنایەکی زیندانەکەوە جێ گیربووم، زۆر دڵم سەغڵەت بوو، کەسێ نەبوو لەسەرم هەڵبداتێ.

لەو ڕۆژانەدا بوو پۆلیسەکانی دوکان هەموویان بەچەکەوە هاتن خۆیاندا بەدەست شۆڕشەوە وچەکی زۆریان هێنا بوو، خۆشی و سەرکەوتنێکی چاك بوو، ئەو ڕۆژە(٥)ڕۆژ بوو من لەو ئەشکەوتەدا ئەسپێم دەکوشت، شەو چەم بووبە چەپڵە ڕێزان وتەقەی خۆشی، منیش بە کویرە خەتەکەی خۆم نامەیەکم نوسی بۆ مام جەلال وداوام کرد بەو بۆنەیەوە لێم ببورن و لەم زیندانە ئازادم کەن، باش بوو نامەکەم گرتی و ئازادیان کردم. بەڵام غەزەبی مام جەلال هەر لەسەرم بوو کەدیم لە ئەشکەوتێکی بچکۆلەدا شتی ئەنووسی، وتی:"هەتا من لەم هێزە بم نابێ تۆ چەك بگری بەدەستەوە" منیش لە دڵی خۆمدا بەڵێنمدا هەر ئەبێ ئەو بڕیارەت پێ بشکێنم.

ماوەیەکی چاك لەچەم لە ئیدارە دانرام بۆ بەردەستی، هەموو کارێکیان پێ دەکردم، ماوەیەك دەیان ناردم نامە بەرم بۆ هێزی بێتواتە، بە ڕۆژێك ئەچومە بێتواتە بەبێ چەك و لەوێشەوە بەڕۆژێك دەهاتمەوە. ماوەیەك باراشیان پێدا دەناردم بۆ سورقاوشان ئاش تا جارێکیان لە گوندی عەسکەر بەندییەکیان دامێ

لەگەڵ برادەرێکی تردا بیگەیەنینەچەم، شەو بردمانە ئاشەکەی شێخان لەوێ تا بەیانی ئێشکمان لێ گرت، ئاخری لەدەستمان ڕایکرد چونکە ئێمە بێ چەك بووین و لەکاتی ئێشکی هاوڕێکەمدا فێڵی لێکردبوو، وتبووی ئەچمە سەرئاو، کاتێ نەهاتبووەوە منی لە خەو هەڵساند، ڕامان کرد، نەیگەیشتینێ وخۆی کرد بە مەخفەرەکەی قەشقۆڵیدا، لەسەر ئەوەش هەندێ لۆمە کراین بەڵام من بەڵگەم هەبوو چونکە لە سەرەی ئێشکی مندا نەڕۆیشتبوو.

ئەوسا پەلێکی ئیدارە لەعەسکەر هەبوو، ئەو ئەرکی کۆکردنەوەو پارێزگاری ئەو دەغڵ و دانەبوو کەلەسەر خەرمانی جوتیاران کۆ دەکرایەوە. هەر کاتێ ئارد بۆ چەم پێویست بوایە چەند بارێك گەنم دەناردراو دەبرا بۆ چەم. ماوەیەك دایان نام لەو بەشە کارم دەکرد، سەرەتا باراش هاڕین پاشان کرام بەسەردەستە، دوایی کرام بەکادری کۆکردنەوەی گەنم و جۆو ڕەوانە کردنی بەسەیارە بۆ عەسکەر. هەر بەتەنها دەگەڕام چونکە هەر دێیەك چەند کەسێ بەر پرسیاری کۆکردنەوەی بوو لەو گوندە چاڵ دەکرا هەتا من ئەچووم بەلیست وەرم دەگرت و دەمنارد بۆ سەرووی خۆم. بەهۆی ئەم کارەمەوە دۆست و ناسیاوێکی زۆرم لەناو جوتیاراندا پەیداکرد لەناوچەکانی شوان، شێخ بزینی و قەڵاسیووکە.

لەکاتێکدا دەگەڕام ئەسپێکیان دابوو پێم بۆ ئەوەی فریای کارەکەم بکەوم، یەکەم جار بوو شەڕێکی زۆر گەورەی ڕوو بەڕوو لەنێوانی سوپای عێراق و هێزی پێشمەرگە بەو بەربڵاوییە ڕوو بدات لەدەربەندی بازیانەوە بەرەو ئاغجەلەر چەند شەوو چەند ڕۆژی خایاند، سەربازێکی زۆر بەشدار بوون، دەبابەو فڕۆکەش هاوکاری دەکردن، شوێنێك هەبوو لەدەوروبەری گوندی خەربەندەلوو پێی دەوترا گردە قارەمان. ئەنجامی ئەوە ئەو ناوەی لێنرا، مام جەلال داوای لە هەندێ پ.م کردو وتی: "دەمانەوێ ئەو گردە بگرین بۆ ئەوەی دوژمن بشکێ بەڵام ئەوانەی ئەچن سبەینێ ئەم دەمە فاتیحایان بۆ دەخوێنین و شەرەفی شەهیدو قارەمانیان پێ ئەدەین، چونکە سەرکەوتنی ئەم شەڕە سەرکەوتنی شۆڕش و گەلە" (١٨) پێشمەرگە شێرانە خۆیان فیداکردو چوون گردەکەیان گرتەوەو شەهیدیش نەبوون. بەڵام هەر لەو شەڕە کۆمەڵێك کوڕی چاك شەهید بوون لەو چەند ڕۆژەدا، زیانێکی زۆریش لەدوژمن کەوت و دەبابەیەك کەوتە دەست شۆڕش بەهەڵگەڕاوی و چەك و تەرمی سەرنشینەکانی کەوتنە دەست شۆڕش. ئەو شەڕە ورەیدا بەخەڵك و پاڵی نا

بەشۆڕشەوە بەرەو پێش لەو ناوچەیە ئەو چەند رۆژە ئێمەش دەوری خۆمان بینی لەبەرێکردنی نان‌و خۆراکی پێویست لەگوندەکانەوە بۆ مەیدانی جەنگەکە.

پاش تەواوبوونی کۆکردنەوەی زەکات‌و دەغڵ‌و دان گەڕامەوە عەسکەرن پاش ماوەیەك دووچاری گرفتێکی بچکۆلە هاتم لەسەر ئەوە چوومەوە چەم‌و لەئیدارە مامەوە، هەتا ژمارەم گۆڕییەوە لەگەڵ عەبدوڵڵای ئەحلان شوانی کۆنە پۆلیس‌و ئەو هاتە ئیدارەو من چووم بۆ شوێنەکەی ئەو لە لقی (٣) شەهید عەزیز عەودەڵانی، کاتێ بە خۆشحاڵییەوە رۆیشتم لەناو ئەشکەوت سەحرادا کەبۆ لقەکە بەکار هاتبوون، چاوم کەوت بەلێپرسراوی عەسکەریی لق کەناوی (...) خەڵکی گوندی گڵناغاج بوو. پێم راگەیاند کەمن لەجێگای عەبدوڵڵا دێمە لقی (٣)و ئەویش ئەچێتە ئیدارە لەچەم. زۆر بەرەقی وتی: "ئێمە پێشمەرگەی ئازاو شەڕکەرمان دەوێ، تۆمان ناوێ" وەکو ئەوە وابوو گوللەیەکم لێ بدەی، چونکە منی لەشەڕدا نەبینیوە، یەکێکم لەلقەکەیان دەناسی ناوی مەلا تالیب بوو خەڵکی ساڵەیی پردێ بوو پیاوانە هاتە پێشەوەو وتی: " من لەکەرتی خۆمدا قبوڵمە با بێتە لای من گەنجە کێ دەڵێ ترسنۆکە، جارێ ئێمە نەمان بینیوە لەهیچ حاڵەتێکدا، ئازا یان ترسنۆك" زۆرم پێ خۆش بوو، مەلا تالیب بەو هەڵوێستەی قەرزاری کردم، چوومە ناو کەرتی (٢) لەدڵە خوریە رزگارم بوو، خوا خوام بوو زوو بکەونە جەولەو چەم بەجێ بهێڵم وەهام لێهاتبوو رقم لەچەم دەبۆوە، حەزم دەرکرد ئەوەندە دوور بکەومەوە بەسەردانیش رووی تێنەکەم. لقەکەمان رۆیشتە دەوروبەری قشڵاخ‌و شێخ وەیسی بۆ چاوەدێری جموجووڵی حکومەت لەو سەردەمەدا. بەهاری ساڵی ١٩٦٣ بوو، لقەکەمانیان نارد بۆ گوندی کوچك نەخشینە لەوێ چاودێری کەنەکەوەی دەوروبەری چەمچەماڵ بکەین، چونکە هەواڵەکان وەها بوون هێرشێکی بێ شومار دێت بۆ سەر ناوچە ئازاد کراوەکان. چەند رۆژێك بوو لەو ناوە بووین، ژیانێکی زۆر نوێ‌و خۆش بوو لام، ناوە ناوە حەرەسیاتمان بەردەکەوت، هیچ لە شانم ناخۆش نەبوو چونکە دووربینەکەم دەنایە چاومەوە هەر لە بانی مەقامەوە هەتا دەوروبەری سەنگاوو دەوروبەری دەربەند دەمڕوانی بۆ جموجووڵی سوپای دوژمن. بەیانییەکیان لەرێکخستنی شاری کەرکوکەوە هەواڵێکیان هێنا کە گوایە رژێم نیازی هەیە بەیانی هێرشێکی بەربڵاو بکاتە سەر ناوچە رزگارکراوەکان بە تایبەت هێزی رزگاری کەدەکاتە شوانەکان، شێخ بزێنی

خواروو سەروو، قەلا سێوكە، هەر ئەو رۆژە بروسكەی هێز هات كە دەڵێ چاودێری شەقامی كەركوك- سلێمانی بكەن و لە ئاستی خۆتانەوە رێگەی لێبگرن و لێی بدەن. ئێوارەی ئەو رۆژە كۆكراینەوە لەمزگەوتەكەی كوچك نەخشینەدا، پێیان راگەیاندین ئەبێ دە كەس خۆی ئامادە بكات پاشان خۆمان دەست نیشانی دەكەین بەیانی لەگەڵ تاریك و روونیدا بڕۆنە سەنگەرەوە لەنزیكی جادە لەكەندەكەوە، لەكاتێكا دوژمن هات هەر یەكێك تەنها (٥) فیشەك بتەقێنێ لەپێشەنگی هێرشەكەو پاشەكشە بكەنەوە سەنگەرەكانی دواتر نیاز لەمەش وەشاندنی دەستێكی ناخافلانەو سام خستنە بەر دوژمنەوە.

شەو لەمزگەوتەكەدا چرایەكی كزمان داگیرساندبوو، بۆ دروستكردنی خواردنیش ئاگرمان هەر لە ژوورەوە دەكردەوە، چونكە گوندەكە لەجادەكەوە نزیكەو مەترسی ئەوە هەبوو دوژمن تۆپی لێ بدات. بەیانی پێش روناكی بەیان لەخەو هەڵساین و هەموو چوینە دەرێ روو لەسەنگەری دیاریكراو، ئێمە (٣٠) مەترێ لەتاشەبەردەكانی سەر شەقامەكە لەناو تەختی زەوییەكەدا سەنگەرمان بۆ لێدرابوو، بە قەد بالای زەلام چووینە ناوی نم نم باران دەباری. سەنگەرەكان لەئەرزا بوو، لایەكی سەری گیرابوو، باران نەی دەگرتەوە، تفەنگەكانمان بە دەستەوەبوو لەپاڵ نواكەدا یەكێك ملی لەكونەكەوە دەردەهێنا، كزەبای دەهات باران بە باوە بوو، دنیا روون ببۆوە، لەولاوە وەكو رەوە ریشۆڵە كە لەترسی واشە خۆی بەزەویدا دەدا ئاوا حەرەس قەومی سەر سپی و رەش كەوای درێژی كراسی لێوار بەدەمەوە گرتوو تفەنگ بەدەستەوە هەر خۆیان هەڵدەداو خۆیان بە زەوییەوە دەنووساندو دەهاتنە پێشەوە. زۆر نزیك بوونەوە بەتەواوی خەریك بوو بێنە سەرمان لەسەنگەرەكەدا، سەردەستەكەمان وتی: دەست بەكاربن، دەستمان پێكرد، پێنج فیشەك تەواو، دەش تەواو تۆزێ كشانەوە، مەیتی زۆریان لێ كەوت، كولە باری بەشێوەی بارانەكەی دەباری، هێشتا لێلی مابوو گولەكان سوور دەچوونەوە، هاوانە (٦٠) ملیمەكان لەنزیكمان لەسەر یەك دەكەوتنەوە، رێگامان نەبوو هەڵسین، مەترسی ئەوەمان هەبوو بگیرێین یان سەنگەرەكەمان بەسەرماندا بڕوخێن، هەرچۆنێك بوو فەرمانی كشانەوەدرا تا هەمووومان دەرچووین لەسەنگەرەكانمان گوللەی دەوروبەرمان وری كردین. هەرچۆنێ بوو گەیشتینەوە سنووری برادەرەكان و سەنگەرەكانی پشتەوەی خۆمان، هێرشی حەرەس قەومی مەوجیدا

لەهـەموو لایەکـەوە، دالاْش ئاسـا دابـارین، تەقـەی ئێمـەش روو بـەڕوویان بـووە، خۆیـان بـە زەوییـەوە نووسـاند، تۆپ بـاران کـراین، دەبابـەو دۆشـکەو نـاوە نـاوەش فڕۆکەی مێك بۆردوومانیان دەکردین، وەها رێکـەوت مـن کەوتمـە ئـەو شـوێنەوە کـە لێپرسراوەکەی لێ بوو لەگەڵ چوار پێنج پێشمەرگەدا منیش چوومە لایان و زۆر دڵم خۆش بوو کاتێ لای ئەوان خۆم گرتەوە. بەردێکی خڕ لەسەر گردۆڵکەکەبوو رەنگە لەشـووتییەکی گـەورەی خڕەکـان گـەورەتر بووبـێ، لـە لاشـانی گردۆڵکـە سـەر روتەکـەش رەوەزێکـی بچکۆلە هـەبوو، ئەتوانـدرا لـە کـاتی بارانـدا سـێ چوار کـەس خۆی لـەباران بپـارێزێ. لێپرسـراوەکە بـە منـی وت: "ئێمـە دەمێکـە لێرەین، مـەجال نادەن سەر هەڵبڕین، حەزم لەجگەرەیە ئەچینە ئەوێ جگەرەیـەك دەخـۆین، تـۆ وردە وردە تەقـەیان لێ بکـە، مەهێڵـە بێنـە سـەر گردەکـە پاشـان ئێمـەش دێینـەوە لات" جگەرە خۆرێك شەڕێکی چڕم کرد، بەردەکەی خۆم لەپاڵیا درێژ کردبوو، بە فیشـەك کـون کونیـان کردبـوو، منـیش لەترسـی قسـەی یەکـەم رۆژی لێپرسـراوەکە ترسـم لانەبوو، ناوە ناوە بە تفەنگەکە پێنج تـیرە ئینگلیزییەکەم کەزۆر کۆن و خـراپ بـوو تەقەیەکم دەکردو بەبەرد میلەکەیم دەهێنایـەوەو پەڕۆ چەورەکەم لەمیلەکەی دەدا چونکە زوو زوو دەنووسا، هەر لەم تەقە تەقەدا بووم کوڕێکی هـاوڕێم نـاوی جـەبار مەحمودبوو، خەڵکی گوندی سەربیر بوو گەیشـتە لام و زۆر گـەرم بـوو ل تەقـەکردن، زۆر ملـی هەڵـدەبڕی، هێـورم کـردەوە، وتم شـەڕ لەوانەیـە زۆر بخایـەنێ ئێمـەش تەقەمـەنیمان کەمـە هەوڵبـدە کـەو کوژی لەسـەدا یـەك بکـوژی. ئـەوە چاکترە لـەوەی بەهەزاران فیشەك بتەقێنی چونکە کوژران ورە دادەبەزێنێ، ورەم زۆر بـەرز ببـۆوە، جـەبار هـاتبوو، بەرپرسـەکەو ئـەوان لەلاشـانمانەوە پێیـان وابـوو دوژمـن لـەقوڵی ئێمـەوە ناتوانـێ سـەر بکـەوێ، جگـەرەخۆر بـوو بـە دووجگـەرەخۆر، نیـو سـەعاتی خایاند، بە جەبارم وت: "وشیار بە با بزانم بۆ سـەرناکەون" جـەبار وتـی: "ئـەها تەماشاکە لەولاوە خەریکە پشتمان دەگرن بەڵکە دوانیـان بڕۆنـە سـەرووترو لـەوێوە دایـان پەڕێننـەوە خـوارەوە" کاتـێ چووم هەوارەکـە خـاڵی بـوو تومـەز هـەڵهاتبوون بەرەو پاشەڵی سەنگەرەکان، زۆر بانگم کـردن دەنگیـان نـەبوو، لەوبەرمانـەوە ڕیـزێ سەنگەری خۆمان هـەبوو، بانگیـان کـردم کەلێپرسـراوەکە لەگـەڵ برادەرەکـان چـوون بۆ لای سـەرلقەکەمان کەئەوسـا شـێخ عوسمـان عـەوالانی بـوو، تومـەز لـەوێ شـێخ عوسمـان کاتـێ دەزانـێ بەرپرسـەکە شـوێنی خـۆی چۆڵکردووە پێشـمەرگەکانی لێ دادەبڕێ و خۆی محاسەبە دەکا و دەری دەکا لەشەڕگەکەو دەی نێرێتەوە بۆ چەم.

شـەڕ درێـژەی کێشـا، ئێـوارە کـات خـۆی دابـوو لـە چـوار لەگـەڵ جـەباردا جەمانییـەکانمان هەڵتەکاند بۆ سـەنگەرەکانی خۆمـان و هەڵسـاینە پـێ و بەجووتـە هێرشمـان کـرد بـۆ گردۆڵکەیـەکی تـر کـە لەسـەر سـەری دوژمـن بـوو، لـەوێ چـەند فیشـەکێکمان بەیەکـەوە گرتـە نـاو قەلەبالغیەکـەو پاشـەو پـاش روو لـە شـەقامی سـەرەکی چەمچـەماڵ هـەڵهاتن لـە خواریشـەوە هێزاکانیـان هەنـدێ کشـانە دواوەو مەعەسـکەرێکیان هەڵـداو هـەموویان تەقـەیان راگـرت. ئێمـەش کـات خـۆی دا لـە شەشـی ئێـوارە پاشەکشـەمان کـرد بـۆ مزگەوتەکـەی کوچـك نەخشـینە، بەسـەر تـەق تەقە شـاخێکا گەڕاینـەوە کاتێکم زانـی جەبار خـۆی دا بـە زەویـداو فیشـەکی بـردە پـێش و وتـی: "کێـی تـۆ؟!" چـەند جـارێ دووبـارەی کـردەوە کاتـێ سـەرنجمدا سـەربازەو خودەکـەی لەسـەردایەو کـوژراوە بەیەکـەوە چـووینە سـەری، کۆمـەڵێك فیشـەکی پـێ بـوو دیـار بـوو یاریـدەدەری دووهـەمی ڕەشاشـی برین بـووە، لـە پاڵیا تفـەنگێکی ئینگلیـزی کـەوتبوو، زۆرمـان پـێ خـۆش بـوو وتم: "خـوا دای ئـەوە تفەنگەکەم مسۆگەر بۆ دەگۆڕن" فیشەکەکان زۆر بوون، بەجووتە بە سەری بەرزەوە چووینەوە لای هاوڕێکانمـان تـەنها ئێمـە دەسـتکەوتمان ببـوو، هـەموو دەوریـان لێ داین، ڕێزیان لێ دەگرتین، دەستیان بەسەر شانماندا دەدا.

تفـەنگ و فیشـەکەکانمان دایـە سـەرلقەکە، پێشـنیارمان کـرد تفەنگەکـەی مـن بگۆڕن، زۆر بەداخـەوە بۆیـان نـەگۆڕین بـەڵام هـەر یەکـە چـەند فیشـەکێکیان داینـێ، ئەو ڕۆژە سەرکەوتوو بووین.

برادەران هاتنە لام، وتیان: مریشك دەکڕین، هەر یەکە ئـەبێ (١٠٠) فلس بـدات، مـن وتم: "زۆر سوپاس مـن نـاخۆم چونکە پـارەم نییـە" برادەرێـك لـێم تـوورە بـوو، وتـی: "مـن پارەکـەت ئـەدەم و هـەر ئـەبێ هەڵسـی" خەفـەرەکان مریشـکەکانیان ئـاوەڕووت کـرد و خسـتیانە مەنجەڵـەوە، هـەر چـەند کەسـێ بـە یەکـەوە مریشـکێك دوانیـان کڕیبـوو، کـات خـۆی دابوو لـە (١٢)ی شـەو، هـەڵیان سـاندین زۆر هەوڵمـدا هەڵنەستم بەڵام وازیـان لێ نـەهێنام، هەڵسـام ژوورەکـە زۆر تاریـك بـوو چـراکە بـاش ڕۆشـنی نـەکردبۆوە. لەتەشـتێکی بچـکۆلەدا پـڕ کرابـوو لـە ئـاوی مریشـکەکەو گۆشتەکەی و هێنایانـە پێش، زۆرم حـەز لێ بـوو، زۆر دەمێك بوو گۆشـتی مریشـکم نەخواردبوو، یەکـەم کەوچـك فڕوجـاوم خسـتە سـەر لێـوم، فـرێکم لێـدا هـەر هـەموو دەمارەکانی لەشم وەکو بەچکە چۆلەکە دەمیـان کـردەوە، ئـای لـەو تەزووانـەی بـە لەشمدا دەهات، لە ژیانمدا جارێکی تر ئەو تەزووە خۆشییەم نەدیوەتـەوە، شـەو بـە

تێری خەوتین، لەو سەرەوە زوو هەڵساین لە سەنگەرەکانمان دامەزراینەوە، شەڕ دەستی پێ کردەوە، هێزی دوژمن خۆی لە ئێمە نەدا، جادەو جادە روو لە دەربەندی بازیان رۆی، زۆربەی هێزی بەرەو ژوور بەڕێکرد، رۆژی دووهەمی شەڕمان بوو نێوانی ئێمەو دوژمن (٥٠٠) مەتر نەدەبوو، بە تەواوەتی لێك نزیك بووین، فڕۆکە نەی دەتوانی لەبەر هێزەکانی خۆی بۆردومانمان بکات.

ئەو رۆژە واتە رۆژی دووهەمی شەڕ نیوەڕۆ ببوو، بروسکەی سەرکردایەتی هات کە بە پەلە هێزەکومان بکێشینەوە بەرەو چەم بەڕێکوپێکی، ئەم هەواڵەمان زۆر پێ ناخۆش بوو چونکە لای خۆمانەوە سەرکەوتوو بووین و نەمان دەهێشت دوژمن بێتە پێشەوە، بەلام بڕیاری سەرکردایەتی چی بوایە ئەوە جێبەجێ دەکراو هێزەکەمان کەوتەڕێ بەرەو ئاغجەلەر لە کاتێکدا هێزی زۆری دوژمن روو لە سلێمانی دەجوولا. وەکو شارە مێروولە ئێمەش بە داوێنی ئاغجەلەردا بەرەو چەمی رەزان بەڕیزو یەك لەدوای یەك و مەسافە وەرگیرا، بۆ ژەمەکان لە گوندەکانی سەر رێگا لامان دەداو نانمان دەخواردو دەکەوتینەوە رێگا هەتا گەیشتینە پشتی پلەی بەردە عەلی روو بە رووی قەلای جوڵندی. لەوێ شوێنی سەنگەریان بۆ دیاری کردین، هێزێکی یەکجار زۆر بە دەوری چەمی رەزاندا سەنگەر بەندی کردبوو، بەلام هێزی حەرەس قەومی و هێرشەکەی لەوە بەتواناتر بوو، بۆیە هێر بە تەواوەتی کەوتبوونە جموجووڵ.

ئێمە لەسەنگەردا ئەمان روانیە هێزە لەژمارە نەهاتووەکەی حەرەس قەومی، سەراپای گوندەکانی ناوچەی قەلاسێوکەی گرتبوو، گوندەکان زۆربەیان دەسوتێندراو بە بلدۆزەر تەخت دەکرا، دەرگاو پەنجەرە بە سەیارەو تراکتۆرو بەکۆڵ دەگوێزرایەوە، لەلایەن حەرەس قەومییەکانەوە تالانی مەڕو بزن و گاو گوتاڵ دەستی پێ کردو ماڵاتی کەس نەپارێزرا. پێشەنگی هێرشەکە گەیشتە زیخەڵان و خورماخاجی و لاقەدی ئەشکەوتی گامێشان، گوللەو تۆپی دوژمن هەمووی دەکەوتە چەمی قەلاو دەوروبەری سەنگەرەکانی ئێمە، هەندێ گاگەل و مێگەلە مەڕ لەو ناوە بوو هاتن تالانی بکەن، دەستمان کرد بە لێدانیان تالانەکەمان لێ سەندنەوە، شەڕ گەرم بوو، ئەوان زۆر بوون، لێمان هاتنە پێش تا خۆرئاوا پاشان کشانەوە گوندی عەسکەرو لەوێ سەربازگەیان دانا بۆ ئەوەی سبەی بۆمان بێنەوە.

رۆژی دوایی بە دروشمی "ئەحنە بەدوو، وێنەل عەدوو" بۆمان هاتنەوە، ئەو

رۆژەش نەمان هێشت لەوە زیاتر بێنە پێشەوە، هەرچی هاوارو هۆسەی (خەفاف شلیل)یان کرد ئەو رۆژەش گەڕانەوە گوندی عەسکەر، ئێوارەی دووهەم بوو، رەشید سندی نوێنەری هێز بوو ئاگاداری لق و کەرتەکانی کرد بۆوە کە ئەبێ هەر ئەمشەو بەرەو بناری چەرماوەند بکەونەڕێ و کەس بەجێ نەمێنێ و هێز چەم چۆڵدەکات، چونکە هەواڵەکان وەهایە دوژمن ئەیەوێ چەم بگرێ، مادام بیەوێ هەر دەیگرێ، بۆ ئەوەی شەهید زۆر نەدەین، چۆلی دەکەین پاشان بۆی دێینەوە، ئێمەی پێشمەرگەی خواروو بڕیارەکەمان نەزانی، مەشغوولی ناشتنی تەرمی دڵشاد کۆیی بووین کە ئەو ئێوارەیە شەهید بوو لەتەك منەوە لەسەر لوتکەی زیخەڵان، لاوێکی بەکارو خوێنگەرم بوو هەرچەندم پێوت کە قوتە نەکات، بەڵام گوێی پێ نەداو لە زەردەپەڕدا بوو گوللەیەك بەر ناوی دەمی کەوت و شەهیدبوو. تەرمەکەیمان لەبن دارە شەخسەکانی رووبەرووی قەڵای جوڵندی بە خاك و بە ئامانەت سپارد. ئێمە پاش سپاردنی تەرمی شەهید دڵشاد چووین بۆ ئەشکەوتەکانی قەڵای جوڵندی هەندێ لە خزمانمان لەوێ بوون لە ترسی هێرشەکە هەڵهاتبوون، کاتێ ئێمەیان دی زۆریان پێ خۆش بوو، هاتنە دەورووپشتمان پرسیاریان کرد ئێمە چی دەکەین، ئێمە ئاگامان لە بڕیاری سەروو نەبوو وتمان: " هەر لە شوێنی خۆمان دەمێنینەوەو دەجەنگین تا دوژمن دەگەڕێتەوە".

کاتێ ئێمە گەڕاینەوە سەر زیخەڵان و سەنگەرەکانی خۆمان، پێیان راگەیاندین کە ئەمشەو ئەبێ بڕۆین، شوێنەکەش وەها رێکەوتبوو ئەبوو بە بەردەمی ئەشکەوتی قەڵای جوڵندیدا بپەڕینەوە، هێزەکەمان رچەی بەست و هەریەکە بەتانییەکی گرتە کۆڵ و سەرەوخوار روو لە چەم رۆیشتین، گەیشتینە بەردەمی ئەشکەوتەکە دوو سێ ئافرەت لێمان راپەڕین، هەرچی ناشێ پێیان کردین وتیان: "سبەی دوژمن دێت هەموومان دەبەن و سەربەرزی بۆ ئێوە دەبێ هەرچی لە ئێمە بکەن!!" ئای کە دیمەنێکی دڵتەزێن و هەست بە شەرمکردنی بۆ دروستکردین، مردن بوو زۆری دەویست تا خۆمان لە شەرمەزاری چاککەینەوە. هەر لەم هێرشەدابوو هێزێکی حەرەس قەومی چوو بووە گوندی کلێسە لەبەری کۆیەو هەندێ تفەنگ بە دەستی ئەو ناوەو هەندێ پێشمەرگە لێیان رادەپەڕن و حەرەس قەوییەکی زۆر دەکوژن، پاشان حەرەس قەومییەکان هار دەبن و دێنە سەر ئەشکەوتی قەڵا و هەرچی ماڵە جوتیاری تێدا دەبێ دەیان گرن و بەرەو ئاغجەلەریان دەبەن، سەعات و ئاڵتون و پارەو پێڵاوو قاتی رێکوپێکی ژن و پیاو دەبەن و ژنەکان

دەكەنە تەلبەندێكەوە لە ئاغجەلەرو پیاوەكانیش بە پێی پەتیو بە لێدان دەبەن بۆ بەرامبەری كلێسەو تەرمی حەرەس قەومییەكانیان پێ دەهێننەوە بۆ ئاغجەلەر.

ئێمە هێزەكانمان لەحاجیتانی سەروو پشتی سورداشو ئۆمەر قەومو شەدەڵەو دۆڵی مێرگەپاندا كۆكردبۆوەن هەر یەكێك شوێنێكی پێ سپێردرا بوو، لقی ئێمە حاجیتانی سەرووی پێ سپێردرا بوو، تازە دوو رۆژ بوو گەیشتبووینە حاجیتان هێرشی حەرەس قەومی دای بەسەرماندا، ئێمە چووینە ئەم بەرو بەری شاخەكە، داڵە كەرخۆرەكان هاتنە ناو گوندەكەو دەستیان كرد بە شرە خۆری، تەقەمان لێ كردن، تۆپ بارانێكی چرمان لەسەر بوو، بە بەر چاومانەوە دەرگاو پەنجەرەكانیشیان دەخستە سەر شانیانو دەیان گەیاندە مەعەسكەرەكەی حاجیتانی خواروو. ماڵ بەماڵیان تالان كرد، تەقەی ئێمە هەندێ پەریشانی كردبوون، بەڵام نەبوو بەهۆی ئەوەی شرەو شاتاڵ نەگوێزنەوە، خەڵكیان لێ كوژرا، زامداریان زۆر بوو، بەڵام خۆیان ئەوەندە زۆر بوون دەت زامدار ئەكرد بیستی تر دەهاتە شوێنی، تا ئێوارە شەڕ بوو، ئێوارە گەڕانەوەو گوندەكەیان سەراپا تالان كردو سوتاندیان، خانووی تێدا نەمابوو نەسووتێندرێ.

هێزەكانی ئێمە چونكە لە شوێنەكانی خۆمان هەڵكەندرابووین، لەرووی ئیدارییەوە باش بەڕێوەنەدەچوو ئەو گوندانەی ئێمە لەسەری دابەش ببووین دەرەقەتی نانی خۆرایی نەدەهاتن، شۆڕشیش ئازوقەی وەهای بۆ نەخستبوو لەوێ، ناچار بۆ خۆمان پارەمان كۆدەكردەوە بۆ كڕینی نانو مێوژە ڕەشكەو هەنجیرە وشكە، ئەبوو ئیدارە بكەین. رۆژی شەڕەكە هەتا نەمان دەتوانی ئاویش پەیدا بكەین چونكە ئاوی گوندەكەش لەژێر دەستی حەرەس قەومیەكاندا بوو، شەو چووینە ناو گوند ماڵ بە ماڵ گەڕاین هیچ لە كەلاوە سووتاوەكاندا نەدەبینرایەوە، من زۆر گەڕام دوو شتی باشم دەست كەوت ١- قوتوویوكی بەتاڵ بۆ ئاو بردن. -٢- گۆزەیەكی سووری بچكۆلە رەنگە سێ كیلۆ گەنمی كوتراوی تێدا بووبێ هەردووكم لەگەڵ خۆم برد شەو دەستم كردبە كوڵاندنی گەنمەكە كردم بە (دانولە) بە خوێوە دەستمان كرد بە دابەشكردنو خواردنی لەناو دەستەكەی خۆمانداو وەكو مێوژ دەمانكردە گیرفانمانەوە بۆ كاتی برسێتی.

# ئینقلابی ناوخۆی بەعسییەکان

زوڵـمو ناڕێکی نـاو بەعسـییەکان وەهـای کـرد خۆیـان لـەناو خۆیانـدا ئینقیلاب بکـەنو گـۆڕ بـۆ حـەرەس قـەومی هەڵکـەنن و نـاوی حـەرەس لا قـەمیان لێ نێن، ئـەم کودەتایـە ڕووداوێکـی زۆر چـاك بـوو بـۆ ئێمـە چـونکە هێزەکـانی دوژمـن نـاکۆکی تێکـەوتو پەلاماردانەکـەی سـەر کوردسـتان پاشـەو پـاش کشـایەوەو جوتیـارە دیلەکانی ئاغجەلەر بەردرانو خەڵکی گەڕانەوە سەر کەلاوە سووتاوەکانو هەرماڵـە هـەوڵیان ئـەدا سـەری هۆدەیـەك بگرنـەوەو ئیـدارەی تێـدا بکـەنو وردە وردە خـانوو ماڵ دابمەزرێننەوە. کودەتاکەی (١٩٦٣) هەلێکی چاك بوو بۆ پشووداندو لاچوونی ئەو حەشاماتە لەسەر کوردستانو جارێکی تر خۆڕێکخستنەوە.

کاتـێ بانگـەوازی دژی حـەرەس قەومییـەکان لـەڕادیۆی بەغـداوە بڵاوبـۆوە، هێزەکانی شۆڕش بۆ ناوچەی هێزی ڕزگاری گەڕانـەوە سنوورەکانی خۆیـانو لقی ئێمەش گەڕایەوە عەودەڵان.

بە هەلمزانی داوام کرد ئیجازەم بدەن بەرەو عەسکەر بڕۆم سۆراغێکی کەسوکار بکـەم، ئێـوارە بـوو ڕۆژ زۆری نـەمابوو ئاوابـێ ڕێگـای عـەودەڵان بـە چـەمی ڕەزانو پلەی بـەردە عـەلی بـۆ عەسـکەر تـا لەچـەم ڕزگـار دەبـی کـارێکی زۆر دژوارە، جگـە لـە بوونی حـەیواناتی کێوی وەکو بەرازو دڕنـدەکانی تـری لـە بێشـەی چـەمدا هـەبوون، دارو دەوەنی چڕو تاریكو تنوکی مرۆڤ بـە هیلاکـەت دەگەیـەنێ. هـەر چۆنێك بـوو لەدار بەڕووەکانی سەر گۆڕستانەکەی شێخ ئیسماعیلی عەودەڵان کە لەبەر ئـەوەی شەخسـێکی بـەڕێزو نـاودارە لای خـەڵکی کـەس دەسـتی بـۆ نـەدەبرد بـەردی زۆر هەبوو، ئێمەش نانمان نەبوو ناچار کۆڵەپشتەکەم پڕ کردو خۆیشم هەمیشە لەگەڵ شخارتەو چەقۆو قاپێكو کەوچکێك لە کۆڵەپشتەکەدا بوو. وردە وردە هەنگاوم ناو تفەنگەکەم گرتە دەستەوەو هێشـتا ڕۆژ ڕۆشـنایی ئـەدا بـە چـەم لـە بێشـەکە ڕزگـارم بوو، بە هەورازەکەی پلەی بەردە عەلیدا هەڵگەڕام لەسـەرخۆ دەڕۆیشـتم، گەیشـتمە پلەی یەکەم هەڵوێستەم کرد پشوویەکی چاکم داو خۆم دانەواند، بە دووربینەکـەم سـەرنجێکی وردی ئاسـۆگەکەم دا تارماییـەکی ڕەش لەسـەر تـەق تەقـە شـاخەکەی پلـەی دووهـەم بـوو، لـەو ڕێیەشـدا هـەر ئـەوەی جێگـای مەترسـی بـوو لـەتوێ ڕێـزە شاخو بەردێك بۆ ئەبوو هەر لەوێوە بڕۆیو تـەنها چەکدارێك بـەس بـوو تـا هەرچی

بەرەو ئەویٚ بڕوا بیکوژیٚ، زۆر سەرنج راکێشبوو نەمدەزانی مرۆڤە یان ئاژەڵە، بیٚ چرپە فیشەکێکم خستە بەرو وردە وردە چووەمە نزیکی. سەرەتا وامدەزانی سام وەهای کردووە ئەو تارماییە ببینم، بەڵام کەنزیك بوومەوە بوو بە راستیو رەشاییەك لەسەر لوتکە شاخەکەیەو نزیکی دە مەتریٚ لێك نزیك بووین، هاوارمکرد کوڕە کێی کوژرای، هەستم کرد جووڵایەوە، بەڵام دەنگی نەبوو، جارێکی ترو جارێکی تر خۆم شپرزە کرد دەنگ نەبوو، چاوم نوقاندو خۆم تەکاندا بۆ پێشتر لە بن تارمایی ئەشکەوتەکەی بەر پلەکەدا کۆمەڵێکی گەورە رەشایی هەبوو، بۆنی نەوتو شتی هەڵکڕوزاو دەهات خۆم خستە پاڵ بەردێکی گەورەو جارێکی تر دووربینەکەم خستە چاوم، روانیم شتی سووتەمەرویە، روانیم بۆ سەر لوتکەکە، قەلێکەو لەویٚ هەڵنیشتووە، ترسم شکا، چوومە پێش بن ئەشکەوتەکەم تاقیکردەوەن تێگەیشتم کاتیٚ حەرەس قەومییەکان لەو ناوە بوون ئازوقەی خەڵك کە لەو ئەشکەوتەدا بووە هەموویان بەسەر یەکدا کردووەو نەوتیان پێدا کردووەو ئاگریان تیٚ بەرداوە. زۆرم بەزەیی بە خۆماندا هاتەوە لەو شاخو داخەشدا وەکو ئاژەڵ ئەژین هەر لێمان ناگەڕێن بژین، ئێمە نەچووینەتە سەر خاكو نیشتمانی ئەوان، ئەوان وڵاتی ئێمەیان داگیر کردووەو ئەوانیش ئەمان کوژن. زۆر دانیشتم نەم دەتوانی بگریم بۆ حاڵی خەڵکەکەمان بەڵام موچڕکە بە لەشمدا دەهات ئەتوت هێزێکی موگناتیسی لەویٚ رای گرتووم، لە پڕێکا گوێم لە دەنگی پێی گویٚ درێژێك بوو، سەرکەوتمە ناو کەلەکە، خۆم دانەواندو روانیم سیٚ چوار پیاوو ژنێك لەگەڵ گویٚ درێژێك روو لەویٚ دەهاتنو لەبەر خۆیانەوە قسەیان دەکردو دیار بوو ترسیان نەمابوو ماڵیان سووتابوو، هیچ شتیان بۆ دەرنەچوو بوو روو لەو چەمە ئەڕۆیشتن نەم دەزانی بۆ؟

نەمویست رایان چڵەکێنم لەسەرخۆ وتم: براینە بۆ کویٚ ئەچن؟ زۆریان پیٚ خۆش بوو گوێیان لە دەنگی براینە بوو تێگەیشتن دوژمن نییە، هاتنە لام لەسەر رێگاکە دانیشتن، پرسیارم لیٚ کردن خەڵکی ناوچەکە چییان لیٚ هات پاش ئەو شاڵاوە دڕندانەیەی بەعس، وتیان: هەموویان رووت کردینەوەو ماڵو سامان هەرچی لە گیرفانو بەرو دەستو گویٚو مل دابوو بردیان، پاشان بردمانیانە تەلبەندێك لە ئاغجەلەر هەر لە برساو لە تونیا دوامان بڕا ئاوی ئاو ئاساییان نەئەدایניٚ، باش بوو ئەم ئینقیلابە بوو، هەموومانیان ئازاد کردو هەر یەکە بە

لایەکدا بلاوەمان لێکرد چونکە کەس خانوو ماڵی نەماوە. هەواڵی ماڵی خۆمانم پرسی وتیان: چوونەتە گوندی موتلیجە هەندێ ناسیاوتان لەوێ بوو باشە ئەویش چونکە لە نزیکی ئاغجەلەرە دەستی لێ نەدراوە، ئێستا ماڵی ئێوەش لای ناسیاوەکانتانن لەوێ، بەلام دڵت هیچ نەکا هەموو سەلامەتن.

هەندێ بە یەکەوە دانیشتین پاشان ئەوان بەرەو چەم رۆیشتن و منیش نەخشەکەم گۆڕی، لام دایە ئەشکەوت و کانیەکەی (کانی دزان) وتم: ئاگر دەکەمەوە و هەتا بەیانی لەوێدا بۆ خۆم هەڵدازێم بەیانیش هەتا گوندی عەسکەر ئەڕۆم و پاشان دەگەڕێمەوە ناو هێزەکەی خۆم لە عەودەلان. سەرڕازو سەرڕاز رۆیشتم هەوای شەوان فێنکترە هەستم بە سەرما دەکرد، هەنگاوەکانم خێراتر کرد. گەیشتمە کانیاوەکە لەبەر زالوش نەم دەوێرا باش ئاو بخۆمەوە، هەرچۆنێ بوو کوپی چا خواردنەکەم دەرهێنا و پڕم کرد لە ئاو، دەستەسڕەکەم پێداداو هەندێ ئاوم خواردەوە و بەرەو ئەشکەوتەکە رۆیشتم. هێشتا مابووم بگەمە ئەوێ تروسکایی ئاگرم بەدی کرد، هەوڵمدا بێ چرپە لێی نزیک ببمەوە، وەها نزیک بوومەوە بۆم دەرکەوت گەنجێکی لای خۆمانە لەوێ هەلاژاوە لەبەر ئاگرەکە بەلام بەخەبەرە، چونکە ئەو لەبەر ئاگرەکە بوو شەوقی ئاگرەکە نەی دەهێشت من بەدی بکات. تۆزێکی تر چوومە پێش و بانگم کرد هۆ (مەلا حەمید) خێرا هەڵسایە سەر پێ و دارەکەی گرتە دەستەوە وتی: تۆ کێی؟

وتم منم عەلی، کاتێ زانی منم زۆر خۆش حاڵ بوو، دیار بوو دابڕابوو بەتەنها بێ تاقەت ببوو، هەڵسا لەبەرم و شوێنەکەی خۆی بۆ چۆڵکردم. لێم پرسی نانی لانییە، وتی: دوو رۆژە هیچ شتێکم نەخواردووە، چونکە ئاوەدانی نەماوە و منیش هەر بەم چۆڵەوە ژیاوم و کاتێ کۆڵە پشتەکەم کردەوە هەندێ بەڕووی گەورە گەورەم دەرهێنا زۆرتر دڵخۆش بوو، چنگێکم سەرو قنگ بڕی و خستمە ناو پشکۆ ئاگرەکەوە، دەستی کرد بە تەقە تەق و هەڵ بەزینەوە. زۆری برسی بوو پەلەی کردو یەك لەسەر یەك بەڕووی پاکدەکردو دەیخوارد منیش هاوبەشیم کردو هەندێ بەڕوومان خوارد، پاشان کەوتینە پرسیار لە یەکتری وتی: گەیشتین رووداوەکان چۆن چۆن بووە، هەر بەدەم قسەوە چاوەکانمان لێك دەناو خەبەر دەبووینەوە، بەیانی زوو هەڵساین و ژەمێکی تر بەڕوومان برژاندەوە و پاشان من رام گۆڕی و گەڕامەوە بۆ عەودەلان و ئەویش بەرەو هەواری رووخاو لە گوندی

عەسکەر. پاش چەند ڕۆژێ سەرەتای گفتوگۆ لەنێوان شۆڕش و حکومەتی عەبدولسەلام عارف دەرکەوت، هەرچەندە پێشتریش لەگەڵ حەرەس قەومییەکان و لەگەڵ ڕژێمی قاسمیش گفتوگۆی نەزووك کرابوون. جێگای داخە هەموو ئەو یاداشتانەی ڕۆژانە دەم نووسین لەسەر ڕووداوەکانی ڕۆژ بە چەند جارێ کەوتنە بەردەمی ئاگرو تالانی بەعس کۆتایی بەڵگەی یاداشتەکانم بەر شەپۆل و شالاوی دڕندانەی ئەنفالی سیێ کەوت و ئیستاش بێ بەڵگەی تۆماری ڕۆژ قسە دەکەم و نامەوێ هاناش بۆ هیچ بەڵگەیەکی تر بەرم چونکە نیازی من یادکردنەوەی یادە کۆنەکانە کە بۆ من پڕن لەسەروەری. بەکوردی لە (١٩٦٣)دا بوو جاری دووهەم گفتوگۆ دەستی پێکردبوو، سەرۆك وەزیران (تاهیر یەحیا) سەردانی لای بەڕێز بارزانی مستەفای کرد لەگەڵیانا نەخشەی لامەرکەزییان بۆ کورد باس کردبوو کە ئەمەش بەرەشترین ڕۆژ وەرگەڕابوو بۆ کورد بوو بەهۆی دروستکردنی ناکۆکی و لەت و پەرتکردنی بزووتنەوەی یەکگرتووی کورد لەکوردستانی خواروو.

## ژیانی رۆژانی گفتوگۆ

با ئەمە لێرە بوەستێ، دێینەوە سەر لقەکەمان لە عەودەڵانەوە گوێزرایەوە بۆ گوندی قۆجەلەر، گوندەکە لە نێوانی هەندێ گردۆلکەی داراوی دایەو لە خوار ماڵەکانیشەوە رەزو باخێکی هەنارو هەنجیرو داری بێبەری تێدایە، ئاوی بەشی زەراعەت کەمو کورت هەیەو پاشەڕۆژی ئاوەکەیان دەچێتەوە چەمی گەورەی ئاغجەلەر رێك ئەم گوندە لە خۆرهەڵاتی شارۆچکەی ئاغجەلەرە. ئەو کاتە بارەگای بەتالیۆنی(٢) برایەوە ئاغجەلەرو ژیانی پێشمەرگە گۆڕانێکی نوێی بەسەردا هاتبوو، برنج، رۆن، گۆشت، ئاردی سپی بۆ نان، بەتانی سەربازی بە سەیارە رێکردن، چوونە ناو خەڵكو گەڕان بێ ئەوەی لە هات هاتی کۆپتەرو فرۆکەی تری جەنگی مەترسیان هەبێ. ژیانی لقەکەی ئێمەش بە تەواوەتی گۆڕابوو، ناوە ناوەش ئیجازەی دوو سێ رۆژ ئەدراین، ماڵی ئێمەش هاتبوونە موتلیجە هەفتەی شەوو رۆژێك ئەچوومەوە، هەرچەند گفتوگۆکە پشت پێ بەستراو نەبوو چونکە تەجروبەی گفتوگۆی یەکەم پۆلی بەعسییان ئەوەی پێ بەخشیبووین کە بڕوای تەواو نەکەینو هەمیشە بە وشیارییەوە لەهێزەکەمان دوور دەکەوتینەوە.

وردە وردە هێزەکان مەشق پێ دەکران گوایە ئەگەر رێك کەوتین ئەبێ لە هێزی سەربازیدا بەشداری بکەینو ناشکرێ ئەوسا مەشق نەزانین، بەیانیان ماوەیەکی باش راست چەپیان پێ دەکردین. پەیوەندی کردن لەگەڵ رژێمی عەبدولسەلام عارفو هاتنی تاهیر یەحیا بۆ رانیەو دانی بەتانیو برنجو شەکرو رۆنو ئاردو ئیجازە بە پ.م کوێ بیویستایە بۆ ئەوێ نەقل بکرێو پارەدان بە پ.مو خەڵاتی چاك بە ئەفسەرەکانو لێپرسراوانی پێشمەرگەکان، هەلێکی چاکی رەخساند بۆ ئەوەی مەکتەبی سیاسیو رێکخستنی پارتی بە تەواوەتی بن کەند بکرێو خەڵکی فێری بەرەڵڵاییو بێ ئیلتیزامی بکرێو خەڵکی فێری ئەوە بکرێ گاڵتەی بە پارتایەتیو بیرو باوەڕبێتو فێری ئەوە بوو بڵێ بەسەری بارزانیو گو بەگۆڕی باوکی پارتی.

مەکتەبی سیاسی هاواریکرد لەڕێگای ئەندامەکانیەوە ئاشکرای کرد کە سەرکردایەتی بارزانی بە تەنها لەگەڵ دەوڵەتی عارفو یەحیا بە بەلاش

ڕێکەوتووەو ئەنجامی کورد شتێکی پێ نادرێ، بەڵام ئەوانە سوودی نەبوو شەو هەڵەسای لە لقێکدا کەرتێکی ڕۆیشتووە بەرەو لای هێزی بارزانی، ڕاکە ڕاك و بێ بڕوایی تا دەهات زیاد دەبوو، ئەوەبوو مەکتەبی سیاسی پارتی لە ماوەت کۆنفرانسێکی گەورەی گرت لە ئەندامانی پارتی و مەسئولینی پێشمەرگە. لە فەرماندەی کەرتەوە هەتا سەروو، چەند ڕۆژێ قسە لەسەر وەزعەکە کرا، ئەوەی بەشدار ببوون هیچ کەسێك لەو کۆنفرانسەدا هەڵوێستێکی جیای دژی م.س ڕانەوەستابۆوە. هەمووی پاڵپشتی لە سیاسەت و خەتی م.س دەکرد و دژی تاکڕەوی سەرۆکی حیزب بوون. بەڵام هەر لە کۆبوونەوەکە هاتنە دەرێ هەر ئەو شەوە لەو نوێنەرانە بە خۆیان و چەکەکانیانەوە بۆ لای هێزی بارزانی ڕۆیشتن. ماوەیەکی چاك هەوڵدرا بۆ یەك خستنەوەی م.س و سەرۆکی حیزب بەڵام ئەنجامێکی باشی نەبوو. پاش چەند ڕۆژێ مام جەلال بە چەند سەیارەیەك پڕ لە پ.م دەستی کرد بە جەولە لە ماوەتەوە بەرەو چەمچەماڵ هات، لقی ئێمە کە لە قۆجەلەر بووین بانگ کراین و ئێمەش چەند سەیارەیەکمان پڕ کرد، چووینە هەمەوەند لەوێوە بۆ جەباری لە هەر یەکێ لەم شوێنانە مام جەلال قسەی بۆ خەڵکی دەکرد هێزی پێمشەمەرگەی کۆدەکردەوە باسی هەڵوێست و بۆچوونی م.س و هەڵوێست و چۆنێتی گفتوگۆی نێوانی سەرۆکی حیزب و حکومەتی دەکرد. لە گەرمەی کۆبوونەوەدا کەس هەڵوێستێکی دژی نەدەنواند، کاتێ مام جەلال و هێزەکەی ئەوێ بەجێ دەهێشت ئەوانیش بارو بارگەیان لێکدەنا و ئەچوونە لای هێزی سەرۆکی حیزب تا وای لێهات جەولەکە گەیشتە دەربەندی بێ لوولە و لەڕێوە سەرکەوت بۆ سەرشاتە و گوندی پشتە، لەو دیوی بناری بەمۆ.

لەوێ هەڵگەڕانەوە دروست بوو هەندێ وردە تەقەش دروست بوو لە نێوان ئەو هێزەی مام جەلال لەگەڵ خۆی بردبووی هەر لەوێش لقەکەی ئێمەش هەڵوێستی خۆی نیشانداو بوونە لایەنگری سەرۆکی پارتی، من و یەکێ دووان کە خۆمان بە ئەندامی دڵسۆزی پارتی دەزانی دژی هەڵوێستی لقەکەمان بووین بەڵام لە دڵی خۆماندا.

مام جەلال خۆی و دەستەکەی گەڕایەوە بۆ ڕانیە لەسەر داوای بارزانی مستەفا و بڕیاری م.س. هێزەکە بلاوەی لێکرد، هەر یەکە(٥) دینارو ئیجازەیەك و وەرەقەیەك کوێی دەوێ بڕوات. لەوێ پ.م بێ هەندێکیش خەڵات کراو مەسئولیاتی بۆدانرا، لەو پلەیەی هەبوو زیاترو دڵخۆشکەرتر. پ.م بەپلەی سەدا سەد بەلای سەرۆکی

حیزبدا گەڕانەوە، چونکە لە سەردەمی پارتیدا پێشمەرگە ئەبوو ئیلتیزام بکات لە کوێ پ.م بو بەئەرزی خۆی بزانێ، پارە پێدان نەبوو! مەسئولیات بە لێوەشاوەیی بوو.

بڕیار بڕیاری پارتی بوو تاکە نەفەر بۆی نەبوو بڕیار لەسەر شتێ بدات کە دواڕۆژی شۆڕشی پێوە دیارە.

کاتێ هێزەکەمان چووە گوندی قەرەچەتان، لە مزگەوتەکە پێشوازی کراین ژەمێ دووان برنجی چەورو زۆر بەنانی سپی ئاردی بەمبەوەو خەوی بەتانی نۆکاوی سەربازی دێ بە تەواوەتی بوونە سەربازی گومناوی بارزانیو سەد تفیان لە چارەی م.س دەکرد، لەوێدا زۆر ڕقم لە بێ باریو پوولەکێتی پێشمەرگەکانی هاوڕێم بۆوەو بڕیارمدا پەیوەندی بکەمەوە بە م.س زوو یان درەنگ..

منیش (٥) دینارو ئیجازەی یەك مانگم وەرگرت، چوومەوە عەسکەر، لەگەڵ عەبدوڵا مەجیدی شەهیدو ڕێکەوتین تا بوار هەڵدەکەوێ بگەینەوە ماوەت خۆمان لەگەڵ بەتالیۆنی حاجی شێخ قادر بگونجێنین ناوی خەڵکی دەنووسرا بۆ حەرەس حدود، ئێمەش خۆمان ناو نووسکرد بۆ ئەوەی سەریان لێ تێك بدەینو ئەگەر لەڕێی چوون بۆ ماوەت گیراین بڵێین ئیشو کارمان هەیە بەڵام ئێمە ناومان بۆ حەرەس حدوودی نووسیوە، نەخشەکەمان سەری گرت، دوای یەك هەفتە دوو قۆڵی بەرەو ماوەت بەناو هێزی بارزانیدا ڕێکەوتینو بێ ئەوەی بگیرێین چووینە ماوەتو لەوێوە بۆ ژاژڵەو ئاو کورتێو عیساوێ. ئەوسا بارەگای م.س لە ئاو کورتێ بوو چەند هەفتەیەك لەوێ بووین هێزەکانی بارزانی پەلاماری بنکەکانی م.س داو خەڵکێکی زۆری هاندا، سەری ئەوانەی لەگەڵ م.س بۆ پارتیو ماڵو سەروەتیان بۆ هێرش بەران.

هێز ناوچەی م.س تەنگ کردەوەو شەڕ هاتە سەر م.س، ئێوارەیەك هێزێکی یەکجار زۆریان هێنایە سەرمانو لە یەك دوو ڕۆژدا بە گوللە کردمانیانە درەوە.

مایسی ١٩٦٤دا بوو کە م.س و (١٥٠٠) پ.م دەرپەڕێندراین بۆ خاکی کوردستانی ئێران بۆ گوندی بەردانو هەتا لەوێش وازیان لێ نەهێناین گوللە بارانیان دەکردین.

## تێكشكانی بیروباوەڕ

ئەوسا پێشمەرگە پێش ئەم ناكۆكیە سوێندی بەسەری یەكتری و شۆڕش دەخوارد، بەڵام كاتێ ناكۆكی دروست بوو، خەڵكانی هەڵمەتە كاسە سوودیان لێ وەرگرت و شۆڕشیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەكار دەهێنا كە وتیان: لایەنی هێزی سەرۆكی حیزب بە لۆری شەكرو ئاردو برنج و رۆن و گۆشتی بۆ دێ لەلایەن حكومەتەوەو بە سەیارەی سەربازی دەگوێزرێتەوەو لەجیاتی لێفەی داڕزاوی مالان و لە مزگەوت خەوتن لە مقەڕی دەوڵەمەندو نێردراو بە بەتانی سەربازی دەخەوی و گیرفانی جاران عانەی تێدا نەبوو، ئێستا پارەی خەڵات و پارەی مانگانەی تێدایە، ئەوەی پ.م بوایە پارەی مانگانەو ئەوەی فەرماندەی دەستەو كەرت و لق و بەرەو ژوور خەڵاتی بەپێی پلەی پێ ئەدراو دەمی چەور دەكرا. هەرچی پێی بڵێی بیرو باوەڕ لە گۆڕێدا نەمابوو، ئەم دەم چەوركردنەو خەڵاتە بێجێ و ڕێیە، خۆشەویستی و تەبایی و دڵسۆزی و برایەتی لەناو هێزی پێشمەرگەو خەڵكدا نەهێشت و لە جێگایدا درۆزنی، دەم لووسی، ئاژاوە نانەوە، خەڵك تووشكردن، قسە لەسەر خەڵكی كردن بۆ خۆ گەورە كردن هاتە جێگای و كەس بۆ كورد خۆی نەدەسووتاند. هەرچی فرمێسكی ئەڕشت بۆ هەریسەكە نەك بۆ حسێن، هەر كە ئاشكراش بوو م.س و سەرۆكی پارتی لێك دابڕان، هەوڵدەدرا گەشە بە كوشتن بدرێ بۆ خۆ چاككردن یەكێكی سەر بە م.س بكوژێ تاكو پلەی بەرز دەكرێتەوەو دەری بخات دڵسۆزی سەرۆكی پارتییە. بەم شێوەیە ئەنجامی ئەو ناكۆكییە لەوپەڕی پەرۆش و دڵسۆزی و خۆشەویستی و خاوەنی بیرو باوەڕەوە گەیشتە ئەوەی دەستیان سوور بكەن بە خوێنی یەكتری و هەرچی پێی بڵێی بیرو باوەڕو دڵسۆزییە نەمایەوە!

## بەرەو ئێران

ئەو هێزە (١٥٠٠) مرۆییەی پەڕینەوە بەری بەردانو بێتووش هەر ئەو شەوە زیاتر لە (٧٠٠) کەس لەڕێ خۆی دزییەوەو گەڕایەوە ناو هێزە زۆرو زەبەندە عەشایەرییەکەی سەرۆکی پارتی کۆی کردبۆوە بۆ سەر م.س خۆی.

وای لێهات لە تەنیشتەوە لای ئەدا بۆ میزکردن کاتێکت ئەزانی نەماوەو هەڵهاتووە. ئەو شەوەی هێزەکەی م.س پەڕییەوە کوردستانی ئێران، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو یەکێکی تر بەرێکران بۆ ئێران، بۆ ئەوەی قسە لەسەر ئەوە بکەن ئێران رێگا بدات مەکتەبی سیاسی تاماوەیەك لەو دەم سنوورانە بمێنێتەوە تا تۆزێ باری کوردستانی خواروو ئارام دەبێتەوە، ئەوسا بگەڕێتەوە کوردستانی خواروو. ماوەی (٢٤) سەعات دانرا یان چەك دانێن یان بگەڕێنەوە بۆ کوردستان. ئێمەش ئەبوو لەو دوو رێگایەی بۆمان دانراوە یەکێکیان هەڵبژێرین. ١- گەڕانەوە بۆ کوردستانی خواروو. -٢- چەك دانە دەست رژێمی شاهەنشایی، کە هەردووکیان بۆ ئێمە ئاسان نەبوو، بۆیە ناچار کۆبوونەوەیەکی گەورە بە هێزەکە کرا کە دەوری (٩٠٠) پ.م بوون کە زۆربەیان کادر بوو، مشتو مڕ لەسەر ئەو دوو خاڵە کرا. هەرچی مام جەلال بوو رای وابوو بگەڕێینەوە لە بناری سوورکێو شوێنێك داگیر بکەینو داوا لە سەرۆکی پارتی بکەین شەڕی یەکتری ناکەین تا ئەنجامی گفتوگۆی نێوان پارتیو میری ئەوسا بەلایەکدا دەکەوێ. راکەی تریش ئەوەبوو هەر یەکسەر داوای پەنابەری بکرێ بۆ ماوەی زیاتر لە ساڵێك، تا ئەوساش هەڵویستی بارزانیو میری دەردەکەوێ لە گفتوگۆکە. ئەنجام رای یەکەم سەرکەوت بەوەی داوا لە دەوڵەتی حەمە رەزا شا بکرێ (١٥) شەو مۆڵەتمان بدات لە بێتووشدا بمێنینەوەو هەندێ ئازووقەو پێویستیمان بۆ دابین بکات.

رۆژی دووهەممان بوو، فرۆکەی کۆپتەری جەنگی ئێرانی پڕاوپڕ بە دۆڵی بێتوش بۆت ئەسووڕانەوە، مەترسی ئەوەمان هەبوو چەکمان بکەن چونکە سوپای ئێرانیش ئابلۆقەیان داین، لەلای مەرگەشەوە هێزەکانی بارزانی لێمان نزیك ببوونەوە، بە بەردەوامی تەقەیان لێ دەکردین. رۆژگارێکی تاریكو ئاڵۆز بوو هەموو تەنگەتاو ببووین تەنانەت ئەندامانی سەرکردایەتیش، هەندێ ژاندار میریو

سەرباز لە لێپرسراوێکی ئیداری ئێمەیان هەڵپێچابوو لە سنووری لقەکەی راویان نابوون. مام جەلال بە خۆیو دەستەکەیەوە چووە گیانی ئەفسەری بەرپرسیاری ئەویو هەزار قسەی توندی پێوت. وتی: ئەگەر ئێوە میوانداری نازانن بۆچی میوان رادەگرن، بە هەرحاڵ، ژیانی ئەو چەند رۆژەی بێتووش نویٚ بوو ناخۆشو خۆش تێکەڵاو بوو، ئاشنا بوونمان بوو بەگوندێکی دابڕاوی کوردی لەکوردیو بە تەواوەتی چێژمان لە یەکتری وەردەگرت، هەر چەندە ئەوانە ئەوەندە ژێر دەستی ژاندارمەکان بوون ئێمە تەریق دەبووینەوە کاتێ ئەفسەرێکی ژاندارمە ئەچووە ماڵێك خێرا خاوەن ماڵەکە لەبەر دەستیا هەڵدەسووڕا وەکو نۆکەرو بەردەستی. هەستمان دەکرد کەسایەتی لە خاوەن ماڵەکە سەندراوەتەوە لە ئاستی زۆرداری ئەو دڕندانە. بەلاّم کاتێ ئێمەی کورد هاتوو چۆمان دەکردن زۆریان رێز لێ دەگرتین لەگەڵمان دەکەوتنە پرسیارو وەلاّم.

(١٥) شەو تەواو بوو، ئێوارانێك پاش دنیا تاریك بوون هێزەکەمان رێچکەی بەستو بەناو خاکی کوردستانی ئێراندا روو لە ئاوی ئاڵووتانو بناری سورکێو کەوتینەڕێ، ئەو شەوە بۆ مەلا بانگدانی بەیانی لە ئاوی ئاڵووتان پەڕینەوە بەری سورکێو، چەند رۆژێ لەوەو پێش هێزێکی ترمان بە سەرپەرشتی شەهید عەلی عەسکەریو رەئیس کەمال موفتی پەڕیبوونەوە باسنێو لەوێوە پەلاماری گمۆیان دابوو، بە نیازی دابڕینی بەشێك خاكو پاشان بروسکە کردن بۆ سەرکردایەتی بارزانی کە هەر هێزەمان لەشوێنی خۆی تا ئەنجامی گفتوگۆ. کاتێ ئێمە گەیشتینە یەکەم لوتکەی سورکێو شەڕو پێکدادان لە گوندی باسنێو پشتی باسنێ گەرم بوو، منیان بە کارێك نارد. لەوێ شەهید عەلیم بینی بە پێوە لە دەوەنەکێکدا وەستابوو، گوللە زۆربەی سەرچڵی دارەکانی بردبوو هاوارم لێکرد کاك عەلی دانیشە، پێکەنینی پێهات وتی: هیچ نییە رۆڵە دانیشە بۆچی هاتووی.؟ نامەیەکم پێ بوو دامێو سەعاتێ لای بووم. ئەم مرۆڤە چاو نەترسە هەر لەو دەوەنەدابوو تاو تاوە دادەنیشتو دوو سێ پێشمەرگەی تری لە تەنیشتەوە بوو، نامەی نووسییەوەو منیش گەڕامەوە سەر سورکێو. چەند رۆژێ لەوێ بووین، شەو سەرماو رۆژ گەرما، بەرازی زۆر بە رۆژیش هاتوچۆی دەکرد، ئاژەڵی تری هەبوو نەمان دەوێرا تەقە بکەین بۆ ئەوەی شوێنەکەمان دەرنەکەوێ.

سەرماو گەرما+ ئەسپێ نانی وشك وەختا بوو هەمووومان لەناو بەرێ، ئەگەر

بهاتایه ماوەیەکی تر لەو سەر چیایە بووینایە تەنها ئەسپێ بەس بوو بۆ ئەوەی بمانخوات.

شەڕ تا دەهات گەرم تر دەبوو هێزەکانی لای شەهید عەلیو ئەوان پاش هەندێ سەرکەوتن شکانو هاتنەوە سورکێو. هێزەکانی ئێمە بە سەرکردایەتی مام جەلال چووین بۆلای نوپكو باریۆ سەریشمان لە شێخ لەتیفی نەمر دا لە سیاگوێز، پاشان هێزمان هێندە لەسەر کۆبۆوە کە خۆمان لە بەریدا پێ رانەگیرا.

بە پێی قسەی سەرکردەکانمان هەندێ لە سەرلقو کەسە لێپرسراوەکانی لای پارتی لە ناوچەی شارباژێرو سیوەیل نامەیان بۆ ناردوون ئەگەر ئێوە نەیەنەوە ئێمە دێینەوە لاتانو بۆمان دەرکەوتووە گفتوگۆکە داوێکە بۆ لەناوچوونی بزوتنەوەی کورد. بەلام لەڕاستیدا کاتێ چووینەوە ئەوانە لەپێش هەموویانەوە بەقەستی کوشت تفەنگیان پێوە دەنایین بۆ ئەوەی سەرمان بە دیاری بەرنەوەو چەکەکانیش لەگەڵ خەلاتی دوایی بۆ خۆیان، شەهیدێکمان لە بەرامبەری سیاگوێزدا بەناوی ئەحمەد حاجی عەبدولا خەڵکی سلێمانی رۆژێك لەلامان لە سەنگەرەکەدا مایەوە گیانمان بەوە باش بوو شوێنەکەمان فێنك بوو بۆنی نەکرد شەوی سێهەمی شەڕ بە بڕیاری مام جەلال سەنگەرەکەمان چۆڵکرد. پێشمەرگەکانی بارزانی نیشتنە سەرمانو بەرەزالەتێك ئەو پێشمەرگە شەهیدەمان رزگار کرد ئەگەر بڵێم لەو هەورازەی پشتی نوپکەوە دەجار لەسەر ماینەکە بەربۆتەوە درۆ نییە، بەلام هەر جێمان نەهێشت، بەیانی رۆژ بۆوە هێشتا سورکێومان جێ نەهێشتبوو هێزەکەی بارزانی دایانینە بەر شلنیکی بڕنەو. هێزی شکاوی ئێمەش هەڵ دەهات خۆی پێ نەدەگیرا، ئەوسا من لە دەستەی مام جەلال بووم لەگەڵ هەندێ برادەری تر لە مشووری ئەوەدا بووین مام جەلال رزگار بکەینو نەکەوێتە داو. مام جەلال ناوی خۆی نا (پیرۆت)و بە دوو سێ پ.م دا لەپێش خۆمانەوە بەرەو گوندەکانی ئێران بەڕێمان کرد بۆ لای شەهید مەلا ئاوارەو سلێمانی موعینیو فایق معینی کادری دیموکرات بوون لەو ناوە مشووری خۆراکیان بۆ دەخواردین لەناو کوردەکانی ئەودیودا، هێزەکەشمان هەموو چووینە گوندەکانی ئێران تا چەند گوندێ دوور کەوتینەوە گوللەی گڕداری بارزانیەکان لەسەر سەرمان گیزەی دەهات، زۆرمان شەو ببووین بە ئێشکچی لەسەر کۆڵانو سەربانەکانی یەکێك لە گوندەکان کە بەداخەوە ناوەکەم لەیاد نەماوە، ئەوەندە

دەزانم لە نزیکی سورکێو بۆ لای بلەکێ وەبۆر.

هێشتا خەو باشی بەرنەدابووین شاوری کۆبوونەوە لێدراو کەوتینەرێ بۆ نزیکی پلەکی لەوێ مام جەلال زۆر پەژارە دای گرتبوو تەنها دەهات و دەچوو دەستی بە کاکولەکەیدا دەهێنا ئەیکرد بە دوو بەشەوە تۆپەڵێکی لەسەر نێوچاوانی کۆدەکردەوە لە پڕێکا تێکی دەدایەوە، تازە هەندێ چەکی نوێمان بۆ هاتبوو کە هەمووی بڕنەوی ڕەش بوو لە ئێرانمان وەرگرتبوو، تازەش درابوو بە پێشمەرگە، ئەو بڕنەوانە زۆر خۆشەویست بوون، فرمێسکی بۆ دەڕژا بدرێتەوە بە ئێران، چەك کردن ناخۆشترین کارە کە لەگەڵ پ.م بکرێ ئەوەش لەوە ناخۆشتر بوو هیوا نەبوو بگەڕێتەوە کوردستان، لەویش ناخۆشتر ئەوە بوو لەدەست کورد دەردێن و کوردو هاوسەنگەرەکەی خۆمان هەڵمان دەبڕێ.

دێتەوە یادم ئەو ڕۆژە نیاز وەهابوو هەرکەسێ بتوانێ بگەڕێتەوە خۆی لەناو پارتیدا بپارێزێ با چەکەکەی نەفەوتێ و نەدرێ بە ئێران بڕواتەوە، هەندێکیش وەك و دەستە بەیەکەوە دانران بەسەرپەرشتی عەریف مەجید شوانی بگەڕێتەوە لەنێوان سنووری ئێران و کوردستاندا بە چەتەیی بژین تا بەتەواوەتی ئەندامانی پارتی دابڕاو کۆدەکەنەوەو ببنە بنکەیەکی شاراوە تا پارتی زیندوو دەبێتەوەو حیزب دروست دەکاتەوە، چوونکە دڵنیا بوون گفتوگۆکە سەرناگرێ و شۆڕش هەر دەست پێدەکاتەوە.

هەرچۆنێ بوو چاکترین چەك درا بەوەی بگەڕێتەوە لای بارزانی و ئەوەی لەو ناوەش دەمێنێتەوەو باقی چەکەکانیتر ژمارە کراو کۆڵ کۆڵ بەستراو تەسلیم بە ڕژێمی شاکرا، هەندێ دەمانچە کە هەبوو هەرکەسە لە بن پشتێنەکەی شاردییەوەو بردمان بەسەیارە براینە سەربازگەکەی بەر ئەربابەو چەند ڕۆژێ لەوێ بووین پاشان براین بۆ سەقز لەوێ لە هەندێ ژووری کە هی ولاخە بەرزەکانی سوپابوو ویستیان لەوێ دامان بنێن بەڵام مام جەلال تووڕە بوو وتی: هەر ئێستا دەگەڕێینەوە ئەفسەرەکان دەوریان لێداو دڵیان دایەوەو بڕیاریاندا هەر دوو نەفەر خێمەیەکی بچکۆلەی بدەنێ نامەوێ بیشارمەوە کە لە بانە بەبازاڕەکەدا بەڕێ کراین منداڵ و خەڵکێکی زۆر بەردە بارانیان دەکردین و بژی بارزانیان دەوت، لە سەقز پاش ئەوەی خێمەکانمان دانا هەر دوو کەس بۆ خۆی جێگا چاك دەکرد مام جەلالیش خۆی جێگای خیمەکەی چاك کردو قوڕی بۆ گرتەوەو جوان جوان

ناوەکەی سواغدا.

زۆر چڵکن بووین ئەسپێ زۆری تێدابووین، ڕێگایان داین بڕۆینە سەر چەمەکەی سەقز لەو ئاوە خۆمان بە ئاوی سارد دەشۆری، بەڵام چونکە ئاوی گەرم نەبوو چەندە ئەسپێمان ئەدایە ئاودا شەو ئەوەندەی تر دروست دەبۆوە، پارەشمان نەبوو دیارە هەموومان نا بەڵام من یەك تمەن چیە پێم نەبوو هەر دوو کەس شووشەیەك دەرمانی ئەسپێی دەکڕیو دەیگرتەوەو سەراپای جلەکانی تێ دەدا. هەندێ لەسەری ئەدا هەتا ڕێکەوت یەکێك هێندە داخی لە ئەسپێ خواردبوو هەموو لەشی پێ چەور کردبوو دووچاری پێست سووتاندنو حەساسیەت بوو لە ئەنجامی خراپ بەکار هێنانی.

من هاوڕێیەکم لەگەڵدا بوو خەڵکی گوندی گەڵنێری کە گوندەکەیان بەر دەریاچەی دوکان کەوت،ماڵی چووبووە بەکرەجۆ ناوی سەید حەسەن بوو ئەویش لە دەستەی ئێمەبوو، شووشەیەکی کڕی تا بە تەواوەتی جلەکانی خۆی تێ نەداو لێ نەبۆوە نەیداینێ ماڵی ئاوابێ بە دەرمان کردنی جلو بەرگو جێگاوبانەکەمان ئۆخەی رزگارمان بوو لە سوخورمەی ئەسپێو لەش خوران.

دە پانزە ڕۆژێك دەبوو لە سەقز بووین هەر ڕۆژە چەند پێشمەرگەیەکمان دەڕووخاو دەڕۆیشتەوە بۆ کوردستان، ئەمە لە کاتێکا لەسەر سنوور بە هەمووی وترابوو ئەوەی ئەیەوێ بگەڕێتەوە بۆ کوردستان باچەکەکەی بەرێ‌و بڕواتەوە، هەندێ خەڵك دەورێکی خراپیان دەبینی لەڕووخانی برادەرەکانمانو چاوساغیان دەکردن بۆ گەڕانەوەیان، بۆیە سەرکردایەتی م.س ڕێکەوت لەگەڵ ئێران کە بمان بەن بۆ هەمەدان لەوێ خەریکی خۆ پەروەردەکردن بین.

چەند ڕۆژ بەڕێوە بووین شەوێك گەیشتینە هەمەدان خراینە بینایەکی گەورە کە کۆن کارخانەی شقارتە بوو، ئاگری تێ بەربوو، سەرلەنوێ چاکیان کردبۆوە. حەوشێکی گەورەی هەبوو یەك هۆدەی زۆر گەورەی هەبوو کە دوو سەد مرۆڤێکی تێدا جێدەبۆوە، بەدەوریشیدا چەندان هۆدەی بچووك بچووك هەبوون، سەرەتا دەرگا گەورەکەی نێوانی بیناکەو دەرەوەیان دادەخستو دەستەیەکی ژاندارمەی پاسەوان بوون، لە کاتێکدا شتێکمان پێویست بوایە یەکێك دووان لە لەگەڵ یەك دوو ژاندارمێ دەچوونە بازاڕو پێویستیەکانی دەکڕیو دەهاتنەوە. سەرەتا ئەوان خواردنیان ئەداینێ، پاشان چەند پێشمەرگەیەك کران بە چێشت لێنەرو لەهەر

دەستەیەك رۆژی نەفەرێ دووان ئەبوون بە خەفەر لەگەڵیان‌و جۆری خواردنەکەمان چاکتر ببوو.

مانگانە نەفەری بیست تمەنیان ئەدایێ بۆ حەمام‌و سابوون‌و شتی پێویستی، بەڵام خواردنمان بۆ دەکراو لەسەر مەسرەفی دەوڵەت بوو.

## دەوەرەی زمانی ئینگلیزی و مەرگی کاکەڕەشی

ڕۆژێکیان لەسەربانەکەی چێشتخانەکە دەرسی زمانی ئینگلیزیمان دەخوێند هاوارێ لە خوارەوە هەڵساو کاتێ چووین کاکە ڕەش هەرزانی کەوتە مەنجەڵە چێشتەکەوەو پاش شەوو ڕۆژێك شەهید بوو. هەر ئەوساش (خالید دلێر)ی شاعیرو نوسەر ئەم چوار دێرە شیعرەی بۆ نوسی.

فەرزە لەسەر پێشمەرگە بۆ بەرزی کوردستانی

درێغی نەکا بەسەر، بەماڵ یا بەژیانی

ڕەفتاری وابوو شەهید کاگە ڕەشی هەرزانی

تا گیانی پاکی بەخشی نەمریی بەدەستهانی.

لەم دواییانەدا وەهای لێ هات وردە وردە ڕۆژی دە پ.م دەنێردرا بازاڕ بگەڕێن بەڵام چەند کەسێکی ئێمەو چەند ژاندارمێری یەك بە یەکەوە چاودێری هەڵس و کەوتی دەکردن لەبەر ئەوەی نەك لەگەڵ خەڵکا نەگونجێن و شەڕ بکەن. پاش ماوەیەك ئاسایی بۆوەو کێ ئارەزووی بازاڕ یان گەڕان بوو، بۆ هاوینە هەواری ئەباس ئاباد یان دەوری هەبوایە ئەڕۆیشتن ئێمە چەند کەسێك بووین نەمان دەویست بڕۆینە بازاڕ چونکە ئەوسەردەمە هەموو کۆڵانێك چەند ماڵێکی ڕەسمی لەش فرۆشی تێدابوو ئێمەیش هەندێکمان بێ ژن و ماڵ بووین هەندێك هەبوو هەر کە دەچووە دەرێ تا ئەوێ نەدەوەستایەوە وەهای کردبوو ئێمەش لە چوونە بازاڕ سڵ بکەینەوە بۆ سینەما یان گەرماو نەبوایە نەئەچووین بۆ بازاڕ. لەجیاتی ئەوە ئەڕۆیشتین بۆ دەرەوەی شارو لە دەوری هەمەدان گوندی کورد هەبوون هێشتا شوێنەواریان هەبوو ئەمان دۆزینەوەو قسەمان لەگەڵ دەکردن و ڕۆژمان لە ناو باخەکان و لای جوتیارە کوردەکانی دەوری چیای ئەلوەند بەسەر دەبرد. هەندێ ڕۆژ بە هاوبەشی هەندێ گۆشتمان دەکڕی و هەر لەو دەشتە سوورمان دەکردەوەو لەوێ نانی نیوەڕۆمان دەخوارد.

لەو ئۆردوگایەدا دەورەی خوێندنی کوردی، کاری کادری و ڕامیاری، جیهاز فێر بوون، فێربوونی زمانی فارسی کرابوونەوە، جگە لەوەی هەموو بەیانیەك ڕەئیس کەمال مفتی مەشقی پێ دەکردین بۆ نەمردنی وزەی لەش، بەوە هەموو خەفلابووین شەوانیش ڕێگا کرایەوە بۆ خوێندن لە قوتابخانەی ئێرانی بۆ

خوێندنی زمانی فارسی‌ن زۆر کەس چوون‌و کەڵکیان لێ وەرگرت، لەلای خۆشمان حاکم تەها بابان دەوری فێرکردنی زمانی ئینگلیزی کردەوەو من یەکێك بووم لەو پێشمەرگانەی ئەی بی سی (A.B.C) لەلای ئەو فێر بووم‌و ئەنجام توانیم سوودێکی چاك چاك وەربگرم کاتێ ئەچووم بۆ سینەما ئەوەندەی لە فارسی تێ دەگەیشتم ئەوەندە زیاتر تەرجومە ئینگلیزیەکەیم دەخوێندەوەو تێ دەگەیشتم، ناو بەناویش ئەندامێکی سەرکردایەتی هەمووماني لە هۆڵە گەورەکەدا کۆ دەکردەوەو ڕووداوی ڕابردووی دنیاو کوردستانی بۆ باس دەکردین، جیهازێکی ڕاکاڵیش لەوێ خرابووە کار یەك دوو کەسێکی خۆمان سەرپەرشتی دەکردو ڕۆژانە ڕووداوی نێوانی پارتی‌و حکومەتی عێراقی وەردەگرت. مەحمودی مەلا ئیسماعیل‌و عوسمان سەرمۆردی دوو عدد جیهازی زۆر کارامە بوون کلیلی جفرەکانیان هەموو دەکردەوە بەو کارەشیان ڕۆژانە لەگەڵ ڕووداوەکانی کوردستان ئەیان گەیاندینەوە یەکتری‌و لێك دانەدەبڕاین. یەکەم جاریش بوو ئاوارە ببووین زۆر هەناسەی ساردمان هەڵدەکێشا وامان دەزانی قەتاو قەت ڕۆژێ نایەت بڕۆینەوە کوردستانی خۆشەویستمان.

هەر لە بواری خوێندن‌و دەورەدا ڕۆژێکیان چوومەوە ژوورەکەی دەستەکەی خۆمان لەسەر تەختە ڕەشەکە باسێکی گرنگی سیاسی‌و ستراتیژی خۆمان نووسرابوو، بڕیاریش بوو جێگری شا یان لێپرسراوێکی زۆر گەورە لە تارانەوە ئەو ڕۆژە دێتە لامان، هەستم بەوە کرد ئەوە بزانن ڕەنگە هەندێ لە پەیوەندیمان تێك بچێ، بۆیە کوژاندمەوەو لەسەر لاپەڕەی کتابێکی فارسی شیعری نووسرابوو ئەوەم نووسی‌و بەجێم هێشت‌و چووم بۆ هۆڵە گەورەکە بۆ لای هاوڕێیەکم زۆر دانەنیشتم وتیان: میوانەکان هاتن‌و چوونە ژوورەکەی ئێوەوە، هەر لەخۆمەوە پێم ناخۆش بوو، کاتێکم زانی پێشمەرگەیەك بانگی کردم بەدوایدا ڕۆیشتم، مام جەلال‌و مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو مامۆستا عومەر دەبابەو هەندێکی تر لەگەڵ میوانەکان بەدیار تەختە ڕەشەکەوە وەستابوون، بە کابرای میوانیان وت: ئەم کوڕە ئەو خەتەی نوسیوە، ئەویش دەستی خستە سەرشانم‌و وتی: لێرە خوێندنی فارسی فێر بووی.؟ وتم: بەڵێ. وتی: پێشووتر فارسیت نەدەزانی‌ۆ؟ وتم نەخێر. سێ چوار جار وتی:بارەکەڵاو بە جانتا هەڵگرەکەی وت (٥٠)تمەنی بدەنێ، هەرچەندە خۆی لە خۆیدا نرخێکی نییە بەڵام بۆ ئەو ڕۆژە بۆ پێشمەرگەیەکی

دووره وڵاتو بێ دەرامەتو بە خەڵات پێ بدرێ کەم نەبوو، پارەکەیان دامێ، هێشتا میوانەکان رەت نەببوون هاورێکانم لێم نزیك بوونەوەو دابەشیان کرد لە نێوان خۆیاندا (٥) تمەنیان دا بە من مەبەستم ئەو هاورێیانەی رۆژانە بە یەکەوە هەڵس و کەوتمان دەکرد، بڕوا بکەن ئەو رۆژە نەچوومە بازار بەیانی هاورێیەکی چڵێس هەبوو هات ئەوەشی لێ ساندمو رۆیشت خۆی خەرجی کرد.

ئێمە جلو بەرگمان تەنها شەرواڵێكو کراسێکی خاکیان بۆ دەکرین لەلایەن مەکتەبی سیاسییەوە. ئەوێش سارد بوو، پێویستمان بەسەر بەرگو فانیلە هەبوو پارەشمان نەبوو بیکرین، ناچار لەو ٢٠ تمەنەی مانگانە ١٠ تمەنیمان لەگەڵ دوو سێ برادەری تر یەك دەخستو هەر مانگە شتێکمان پێ دەکری بۆ یەکێك تا سەر بەرگو فانیلەی زستانەمان تەواو دەکرد لە کۆنە.

لە هەمەدان بە گشتی باشمان بەرێ کردو کەمترین کێشەمان بۆ دروست بوو، تەنها جارێك نەبێ کورێك بەناوی شێخ عەزیز خەڵکی سلێمانی لەگەڵ یەك دووانێکی هەمەدان لێیان ببوو بە شەرو ئەویش بەر چەقۆی دابوون، لەوە بترازێ موشکیلەی ئەوتۆمان نەبوو، جێگای سەرنجی دەوڵەتو خەڵك بێ، بەراستی خەڵکی هەمەدانیش خەڵکی چاكو بە ئەدەب بوون شارێکی جوانو بێ موشکیلە بوو بۆ ئێمەی ئاوارە. شتێکی زۆر خۆشو سەرنج راکێش بوو بۆ ئێمە ئەوەبوو هەموو رۆژانی هەینی لە سەعات سێ بەدواوە لەناو شاری هەمەدانەوە هەتا سەیرانگای عەباساباد ئەمبەرو ئەوبەر خەڵکی سەماوەریان دادەناو بەرەیەك راخەرێکیان دادەخستو نانی نیوەرۆو ئێوارەیان لەوێ دەخواردو خۆیانو ماڵو منداڵیان شاریان لەبیر دەکردو هەرچی پەژارەیان هەبوو لەگەڵ هەوای ئازادیدا دەرۆی. دیمەنێکی زۆر جوان تەنها لە ئادارو نیساندا وێنەی جوانی لای گوڵی گاگرو نیسانو مەشقانو قەسپەو جۆرەها وردیلە گوڵی ئەو دوو مانگەی بەهاری لای خۆیا هەبوو.

کەم یان زۆر نەخوێندەوارەکان خۆیان فێری خوێندەواری کرد، ئەوەش یەك زمانی ئەزانی بوو بە دوو لانی کەم ئەگەر نەبووبێ بە سێ زمان، سەرەرای ئەوەش لە دەورەی کادرانیشدا ئاستی زانستی سیاسی بەرز ببۆوە.

کۆمەڵە خەڵکێ کە ژمارەمان (٤٧٠) کەس دەبوو تەباو هاوباوەرو برا بووین. ماوەی ساڵێکی رێك لە ئاوارە بووین لە کاتێکا باس دەکرا هێزێکی سەربازی

دوژمن له کەرکوکەوە بۆ ناوچەی هێزی پێشمەرگە هاتووە هەموو دڵمان دەگوشرا دەمـــان زانـــی درنـــدەکان ئـــازاری خـــەڵکی کوردســـتان ئـــەدەن.
ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم لە ١٧/ مایس هەڵیان برین یان ١٧/ نیسان بوو هەروەها لـە ١٨،٢٠ نیسـان یـان مایسـدا گەڕاینـەوە بـەڵام کاتـێ گەڕاینـەوە بـە دوو بـەش ماوەیـەکی زۆر شـێخ عـەزیزی شـەمزینی و کۆمـەڵێکی زۆر خـەڵك نیشـتمان پـەروەر لەگـەڵ سـەرکردایەتی پـارتی قسـەیان کـرد کـە رێگـە بـدەن م.س و پێشـمەرگەکانی بگەرێنـەوەو بەشـداری شـۆڕش بکەنـەوە، کـاتی خـۆی م.س دەیـوت حکومـەتی عـارف و یـەحیا هـیچ بـە کـورد نـادەن، سـەرۆکی پـارتی ئـەیوت نـا هـەموو شـتێ وەرگیراوەو ئێوە لێناگەرێن، وا ئێستا دەرکەوت ئێمـەش رێگر نەبووین و ئـەوانیش جارێکی تر پەلاماری کوردستانیان دایەوە، ئێمە وەکو کەسانی نیشتمان پـەروەر هەڵویستی خۆمان نیشان ئەدەین و بێ مـەرج دەگەرێینـەوەو ئەمانـەوێت بەشـداری شەڕی سەنگەر بە سەنگەر لەگەڵ ئێوەو خەڵکی کوردستان بکەین، بەڵام سـەرۆکی پارتی زۆر پێی دادەگرت و هەر رێگای نەدەدا بگەرێینەوە، دەوڵـەتی شـاش زەختـی کرد رێگامان بدەن ئەوسا رێگەیان داین بگەرێینـەوە، بـەڵام لـەکوێ دامـان نـان نـابێ نارازی بن م.س بەوەش رازی بوو، سەرەتا شەهید عەلی عەسکەری و رەئیس کـەمال مفتییـان لەگـەڵ هێزێکـدا بـەرێکرد هـەر کـە گەیشـتنەوە بەشـداری شـەڕی زۆزگ و هەنـدرێنیان کـردن و لـە پرێکـا ژمـارەی (٨) پ.م شـەهید بـوو بـێ ئـەوەی پـاش ئـاوارەیی بـۆ تاکـە چرکەیەکیش کـەس و کـارو ناوچـەی خۆیـان ببیـنن لـەجیاتی ئەوەی رێزیان لێ بگرن و یەکی مانگێ ئیجازەیان بدەن و دڵنەواییان بکەن و دەری بخـەن کـە هـیچ شـتێ لە دڵیانـدا نـەماوە، هـەر دوابـەدوای شـەڕی زۆزگ و هەنـدرێن بەش بەشیان کردن و تـاك تـاك و دەسـتە دەسـتەیان کـردن و زەختیـان لێ دەکـردن لـە جـوێن بـە ئەنـدامانی م.س بـدەن و ئـەوەی جوێنیشـی نەدابایـە، خـۆی دووچـاری محارەبەیەکی نەفسی گەورە دەکرد.

پاڵەپەستۆیەکی وەها خراپیان لەگەڵ رابەرەکانی ئێمە دەکرد گیانی ئەوەیان لا دروست کردبوو کە خێراو بێ دواکـەوتن بیر لـە دارشـتنەوەی رێکخسـتنی سیاسـی سەربەخۆ جیا لە پارتی بکەنەوە.

بەشـی دووهـەمیش بەسـەقزو بانـەدا گەڕاینـەوە لـەوێ لـەجیاتی بـەرد گوڵیـان تێدەگرتین و هاواریان دەکرد هەر ئێوە راست بوون هەر ئێوە بژین، چووینە بلـەکێ

لەوێ هەموو چەکەکانی کە لێیان وەرگرتبووین بۆیان هێناینەوەو ئەوەی نەشمابوو چەکی تریان داینێ لەجێیاتیو بەڕێ کەوتین بەرەو خانەو لەوێوە بۆ دەوری چۆمان پاشان بردیانین بۆ گوندی خوشکان هەفتەیەك تەنها م.س لەوێ بوو باقی هێزەکەیان برد بۆ دەوروبەری سەرکەپکانو سەروچاوەو لق لق بەجیا خستنیانە ژێر چاودێرییەوە. پاش هەفتەیەك چاودێری لە گوندی خوشکان بە بروسکەی سەرۆك بارزانی براین بۆ گوندی پلنگان لەلای پیاوێك دایان نایین چاودێریمان بکات ناوی مەلا حسێن بوو پاش چەند هەفتەیەك لە پلنگانەوە براینە دۆڵە رەقەو لەوێ لەمبەرو بەری چەمەکەوە مقەڕمان دامەزراند، ئەوسا کاك عەلی عەسکەریو مامۆستا حیلمی عەلی شەریف، کاك عومەر دەبابە، مام جەلال لەوێ بوو، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد نەهاتبۆوە هەر لە ئێران مابۆوە.

کاك نوری شاوەیسی رەحمەتیو کاك عەلی عەبدوڵا کە ئەوانیش ئەندامی سەرکردایەتی پارتی بوونو کاتی خۆی وەکو دەست بەسەر لای بارزانی مابوونەوەو نەهاتبوون بۆ ئێران بەڵام پەیوەندی هەمیشەییان بە ئەم چوار برادەرەوە هەبوو، ئەم برایانە بۆیە هێندرانە دۆڵە رەقە لەژێر چاودێری رەحمەتی عەباسی مەمەند ئاغادا بن بەڕاستی عەباس ئاغا هەرچەندە رەئیس عەشرەت بوو بەڕاستی پیاوێکی بەکەڵك بوو قەت وەهای نیشان نەئەدا کە ئەم برایانە بوونە بە ئەرك بەسەریەوە.

من ئەوسا پ.م سادە بووم لە دەستەی مام جەلالو دەستەکەمان ١٥ پ.م دەبوو ئاگاداری ئەوە بووم کە لەلایەن بارزانی مستەفاوە بروسکە هات داوای هەر چوار ئەندامانی سەرکردایەتی پارتی دوو دوو بۆ لای یەکێك بۆ لای بارزانی مستەفاو دوان بۆ لای ئیدریسی کوڕی، برادەران مەترسیان هەبوو لە چوونیان بۆ ئەو سەفەرە، پێم وەهایە عەباس ئاغاش شتێکی ئیشارەت کردبوون، کەوتنە هاتوچۆی لای کاك نوری شاوەیسو کاك عەلی عەبدوڵا بۆ لای ماڵی عەباس ئاغاو پێ دەچوو زنجیرەیەك کۆبوونەوەیان لەگەڵ کردینو نەگەیشتینە یەکتری لەسەر ئەوەی پارتی م.س رێکخراوی خۆی نوێ بکاتەوەو دەست بکەن بە کاری نهێنیو شاخ بەجێ بهێڵنو بڕۆنەوە ناوشار.

ئێوارانێك هەور بوو نمە نمە دەباری مام جەلالو عەلی عەسکەریو حیلمی عەلی شەریفو عومەر دەبابە رۆیشتن بۆ ماڵی ئەنوەر بەگی بێتواتە هەر لەو دۆڵەی

سەرکەپکانە ناوی گوندەکەیم لەیاد نەماوە ئێمەش کە دەستەی مام جەلال بووین ئاگادار کراینەوە درەنگێ بڕۆین بۆ ئەوێ، ئەمان دەزانی چییە بەڵام دەمانزانی جوولەجوولێک هەیە. کاتێ چووینە ماڵی ئەنوەر بەگ هەموو پێشمەرگەی دەستەی برادەرەکانی تر هاتبوون، ئەو رۆژەش مام جەلال و هەڤاڵانی لەگەڵ عەلی عەبدوڵا و نوری شاوەیس لەبەر چاوی خەڵکی و لەماڵ عەباس ئاغا قرە قرپیان کردبوو جا نازانم تاکتیك بوو بۆ دوا رۆژی ئەو دووانە یان بەڕاست لە یەکتر تووڕە بوون و قسەی بەرزو نزمیان بەیەکتر وتبوو.

# بەجێ هێشتنی دۆڵە ڕەقە

بۆ ئەوەی فەرامۆشی نەکەین ماوەیەك بوو دۆڵە ڕەقە خرابووە ژێر چاودێری‌و یەك کەرت پێشمەرگەی بارزانی جامانە سوور هێندرابوونە پشت قوتەڵ بۆ ئەوەی لە نزیکەوە چاودێری جم‌و جووڵی ئەندامانی سەرکردایەتی م.س بکەن.

بارانەکە لە نمە نمەوە زیادی کرد تاریکی دەستی پێ کردبوو، کۆیان کردینەوەو پێشمەرگەکان ڕیزکران‌و ناوی نهێنی داندراو بەپشتی ئەو کەرتە بارزانیەدا بەڕێ کەوتین، ئێشك چییەکەیان نەی دی بووین، بەڵام هەستی بە چرپە کردبوو هاواری کرد کێن کرو، برادەرێکیان لەگەڵ بوو بە ناوی خورشید حەمەی ئەویش شەهید بوو، وەڵامی دایەوە کە خۆمانین، کابرا بێ دەنگ بوو ئێمە تێپەڕین باران ئەویش‌و ئێمەشی شپرزە کردبوو بۆیە لەسەری نەڕۆی‌و ئێمەش تێپەڕبووین بێ دەردەسەری. دنیا سارد بوو لە مانگەکانی ئاخری ساڵ بوو قوڕی بتوێن بەناوبانگە، پێڵاوەکانمان تەڕ ببوو، قوڕە لینجەکە ڕای دەکێشا‌و پێڵاوەکانمان دادەکەندرا‌و پێمان دەچووە سەر زیخەڵانەکەی ڕێ، هەندە وردە بەرد بە قاچماندا ئەچوو وەخت بوو کوێراییمان دابێ، کاك حیلمی شەو کوێر بوو، شەهید عەلی ئەیزانی هەر ئەچووە بن دەستی‌و بەلای خۆیدا بەکێشی دەکرد. من پێڵاوەکانم لێ بەجێ ما لە قوڕا چەقی بۆم دەرنەهات، دوو جووت گۆرەوی زیادەم پێ بوو بەسەر یەکەوە کردمە پێم بەڵام سوودی نەبوو، سەرەڕای ئەوەی لە سەرما ڕچی بوو ئازاری زۆریشی ئەدام، باش بوو قۆناغی یەکەممان ماڵێك بوو لە گوندی کفرە دۆڵ لە خوار گوندی سەرکەپکانەوە، ماڵێکی حەوشە گەورە هەبوو لە دەرگاکە چووینە ژووری زانیمان تراکتۆریان هەیە، هەموو چووینە هەیوانێك کە ژوورێکی لە بەردەمدا بوو، ئەو چوار برادەرە چوونە ژوورەوە باقی لە هەیوانەکە ماینەوە، باران هەر ئەباری ماڵەکە نەیان وێرا ئاگر بکەنەوە هەتا چراش لە هەیوانەکە هەڵبکەن هێشتاش برسی نەبووین بۆیە نانیشمان نەخوارد. ئەوانی ژوورەکە هەڵاژان ئەوەی هەیوانەکەش دوو ئێشکچی دانراو ئەوەی تر پشتمان کردە یەك، بەڵام لەشمان تەڕبوو خراپتر بوو نەمان دەزانی چی بکەین. سەعاتێ دووانی مابوو هەتاو بکەوێ، دوو تەرەکتۆر یەکیان بێ عەرەبانە هەر چوار ئەندامانی سەرکردایەتی سوار بوون یەکێکی تریش عارەبانەی هەبوو پێشمەرگەکانی تر سوار بوون ڕوو

لەچوار قوڕنە کەوتینە ڕێ، پاشان روو لەبناری کۆسرەت رۆیشتین و لە خدران رەت بووین روو لە ئالیقەکان پاشان گەیشتینە گوندی چناران و ئەوسا ماڵی مەحمود ئاغای کاکە زیادی کۆیە لەو گوندە بوون هەموومان بووین بە میوانیان و مەحمود ئاغاش لە بارەگای بارزانی بوو هەتا سەعات چواری دوا نیوەڕۆ پاشان روو لە لوتکەی شاخی کۆسرەت بەڕووکاری دوکاندا کەوتینەڕێ و تاریك داهات بەرەو بەری کەڵکە سماق و لەوێشەوە بۆ گوندی سارتکە بەڕێ کەوتین و چووینە ماڵی شێخ قادر شێخ مارف سارتکەیی. ئەوان دۆستی ئێمە بوون و خزمی شەهید عەلی عەسکەری بوون، ئێمە زۆر ماندوو ببووین چونکە لەو لاپاڵ و ناوڕەزانەی بەر ماڵانی کەڵکە سماق و سارتکەوە زۆر هەڵدێرابووین و هەڵدەستاینەوە، زۆر برسیمان ببوو چاوەڕوانی ئەوەمان نەدەکرد چەند مریشکێ سەربڕن و پلاوێکی چەورمان بۆ لێ بنێن، چونکە لەوانە خۆشتر نانێکی رەق بە جامێ ئاوەوە یان بە چایەکی شیرینەوە زۆر لەوە خۆشتر بوو لامان، بۆیە هەموو یەك دەنگ هاوارمان کرد نان و چایەك بە پەلە بۆ ئەوەی سەرخەوێ بشکێنین تا رۆژ نەبۆتەوە. ئەوانیش یەك هیزە دۆشاوی ترێی رەشیان هەبوو بە جامی گەورە گەورە بۆی تێ کردین و خۆمان تێدا شەهید کرد، هەندەمان خوارد و هەر کەسە لەلای خۆیەوە بە تاقم و تفەنگەکەیەوە گورگە خەوی کرد و چەند برادەرێکیش دوو دوو بوونە ئێشکچی، بەیانی کاتژمێر چوار هێشتا چۆلەکە نەکەوتبووە جریوە جریو هەڵیان ساندین دوو هێستریان بار کرد لە چوپ و بەرمیل و لەولاشەوە قەلەمونێکی گەورە و کاوڕێکی چاك ئامادە کرابوو بە لاوێکا لە دوامانەوە هێنایان روو لەسەر زێ و تەنگەبەری پەنجە شوێنێکە بەردەلان و دەم زێی دوکانە و ئەمبەرو بەری شاخەکەیە رێگایەکی پیادە نەبێ بە گوێدرێژ نەبێ هاتووشۆی ئەتومبیلی پێدا نەدەکرا. لە کۆندا شوێنی لەمەکۆدانی ئاژەڵی دزراوی ناوچەکە بووە، دزەکان ئەوێ سەنگەری شەڕیان بووە، لەگەڵ ئەوەی بنکەی حەوانەوە و پشوودان و ساغکردنەوەی دزیەکەیان بووە، لەزێ پەڕینەوە بەری تەلان و لەناو چڕی پەنجەدا خۆماندا بە زەویدا.

دوان لە پ.م گورج و گۆڵەکان لەگەڵ خوشکەزای شێخ قادردا ناوی حسێن بوو کە کاوڕەکەیان سەربڕی لەگەڵ قەلەموونەکە و پاش شۆرینەوە خرانە مەنجەڵەوە بەجیا و بە دارو چیلکەی وشك و بێ دوکەڵ خرایە سەر ئاگر. مەنجەڵەکە و قاچ و

ورگ‌و سەری کاوڕەکە بە دوو سێیەك کە نەخەوتبووین ئاگرێکی چاکمان کردەوەو بەزمەی تفەنگ دەستمان کرد بە هەڵکڕوزان‌و برژاندنی. بڕوا بکەن هەتا برادەران هەڵسان‌و خواردن پێ گەیی کەم شوێنی سەروپێ‌و قاچ‌و فاتە رەش‌و گەدەکەی کاوڕەکە مابوو ئەوەی تریمان گورگ ئاسا خوارد، لە یادمە مام جەلالیش لە گەڵمان بەشداریکرد لە کڕانەوەی سەرو پێیەکەی.

ئێوارە خەریکی ئەوە بوو دنیا تاریك ببێ‌و بارانیش نمە نمەو لەسەرخۆ دەباری رێچکەمان بەست بۆ ناو مالانی تەلان، ئەوسا لە ترسی بۆردومانی سوپای عێراق کە لە دوکان‌و قەشقۆڵی بوون بە سووتاوی چۆڵ کرابوون، بە بێ چرکە ئەوێمان بڕی‌و بە بناری کانی هەنجیرەدا روو لە سردە سورکە کەوتینەڕێ، شەو چووینە ئەشکەوتە گەورەکەی سردە سورکە کە دەڕوانێ بەسەر گوندی زەرزی‌و قوچبلاخ دا، ئەم رۆیشتنانەی ئێمە ئەبوو نە حکومەتی عێراقی بمان بینێ‌و نەپێشمەرگەی بارزانی، ئەبوو لە نێوانی هەردووکیاندا بڕۆین تا شوێنی دیاریکراو زۆر لەوە ئەترساین ئاشکرا ببین چونکە ئێمە کەم بووین یان دەگیراین یان دەکوژراین‌و ئەوساش مێژوو وەکو خائن لەسەری دەنووسینن چونکە هێزی بارزانی هێزی سەرکەوتوو بوو ئەوان لەو رۆژادا مێژووی کوردایەتی‌و نیشتمان پەروەریان بۆ خۆیان دەنووسی.

چووینە ئەشکەوتەکە پڕی بوو لە قشپلی مەڕو بزن، کێچ تێمان ئالا هەر پێمان دەکرا خۆمان بخورێنین ئاگرێکمان کردەوە خۆمان لەبەردەمدا وشککردەوە، برادەران دوو پ.م یان نارد بۆ مالی حاجی شێخ کەریم زەرزی کە لە سەردەمی بنکەکانی چەمی رەزاندا ئیش‌و کاری زۆری بۆ شۆڕشدەکردو ئاشنای هەموومان بوو خۆیشی بە دۆستی نزیکی مام جەلال دەزانی وترا هەندێ نان‌و شەکرو چاو کەتری‌و پیالە بهێنن‌و یا شێخ کەریم خۆیشی بێ هەندێ پرس‌و ڕای رێگای لێ بکەین بزانین هێزەکانی ئەو ناوەی سەر بە بارزانی لە کوێ‌و کوێ هەن بەزۆری.

پاش سەعاتێك هاتنەوە بە هەموو پێویستیەکانەوە، چا سازدرا بە شەکری کلۆوە یەکی یەك دوو چامان بەرکەوت، بەتەواوەتی هەناومان گەرم بووەوە، ماندوویەتی رێگامان لە گیان دەرچوو پرسیارەکان لە شێخ کەریم کراو بەیانی ئێمە بەڕێ کەوتین بەرەو شیلەخان‌و شورناخ‌و لەوێشەوە نیازی ئەشکەوتەکەی گەبەمان هەبوو. لە یادمە لە رووبارەکەی زەرزی پەڕینەوە بەری کەلەباش، نەمزانی

لەسەرچی بوو مام جەلال لەخوا لێخۆشبوو کاك عومەر دەبابە تووڕە بوو، هەستم کرد زۆر دڵگیران بوو پێی هەر چەندی کردم نەم دەزانی چییە، لەوە زیاتر کاك عومەر قەڵەوو قورس بوو باش لەپێش مام جەلالەوە نەدەڕۆی بەڕووی ڕێچکەی پێشمەرگەکاندا، سەرکەوتینە گوندی شیلەخان لەم دیوی ماڵەکانەوە مێگەلێ مەڕمان بینی، شەهید خورشید حەمدیو شەهید حەسەن کەوەڵە چوونە لای شوانەکەو داوایان کرد مەڕێکیان پێ بفرۆشێ، کابرای شوان مەڕە قسرێکی چاکی دابوونیو پارەی لێ وەرنەگرتبوون، وتیان: کاکە پێمان خۆشە شتێکمان لێ وەربگری، وتبووی لە دوورەوە کە هاتن مام جەلالم ناسییەوە ئەمەش مەڕی ئەوە، بڕۆن ماڵتان ئاوابێ پارەم ناوێ ئەوجا وازیان لە شوانەکە هێنابوو.

لە ماڵەکانی شیلەخاندا مەنجەڵێکی گەورەیان هێنا ئەوسا ئەوێش چۆڵ بوو تاکە تاکە پیرێژن یان پیرە پیاوێکی تێدا مابوو، تا عەسرێکی درەنگ گۆشت پێ گەیی هەر لەو ناو دارانە خۆمان ماتدا، عەسرەکەی گۆشتەکەمان دابەشکرد بەلام قاپمان دەست نەکەوت گرتگی گەورە گەورە کرابوو هەر کەسە بەردێکی تەختی بۆ خۆی دۆزییەوەو بۆیان خستە سەرییو خواردمانو بەرەو ئەشکەوتی گەبە کەوتینەڕێ. یەکێکمان لە پێشەوە ڕۆی بۆ ماڵی سدیقی حاجی ئەمینی گەبە، رامان سپاردبوو خواردن دروست بکا بۆ ئەشکەوتەکە بۆمان بهێنێ، شەو گەیشتبووە یانزەی شەو سدیق لەگەڵ پێشمەرگەکان هاتەوەو هەموو پێویستیەکیان بۆ هێنابووین، بەلام دارمان دەسن نەئەکەوت ئاگری پێ بکەینەوە چونکە باران دەباریو هەرچی کردمان دارەکە باش نەدەسووتا چونکە ئەشکەوتەکەش دووکەڵی لێ دەرنەدەچوو هەندەی کردمان ئاگرمان بۆ نەبوو بە ئاگر لەوە زیاتر خۆمان قانگ دابوو بە دووکەڵی دار بەڕووی تەڕ، ئەو شەوە نەك ماندوومان دەرنەچوو بەڵکو زۆر هیلاکتر بووین، سەرما، دووکەڵ، تەڕی، کزەبای سارد کرژی کردبووین دەمان وت قەت ئەمشەومان لێ ناڕوات. چارەش نەبوو نەمان ئەتوانی بڕۆینە گوندەکە، چونکە بەس بزاندرابایە بە سەعاتێك هەموومانیان کەوڵ دەکرد، هەرچەندە هەستمان دەکرد زۆرمان نەماوە لە ناوچەکە دەرباز بینو مام جەلالو برایانی سەرکردایەتی بگەیەنینە شوێنی دیاری کراو، لەوەو دوا ئێمەمانان واتە پێشمەرگەکان دەشاراینەوە لەناو هێزەکەی بارزانیدا، بۆیە کەمێ دەموچاومان ڕۆشنی تێ کەوتبوو. هەرچۆنێ بوو ڕۆژمان لێ بۆوە بەیانی مام

جەلال سدیقی حاجی ئەمینی گەبەی بانگ کردو وتی: بنێرە بۆ دوکان چەند جووت پێڵاو چەند جووت گۆرەوی‌و هەندێ پاکەتی جگەرەو سندوقێ سێو یان پرتەقاڵ‌و بەشی ژەمی ئێوارەشمان کەباب بۆ بهێنی. کاتێ هەتاو کەوت برادەرانی سەرکردایەتی کەوتنە پیاسەو پێکەنین، ئەتوت ئەوان نەبوون شەو نووزەیان لە خۆیان بڕی بوو لە سەرماو لەبەر دووکەڵی پەنگ خواردووی ناو ئەشکەوتەکە.

ناخۆشی شەو ئاساری نەما، عەسر جوتیاری رۆیشتوو بۆ دوکان بە دەستی بەتاڵ هاتەوە نەیوێرابوو لە چەرمەگاو کرژە رەت بێ، بۆیە چاوەڕێی ئاوابوونی رۆژمان بوو لەگەڵ تاریك بوون ئێمە بەڕێ کەوتین بۆ تەپەماری خواروو کە ئەوسا جەماعەتی عومەری حەمە عەلی رۆستەمی لێ بوو، لەوێشەوە خەڵك نێردراو سێ چوار چەکداریان هاتنە دەوری گوندو ئێمەیان لەگەڵ خۆیان بردە نزیکی ماڵەکان بەڵام نەیان هێشت بڕۆینە ماڵی کەس‌و هەر لەوێ مام جەلال قسەی بۆ کردین‌و وتی: زۆرم پێ ناخۆشە لەگەڵتان دادەبڕێین، بەڵام باروودۆخی سیاسی وەهایە هیوادارم رۆژێکی نزیك لەم سەرکێوە ئازادانە بە یەك بگەینەوە لە سەنگەری بەرگری لە کوردو کوردستان. مام جەلال قسەی زۆر پێیە هەندێ جار مرۆڤی هەڵدەداو هەندێ جار دەشی گەیەنێ بەس نای بەزێنێ‌و بەزینی لادەست ناکەوێ.

## بەڕێکردنی ئەندامانی (م. س) بۆ خۆ شاردنەوەو کاری سیاسی

پاشان عومەری حەمە عەلی رۆستەم هات هەر چوار ئەندامانی سەرکردایەتی بردبوو ئێمەش بەپێی ئەو نەخشەیەی بۆمان کێشرابوو هەموو گەڕاینەوە پشتی گەبەو گولیجەو لەوێوە بووین بە دوو بەش هەندێکی بۆ قەمچوغەو سەرگەڵوو، ئەوەی تریشی بڕۆینەوە قەڵا سێوکەو لەوێوە هەندێ برادەری لای کاك عومەر دەبابە هەبوون خەڵکی دەشتی هەولێر بوون، لەوانە ئەنوەر جوخین و بارامە درێژو قادر خەیات و چەند برادەرێکی تر ناوەکانیانم لەیاد نەماوە بەداخەوە.

هەر کە بووین بەدوو بەش و هەر یەکەمان بەلای خۆیدا رۆی هێشتا ئێمە لە گەبە سەرنەکەوتبووین لە دەشتی کرژە دەست ڕێژی جاشان کراو تەقەکان درێژەی هەبوو، زۆر مەترسی ئەوەمان هەبوو هاوڕێکانمان بەرکەوتبن لەکەمیندا.

چارمان نەبوو بە نێوانی گەبەو گولیجەدا سەرکەوتین بۆ پشتیماڵەکانی گەورەدێ، مانگە شەوێکی خۆش بوو مرۆڤیش کەڕێی بەردەوام بکات نازانێ سەرما چییە، بەڵکو هەمیشە گەرمایەتی، دامان بەپشتی ماڵانی گەورەدێدا، چونکە دەمانزانی پێشمەرگەی سەر بەبارزانی تێدایە، ڕوومانکردە دوو ماڵەکەی کەڵەشێرە، لەو دارو دەوەنانەی خوار گەورەدێوە ڕێمان لێتێکچوو، شارەزا من و غەریب سەعید بووین. غەریب هەمیشە لە پێشەوە دەڕۆی و منیش لەپشتی برادەرانی نەشارەزاوە بۆ ئەوەی بزر نەبن، غەریب زۆر پەلەی بوو ئەیویست خۆی دەرباز بکات و خێرا بگاتەوە عەسکەرو لەوێ خۆی ئاشکرا بکات. ئەو وازی لە پارتی هێناوەو ئیستیقالەی کردووە، چونکە نەخشەکەمان وەهابوو، منیش زۆر لەوە ئەترسام یەکیان دابڕی و گلەیی دواڕۆژمان بێتە سەر، بۆیە بە پێی ئەوان دەڕۆیشتم هەندێ جار دادەبڕاین لەگەڵ غەریب سەعید.

لەبەر ماڵانی گەورەدێ وامان لێهات باشبوو سەگ وەڕی کەڵەشێرە هەمیشە هەبوو، بەسەگ وەڕەکە چووینەوە ناو ماڵەکەی سەرێ پرسیارمان لەماڵی کوێخا نەریمان کرد وتیان: بڕۆنە ماڵەکەی خوارێ ئەو دوو ماڵەش سەگیان دڕ بوون زۆر ئاسان نەبوو لەممال بۆ ئەو ماڵ بڕۆی. لە ماڵی دووهەم نزیك بووینەوە لەناو ڕێگە لە بزنە ڕێکەی پشتی دیوەخانەکایانەوە میلی تفەنگ هێندرایەوەو وتی: کوڕە کێن، یەکێك لە برادەران لەسەرخۆ وتی: دەی بمان کوژە دەی، بەم قسەیەی کابرای

ئێشكچی بەخەڵكی ماڵەكەی زانیو هەستی لە خۆی بڕی ئێمەش لەسەرخۆ وەكو كەسێكی خۆماڵی چووینە بەردەرگای ماڵەكەو لە دەرگاماندا، یەكێك هاتە دەرێ لێمان پرسی ئەمەیە ماڵی كوێخا نەریمان.؟ وتی: بەڵێ بفەرموون چیتان دەوێ؟!
وتمان: لە خوارەوە هاتووین ماندووین ئەمشەو جێمان بكەرەوە سبەی ئەڕۆین بۆ سەرگەڵوو، مەبەست لەم قسەیەمان لێ تێكدان بوو چونكە ئەمانزانی دوای (٢٤) سەعات عەباس ئاغا بروسكە بۆ بارزانی دەكا كە جەماعەت رایان كردووە ئەوسا ئەم رێگاوبانە دەگرن بە تایبەت چەمی رەزانو كەڵەشێرە. ئەوەی جوابی داینەوە نەریمان خۆی بوو وامان زانی ئەمان ناسێ بەڵام لەبەر ئەوەی هێز لە ماڵەكەیایەتی بۆیە خۆی نەناس دەكات، وتی برا جێگا نییە ئەوە بەتالیۆنی (٢) حاجی شێخ قادر (٣٠-٤٠ )پ.م لێرەن ئەوەش شێخ عوسمانی عەودەلان خۆیو كەرتێك لێرەن، هەر ئەوەندە گوێمان لەوە بوو لە ماڵەكە دوور كەوتینەوە هەڵاتین بەرەو كانی شێخ ئەولاو لەوێوە بۆ ماڵە كوردەكانی پشت عەسكەرو چووینە لوتكەی توتەمر كە دەكەوێتە رۆژهەڵاتی گوندی عەسكەر لەوێ لەناو رازەكەدا هەڵوێستەمان كردو رێكەوتین لەسەر ئەوەی شەهید حەسەن كەوەڵە بڕیاربوو بڕواتەوە بۆ خاڵە بازیانیو لەوێ ئیعلان بكات كە وازی لە سەركردایەتی پارتی هێناوەو گەڕاوەتەوە لەو ناوە پێشمەرگەیی دەكات، وتمان: تۆ لە عەسكەر نات ناسنو گومانت لەسەر نییە، بڕۆرە لای شەهید عەبدوڵا مەجیدو تێیگەیەنە ئێمە لێرەین نانو پیویستیمان بۆ بهێنێو بۆ چاوساغی بێتە لامان، چونكە عەبدوڵڵا لە لاوە رۆشن فكرو شۆڕشگێڕەكانی ئەوسای عەسكەر بوو.

# قادر خەبات و پڵنگ کوشتن

هەتاو لە لوتکەی وشکە شیوی دابوو خۆمان لەناو رازە بەردەکاندا شاردەوە، بە دووربین دەمان ڕوانیە بەری کۆیەو دەشتی گۆپتەپەو شێخ بزێنی و خاڵخالان، هەناسەی دووریمان بۆ هەڵدەکێشا و بە تەواوەتی خافڵابووین، هەتاوەکە گەرمی کردبوو قادر خەبات بانگی کردم عەلی وشیاربە ئەوە پڵنگێکە لەم بن ئەشکەوتوکەدایە، تەقەی لێ دەکەم ئەگەر بۆم نەکوژرا یان شالاوی بۆ هێنام تۆ بە رەشاش دیکتاریۆفەکە سەڵییەیەکی پێوەنێ، بۆ ئەوەی شپرزەمان نەکات. من پڵنگم نەدیوە رووبەڕوو بەلام ئەشزانم پڵنگ دڕندەیەو بە ئاسانی ناکوژرێ بە تایبەتی ئەوها لە نزیکەوە، رەشاشەکەم روو لەوێ دابەست، ئامادەی دەست پێدانانی بووم، چاوم هەر لەسەر سیرەبوو، تەقە هەڵسا وتم: چی بوو.؟ وتی: کوشتم، لام سەیربوو چۆن پڵنگ بەیەك گوللە دەمرێ، بێ بڕوا بووم بانگی قادرم کرد چی بوو.؟ وتی: ئاگاداربە ئەچم لە ئەشکەوتەکە دەری دەهێنم. کاتێ وای وت من لێی نزیکتر بوومەوە ئەترسام ئەو زەلامە خۆی دابنێ. خۆی رووت رووت کردبۆوە چووبووە ژووری قاچی گرت و هێنایە دەرێ کەڕوانیم پڵنگ نەبوو، بەلام شتێك بوو کوڵکن و توکەکانی درێژ وەك گوڵکی کوڵکن دەچوو، شتێکی زۆر ناشیرین و ئێسك گران بوو، لە بەرزی لوتکەی وشکە شیوەوە بۆ خوارێ (١٥٠) مەتر زیاتر دەبوو فڕێمان داو هەر بە تەقلە رۆیشتە خوارێ.

ئارام بووینەوە لە بەزمی پڵنگ رزگار بووین، چاومان دەگێڕا کەی دەردەکەوێ نان و کەتری و شەکرو چامان بۆ بهێنێ.

بوو بەهات هات دەرکەوت دوو پیاوو مێردمنداڵێ روو لەسەر کانی و ئاوەکەی وشکەشیو دێن دووربینەکەمان بەکار هێنا، دەرکەوت عەبدوڵا مەجیدو شێخ عەبدوڵا عەسکەری و ئەحمەدی کوڕی بوو، شێخ عەبدوڵا ئەو کاتە یەکێك بوو لە سەر لقی ئەو برادەرانەی لە هەمەدانەوە گەڕابوونەوەو لقەکەی لە سەروچاوەی بتوێن بوو، زۆرمان پێ خۆش بوو هەلێکی چاك رەخسا بۆ ئەوەی قادر خەبات و بارام و ئەنوەر جۆخین و ئەوانەی دەشتی هەولێر لەڕێی ئەوەوە بەرێ بکەینەوە سنووری خۆیان.

لەسەر کانی و ئاوەکەی وشکە شیو یەکمان گرتەوە، پاش چاك و چۆنی ئەوە

هاته پێشەوە ئەو تەقەیە چی بوو کرا، بۆمان گێڕانەوە شتێکمان کوشتووە نازانین چییە، هەرچەند قادر خەبات کوڕی باڵەکایەتییەو ئەو جۆرە دڕندانەش لەو ناوە هەن، شەهید عەبدوڵڵا مەجید داوای کرد چەقۆیەکی بدەینێ و لەگەڵیا بڕۆمە سەر کەلاکەکەی، کاتێ بردمە سەری یەکسەر وتی: ئەمە کەمتیارە با کەوڵی بکەین و گۆشتەکەی بەپێی شەرع نیوەی دەخورێ، کەوڵی کردو بە دوو قۆڵی ناو سکەکەیمان دەرکردو ورگ و شتەکەیمان فڕێ داو بە هەردووکمان لاکەکەمان بردە دەوری برادەران لەسەر بەردێکی تەختی گەورە دامان ناو هەندێ شووڵە هەنارمان ئامادە کرد چونکە لەسەر کانی و ئاوەکە سێ چوار بنە هەنار هەن هەمووساڵێك هەناری چاکیش دەگرن ئاگرمان کردەوەو گۆشتمان برژاند، هەموومان یەکەم جار بوو گۆشتی کەمتیار بخۆین. هەتا ئێوارە پێش خۆرئاوا بە گۆشت برژاندنەوە کاتمان کوشت و دوا نیوەڕۆ بوو دەوری پێنج کیلۆ گۆشتی نەرمەمان جیاکردەوە شێخ عەبدوڵڵاو ئەو برایانەی دەشتی هەولێر لەگەڵ خۆیان بردیان بەو نیازەی شەو لە گوندی بوگد لە ماڵی شێخ عەبدوڵا بە ساوەری چەورو چوڵەوە بیخۆن.

ئێمەش ڕۆژئاوا نیازمان بوو دزە بکەین و خۆمان بکەین بە عەسکەردا بەوریایی، چونکە ئەوسا دوو بەتالیۆنی پێشمەرگەی سەر بە بارزانی لەوێ بوون پێش ئەوەی بکەوینە ڕێ ئێمەش هەندێ گۆشتمان لێ کردەوەو لە دەسرێکا گرێماندا لە پڕێکا دوو کوڕی کۆچەری بە دوو گای بارەوە هاتن زانیان گۆشت دەبرژێنین فەرموومان کردن و یەکی دوو شیشمان بۆ برژاندن و خواردیان و ڕۆیشتن. وا ڕێکەوتبوو ئەوانە من و غەریب سەعیدیان چاك دەناسی، ئێمەش ئەوەندە بە هەندمان نەگرتبوو، چونکە ئێمە پێشمەرگە بووین ئەوان دەمان ناسن یان نا شتێ نییە.

شەو خۆمان کردە ناو ماڵان و چووینە ماڵی کوڕێك ئەو سەردەمە لە ڕێکخستنی ئێمەدابوو، ناوی بەکر مستەفا بوو، لەلایەکی تریشەوە نوسەری بەتالیۆنی حاجی شێخ قادر بوو، ماڵەکەی جێگای گومان نەبوو شەو لە یەکێك لەو دوو ژوورەی هەیبوو دای ناین، بەڵام تاقێکی گەورە لە نێوانی هەردوو هۆدەکەدا بوو ئەگەر کەسێکی خۆی بهاتایە ئەو ماڵە لەو تاقەوە ژوورەکەی تر چی تێدا بوایە ئەیبینی. سەرمامان بوو داوامان کرد ئاگرمان بۆ بکاتەوە، کۆتەرە دارێکی گەندەڵی پێوەنا یەك دووکەڵی دروست کرد، هەردوو ژوورو حەوشەکەشیانی ئیزعاج کردبوو، لەو کاتەشدا بۆ نەگبەتی کۆمەڵێك لاوی هاوتەمەنی هاتن وتیان: ئەم دوکەڵە چییە؟

ئەویش وتی: پیاوێکی پیر لەو ڕێگایە تووشم بوو وتی: شوێنێکم نییە ئەمشەو لێی بحەوێمەوە منیش لەڕێی خوادا هێناومەتە ئەوێ ئەو ئاگرەی کردۆتەوە ئەو دوکەڵە زۆرەی دروست کردووە. زانیمان باسەکەی هەڵەیە خۆمان ئامادە کرد نەکو سەرێ بە تاقەکەدا بگرن و بمان بینن، باش بوو بەشەرە شەقێی خۆیانەوە خافڵان ئاگایان لە ئێمە نەما.

## ئێمەو ڕەشید بارزانی

پیاوێکی خەڵکی بارزان بەناوی ڕەشید بارزانی کە ماڵی لە گوندی هەیدەر بەگ بوو کاتی خۆی موشکیلەی لە دەست قەومابوو هەڵهاتبوو، چەند ساڵێك بوو لەوێ خۆی پەنا دابوو، بەڵام لەگەڵ پێشمەرگە خۆی تێکەڵاو کردبوو بۆی دەلوا هەرچی بکاو هەرچی بڵێ، خۆی کرد بە حەوشەی ماڵی بەکردا ترسمان لێ نیشت لە پەنجەرەکەوە سەرێ بکێشێ ئێمەش ئەبینێو ئەبوو بیکوژین، یان ئەو ئێمە بە کوشت دەدا. دیکتاریۆفەکەم لە خۆم نزیك کردەوە بێ چرپە غەریب تفەنگێکی برنەوی درێژی پێ بوو، ئەویش خۆی ساز داو وتمان: هەر سەری کرد بە ژوورەکەدا ئەیکوژینو هەڵ دێین بە چەمی بەر ماڵاندا. لەلایەکی تریشەوە لەوە سڵمان دەکردەوە ئەو کارە بکەین ماڵەکە دووچاری بەڵا دەبن، هەرچۆنێ بیرمان لێ دەکردەوە چارە هەر ئەوەبوو ئەگەر دیمان دەیکوژینو رادەکەین ناهێڵین کەس بزانێ ئێمە بووین بۆ ئەوەی بەوە ماڵەکە تاوانبار نەکەین.

ماڵەکە فەرمووی گەرمیان لێ کرد، بەکر وتو وریا بوو لای پەنجەرەکەی گرتو لەولاوە ڕێی بۆ کرد بڕوات، بە قسەوە خافڵاندی هەر کە سەرەی ڕەشید هات وتی: ئەڵێن جەلال تاڵەبانیو ئەوان رایان کردووەو بوون بە جاش غەریبو عەلی بچکۆڵو عەبدوڵا عەسکەریشیان لەگەڵدایەو ئەمشەوی رابردوو لەوشکەشیو دیویانن هەر لەم ناوانەن، ئەمڕۆ هێزم ئاگادار کردەوە ئەگەر لەم ناوە مابن هەر ئەمڕۆ تڕیان دەبڕنو دەیان کوژن. کۆمەڵێك جوێنی خەستی بە هەمووماندا‌و وتی: ئەوانە ترسنۆکن چۆن ئەتوانن لەم ناوە خۆیان بگرن، بەکر جارێکی تر ڕێوی پێچی بۆ کردو بە پەلە نانو ماستاوێکیان بە تەرە پیازەوە دایەو پێشی کەوت وتی: من لە بەتالیۆن کارم هەیە، ڕەشیدی ناچار کرد هەڵسێو وەك جاری پێشوو لای پەنجەرەکەی لێ گرتەوەو ڕۆیشتن. بڕیارماندا ئەمشەو بێتەوە غەریب بڕواتەوە ماڵی خۆیانو منیش بڕۆم بۆ بوگد بۆ لای شێخ عەبدوڵلاو لەوێشەوە بۆ ناوچەی پشدەر بۆ هێزی کاوە، بۆلای ڕەئیس حەمە ئەمین فەرەج کە فەرماندەی بەتالیۆن بوو.

شەو پاش نان خواردن برادەرێکی خۆمان لەگەڵمدا هات بۆ گوندی گۆپتەپەو غەریب سەعیدیش چووە ماڵەوەو نامە ئیستیقالەکەی کەلەلایەن مام جەلالەوە پەسەند کرابوو پێ بوو بۆ ئەوەی بڕوای پێ بکەن وازی هێناوە. منیش کاتێ

چوومە گۆپیتەپە چوومە ماڵی عەبدوڵای مام ڕەزا خۆی‌و براکانی هەموو دۆستی ئێمە بوون‌و بیروباوەڕیان لەگەڵ ئێمەداجووت بوو، خزمەتێکی چاکیان کردم، پاشان برایەکی لەگەڵمدا نارد بۆ ماڵی مام شەفیقی ڕەحمەتی ئەوکاتە ئەوان کەڵەکیان لەسەر زێیەکە هەبوو نەفەری بە (٥٠ )فلس دەپەڕێندرایەوە، خەلیلی کوڕیمان برد زۆر برادەرم بوو بەڵام من وەها خۆم پێچابووەوە نەی دەناسیمەوەو هەر براکەی عەبدوڵای مام ڕەزا قسەی لەگەڵ دەکرد, ئاگام لێبوو خەلیل زۆر سەرنجی ئەدام وەکو بەگومان بێ لێم وەها بو بۆیە وتی: باشە بەم سەعات یەکی شەوە تۆ بۆ دەڕۆی.؟ سبەی زوو ئەت پەڕێنمەوە خۆ هیچ هێزت بەدواوەنییە, بەدەنگێکی گڕ وتم: سبەینێ لقەکەمان دێتە کانی بی و ئەڕۆین بۆ گەلاڵەو چۆمان کاری سەرکردایەتیمان پێ سپێردراوە, دیاربوو بڕوای بەقسەکەم نەبوو زۆریشی پێ ناخۆش بوو بۆ(٥٠) پەنجا فلس بەم شەوە درەنگە ئازاری نەدەیت چونکە لەلادێ سەعات دەی شەو هەموو خەوتوون, زانیم کوێی دێشێ وتم: برای باش من (٢٥٠) فلست ئەدەمێ ئەزانم ئازارە بۆ تۆ بەڵام ئەگەر نەگەم منیش موحاسەبە دەکرێم, کەمێ ڕەنگی گەشایەوە, بەدەمە تەقێوە گەیشتینە سەر کەڵەکەکەو پەڕاندمییەوە. خێرا خێرا هەنگاوە کورتەکانم هەڵدەگرت بۆ ئەوەی ڕۆژنە بێتەوە بڕۆمە لای شێخ عەبدوڵا بەیانی وەکوو پێشمەرگەی دەستەی ئەو خۆم ناونوس دەکەم‌و لەگەڵ ئەودا ئەڕۆمەوە بۆ پشدەر.

چوومە کانی بی هەر بە تەنیشت ماڵاندا سەرکەوتم ڕووم کردە بۆگد، ئەوخانووەی پێشوو ماڵی شێخ عەبدوڵای تیابوو، کاتێ من چووم پیرێژنێکی کەڕی تێدابوو، خەریکی جل گەرم کردنەوە بوو نازانم بۆچی بەو شەوە درەنگە نەخەوتبوو. هەرچی لەدەرگامدا نەهات بیکاتەوە لەپەنجەرە بچوکەکەشیانەوە دیاربوو لەبەر سۆپاکەدا جلەکانی کزر دەکاتەوە، لەپەنجەرەکەمدا هاواری کرد کێیە.؟ وتم: دایە ماڵی شێخ عەبدوڵا بۆکوێ چوون.؟ هاتە دەرێ دەستی درێژ کرد بۆ خانویەك لەخوار ماڵانەوە بوو چراکەیان دەسووتا. وتی: ئەوە هەوە ڕۆڵە گیان، منیش ڕووم لەو چرایە کردو چوومە بەردەرگا دوو سێ جارم لێدا کاك شێخ عەبدوڵا هاواری کرد عەلی تۆی.؟ وتم: بەڵێ. دەرگای بۆ کردمەوە چوومە ژورێ هەر بەو شەوە چایەکیان بۆ ساز کردم، پاش هەندێ پرسیار لەیەکتری کردن هەڵاژاین‌و سەرخەومان شکاند، چونکە کات گەیشتبووە چواری بەیانی.

بەیانی شێخ عەبدولاّ لەگەڵ هەندێ خەڵکی بوگد مەوعیدیان هەبوو بڕۆن بۆ ڕاوە ماسی، بۆ دەوروبەری (قەلاّیگان) منیشیان برد شێخ عەبدولاّ وتی: یەك دوو ڕۆژی تر دەڕۆینەوە بۆ لق تا ئەوسا هەندێ خۆت پەنابدە با حاجی شێخ قادر نەزانێ لەم ناوە بەیەکەوەین دوایی دووچاری بەلاّیەکمان دەکات. لەگەرمەی ڕاوە ماسیدا بووین دەستەیەك پێشمەرگەی بەتالبوونی حاجی شێخ قادر هاتن گومانمان کرد کە سەرەنجامی قسە کردنی ڕەشە بارزانی حاجی ئەم دەستەیەی بەدوای مندا ناردبێ بۆ لای شێخ عەبدوڵلاّ بۆیە من خۆم خستە ناو زێیەکەوەو بەوردە مەلە هەندێ دوورکەوتمەوە لەقەرەباڵغییەکە. ئەوانیش پاش سلاّوو چاكو چۆنی ڕاوچییەکانیان بەجێ هێشت و شەڕیان لێ لادایـن, ڕاوە ماسی ئەو ڕۆژەمان هیچی تێدا نەبوو هەندێ مەلەو هەندێ هەوای خاوێنمان وەرگرتو عەسرێکی درەنگ گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە. تازە گەیشتبوینە ماڵی شێخ عەبدولاّ کەرتێك پێشمەرگە لەکلێسەوە هاتن, لەگەڵ شێخ عەبدولاّ ڕامان وابوو ئەگەر ئەم پێشمەرگانەی بەیانی ئەوان نەبوون ئەمانە سەداسەد بەدوای مندا دەکەڕێن, شێخ عەبدولاّ وتی: با لە ماڵەوە دوور بکەوینەوە تۆ لە پشت قەلاّ دروست کراوەکەی سەردەمی پاشای کوێرەی ڕەواندزی کە لە بوگددا دروستکرابوو خۆمان پەنا ئەدەین و من دێمەوە ئەگەر هەواڵی تۆیان پرسی ئەوە هەر شەو خۆمان ئامادە دەکەینو دەکەوینە ڕێ بەرەو بتوێن، ئەگەر وەهاش نەبوو منداڵێك ئەنێرم وەرەوە.

شێخ عەبدولاّ بەجێی هێشتمو پێشمەرگەکان روو لە مزگەوتەکە هاتن، دنیا لێڵ ببوو دوو پێشمەرگە روو لەلای من هاتن هاواریان دەکرد حەسەن پۆلیس وەرە، زۆر هەڵکشان ناچار منیش روو لە کانی سوورو ئیلەلاّ سەر بکەوم ئەوانیش هەر دەهاتن پاشان تووڕە بوون وتیان: مادام نایەیتەوە جەهەنەم. منیش بە دوایاندا گەڕامەوە شوێنی چاوەڕوانی، شێخ عەبدولاّ برادەرێکی نارد بە دوامدا ئەویش پێشمەرگەی هەمەدان بوو ناوی ڕەشید خورشید بوو، وتی: بابڕۆینەوە ئێمە هەر لەخۆمانەوە خۆمان گورگە کردووە ئەوان ئاگایان لەوەی ئێمە هەر نییە.

شەو لە ماڵی شێخ عەبدوڵلاّ ماینەوە سبەینێ ڕۆیشتین بۆ کانی کوردە مەقەڕی بەتالیۆنی دەشتی کۆیە بوو، لەو کاتەدا هەندێ برادەری ئێمە لەوێ خۆیان مات کردبوو، لەوانە ئەکبەر مەحمود، عاسی مەجید، مەولود قەرەدەرەیی و هەندێکی تر، کاتێ ئێمەیان دی هاتنە لامانو وتیان: ئەوە چی دەکەن لێرە، خێرا بڕۆن

ئـەمڕۆ بروسـکە هـاتووە کـە مـام جـەلال‌و پێشـمەرگەکانی لـەم نـاوە خۆیـان شاردۆتەوەو گوایە ناوی ئێمەشیان بردووە کە لەگەڵیدا بین، لە بروسکەکەدا بە گرتن‌و بە کوشتن داوا لـە هێزەکانی بارزانی دەکات لەو ناوە. بە پەلە بردمانیانە ماڵێك‌و نانی نیوەڕۆیـان داینـێ‌و خێرا خواردمـان‌و بـەرەو خەلـەکان کەوتینـەڕێ‌و پاشـان روومـان کـردە کـانی مـازوو کـانی وەتمـان‌و لـەوێوە بـۆ بـاداوان‌و پاشـان چووینە خدران‌و لـەوێوە بـە داری قەمتەرانـدا بـەرەو سەروچاوە رۆیشتین. لـەوێ‌و لەناو لقەکەدا ئاهێکمان هاتێ تازە رێگای ئەوە هەیە کە من دەمێکە نـەقڵی ئـەوێ بووم، وازم لە لای مام جەلال هێناوە. لەو کاتانـەدا بـوو سـەرکردایەتی بـارزانی دوو یارمەتییان ئەدا، شێخ عەبدولاّ نـاوی نـام عەلی قادر تـەنها محەمەدەکەی دەرکردو دوو مانگ لەوەوبەر ناوم نوسرا لە لیستا کە بووم بە پ.م لەو لقە، خۆشم پاك پاك سەرم تاشی‌و وام نیشان ئەدا پێشمەرگەیەکی نوێم کاتێ یارمەتیاندا دوو مانگانەم وەرگـرت. زۆری نەخایانـد لـەهێزی خەباتــەوە ئاگـادار کراینــەوە کـە لقەکـەمان پەیوەندی بکات بە ئەوێوەو نەقڵی ئەوێ کراوین، ئەوسا نەوشیروان فوئاد مەستی فەرماندەی هێز بوو، لقەکـەمان بـەڕەسمی نـەقڵ بـوو. بـەڕێ کـەوتین بـەرەو پشدەرو چووین بۆ گوندی هەڵشۆ کەرەئیس حەمـە ئـەمین فـەرەج فەرمانـدەی بـەتالیۆن بـوو، هـەروەها مامۆسـتا جـەلال کـەریمی شـەهید رابـەری سیاسـی بـوو، لـەخوار مـاڵانی بێتووشـەوە شـەهید جـەلال کـەریم‌و یـەك دوو بـرادەری ترمـان بـەرەو پیرمـان هـاتن‌و رێزیان لێگرتین بە گەرمی بەخێر هاتنیان کـردین‌و ئـەم لاو ئـەولایان مـاچ دەکـردین، سـۆزی هاوڕێیـەتی خـەباتی بیروباوەڕ بـە تایبـەت لـە کـاتی نهێنـی‌و مەترسـیدا لـە سۆزی دوو دڵداری کوڕو کچ خۆشترو بەهێزترە، ئێمە ورەمـان زۆر پێـی بـەرزبۆوەو ئـەویش وای هەسـتدەکرد بوونـەتـە خـاوەن هێـزو مەترسـی هەڕەشـەی کوشـتنیان لەسەر نەماوە لەلایەن سەرکردایەتی بارزانییەوە.

ئـەو شـەوە زۆر رێـز لـەخۆمان لـە لقەکـە گـیراو شێخ عەبـدولاّ و مـن چـووینە لای رەئیس حەمـە ئـەمین‌و جـەلال کـەریم، رەئـیس حەمـە ئـەمین هەمیشـە زۆر مەشـغول بـوو، چـوار گیرفـانی گـەورەی هـەبوو هەمیشـە کیلۆیـەك نامـەی زیـاتر تێـدا بـوو، دەسـتی کـرد بـە گیرفانیـا وتـی: مـام نامەیـەکی بـۆ نـاردووم دوێنـێ سـلاّوی بـۆ هـەردووکتان تێدایە هەرچـەند گـەڕا لـەناو ئـەو هـەموو نامەیـەدا بـۆی نەدۆزرایـەوە، شـەوەکەی بـە قسـەی خـۆش بردمانـە سـەر، پاشـان پێـی وتـین ئێـوە ئـەبێ بڕۆنـە

دارەشمانە لەوێ چاودێری ناوچەی قەڵادزە بکەن مەترسی ئەوە هەیە دوژمن شاڵاو بهێنێ بۆ بێتوش، ئێمەش دڵنیامان کرد لەوەی هەرچی لەتوانادا هەبوو ئەیکەین.

مەقەڕمان بردە مزگەوتەکە بەڕاستی دارەشمانە گوندێکی دڵگیرو خۆش بوو ئاوێکی سازگارو خەڵکی چاکو باش لەگەل خەڵکەکەی بە ئاشنا برادەرەکانمان چووبوونە ناو دڵی خەڵکەکەوە، بە ئاسانی جیا دەکرانەوە لەو پێشمەرگانەی سەرکردایەتی بارزانی سەرپەرشتی دەکردن.

بەیانیان زوو دوو دەستەمان دەردەچووین لەرێ ئوتومبیلەکان ئەلغامیان دەناشت بۆ دەبابەو بە سەیارە، هەتا سەعات (١٠) یانزە، پاشان هەڵمان دەگرتو دەگەڕاینەوە. نیزامی خەفارەت پاکو خاوێنی مزگەوتەکەمان زۆر بەرێکوپێکی بەڕێوە دەبرد، خەڵکی بیکلوو نێرکە پیازی شیرینی چاکیان دەهێنا بەکوڵ لێمان دەکرینو دۆش زۆر بوو لە دارەشمانە بۆیان دەهێناین ژەمێکی تەواومان دۆو پیازو نان بوو.

## من و ئێشك گرتن

شەوان ئێشك چێتیمان دەردەكرد زۆربەی شەو من ئێشك چێتیم دەنووسی ئەبوو خۆم بۆ سەعات ٢-٣ شەو دابنێم كاتێك مەترسی هێرش هەیەو خەو خۆشە، شەوێكیان لەبەر دەرگای مزگەوتەكە لەسەر كورسیەك دانیشتمو تفەنگەكەم بە پاڵ دیوارەكەدا هەڵواسی هەوایەكی فێنكو خۆش هیچ هەستو خوست نەبوو خەڵكی هەموو خەوتبوون، چێژی زۆرم لەو بێ دەنگییە وەردەگرت، بەدەم چێژەكەمەوە خەوم لێ كەوتبوو، لە پڕێكا سێ چوار تفەنگ تەقی راچەنیم تفەنگەكەم مابوو، پەلامارمدا برادەرانم هەڵساندو خۆم روو لە تەقەكان چوومە ناودێ، كاتێ بەسەر غەڵبە غەڵبی ماڵیكا چووم لێم پرسین ئەو تەقانە چیەو بەچی؟ وتیان: حەیوانەكانمان رایداوە بۆ ئەوەی ئەگەر گورگیان لەسەر بێ نەیان خوات هەتا دەیان گەینێ. خێرا رامكردو برادەرانم هێور كردەوەو لەڕووداوەكەم گەیاندن. ئای لە دڵی خۆمدا چەند خەجاڵەت بووم من خەڵكم لۆمە دەكرد لەسەر ئەوەی خەوەنوچكە دەیان گرێ لە حەرەسیاتدا كەچی خۆم یەكجاری خەوتبووم، باش بوو سەلامەت دەرچووم.

## بیرەوەرییەكی تاڵ

رۆژێكیان لەوێ بووین قەت لە یادم ناچێ كەرتێكی بارزانییەكان بەجامانەی سوورەوە لە ناوچەی سۆرانەوە دەهاتنو ئەیانویست بڕۆن بۆ ناوچەی سەركردایەتی پارتی بارزانی، دیلێكیان پێبوو لایان دایە بنكەكەی ئێمە، دیلەكە زۆر سەرنجی ئەدایین قسەیەكی پێبوو كابرای بەند ئێمە تێ نەگەیشتین تومەز ئەو ئەزانێ ئەم لقە سەر بە پارتی م.س یەو ئەیویست پێمان بڵێ رزگارم بكەن.

# بەرەو ناوچەی سلێمانی و گرتنی هەڵوێست

بەڕاستی ئەو ناکۆکیەی نێوانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی بارزانی زیانێکی گەورەی بە میللەتەکەمان و بە شۆڕشی گەلەکەمان گەیاندو بە سەدان رۆڵەی دڵسۆزو کارامەی تێدا بوو بە قۆچی قوربانی. مانگی ١٩٦٦/٣ رەئیس حەمە ئەمین دەستەیەکی هەڵگرت و بەرەو ئێران چوو، منیشی لەگەڵ خۆی برد، چەند رۆژێ لەو گوندانەی کوردستان بووین، دیار بوو بۆ کارێکی تایبەت هاتبوو من ئەم زانی، ئەو رۆژەی عەبدولسەلام عارف لە فڕۆکەکەی کەوتە خوارێ ئێمەش گەڕاینەوە بۆ دارەشمانەو چەند رۆژێکی تر ماینەوە. رۆژێکی تر رەئیس حەمە ئەمین بانگی کردم کاتێ چووم وتی: بڕۆ بە شێخ عەبدوڵا بڵێ هێزەکەی سازو ئامادە بکا، شەو کە هاتم هەموو ئامادەی سەفەرێکی دوورو درێژین بەڵام نەی وت بۆ کوێ؟! شەو بارەگای هێزی کاوە کە نەوشیروان فوئاد مەستی فەرماندەی هێز بوو هەموویان پێچابۆوەو لە پشتی ولاغێکی بەرزەیان بار کردبوو، ئەو پێشمەرگانەی لایەنگری م.س بوون هەموویان هێناو ئێمەش لەگەڵیان کەوتینەڕێ بەرەو چیای ئاسۆس لەدەروەکانەوە پەڕینەوە ئەوبەرو چووینە سەری دەرو لەمەرگەشەوە رۆیشتین لە هەنجیرەوە رەت بووین، پەڕینەوە بەری کۆسرەت و لەوێشەوە چووینە پشتی ایلاالله ی سەروو، کاتێ گەیشتینە ئەوێ هێزێکی یەکجار زۆری پارتی سەرۆکایەتی بارزانی لەلای کانی سوورو بوگدو اللاالله وە بەرەو شاخ هەڵکشان و لە نێوانماندا شەڕێکی چڕ دروست بوو، هەتا ئێوارە دنیا تاریک بوو، لاوێکمان لێ شەهید بوو بەناوی فاروق خەڵکی حاجی قەلا بوو تەرمەکەمان هەڵگرت و شەو بە حاجی قەلادا شوێنی شەڕمان بەجێ هێشت و روو لە قوزلوو لێژ بووینەوە. هێزەکەمان بوو بە دوو بەشەوە بارەگای هێز بە چەك و جیهازو هاوانەکانەوە کەوتە کەمینی پارتی بارزانی لە دەوروبەری خەرابەو بە فەلاکەت پێشمەرگەکان دەرباز بوون، باقی ئەشیاکان بەجێمان بە ولاغەکانیشەوە، بەشی ئێمەش زنجیرەمان بەست و بەری بەیانی بوو گەیشتینە بەستی قوزلوو بەرامبەری کانی هەنجیری ئیبراهیم ئاغا، زۆر ماندوو ببووین من لەڕێگا خەوم لێ دەکەوت بەدەم رۆیشتنەوە، جاری وەها هەبوو لە ریزەکە لادەدا یەکێك لە برادەرەکان دەی هێنامەوە ناو ریزەکە. لەسەر بەستی قوزلوو لەسەر زێیەکە ویستمان هەلاژێین وتیان: ئەبێ بپەڕنەوە ئەوەی مەلە ئەزانێ بە مەلەو ئەوەی تر بە کەڵەك دەی پەڕێنینەوە. چاکم لە یادە دنیا رۆشن بۆوە، من و چەند برادەرێك

ئەشیاکانمان لە شەڕواڵەکەمان گرێداو کردمان بەسەرمانەوەو تفەنگەکانیشمان لە مل کردو چووینە لای سەرەوە خۆماندا بەدەم زێیەکەوە، ئاوەکە تیژ بوو، خێرا بە چەند جولەیەك پەڕینەوە ئەوبەرو لەوێ خۆمان پۆشتە کردەوەو تفەنگەکانمان وشك کردەوەو هەر لەسەر ئەو بەستە خۆماندا بە زەویدا، چاومان نەچووبووە خەو لە پشتەوە درایەنە بەر دەستڕێژێن بەڵام کاتێ ئەمە بوو هەموو هێزەکەمان پەڕیبۆوە بەری گۆپتەپە، ئێمەش وردە تەقە جوابمان دانەوە ئەوانیش زیاتر نەهاتنە پێش، دەست بەجێ فەرمانیاندا بەرەو کانی بۆگەنە بڕۆین باش لە یادم نەماوە لە گۆپتەپە تراکتۆرمان برد یان بەپێ ڕۆیشتین گرنگ گەیشتینە کانی بۆگەنە. لەوێوە زانیاریمان وەرگرت کە هێزێکی زۆری پارتی بارزانی لە گەورەدێ و مەکتەبی سیاسی لەکۆکەو کرژەو گەبەو گولیجەن، ئێمە نیازمان وەها بوو بڕۆینە گەورەدێ نەمان زانی لەوێ شەڕێکی چڕ بووەو کۆمەڵێکی زۆر لە برادەرانی ئێمە لەوێ شەهید کراوەو هێزەکانمان شکاوەتەوە دیوی گەبەو گولیجەز بۆیە پاش وەرگرتنی زانیاری لەسەر شوێنی هێزی خۆمان، بە کانی بیو سەروچاوەی بازیاندا بەرەو گولیجە ڕۆیشتین و چووینە ناو هێزەکانی خۆمانەوە. ئەو سەردەمە ڕەئیس کەمال مفتی لە هێزی قەرەداخ بوو ئەویش خەڵکێکی خۆی هەبوو، مەکتەبی سیاسی بڕیاریدا هەموو هێزەکانمان بڕۆین بەرەو قەرەداخ و لەو ناوە شوێن داگیر بکەین و بکەوینە گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردایەتی بارزانی. سەرەتا ڕوو لەداری کەلی ڕۆیشتین و لەوێوە بۆ گوندەکەی شێخ محەمەد کرم چنە (ئۆمەرامان) پاشان چووینە سەر قۆپی و سەگرمە لەوێشەوە هەتا ڕەشە دێ و ئەو ناوەش ڕۆیشتین پاشان هێزەکانمان هەڵکشاندەوە گوندی تیمارو لەوێ سەقام گیر بووین. مام جەلال لەوێ کۆنفرانسێکی بەست، تێدا باسی ڕاو بۆچوونی م.س و پارتی بارزانی و جیاوازیەکانی کرد. کۆمەڵێك کادری شاریش هاتبوون، من ئەو سەردەمە ئەوەندە لەپێش نەبووم بۆیە بەشداری کۆبوونەوەکە نەبووم و تەنها لە بڵاوکراوەکەی مام جەلالدا خوێندبوومەوە لەژێر ناوی کۆنفرانسی تیمار. لە ناوچەی قەرەداخ بووین دەستەی ئێمە لەسەر کەلی سەگرمە بووین، کە بەیانی (٢٩ )حوزەیران دەرچوو، گوایە برایانی مەکتەبی سیاسی لە ژێرەوە لەگەڵ حکومەت قسەیان کردبوو ئەگەر شتێ بۆ کورد دان پێدا بنێن ئەوە م.س لەگەڵیان ڕێکدەکەوێ، شەوی یەکەم وامان زانی لە بەیانی (٢٩) حوزەیراندا باس لە م.س دەکرێ کەچی خوالێخۆشبوو بارزانی یەکسەر قۆستیەوەو بڕیاریدا شەڕ ڕاگرێ و بکەویتە گفتوگۆ لەگەڵیان.

## بەیانی(٢٩)ی حوزەیران

لەملاشەوە سەرکردایەتی م.س ناچاری پێکدادانێك بوون چونکە هێزەکەمان ئەوەندە نەبوو لە شاخ بتوانین بەرهەڵستی پارتی بارزانی پێ بکەین، بەو قەوارە کەمەیشەوە دوای بانگەوازی (٢٩) حوزیران دەوترا میری لەگەڵ هێزە زۆرەکە دانوستان دەکات، ئەم بارودۆخە نالەبارە م.س راکێشا بۆ پێکهاتنەوەیەکی وەختی ئەویش شەڕ راگرتنی قەبوڵکردو وەفدی خۆی بەجیا نارده لای رژێم.

هەر لەو سالآنەدا چەند جارێ ئاڵوگۆڕ بوو لەڕژێم ئەم دەهاتو ئەو دەڕۆیشت، ئەنجامی شەڕ لە نێوانی حکومەتی عێراقیو بارزانیدا دەستی پێ کردەوە. لادێو شاخ هێزی پێشمەرگەی بارزانی لێ بوو هێزی م.س خۆی فرێ دایە شارەکان، بەتایبەت بەکرەجۆو چەمچەماڵو کەلارو حەسارو هەندێ شوێنی تر، خۆی لە خۆیدا ئەم هەڵوێستەی ئێمە لاواز بوو، بەڕواڵەت ئەوەی بە شاخەوە بوو پێی دەوترا پێشمەرگەو ئەوەی لە شاریش بوو دوو ناوی هەبوو، جەلالیو هەندێکیش ئەیانوت جاشی (٦٦) هەروەها ناویش لەوەی شاخ نرابوو مەلایی لەلای هێزەکانی م.سو دۆستەکانیەوە. واتە شەڕی مەلاییو جەلالی بوو بە یاساو خۆرەیەکی ژەنگاوی بۆ ئاسنو پۆلای کوردایەتی گەندەڵ کرد. سەرکردایەتی بارزانی نەرمی تێدا نەبوو بە هیچ شێوەیەك مەکتەبی سیاسی بە مرۆڤی ماندووی کوردی دانەدەناو هەر بە جاش جاشو هەڕەشەو گوڕەشە بوو لەسەریان، لەم لاشەوە م.س ئەیویست نەرمییەکی زۆر نیشان بداتو خۆی لە شەڕی پارتی بارزانی دوور بگرێ، بەلآم پاڵەپەستۆی هێزەکانی بارزانی مەکتەبی سیاسی بەرەو هەڵەیەکی گەورە بردو لە ساڵی (١٩٦٧) لەگەڵ حکومەتی عێراقی کە هیچ شتێکی نەدابوو بە کورد لە چەند قۆڵێکی جیا جیاوە شەڕی گەورەی هێزەکانی بارزانیان کردو بوون بەهۆی ئەوەی هێزەکانی بارزانی لە ناوچەی سۆران راونێن بۆ سەر سنوورەکان.

## دەڕاسەو زامداری

لە ساڵی (١٩٦٧) هەندێ پێشمەرگەمان هەبوو ئەوسا من مەسئوولیاتی گەورەم هەبوو لە چەمچەماڵ، لەلایەك لە ئیدارەی هێزی رزگاری بووم‌و لەلایەکی تریشەوە ئەندامی لیژنەی ناوچەی هەڵمەتی پارتی بووم زۆرجاریش لە سەردەمێ کە عەبدولا عەسکەری فەرماندەی هێز بوو کاتێ بەملاولادا دەڕۆیشت من دەبوومە جێگری، پاشان عەلی سەلیم بەگ کەلار بوو بە فەرماندەی هێز ئەوساش هەر من لە جێی دەبووم بەملاولا بڕۆیشتایە.

هەندێ پێشمەرگەمان هەبوون خەڵکی گوندی دانە سۆفی بوون، دانە سۆفیش لە چامچەماڵ نزیك بوو ئەوانە دەغڵ‌و دانیان کردبوو کاتی دوورینەوەی بوو داوایان کرد کەرتێ پێشمەرگە بەرین‌و ئەوانە دەراسە دەگرن بە یەك دوو سەعات دەغڵ‌و دانەکەیان دەدورنەوەو دەگەڕێنەوە، منیش نامەم نووسی بۆ بەڕێز کاك عومەر دەبابە ئەوسەر سەرپەرشتی قۆڵێکی هێزەکانی مەکتەبی سیاسی دەکرد لە ساڵەی پردێ، لەوەڵامدا رازی بوو بڕۆم هێز بەرم دەغڵ‌و دانەکە بدورینەوەو بە پەلە بگەڕێینەوە.

بەیانیەك هێزێکی ٣٠-٤٠ پێشمەرگەیی‌و دوو سێ ئوتومبیل‌و دەڕاسەمان بردو چووینە پشتی دانە سۆفی لە دارە گەڕە دامەزراین لەنێوانی تورکەو دانە سۆفیدا دەڕاسە دەستی کرد بە درەوو زۆرمان نەمابوو بگەڕێینەوە هێزەکانی بارزانی هاتنە سەرمانن بەچڕی تەقەیان لێ کردین ئێمەش وەڵاممان دانەوە، شەڕەکە لاوازبوو من گاڵتەم پێ دەهات هەر بە پێوە دەسووڕاینەوە بەسەر برادەرەکاندا، خەرمانێکی گەنمی دووراوە لەوێ بوو چوومە سەر خەرمانەکە بەرزتر بوو زۆر مسەیتر بووم بەسەر شەڕەکەدا، پاشان هاتمە خوارێ دۆڵێك لە پاڵماندا بوو وتم: نەك لەوێوە دزە بکەن چەند برادەرێکمان شەهید بکەن، دۆڵەکەم تاقی کردەوە گوللە گیزەی دەهات بەملاولای سەرمدا، بە هەندم نەزانی، کاتێکم زانی بەسەر شاندا کەوتم بە زەویداو هەڵسامەوە، دەستی راستم نەمابوو هەستم نەکرد بەوەی دەستم بە لەشمەوە ماوە وامزانی لەبندا پەڕیوە. بە هاوڕێکانم وت: دەستم پەڕیوە بۆم هەڵگرنەوە بەڵام برادەرانی تر بزانن کە زامدارم، چونکە ئەترسام بزانن جەبهەکەمان بشکێنن‌و خراپ ترمان بەسەربێ، بۆیە هەڵسامەوەو

دەستی شکاوم لە بندا بۆیان هێنامەوە، پێشەوە دایانە دەستم گرتم بە سنگمەوە خوێنیشم ئەوەندە لێ نەهاتبوو، دەستم کرد بە گۆرانی هەرچەندە من قەت گۆرانیم نەزانیوە هەر وشەیەکم لە شوێنێکا دەهێنا بۆ ئەوەی ورەی هاورێکانم دانەبەزێ، بەزامدار بوونی من مەسەلەکە وەرسووڕا ئەبوو هێزەکەمان پاشەکشە بکات بۆ چەمچەماڵ ئەو سەردەمە بەکر عەبدولکەریم شیودەشانی قائیمقامی چەمچەماڵ بوو ئەویش دۆستو لایەنگری م.س بوو هەرچەندە موەزەفی حکومەت بوو، ئەویش هەندێ پۆلیسی خۆی هێناو هاتبوو لە دوورەوە چاودێری وەزعەکەی دەکردین. ئێمە گەڕاینەوە چەمچەماڵو من برام بۆ کەرکوك بۆ نەخۆشخانەی کۆماری دوو سێ هەفتە مامەوە چەند جاران دەستیان لە گەچ دەگرتم پاش ئەشیعە گرتن ئەیانوت خوارە جارێکی تر دەیان شکاندەوە. کتابیان بۆ کردم بمنێرن بۆ نەخۆشخانەی کۆماری لە بەغدا، سەیارەیەکم بۆ گیرا لەلایەن پارتییەوە، تا لە نەخۆشخان هاتمە دەرێ دەنگم نەکرد، پاشان زۆرم لە سەیارەکە کرد بۆ مالی خۆمان لە ئیمام قاسم بوو، سایەقەکە ملە جاوکەی نەکرد، چونکە پارەی خۆی وەرگرتبوو بردمیە ماڵەوە. ناردم بە دوای پیاوێکی بەساڵا چووی کورد ناوی (مام تۆفیق) بوو، هاتە دیارم وتی: من ئەتوانم چاکت بکەمەوە بەلام مەرجێکم هەیە، وتم: بفەرموو، وتی‌ك هاوار نەکەی ئەتوانم دەستت وەکو خۆی لێ بکەمەوە بەلێنم دایە. دوو پیاوی بانگ کرد هەر یەکە هاتنە لا شانێکەوەو توند توند گرتمیان، ئەویش دەستمی هەڵبڕی هەتا توانی، پاشان بە هێواشی رایکێشا داوای کرد، هێلکەو خامو راستەی کرد، بە کوردی پێی ئەڵێن (تەتە) بۆ شکاو لەم لاو لای شکاویەکەی ئەدەن بۆ ئەوەی سەنتەر وەربگرێو خۆی بگرێتەوە. پاك پاك بە سابوونی رەقی شۆریتیو هێواش هێواش سڕییەوەو دەستی پێدا دەهێنان هەتا باش باش راستی کردەوەو ئەوجا هێلکەکەی شکاندو کردیە سەر پەڕۆ سپییەکەو لە دەستمینا، کە پێی دەوترێ مشەمما، پاشان تەتەی لێداو ئەوجا پێچایو وتی: پاش دوو رۆژی تر دێمەوە مەسینەیەك ئاوت ئەدەمە دەست ئەبێ بە دەستیەوە بگری، قسەو هیمەتی ورەی بەرز کردبوومەوە، بەجێی هێشتم پاش دوو رۆژ هاتەوە مەسینە ئاوەکەی پڕ کردو دەستی لە ملم کردبوو کردیەوەو وتی: بیگرە بە دەستەوە، گرتم دەستم وزەی نەبوو، بەلام هیمەتی ئەو وەهای کرد بیگرم بە دەستمەوەو چەند سانیەیەك بە دەستمەوە بێ، پاشان بە پارچە پەڕۆیەکی سپی

دەستی بە ملمەوە هەڵواسیو وتی: پاش هەفتەیەك دێم بۆت شل دەکەمەوەو هیچ مەترسیت نەبێ دەستت ئەوەندە چاکە لە دوا رۆژدا هەست ناکەی کامیان شکاوە. بەڕاستی وەهایە ئێستا بەو دەستە شکاوەم ئەم یاداشتەم دەنووسمەوە بێ ئەوەی هەست بە ئازار یان کەمو کورتی بکەم، راستە تا سێساڵیش هیچ هێزی نەبوو بەڵام لە دیمەندا کەسێ نازانێ کام دەستم لە کاتی خۆیدا شکاوە، ئەویش ئازایەتی دەگەڕێتەوە بۆ مام تۆفیقی رەحمەتی.

هێزەکانی مەکتەبی سیاسی لە دەوروبەری سلێمانیو کەرکوكو هەولێر کۆکرابوونەوە، بارەگای هێزی رزگاری لە چەمچەماڵەوە گوێزرایەوە بۆ حەساری گەورە لەو کاتانەدا شەڕی بەینی حکومەتو بارزانی گەرم ببوو، برادەرانی ئێمەش بە حوکمی ئەوەی شوێنێکیان نەبوو لە شاخ تا ئازادو سەربەخۆ بن دووچاری هەڵەی جەنگ کردن بوون لەگەڵ بارزانی، بەڵام برادەرانی ئێمە سەربەخۆ لەلایەكو حکومەت لە لایەکی تر، بە هەرحاڵ هەڵەیەکی گەورەو ناخۆش بوو لە مێژووی خەباتماندا دوچارمان بوو، هەرچەندە لە دڵو لە کردەوەدا ئێمە بەدوای دوا رۆژی سەربەرزیو رزگاری کورد دەگەڕاین هەرچەند لە شاردراین، بەڵام دە ئەوەندەی پارتی بارزانی ئەچووین بەگژ ئەمنو ئیستیخباراتو سیاسەتی چەوتی رژێمو لەناو خەڵکا گیانی دژایەتی کردنی شۆڤێنێتی عەرەبمان بەهێزتر دەکردو سوورتر بووین لەسەر درێژەدان بەخەبات.

١

## حەماڵێکی کوردو سندوقە چای

جارێکیان لە مەرکەزی ئیمام قاسم پیاوێکی هەژاری کورد حەماڵ بوو، لە شۆریجەوە سندوقێ چای دەبرد بۆ بەری قۆریە، لەبەر قەڵادا گیراو پۆلیس بردیان بۆ مەرکەزەکە، شەهید عەلی عەسکەری‌و پێشمەرگەکانی پەلاماری مەرکەزەکەیان داو کابرایان دەرهێناو عەرەبانەو سندوقە چایەکەیان دایەوەو هەموو پۆلیسەکانیان کوتا، پۆلیس روحی چووبوو لە دەستە پێشمەرگەکانی مەکتەبی سیاسی.

ساڵی (١٩٦٩) بوو کۆنفرانسێ لە کەلار گیراو پارتی ناوی گۆڕا بە پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان، بەڵام چونکە لە شارو لەپاڵ دوژمندابوو هەر چاك گەشەی نەدەکرد هەرچەندە رۆشنبیرو کوردی رەسەنی خەباتکەر هەیە لەودا کۆببوونەوە کەچی خەڵکی کورد هەر روویان لە شاخ‌و لە پارتی دیمەکراتی کوردستان سەرکرادایەتی بارزانی بوو.

جارێکی تر لەسەر جادەکەی عەرەسە لە نزیکی حەمام عەلی بەگ بنکەمان لەو ناوە بوو، ئێوارەیەك لەگەڵ حەبیب محەمەد تۆپچی کە پێشمەرگەی ناو شاری پارتی شۆڕشگێڕبوو پیاسەمان دەکرد، لەپڕێکا سەیارەیەك زۆر بە توندی هات لەو کاتەشدا منداڵێکی هەشت ساڵە بەغار دەپەڕییەوە، سایەقەکە ئەیتوانی لابدا یان رای بگرێ گوێی پێ نەداو لە منداڵەکەی داو بێ هۆش بوو، ئەیتوانی خێرا هەڵی بگرێ‌و بیبات بۆ نەخۆشخانە، کەچی ویستی رابکا، من‌و حەبیب رێگامان لێ گرت‌و سایەقەکەمان دابەزاند، لەو کاتەدا خەڵکێکی زۆر لە منداڵە بووراوەکە کۆببوونەوە، بردمان دامانە دەست خاوەنی منداڵەکەو قەلەباڵغیەکەمان بەجێ هێشت، چونکە ئەوسا ئێمە پێشمەرگەی ناو شاری کەرکوك بووین‌و شەوو رۆژ لە هەموو کەرکوکدا دەسووڕاینەوە، جۆری ناکۆکیەکە وەها بوو پارتی هەوڵی زۆر ئەدا لەناو شارا دەست لە برادەرانی ئێمە بوەشێنێ‌و ئێمەش بۆ پارێزگاری لە هاوڕێکانمان لە هەموو گەڕەکەکاندا دەسووڕاینەوە، ئەو سەردەمە شەهید فەیزوڵا حاجی محەمەد بەرپرسیاری ئەو کارە بوو.

کاتێ لە خەڵکەکە دوور کەوتینەوە پیاوێکی باڵا بەرزی چوار پەل قەوی هاتە پێش لە من‌و حەبیب وتی: ئەزانن خەتای منداڵەکە بوو، ئێمەش وتمان: ئەگەر

واش بێ ئەبوو سایەقەکە هەڵی گرێو بیبات بۆ دکتۆر، بەڵکو نەمرێو رزگاری بکات، رووی کردە حەبیب، منی بە هیچ نەدەزانی چونکە حەبیب بالای بەرزترو بەخۆوەتر بوو. حەبیب وتی: نەخێر خەتای سایەقەکە بوو کابرا تووڕە بوو کردی بە تورکیو وتی: (باخ باخ بو قوندەرە لارن) تەماشاکە لەم قۆندەرانە، حەبیب پێی وت: خۆت قۆندەرەی، کابرا زللەیەکی بۆ حەبیب راکێشا هەر ئەوەندەی خۆش بوو کۆمەڵێك کەرپوچی لێبوو پارچە پارچە بوو یەك باوەشم هەڵگرت راستو چەپ تێم سرەواند، ئەوەندەم کەرپوچ پیا کێشا نەی پەرژایە سەر حەبیب، چونکە حەبیب سەری دانەواند هەرچی کاغەزو شتی گیرفانی هەیە کەوتە ئەرزو خەریکی کۆکردنەوەی بوو. کابرا ویستی فرسەتی لێ بێنێ، بەلام من وەکو زەردەواڵە پێوەی نووسام شڕمکرد، تا من بەردم هاتە تەواو بوون حەبیب باوەشێکی تری هێنا بە هەردووکمان دامان بە زەویداو بە جادەکەدا روو لە قەرەباڵغییەکە رۆیشتین، خەڵکەکە ئابلۆقەیان داین دیار بوو کابرایان دەناسی، ناچار دەمانچەکانمان دەرهێناو درمان پێدان. هەر سەد مەترێ بنکەکەمان دوور بوو، چووینە بنکە لە موخابەراتەوە تەلەفون کرا داوای منو حەبیب کرا بمان نێرن، برادەران وتیان: لای ئێمە نین، ئەو رۆژە چەند جارێ تەلەفون کرا هەر پشت گوێ خرا، ئاخری شەو کابرای لێدراو دوو سێ زەلامی گەڕەکەکەی بنکەکەمانی ناردبوو داوای ئەوەی دەکرد بیبورین لەوێوە بۆیان باس کردین ئەفسەرەو لەبەشی موخابەراتە، نیاز لە گێڕانەوەی ئەم باسە ئەوەیە کە ئەوسا پارتی شۆڕشگێڕ هیچ حیسابی بۆ ئەمنو ئیستیخباراتو هێزی دوژمن نەدەکرد، لەو سەردەمەشدا حکومەت نەی دەتوانی خەڵکی بگرێو سەرنگومی بکا خێرا خۆمان لێ دەکرد بە خاوەنو ئازادمان دەکرد یان نەمان دەهێشت بگیرێ.

# هەڵەیەکی مێژوویی

ژیان بەم شێوەیە ڕۆیشت، پارتی دیموکراتی کوردستان هێزەکانی لە هەموو لایەکەوە چووبووە نزیکی سنوورەکان، ئەوەبوو لە یانزەی ئازاری (١٩٧٠) حکومەتی عێراقی دانینا بەبەیانی یانزەی ئازار کە لەڕاستیدا دەستکەوتێکی گەلێ مەزن بوو، بۆ یەکەمجار لەژیانی خەبات گێڕانی کورددا، بەوە بارزانی یەکەمی مەیدانەکە دەرچوو، هێزەکانی ئێمە هەڵوەشایەوە، چونکە لەڕاستیدا ئەو بەیانو دەسکەوتە ئەوەی دەهێنا ئێمە ملی بۆ کەچبکەین. ئەگەر راستە ئێمە داوای مافی کورد دەکەین بەیانەکە زۆر دڵخۆشکەر بوو، بۆیە مەکتەبی سیاسی بڕیاریدا هەموو چالاکیەکی سیاسیو عەسکەری خۆی راگرێ بۆ بەدی هێنانو جێبەجێ کردنی بەیانی یازدەی ئازار. هەرچەندە دەستە دەستەش لە هێزەکەمان دەچوونە ناو هێزی پارتی هەرچەندە پارتییەکان زۆر لوت بەرز بوونو هەر بە جاش دوومان دەکەوتن، لەجیاتی ئەوەی کەڵك لەو سەرکەوتنە وەربگرنو باوەشی دڵسۆزی کوردانە بگرنەوەو ببنەوە بە یەكو وەکو برا کەڵك لەو دەرفەتە مێژووییە وەربگرین.

حکومەتی بەعسیان هەروەکو هەمیشە کاریان لەگەڵ ئەواندا بۆ نەبڕاو وردە وردە ئێمەشیان پشت گوێ خست، بارەگای م.س چووە بەغدا لە شەقامی (٥٢) دا جێگیر بوون، کەلارو بەکرەجۆو چەمچەماڵ بوون بە بنکەی دواوە، هێرشی چەماوەر بۆ شارو خۆشیو لوولەی تفەنگ چاوی ئێمە مانانی دەردەهێنا، ژیان لەم شوێنانە ببوو بە قزەڵقورت، منیش بەهۆی ئەوەی پێشمەرگەی ناوشار بووم لە هەرە کەللە رەقەکانی بەربەرەکانی پارتیدابووم، بۆیە دوژمنی شەخسیم بۆ پەیدا بوو، ژیانم لە کەرکوك نەماو هیچ نەوعە سەرمایەیەکیشم نەبوو بچمە پەنا یەك دوکانێ دابنێم. هەتا یەك کلاشینکۆفێکم هەبوو لە ماڵە دۆستێکم دام نابوو، پارتییەکان ئەوەشیان دۆزییەوەو دەستەیەك دایان بەسەر ماڵەکەداو بردیان. بێ چەك بووم زۆر لەخۆم ئەترسام ئێوارەیەك لەسەر شەقامی کۆڕنیش بووم لە کەرکوك، دوو پاسکیل سوار دایان بە تەکماو هەڕەشەیان لێکردم کەدەمکوژن.

# چوونم بۆ بەغداد

بێ چەکی و بێ پارەیی وەهای لێ کردم روو بکەمە بەغدا، لە ئوتێلێکا لە حافز قازی کە زۆربەی برادەرە هەڵهاتووەکانی ئێمە لەوێ دەبوون، منیش لەوێ خۆم جێگیر کرد. هەر چەندە هیچ پارەم نەبوو چوومە مەکتەبی سیاسی، داوام کرد یارمەتی ژیانم بدەن، ئەوسا مامۆستا عولەما لێپرسراوی مالیە بوو، یارمەتی هەموو ئەو پێشمەرگانەیان ئەدا لە دەوری خۆیان بوون و ئیزنیان دابوون بۆ خۆیان کار بدۆزنەوە. چونکە لەو سەردەمەدا فاخیری حەمە ئاغای مێرگە سوور لە نێوانی م.س و پارتیدا بوو بۆ ئەوەی پارتی شۆڕشگێڕ بەیانی خۆ هەڵوەشانەوە دەربکەن و بەرامبەر بەوەش پارتی لێیان خۆش بێ و مەسئولەکانیان تێکەڵاو بە پارتی بکەنەوە و ناکۆکی لەناو بەرن. دیار بوو م.س لەسەر ئەوە رازی بوون بۆیەش پێشمەرگەکانیان ئازاد کرد، بۆیە هەرچی من کردم شتێکی زۆر کەمیان دامێ کە بەشی پارەی خەوی ئوتێلەکەی نەدەکردم ژیانم زۆر دژوار بوو، بەیانیان سەعات یانزە لەخەو هەڵدەستام پاش دەموچاو شۆرین و چاوکرانەوە بەپێ لە حافز قازیەوە ئەرۆیشتم بۆ باب و شەرجی لەوێ لە کوڵانی کۆنە فرۆشەکاندا عارەبانەی دەستگێڕ هەبوون خواردنیان دەفرۆشت، هەرزان هەموو رۆژێ دوو سەمون و دوو کفتەم دەکڕی بە نرخێکی یەکجار زۆر هەرزان لە دەوری پەنجا فلس دا بوو، ئەو ژەمەم دەبوو بەخواردنی یەك رۆژ. ئێوارانیش خواردنم نەدەخوارد پاشان ئەچوومەوە ئوتێلەکەو لەگەڵ راکردووەکانی تردا دەکەوتینەوە گفتوگۆی وەزعەکە و کەوتبووینە پرتە و بۆڵە لە دەست مەکتەبی سیاسی خۆمان.

# گەڕانەوە بۆ کەرکوك

زیاتر لە مانگێ نەمتوانی لەوێ بمێنمەوە، بە دزییەوە دەچوومە کەرکوك و لە ماڵەوە دەرنەدەچووم، هەتا بەیانی هاوبەشی پارتی دیمەکراتی و پارتی شۆڕشگێڕ دەرچوو، ئەوسا ناوی من وەکو ئەندامی ناوچەی چەمچەماڵ خرابووە لیستی تەسلیم کردن بەپارتی، گوایە لەوەودوا من ئەندامی ناوچەم لەناو پارتی کاتی تێکەڵاوبوونەوە.

وردە وردە هاتمە دەرێ چووم بۆ لقی (٣) ئەوسا بارەگاکەیان لە شەقامی کارەبا کۆنەکەی بەری قۆریە بوو، ئەو کاتە یەکێك لە ئێمە بەرپرسیار بوو ناوی کانەبی بوو خەڵکی هەولێر بوو، چووینە لای خۆمان پێ ناساند زۆر ناشیرین پێشوازی کردین، وایکرد بێزمان لە خۆمان بێتەوە، ئێمەش دەم درێژیمان کرد هەندێ قسەمان کرد لە تۆڵەی هەڵوێستی ئەودا، بڕیار بوو مانگی (٥) دینار یارمەتی بدەن بە من، داوام کرد وتی: جارێ نییە. ئەمە لە کاتێکا بوو یارمەتی خۆیان زۆر زۆر زیاد بوو، گەرمەی پەیوەندی بوو لەگەڵ حکومەت، یارمەتی چاك ئەدرایە ناوچەی کوردستان و سەرکردایەتی پارتی. بەهەرحاڵ چەند جارێ هاموشۆم کرد مانگی (٥) دیناریان بە هەزار ناڵی عەلی دوو مانگی تریشم لێ وەرگرتن.

## شەهید یاسین ئەنوەرو بیروباوەڕ گۆڕینەوە

ساڵی (١٩٧١) بوو لە ڕێگای یاسین ئەنوەر کە قوتابیەکی زۆر وشیاری کورد بوو لە کولیەی ئادابی بەغدا چەند جارێ چووم بۆ ناو کولییەی ئاداب، هەندێ لاوی وشیارم دەبینی بیری (م.ل) یان بڵاودەکردەوەو ئەتوت کورەی هەنگ هاتبوونە جۆش و خرۆش، لەگەڵ کۆمەڵێکیان دۆستایەتی چاکم پەیدا کرد، سەفەرێك دوانیش چووین بۆ سەفارەتی چینی لە بەغدا بۆ هێنانی کتابەکانی (ماوتسی تۆنگ) وردە وردە زۆربەی نامیلکەکانی ماوتسی تۆنگ و بڵاوکراوەی چینیمان دەست کەوت کە زۆربەی ئەوانەمان دەویست باسی لە شەڕی ڕزگاری نیشتمانی دەکرد بە تایبەت وتەکانی (ماو) خۆی.

ئەم هەڵسووکەوتەم لەگەڵ لاوان و قوتابیانی زانکۆ بوو بەهۆی ئەوەی بەدوای خوێندنەوەی چاکدا بگەڕێم، هەموو ڕۆژێ ئەچوومە کتێبخانەی ئاسۆ لە شەقامی شۆڕش بوو، ڕۆژنامەی کوردی هاوکاری، برایەتی دەردەچوون پێشووتریش ڕزگاری گۆڤاری پارتی شۆڕشگێڕ لەسلێمانی دەردەچوو، بابەتی فکری چاکی تێدابوو، هەمووم کۆکردبۆوە. هەروەها گۆڤاری (هەدەف)ی فەلەستین و نوسراوەکانی منیر شەفیق دەکڕی ئەگەرچی من وەزعی مالیەم لەخوار سفرەوە بوو بەڵام ئەگەر لەماڵەوە پەنجا فلسیان بدامایە دەمدایە نووسراو و ڕۆژنامەی کوردی و کتێبی کوردی و گۆڤاری کوردی هەرچی دەربچوایە باش یان خراپ دەم کڕین. مەکتەبەیەکی چاکم بۆ خۆم پێکەوە نابوو، شەو و ڕۆژ شتم دەخوێندەوە، دۆستایەتی قوتابیان بە تایبەت یاسین ئەنوەرو دکتۆر ئەنیس شاکرو مامۆستا عەزیز وەهایان کردبوو بە بەردەوامی بڕۆمە لای خەڵکی ترو هەوڵبدەم بکەوینە گفتوگۆ دوان لەوەزعەکە، هەستم دەکرد لەڕووی فیکرییەوە شتم پێیە. زۆر بەداخەوە زۆری نەخایاند یاسین ئەنوەر لە گەشتێکی بە کۆمەڵی قوتابیانی زانکۆدا شەهیدبوو بە بەریەککەوتنی دوو ئوتومبیل، ئەوەش وەهای کرد پێم لە سەردانی زانکۆی بەغدا ببڕێ، بەڵام پێش لە شەهید بوونە یاسین سەفەرێك بەیەکەوە چووینە بەلەدیاتی کەرکوك لەوێ کارمەندێکی پێ ناسیاندم ناوی فەرەیدون عەبدولقادر بوو ئەویش بیروباوەڕی پێشکەوتووانەی هەبوو، دیاربوو پێشوو تریش لە پارتی

شۆڕشـگێڕا ئەنـدام بـووە، هێشـتا لەگـەڵ فەرەیـدون لـە یـەكتری ئاشـكرا نـەبووین بەوەی كە ڕێكخراوێكی سیاسی نهێنـی هەیە جگە لـە هـەردوو پـارتی، بۆیـە ئـازاد بـووم لەهـەر شـوێنێكا چـۆن قسـەم دەكـرد بـەپێی بۆچـوونی زاتـی خـۆم. لـە سـاڵی (١٩٧٢)دا بـوو سـدیق ئەفەنـدی لێپرسـراوی لقـی سـێ بـوو لـەژێر خـانی بارەگـای پارتی كە لە تەنیشتی بینای شكور نەجارەوەیە لـە كەركوك نەدوەیـەكی كـرد تێیـدا لەسەر بارودۆخەكە بەسـەرو گـوێ دۆسـتایەتی خۆیـان و عێراقیـان هەڵئـەدا. منـیش دەستم هەڵبڕی و هەنـدێ ڕەدی قسـەكانیم دایـەوەو ئیشـارەتم بـە دەوری درۆزنانـەی ئینگلیـزدا لــە ســەردەمی فــەرمانڕەوای شــێخ مــەحمودی نــەمردا لــە ئەنجامــدا تەقاندمـەوەو وتم: عێـراق درۆ دەكـا و مەسـەلەی كـورد جێبـەجێ ناكـا و ڕۆژانـەش خەڵكانی تێكۆشەر سەرنگون دەكا، خێرا بەگژمدا هاتـەوەو وتـی: ئـەوە ڕای خۆتـە كەسمان لێرە ڕامان وەها نیە. كۆمەڵێك لەو كادرە كۆنانەی پارتی شۆڕشـگێڕ لـەوێ بوون قسەكانی منیـان زۆر بەڕاسـت دەزانـی لایـەنگرم بـوون، بـەڵام نـەدەكرا بـە گەڵـە كۆمەكی هەڵسن بۆیـە كـاتێ كۆبوونەوەكـە تـەواو بـوو زۆریـان دەسـتیان كـردە ملـم و سوپاسیان كردم. یەكێك لەوانە حاكم محەمەد ناوێك بوو خـەڵكی ئیمـام قاسـم بـوو تا ئەو كاتە یەكتریمان نەدەناسی، هات ئەملاولای ماچ كردم و وتـی: بەڕاسـتی چـاو نەترسی لەبەردەمی دوو دەسەڵاتی گەورەدا ئەوها بەڕوونی دواڕۆژت باسكرد.

ئێمە لە ماڵی ئیحسان نەجم زۆربەی كادرەكـانی پـارتی شۆڕشـگێڕ كۆبووینـەوە، قسە لەسەر دواڕۆژی ئەنـدامان و كـادرانی پـارتی شۆڕشـگێڕ بكـەین. چـونكە پـارتی دیمـوكرات زۆر خـراپ ڕەفتاریـان لەگـەڵ دەكـردین و بـە سـووك سـەیریان دەكـردین، هەتا ڕۆژێك لەبەر دەرگای بارەگاكەیان لە ئیحسان نەجمیان دابوو.

زیاتر لە ١٨ كادری وشیار كۆبووینەوە قسـەی زۆرمـان كـرد، بـەڵام نـەمان تـوانی بڕیـارێ بـدەین كـە چـی بكـەین، چـەند جـاری تـریش هەوڵمانـدا دوو دوو سـێ سـێ یەكمان دەبینی بەڵام ئەنجام هیچ نەكرا.

# راکردنم لەکەرکوك لەدەست ئەمن

من سەبارەت بەوەی پێشمەرگەی کاتی بە دەسەڵاتی پارتی شۆڕشگێر بووم، دۆستی زۆرم لە شاردا هەبوو بەڵام دوژمنی زۆریشم بۆ پەیدا ببوو، لەوانە ئەندامانی پارتی هەموویان رقیان لێم دەبۆوە، ئەمن و ئیستیخباراتیش چاکیان دەناسیم هەڵیان گرتبوو بۆ رۆژی خۆی.

لە دەوروبەری نیسانی ١٩٧٤دا بوو کۆمەڵێك کادر لە پارتی شۆڕشگێر کەوتبوونە لای حکومەت لە ئەنجامی رافتاری خراپی پارتیو هەموو کەوتبوون بەرقا، رێکخراوێکیان بە ئاگاداری حکومەت دروست کردبوو لەژێر ناوی کۆمەڵێك لە کادری کۆنی پارتی شۆڕشگێڕ، (مجموعە من لفیف من کادر حزب الثوري الکردستانی) من لە بەغدا لە ماتۆڕێکی ئاو کارم دەکرد، زۆر دەهاتو ئەیویست رام کێشێ بۆ ناو لەفیف، بەڕاستی منیش ئەوەم بە دەستی حکومەتی عێراقی دەزانیو زۆریشم پێ ناخۆش بوو کە هاتوچۆم بکات. زۆرجار لەسەر ئیشەکەمەوە ئەڕۆیشتم بۆ نان کڕین، سودفە تووشی (.......) دەبووم سەیارەکەی رادەگرتو ئەیویست بمگەیەنێ‌ن خۆم لێلا ئەداو هەندێ جار قسەی رەقم دەکرد مەسەلەن جارێکیان وتم: من سواری سەیارەیەك نابم ئەمن خاوەنی بێ، لەوەش توند تر وتم: ئێوە حکومەت ئەتان ژێێنێو دروستیکردوون ئەگینا تۆ سەیارەت لەکوێ بوو، پێش ماوەیەك نان نەبوو بیخۆی، بەڵام ئەو هەر لێی قبوڵدەکردم لە پێناوی ئەوەی رام کێشێ. ئەیزانی بەڕاکێشانی من خەڵکێکی تریش هەن دێنە لامان، نێوانمان خراپ بوو من هەر توند قسەم دەکرد ئەویش هەر نەرم بوو، ئەنجام هەستمکرد ئەمن لەسەر کارەکەم چاودێریم دەکات، منیش مەترسیم هەبوو چونکە خەریکی ئیش‌وکاری کۆمەڵەی مارکس- لینینی- کوردستان بووم. لەگەڵ فەرەیدون لێك ئاشکرا بووینو ئەو مەسئولی کۆمەڵەبوو لە کەرکوكو منو شەهید عەبدولرەزاق محەمەد کەخۆم رامکێشابوو بۆ کۆمەڵەو، ئیحسان نەجم ببووین بە کۆمیتەی شاری کەرکوك، بۆ رێکخستنی کۆمەڵەو هەر خەریکی خوێندنەوە بووین. زیاتر سەرچاوە (م.ل) کانمان دەخوێندەوە، بۆیە ئەترسام لەڕێی منەوە زیان بە کۆمەڵە بگات، لەو رۆژانەدا خۆم خەریك کردبوو هاموشۆی خەڵکم نەدەکرد، وەکو جاران کتێبو شت تەنها رۆژنامەی هاوکاریم دەبرد بۆ سەر کار.

ئێوارەیەك هەستم دەكرد ئەمنەكان جێم ناهێڵن، لەو ناوە پاسی هاتووچۆ هەبوو ئەڕۆیشت بۆ تەپەی مەلا عەبدولاّ، چوومە لێواری جادەكە ئەمنەكانیش هەر ئەیانڕوانی، پاسەكە كەوتەڕێ و خۆم فڕێ دایە ناوی، دیار بوو ئەوان بەوەیان نەدەزانی بەدوامدا نەهاتن. شەو لە مەكتەبەی ئاسۆ ڕۆژنامەیەكم كڕی و ڕۆیشتم بۆلای ئیحسان نەجم مەسەلەكەی بۆ باس بكەم، پێش چوونە ماڵی ئیحسان دوو ئەمن لەلای تەكییەی شێخ جامی تووشم بوون، لەم بەروبەری جادەكە بوون وتیان: لە كوێی ئێمە لە ئاسمان بۆت دەگەڕێین تۆ لە ئەرزی.؟ دوورو نزیك بە دووممدا هاتن ئەترسان لەوەی من دەمانچەم لابێ، شوێنەكەش چۆڵی بوو هەرچۆنێ بوو خۆم كردە كۆڵانەكانی سەید سەروەرەو لەوێوە چوومە بەر تەكێ و پاشان هاتمەوە بۆ قەڵا ئەوسا ماڵمان لە قەڵابوو، سبەی زوو ئاگاداری فەرەیدونم كرد لەزاتیەی بەلەدیات بوو كاتی خۆشی ئەو دایمەزراندبووم لە مەكینەی ئاو لە بەلدیەی ئاوەكەی خاسەی یاروەلی و پاشان بەهەوڵی ئەویش نەقل كرامەوە بۆ ڕێگای بەغدا، فلكەی نازم تەبەقچەلی. ئەویش جارێكی تر هەوڵی بۆدام نەقلی چەمچەماڵی كردم بۆ ئەوەی لەوێوە دەست بهام بۆ لادێكان و كاری ڕێكخستنی كۆمەڵە فراوانتر بكەین، كتابی نەقڵكەیان دامێ بە دوو سێ ڕۆژ، من خۆم دەرنەدەخست هەرچۆنێ بوو لە كەركوك خۆم ڕزگار كردو چوومە چەمچەماڵ، بەلاّم لەوێش دووچاری بەلاّیەكی تر بووم.ئەوسا مودیری بەلەدیەی چەمچەماڵ نوێنەری پارتی بوو، ناوی (....) بوو چوومە لای وتم: من بڕیاری گرتنم دەرچووەو من ئەندامی لیژنەی ناوچەم بەپێی بەڵگەی تێكەڵاو بوونەوەی هەردوولا. زۆر ڕەق جوابی دامەوەو وتی: كێ دەڵێ تۆ پارتی، ئێمە ئەندامێكی پارتی لە جێگاكەت دادەنێین ئەگەر لە (٢٤) سەعاتدا نامەی لقی سێی پارتی نەهێنی. ئەوساش لقی سێ لە سەنگاو بوو، زۆرم قسە لەگەڵ كرد وتم: مەعقولە لەوێ ئەمن ڕاوم بنێ و لە كوردستانیش تۆ هەڕەشەی وەرنەگرتنم لێ بكەیت، وتی: هەر ئەوەیە، بۆیە بە پەلە سواری پیكابی ڕێگای سەنگاو بووم خێرا چوومە لای ڕەحمەتی ڕەسول مامەندو نورەدین عەبدولڕەحمان كە لە ژێرەوە لە ڕێكخستنی كۆمەڵە بوون پێم وتن: ئەوە مەسەلەكەمە، خێرا نامەكەیان دامێ و وتیان: فریا بكەوە ئەگینا لێت بە بیانوون خەڵكی تر دادەنێن، گەڕامەوەو هەر ئەو ڕۆژە لە بەردەمی بارەگای پارتی بوو نامەكەم دایە ناچار بوو وتی: باشە سبەی وەرە دەوام بكە بەلاّم دیار بوو زۆر بە ڕقەوە لێی وەرگرتم.

# ژیانم لەشاری چەمچەماڵ

هەر ئەوەندە دامەزرام لەچەمچەماڵ خانوویەکی چۆڵم گرت بە کرێ و هەندێ کتابم هێناو دەستم کرد بە خوێندنەوەو، دەچوومە ناو خەڵکی بۆ دروست کردنی بنکەی ڕێکخستنی کۆمەڵە، لە ژێرەوەو لەولاشەوە زەختم لە پارتی دەکرد خێرا ڕێکم بخەن لەناوچە، بەڵام ئەوان بڕیاری خۆیان زوو دابوو بە هیچ شێوەیەك نەیان هێشت بڕۆمە ناوچەو لە شانەیەکی سەرەکیدا دایان نام و منداڵێکیان کردبوو بە لێپرسراوم کە هیچ شتێکە نەدەزانی. من لەهەموو کۆبوونەوەیەکدا کۆمەڵێك پرسیارم لێ دەکرد هیچی وەڵام نەدەدایەوە، هەمووی بەرێ دەکرد بۆ ناوچە، ناوچە تێگەیشتن منم، دەیان نووسی بائەو برادەرە بێت لە ناوچە بۆمان شەرح بکات نیاز لەو پرسیارانە چییە؟

چوومە ڕێکخراوی لاوانی دیموکراتی کوردستانەوە هەروەها چوومە نقابەی کرێکارانی چەمچەماڵ و لەگەڵ کۆمەڵەی هونەرو وێژەی کوردی دەستەی چەمچەماڵ بەشداریم کرد، خولاسە ببووم بە ئاشی چوار پارچەو هەمووشی بۆ ئەوە بوو باشتر بڕۆمە ناو خەڵکی و خەڵك ڕاکێشم بۆ کۆمەڵەو شانە شانەیان بکەم و لە حەڵقەی ڕۆشنبیرییەوە دەس پێ بکەم کە هەروەهاشم کردو سەرکەوتنی چاکم تێدا بەدەست هێنا. لە غاباتەکەی چەمچەماڵ ژمارەیەکی چاکمان کرێکار ڕێك خست لە ڕێی جوانەمەرگ کوردە محەمەد ئەفەندییەوە. (هەڵگورد) لە لاوانیشدا بۆ کۆنفرانسی یەکێتی لاوانی کوردستان کە لە هەولێر بەسترا بە سەرپەرشتی شەهیدی نەمر مامۆستا ساڵح یوسفی بە هەڵبژاردن ناوچەی چەمچەماڵ من بووم بە نوێنەری کۆنگریس لە ساڵی (١٩٧٤)دا.

لە کۆمەڵەی هونەرو وێژەش هەندێ لاومان لە خۆمان نزیك کردەوە لە هەموو بوارەکاندا دۆستمان بۆ کۆمەڵە پەیداکرد، سەرەڕای ئەوەی هەندێ لە کادرەکانی پارتی کە لە لادێکاندا بوون و بۆ کۆبوونەوە دەهاتن بۆ ناوچەی پارتی دەمگرتن و ئەم بردنە لای خۆم کتابم ئەدانێ و دەم خستنە بەردەمی پرسیارو وەڵامێکی زۆر. هەندێ لەوانەش بە کەڵکمان دەهاتن بۆ ئەوەی نەکەوینە ژێر چاودێری پارتی و هەندێکیشیانمان ڕێکخستن لە کۆمەڵەدا، لەوەش باشتر لە ناوچەی سەنگاو لە

سورداش‌و له بازیان‌و لـه قـه‌ڵا سێوکه شانه‌ی ڕێکخستنی کۆمه‌ڵـه‌مان دامه‌زراندو هه‌مووی په‌یوه‌ندیان به خۆمه‌وه هه‌بوو.

به ڕۆژیش له مه‌کینه‌ی کاره‌باکه‌ی چه‌مچه‌ماڵ ده‌وامم ده‌کرد به‌ڵام سێ وه‌خت‌و چوار بـه‌ش بـووین لـه ٨ بـه‌یانی بـۆ ٤ ئێـواره لـه ٤ بـۆ ١٢ شـه‌و لـه ١٢ شـه‌و بـۆ ٨ به‌یانی وه‌هامان ڕێکخستبوو که ئه‌گه‌ر یه‌کێك کاری هـه‌بوو بـۆ هه‌شت سـه‌عاته‌که‌ی ئامـاده نـه‌بوو دائیـره ئاگـادار نه‌کـه‌ین‌و ئـه‌و بـراده‌ره‌ش له‌وێیـه خـۆی کاره‌کـه هه‌ڵسوڕێنێ، بـۆ کـاری کۆمه‌ڵـه‌ش بـه نهێنـی ئه‌چوومه‌وه بـۆ کۆبوونـه‌وه‌و هـه‌ر ئـه‌و ڕۆژه‌ش ده‌گه‌ڕامه‌وه بۆ چه‌مچه‌ماڵ، به‌م شێوه‌یه کارمـان ده‌کرد، کاتـێ چووین بـۆ کۆنگریسی لاوان‌و گه‌ڕاینه‌وه چه‌مچه‌ماڵ، زۆری نه‌خایاند شه‌ڕ ده‌ستی پێکرده‌وه‌و ئه‌وسـا کتێبـه‌کانم لـه‌کوڵم گرێـداو بـه‌ره‌و گونـدی عه‌سـکه‌ر که‌وتمـه‌ڕێ. هـه‌ر لـه‌و سه‌رده‌مانه‌شـدا بـوو یـه‌کێتی قوتابیـان له‌گونده‌کانـدا ده‌گـه‌ڕان‌و کاریـان له‌گـه‌ڵ جوتیاران ده‌کرد، به‌رنامه‌یه‌ك بـوو یـه‌کێتی قوتابیـانی گشـتی پێـی هه‌ڵده‌ستا. لـه‌و بواره‌شـدا براده‌رانـی کۆمه‌ڵـه‌ی تـێ خزابـوو زۆریشـیان ده‌وری لێپرسـراویان پـێ سـپێردرابوو، ئـه‌وه‌ی لـه دێهاتـدا له‌گـه‌ڵ جوتیـار ده‌کـرا زۆربـه‌ی بیروباوه‌ڕه‌کـانی کۆمه‌ڵه‌بوو جێبه‌جێ ده‌کرا. یه‌کێك له‌و قوتابییه ژیرانه شه‌هید ئازاد هـه‌ورامی بـوو، پێش ئه‌وه‌ی چه‌مچه‌ماڵ به‌جێ بهێڵم هاته لام وتی: ئه‌ڕۆم بۆ ناوچه‌ی قه‌ڵاسێوکه له‌وێ چیبکه‌م ناوی نهێنـی خۆشـی لـه‌ڕێکخراوی که‌رکوکـه‌وه بـۆ هێنـابووم، منـیش هه‌ندێ هاوڕێی ئه‌و ناوه‌م بۆ ده‌ستنیشان کردو ناوی هه‌ندێ ماڵی خزم‌و براده‌ری تایبه‌تیشـم دایـه، بـۆ کـاتی پێویسـت. کاتـێ شـه‌ڕ ده‌سـتی پێکـرده‌وه‌و ئێمـه چه‌مچه‌ماڵمان به‌جێ هێشت که چوومه گونـدی دایك‌و بـاوکم، ڕوانیم شه‌هید ئازاد تـۆوێکی چاکی چاندووه‌و لاوێکی زۆری گونده‌کـه‌مانی لـه‌خۆی کۆکردۆته‌وه، ئه‌و کاتانـه‌ش تـه‌نها کـادری جوتیـاری ئێمـه شـه‌هید عـه‌لی مه‌جیـده جـاف بـوو، پاشـان خۆشم که‌وتمه ئه‌و ناوه‌و دوا به‌دوای ئه‌وه ئه‌مین که‌ریم (شێرکوش) هاته ئه‌و ناوه. له‌وێ لیژنه‌یه‌کی سێ که‌سیمان دروستکرد بـۆ کـاری کۆمه‌ڵـه‌و ئـه‌و هاوڕێیانـه‌ی لـه قوتابیانیش بوون کۆمـان کردنـه‌وه لـه‌ده‌وری خۆمـان‌و، له‌خانووه‌کـه‌ی مـاڵی ئێمـه‌دا دانیشتین‌و به نهێنی کارمان بۆ کۆمه‌ڵه ده‌کرد، بـه‌ڵام بـاری ئابووریمـان خـراپ بـوو. بۆیـه مـن چـووم بـۆ چـۆمان لـه‌وێ وه‌زاره‌تـی به‌له‌دیـه هـه‌بوو نیـوه یارمـه‌تی ئـه‌دا، ناوه‌که‌ی خۆمداو پـاش شـه‌وو ڕۆژێ چاوه‌ڕوانی نامـه‌ی وه‌رگرتنـی نیـوه یارمـه‌تیم

وەرگـرتو ئـەوەبوو بـە سەرچـاوەيەك بـۆ ئـەوەى هـەر سـىَ لامـان بـە تايبـەت منو شـەهيد ئـازاد پێـى بـژين. وردە وردە كـارى ڕێكخسـتنمان جولاّنـدەوەو ئەچـووينە سەر جوتو درەوو زەرعاتو هاوكارى خۆڕايى خـەڵكمان دەكـرد لـە سـەربان سـواغ دانو قوڕكارىو لە كاتى نەخۆشىو سەرهێشاندا سـەرمان بـەلاى هـەموو كەسـێكدا دەكردو هەوڵمان ئەدا دەواو دەرمانى بۆ پەيدا بكەين، كارێكى ئەوەندە دڵسـۆزانەو نەترسانەمان دەكرد گوندى عەسكەر ببوو بە بنكەيـەكى بـەهێز بـۆ كۆمەڵـە. چـونكە زۆر تێكـەڵاوى خەڵكەكـە ببـووين هـەموو بەيانيـەك كـە لەخـەو هەڵدەسـتاين دوو پەنجەرەمان هەبوو شووشـەيان پێـوە نـەبوو، بـەيانيان جوتيارەكـان ماسـت، هێلكـە، ژەمە كەرە، تەماتە، هەنجير، هەنار ئەو شتانەيان لەپەنجەرەكاندا دادەنا بـىَ ئـەوەى بـزانين كـىَ داينـاوە. كاتـىَ بـۆ قاپـەكان دەهاتنـەوە دەمـانزانى كـىَ هێنـاويەتى، لـە بارەگاى بەتاليۆنەكانى پارتيشدا خەڵكى بەدەسەلاّتمان هـەبوو لـەكاتى هاتوچـۆ لـە ناوچەيەك بۆ ناوچـەيەكى تـر پسـوڵەى ڕێگامـان بـە مـۆرى بـەتاليۆن دروسـتدەكرد بەبىَ ئەوەى بزانن چۆن كراوە. لـە بـەتاليۆنى (٥) كـە شـەهيد نـازم حەمـەى سـلێمان فەرماندەى بوو، شەهيد عەلى مەجيد لە بارەگاكە بە دۆستايەتى وەرەقەى دەهێنـا تـا عەريف تالـب مۆرياسـى بـوو بـە جێگـرى بـەتاليۆن، ئـەوسا ڕێكخـراوى كۆمەڵـە نـاوە نهێنييەكەيان دامـىَو پەيوەنـديم پێـوە كـردو لـەوەولا فيشـەكو وەرەقـەو پێويسـتى وردەمـان ئاسـان بـۆ جێبـەجىَ دەبـوو. شـەهيدان عـەلى حسـێن (شـوان) ئەحمـەد عەسكەرىو (صادق بەهادين) خـەڵكى بەغـدا بـوو، كۆمـەڵێكى زۆر لـەناو قوتابيـانو لاواندا هاوكارى چاكيان دەكردين، يـەكێك لەوانـە شـەهيد نـەجم عـەزيز كـەركوكىو محەمەد عەزيز، كە ئێستا حاكمەو بورهان كەركوكىو مامۆستا عەبدوڵا عەبدولقادر برازاى شـەهيد عـەلى عەسـكەرى، بەهـەمووومان ناوچـەى قەلاّسـێوكەمان جولاّنـدبوو، بيروباوەڕى كۆمەڵە لەناو پێشمەرگەو لەناو جوتياراندا ڕەنگى دابۆوە.

من كرام بـە نوێنـەر لـە بـەينى سـەركردايەتى كۆمەڵـەو ڕێكخـراوى كـەركوك، كـە ئەوسا ئيحسـان نـەجم (ابـو شـهاب) بەرپرسـيارى بـوو ئـەبوو هـەواڵى بدەمـەوە بـە سـەروو وەلاّمـى سـەرووش بدەمـەوە بـە شـار، جگـە لـەوەش لـە گونـدى تۆمـار هاوڕێيەكمان هەبوو بەناوى (مەلا ناسيح مەجيد) جوتيـارێكى زۆر كارامـە بـوو لـەو كاتانەدا تاريق ئەحمەد فەوجێكى مغاويرى بۆ كرابۆوە لەلايەن حكومەتى عێراقەوە هـەموو ڕۆژىَ پـەلامارى دەوروبـەرى كـەركوكى ئـەدا، بـە تايبـەت نـاو شـوان بـۆ خـۆ

رزگارکردن لەدەست هێرشی جەیش و جاش هاوڕێ ناسیح لەناو چەمەکەی بەرەو مالآنی تۆماردا کونی هەڵکەندبوو سەری بەدرك و دالّ گرتبوو لە کاتێکا جەیش و جاش بڕۆیشتنایە سەری هەستیان نەدەکرد یان ئاگریشیان لە کۆمەڵە توتڕکەکە بەربدابایە سەربانەکەی ئەوەندە ئەستوور کردبوو لە ناوەوە دەپارێزرا. کەواتە لە کاتی سەردانم بۆ تۆمار ئەو ڕۆژەی دەگەیشتم ئەبوو شەو بێ خۆ ئێواران بوایە چاکتر بوو کاتێ لەوێ دەگەڕامەوە هەر ئەبوو دوای نیوەڕوان بێ، چونکە بە دەست ئەو فەوجەی تاریق ئەحمەدەوە ناوچەکە وەزعی هەمیشە لە مەترسیدا بوو، پاش تۆمار ئەبوو بڕۆم بۆ گوندی تۆپ زاوا لەوێش حەمید محەمەدی لێ بوو لەگەڵ عەلی مغاویر کە هەردووکیان دوو هاوڕێی کۆمەڵەبوون. هەر لەڕێی ئەوانەوە نامەکان دەگەی بە ئیحسان نەجم یان دەم نارد ئیحسان خۆی دەهات لەوێ رامان لەسەر شتەکان دەگۆڕیەوە.

# سەردانی ڕێکخستنی گەرمیان

لە سەردانەکانمدا زۆرجار دووچاری پەلامارەکانی جاش‌و سەرباز دەبووم، یەکێك لە جارەکان ماڵ‌و منداڵی کاکە عەبدوڵام هاتبوون بۆلام لە شارەوە، جگە لەوە ماڵ‌و منداڵی عومەری برازاشم‌و عومەریشم لەگەڵ بوو لە تۆمار لە سەربانی ماڵی مەلا ناسیح خەوتبووین. بەیانی هێشتا هەتاو هەڵنەهاتبوو، سەربازو جاش هاتنە سەرمان من‌و عومەری ڕەحمەتی‌و عەلی مغاویرو ناسیح لە سەربانەکەوە خۆمان هەڵدا بۆ ناو ئاشەکە ڕۆیشتین لەوێ باراش هاڕەکە زۆری لێ بوو قەلەباڵغیان کرد بە دۆشکا تەقەیان لە دەوروبەری ئاشەکە دەکردو جاش‌و سەرباز ئەیانویست ئابڵوقەی گوندەکە بدەن،بۆ ئەوەی کەس دەرباز نەبێ. من‌و ناسیح‌و عەلی بەرەو گوندی قەفار رامان کردو بەپاڵ گردۆڵکەکەی پشتی ئاشەکە کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی گوندی تۆمارو لە پەڕی گوندەکەوە بوو، هەر ئەمەندەمان خۆش بوو دەرکەوتین ئەتوانم بڵێم هەزار فیشەکی هەمەجۆر لە سانیەیەکدا بۆمان هاتووە، سەدجار دایانین بە ئەرزاو هەڵسانیەوەو رامان دەکردەوە، ئەوەندە خستیانین‌و هەڵسانیەوە لەشمان فێری جمناستیك ببوو. هەرچۆنێ بوو زامدار نەبووین‌و لەژێر ڕەحمەتی گوللەی جاش‌و سەرباز بزر بووین، نەوەستاین بەرەو هەیبەوساتی ڕۆیشتین لەوێش ڕوو لە نزیکی جەبەل بۆر لەو هەڵەتانەدا خۆمان مەڵاسداو چاودێری گەردەلوولی سەیارەی فەوجەکەی تاریق ئەحمەدمان دەکرد، زۆر ماندوو بووین کاتێ لە چەمە وشکەکەی خاسە پەڕینەوە لەپشتی سوورە دێی سەروو، کەپرێکی بێستانەوانی لێبوو چووینە بن کەپرەکە، لەوێ لاوێك لەهۆش خۆی چوو بوو من قەت بەرچاوم نەکەوتبوو، بەڵام دەستم برد هەڵی سێنمەوە کاتێ چەپکێ لەوتەکانی ماوتسی تونگی لە باخەڵدا بوو، زانیم ئەمە هەر کەسێ بێ هاوڕێی ئێمەیە لەو ناوەش تەنها زامن ناوێکمان هەبوو خەڵکی سوورە دێ بوو، هەندێ ئاومان پێدا کرد وشیار بۆوە لێم پرسی تۆ زامنی ئەویش یەکسەر وتی: ئەی تۆ کاك عەلی.؟ لە یەکتری ئاشکرا بووین ئەویشمان لەگەڵ خۆمان برد بۆ هەڵەتەکان لەبەرزێکەوە چاودێری ناوچەکەمان کرد. کاتی پێش ڕۆژئاوا بوون بوو، فەوجەکە ملیان شکاند گەڕانەوە بۆ ناو کەرکوك‌و ئێمەش چووینە سوورەدێ لە ماڵێکی

خزمی زامن چایەکیان داینیَو بەرێ کەوتینەوە بۆ تۆمار. کاتێ چووینەوە ماڵی مەلا ناسیح هەواڵی عومەری برازام پرسی وتیان: بێ سەرو شوێنە، زۆر مەترسیم پەیدا کرد بۆیە لەگەڵ هەندێ دۆستی ماڵی مەلا ناسیح دا کەوتینە شەوکێڵ هەموو چەمو پەناکان گەڕاین بەرەو ژوور هەتا عەلی موساکان لە خواریشەوە تا کۆتایی دار بیەکانی تۆمار لەولاشەوە خەڵکمان نارد بۆ گورگانو هەڵەتەکانی پشتەوە، هەرچی کرا کردمان سۆراغمان دەست نەکەوت. بەیانی ماڵو منداڵی کاکەم بەرێ کردەوە بۆ کەرکوكو ماڵو منداڵی عومەریشم هێنایەوە بۆ عەسکەر. کاتێ چووینەوە عەسکەر عومەر گەیشتبووە ئەوێ ئاهێکمان بەبەردا هاتەوە.

# سەردانی گەلاڵەو چۆمان

هێشتا کاکە عەبدولڕەحمانم کۆچی نەکردبوو، ڕۆژێك هاتە لامو زۆری گلەیی لێکردمو وتی: مـن لەسەر شۆڕش ئاوارە بووم، ئەوە دوو کوڕیشم پێشمەرگەن، باشە بۆچی وەها ناکەی نیوە معاشم بۆ سەرف بکەن، قسەکەی لەجێگای خۆیدابوو بۆیە بەڵێنمدا سەفەرێکی سەرەوە بکەمو هەوڵێکی جدی بۆ بدەم. بە کاری کۆمەڵە چووم بۆ پێنجوینو لەولاوە هاتمەوە چوارتاو پاشان بە دۆڵی سەفرەو زەرووندا لەگەڵ کۆمەڵێك سەربازی فێراردا بەرەو گەناو بەڕێ کەوتین. بە هەورازەکەی گەناودا چووینە زوودان لەوێوە بۆ گوندی گەشو سەوزی هێرۆ، پاشان بە بیکلودا چووینەوە دارەشمانەکەی مەلا ئەحمەدی دارەشمانەو لەوێوە بۆ گوندی هەڵشۆو لەوێوە هەڵگەڕاینەوە بۆ گوندی بێگەلاس کاتێ چووینە ئەوێ نزیکی ڕۆژئاوا بوون بوو، ئەوساش خەڵکی وەزعی ئابووریان زۆر خراپ بوو. زۆر لەوە خۆیان لادەدا پێشمەرگە بەرنەماڵەوەیان، چونکە ژیانی خۆیان زۆر دژوار ببوو، بۆیە کە لێمان پرسین گوندی سونێ دوورە.؟ وتیان: لێرەوە هەر نیو سەعات دوور دەبێ، وتمان: بە سەعاتە گەورەکە وتیان: ئەوەتا چەناگەیان خستە سەر، ناچار ملی ڕێمان گرت هەر نەگەیشتین گیانمان بەوە بوو شەقامەڕێ بوو پاشان مانگاشەوێکی خۆش بوو ئەمان توانی ڕێگاکە ببڕین، لە پڕێکا کەوتینە ناو گوندی سونێ، پێم وابێ لە بێ گەلاسەوە بۆ ئەوێ سەعاتو نیو زیاد بوو بە پێی ماندوویەتی ئێمە. خەڵکی گوندەکە ئەتوت خۆڵو دۆی بەسەردا کراوە هەر ماڵە لە سەربانەکەی خۆی بێ دەنگ دانیشتبوون، گوێیان لە دەنگە دەنگی ئێمە بوو ئەوەندەی تر چرکەیان لە خۆیان بڕی، ئێمە ناچار بووین هەواڵی مەسئوولی گوندمان پرسی، دوو زەلامیان نیشان داین، داوامان کرد کە ئێمە (١٥) نەفەرێك دەبین لە گەرمیانەوە هاتووین ئەڕۆین بۆ بارەگای بارزانی نانو چایەکمان بدەنێو تا سبەینێ لێرە جێگامان بکەنەوە، هەر ئەوەندەمان خۆش بوو کابراکان پێماندا هەڵشاخان وتیان: ئێرە حەسۆ میرخان قەدەغەی کردووە نابێ کەسێ شەو لێرە بمێنێتەوە، نەك دابەشتان ناکەین بە یەکەوە دەبێ بە پەلە بڕۆین هەتا کاك حەسۆ نەی زانیوە ئەگینا هەمووتان زیندانی ئەکات. هەندێ لەو برادەرانەی یەکمان

گرتبوو لەڕێ زۆر ترسان وتیان: با بڕۆین، من وتم: ڕێگام بدەن با هەندێ قسە بکەم بەهەلمزانی چونکە لە هیچ شوێنێکا مەسئوولانی شۆڕش بۆیان نەبووە خەڵکی ڕێبوار دەربکەن، بێ ئەوەی نەزانن ئەو خەڵکانە کێن، دەستم کرد بە قسە کردن وتم: ئێمە لەکەرکوك لەدەست سیاسەتی چەوتی بەعسی هەڵاتووین و لە وڵاتەکەی خۆشماندا بۆمان نییە هاموشۆ بکەین، سەرەڕای ئەو هەموو ڕێگا درێژە کە بەکار دەڕۆین بۆ سەرکردایەتی، کێ ئەتوانێ دەرمان بکا ئەی بۆ ئێمە دەممان نییە لە سەرەوە شکاتیان لێ بکەین. قسەم زۆر کرد کاتێکم زانی یەکێك لە ماڵە کاوانیەکان کەئەوسا لەو ناوە ساباتیان کردبووو ئەژیان بە هەڵە داوان هات وتی: تۆ ناوت چیە برا.؟ وتم: عەلی. وتی: لە چەمی ڕەزان پێشمەرگە بوویت وتم: بەڵێ. وتی: ئەی خێرە بەم شەوە بۆ کوێ دەڕۆن.؟ وتمان: ئێستا گەیشتووین نەشارەزاین هەر یەکەمان لە شوێنێکەوە هاتووین کاری سەرکردایەتیمان هەیە. وتی: کاك عەلی گوێم لە دەنگت بوو دەنگەکەم لا ئاشنا بوو، هەر بۆیە هاتم کاتی خۆی ئێمە بە یەکەوە لە چەم بووین من ناوم جەلال کاوانیە، باوەشمان بە یەکتریدا کرد ئەملاولای یەکتریمان ماچ کرد، وتی: بەڕاستی ڕووداو زۆرە لەم ناوە لەبەر ئەوە کاك حەسۆ قەدەغەی کردووە شەوان میوان لەم گوندە بمێنێتەوە، بۆیە زۆر خەجاڵەتم کە گوێم لە دەنگتان بوو لە گەرمیانەوە هاتوون چونکە خۆم هاتوومەتە گەرمیان، ئەزانم خەڵکی ئەوێ سەرەڕای ئازایی و دڵسۆزی زۆریش میوان پەروەرو نان بدەن. بەڵام ڕووی ڕۆژگار ڕەش بێ ئێستا وەزعی خەڵکی ئەم ناوە زۆر خراپەو خۆراك ئاسان دەست ناکەوێ، بەهۆی ئەو ئابلووقەیەی دوژمن خستویەتیە سەر ناوچەکە، هەر بەدەم قسە کردنەوە لەگەڵ جەلال ڕۆیشتین تا چووینە بەردەمی هەندێ کەپر کەدروستکرابوو گۆڕەپانێکی لێ بوو وتی: لێرە دانیشن من ئەڕۆم لەماڵان بەرماوەی ئێوارە چی مابوو کۆی دەکەمەوەو بەشی ئێستاتان بۆ پەیدا دەکەم، بەڵام تکا دەکەم کە نانەکەتان خوارد بەڕێ بکەون گوندەکە بەجێ بهێڵن حەز ناکەم دووچاری گرفتێ لێرە. هێشتا جەلال نەڕۆیشتبوو ژنێکی کاملی ڕەش پۆش هات دەستی کرد بە قسەکردن بە خەڵك و بە شۆڕش و سەد جاری وتووە کوێرە بم، دەستم بشکێ خەڵکی گەرمیان وەهای لێ بێت، لەگوندان دەریان بکەن لەبەر ژەمە نانێك، زۆری دڵدابنەوە دوو سێ بەرەی هێنا و بۆی داخستین و کوڕێکی مێرد منداڵی لەگەڵ بوو سەتڵێ ئاوی بەو هەڵگرتبوو، جامێکی لەناو دانابوو

دەستی کرد بە ئاو دابەشکردن بەسەرماندا، لە جەلالم پرسی وتی: دایکی خەسرەوە، واتە ژنی مەحمود کاوانی شەهیدە، ئەوجا ئێمەش زۆر سوپاسمان کردو پێمان وت: دایکە گیان دڵی خۆت سەغڵەت مەکە ئەمە رۆژگارە، ئێمەش لە شۆڕشداین لە شۆڕشیشدا شتی ئەوها ئاساییە.

هەندێ چێشتی پاشماوەی ماڵان لە تەشتێکی گەورەدا بەسەر یەکدا کرابوو، بە چێشتی ئێوارانی مجێوری مزگەوتەکان دەچوو، بەڵام چونکە ماندوو برسی بووین بە هەموو شتێ رازی بووین، نانمان خوارد لە ماڵی شەهید مەحمودیشەوە چایان داینێ و فەرموویان کردین گوندی سونێ بەجێ بهێڵین، لای ئەوانمان بەجێ هێشت بە دزییەوە چووینە ناو مزگەوتەکە، لەوێش چونکە کێچی زۆر بوو کێچ نەیهێشت بخەوین هەراسانی کردین، بەیانی تاریک‌و روون مزگەوتەکەمان بەجێ هێشت روو لە بناری قەندیل کەوتینەڕێ. یەکەم گوندی نزیکی سونێ هەندێ لە ماڵە مەڕ دارەکان هاتبوونە گوێ چەمی سونێ، بەیانی هەتاو لەزۆر شوێن کەوتبوو، بەڵام گوێ چەمەکە هێشتا فێنك بوو هەتاو نەی گرتبۆوە، رێککەوتین چاوقایمی بکەین هەر سێ سێ بڕۆینە بەردەمی دەوارێك‌و داوای ئەوە بکەین نان‌و دۆیەکمان بدەنێ. ئێمە رێمان کەوتە سەر جۆگەیەك دارییەکی لەسەر بوو، دەوارێکی رەش لە پەنایدا هەڵی دابوو مەلایەکی مێزەر سپی کورتەباڵا چوارمشقی دانیشتبوو من لە هاوڕێکانم بەتەمەنتر بووم داوام کرد لەپاش سڵاو لە مەلا کە دوو سێ کەسین یەکی نانێك‌و قومێ دۆمان بداتێ رێبوارو ماندووین‌و لە ئێوارەوە نانمان نەخواردووە، هەروەکو زەمان زەمانی ربەو لیرە بێ‌و تەقییەوە بە دەمماو وتی: بڕۆن نان نییە، زۆر دڵتەنگ دیار بوو رۆشنایی تێدا نەما هەرچی سەرنجماندا پێ نەدەچوو لە قسەکەی خۆی دابەزێ، ناچار رۆیشتین نەمان دەزانی لەکوێی تر نانمان دەست دەکەوێ. ئەو سەردەمەش لە کۆتایی (١٩٧٤)دا بوو تومان بازاڕی کوردستانی داگیر کردبوو هەمووشتێ بە تومان دەکڕدرا، هێزەکانی شۆڕش دووچاری بێ هیوایی ببوون هەر لە سەرکردایەتی تا دەگاتە خواروو هەر کەسە لە ئاستی خۆیەوە نارەزایی دەردەبڕی لە سیاسەتی دەست تێوەردانی ئێران‌و لە ناکۆکی ناو ریزەکان‌و لە زەبەلاحی شۆڕشێکی بەربەرەڵا. جوتیارەکانیش ناهەقیان نەبوو کە نانیان نەدەدا، چونکە بازاڕێکی گران‌و بێ کار، پولێکی زۆر لەلای شۆڕش بڵاو ببۆوە بەڵام بێ نرخ بوو. ئەشیا بە ئاسانی نەدەگەیشتە دەست جوتیاران بەتایبەت

بناری شاخەکان. ئێمەش ئەم راستیانەو زۆر شتی ترمان لا مەعلوم بوو بۆیە هیچ بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نەبوو گلەیی لەجوتیارێك بکەین کە تیکە نانەکەی دەمی منداڵەکەی خۆی نادات بە ئێمە. ملمان درێژ کرد وردە وردە بە هەورازێکا سەرکەوتین کە نەمان دەزانی کەی دەگەینە ئاوەدانی، یەکەم جار بوو بەو رێیەدا ئەرۆیشتین لەناوماندا رەئیس عورەفایەکی سەربازی راکردوو ئەیویست بۆ هێزێك بڕوات کە بۆ سەربازی راکردوو کرابۆوە لەو ناوە، دووچاری نەخۆشی بوو لە هەورازەکە لە پەل‌وپۆ کەوت ئێمەش (١٢ تا ١٥) کەسێ دەبووین تەنها من کلاشینکۆفێك‌و دوو مەغزەنم پێ بوو ئەوانی تر بێ چەك بوون. ئەوساش خەڵکی تەنها لە ترسا نانیان بە چەکدار ئەدا لەوە ئەترسان ئەگەر نانیان نەدەنێ ئازاریان بەدەن. هەرچی کردمان توانای رێگا رۆیشتنی نەمابوو، ناچار داوام کرد لەوانی تر هەر کەسێ چەند تومانێکی بۆ کۆبکەنەوە با پارەی پێ بێ بۆ خۆی کەی پشوویدا بڕواتەوە ئەو دەورانەو گوێ درێژێ بەکرێ بگرێ بەهەر لایەکدا دەیەوێ بڕوات، خۆشی زۆری پێ خۆش بوو. ئێمەش هەندێ لەو دوور کەوتینەوە.

## شانۆگەری نان

مێگەڵێ بزنمان بینی، چووینە لای شوانەکە هەواڵی نزیکترین ئاوەدانیمان پرسی، وتی: ناوم مەبەن ئەوە لەبن ئەو دار بییە گەورەیەدا دوو سێ ماڵە رەوەندی لێ هەیە، زۆر سوپاسمان کردو بەرەو دار بییە گەورەکە دامان شکاند، چووینە پێشەوە کەپرێك لەسەر ئاوەکە کرابوو نیوەی کەوتبووە بن دار بییەکە، لەم بەروبەری سەکۆی بۆ کرابوو، لە خوارووی کەپرەکەوە تەونێك دانرابوو دوو کیژە کوردی چاو کەژاڵی بالابەرزی دەم بەخەندە تەونیان دەکردو بە خەندەوە سەرنجی گفتوگۆی ئێمە لەگەڵ دایکیان ئەدا، کاتێ سلاومان کرد، پیرێژنەکە کە بالایەکی بەرزی گەنم رەنگی هەبوو پشتێنێکی زلەی بەستبوو بەدەنگێکی گرژ وەلامی سلاوەکەی داینەوەن نیشانی داین کە بەخێر نەڕۆینە ماڵیان ئێمەش ئەتوت منداڵی بێ خواو بێ باوکین سەرمان داخستو من لە جیاتی ئەوان وتم: دایکە گیان زۆر ماندوو زۆر برسین، خەڵکی گەرمیانین ئەڕۆین بۆ سەرکردایەتی ئەگەر بە ئەرکی نەزانن سەرو تیکەیەك نانو قومێ دۆمان بدەنێ ماڵتان ئاوەدان بێ. زۆر بە بێ بەزەییانە وتی: نیمانە بڕۆن، جارێکی تر وتم: بیکە بۆ خاتری خوا، تووڕەتر بوو وتی: من ئەڵێم نیە بڕۆن، هیچ ماندوو نەبووم برسێتی تینی بۆ هێنابووین وتم: دایە، وتی: ها وتم: بیکە بەخاتری پێغەمبەر، زۆر بە تووڕەیی جوابی دامەوە پێی ناخۆش بوو ئەوەندە ناوی خواو پێغەمبەری بەگژدا دەکەم. هەرچی بکەن دەمتان لە گوێچکێ نان ناکەوێ بڕۆن، ئێمە هەتا ربەیەك ئارد سەردەخەینە سەر ئەم شاخە رۆحمان دەردەچێ، هاکا رۆژێ تەیارە یان تۆپ لێرە هەپروون بە هەپرونمان دەکات. لەسەر یەکێك لە سەکۆکانی کەپرەکە دانیشتمو تفەنگەکەم خستە سەر ئەژنۆمو کلاوو جامانەکەم داگرت چاوم پێ سڕییەوە، وتم: دایە بەو خوایەی لە سەروو هەموومانەوەیە شێتو هار بی هەموومان بە شەق بکوژی توانای رۆیشتنمان نییە هەنگاوێ بڕۆین جا یان بە هیمەت یان بە قیمەت نانێکمان بدەنێ. ئێمە ئامادەین بۆ هەر نانێ یەك دینار بدەین چونکە نان نەخۆین دەمرین ژنەکە دەستی نایە کەلەکەیو سەرنجێکی رقاوی دام وەکو بڵێ ئەم بەلایە چیە توشم بووە هەر تێی دەڕوانیم، هەردوو کچەکەش گەنجو بە بەزەیی بوون گرژببوون بە

چاویانا دیار بوو لایەنگری داواکەمان بوون، بەڵام ئەو دایکە نەفوراتە وەهای ترساندبوون نەیان دەوێرا چرکە بکەن، لەو ناوەدا شانۆگەریەك دروست ببوو لە نێوانی رێبواری برسیو پیرێژنی دڵ رەقو غەم داگرتووی دوو کیژۆڵەی قەد باریکی دەموچاو گەشی لێو بەخەندە. لەم لاشەوە ریزێ هەتیوی لە برسا مردووی بێ نەوا، برادەرەکان بە پێوە بوون ئەتوت من مەسئوولیانم، هەموو بێ چرکە چاوەڕێی مشتو مڕی دایە پیرەی دڵ رەق بوون، یەکێکیان ناوی (خولە درێژ بوو) خەڵکی شاری چەمچەماڵ کوڕێکی سپی کاری دەموچاو پانی بالأبەرز لە پشتمەوە وەستابوو، فەنێکی بەکار هێنا بوو بەهۆی سەرکەوتنی داواکەمان، تومەز ئەو باش درکی بەوە کردووە مەسئوول لەناو جوتیاراندا جێگایەکی دیاری کراوی هەیەو حیسابی بۆ دەکرێ جا لە ترسا بێ یان لە خۆشەویستی، مەحمود خێرا لێم هاتە پێشەوە وتی: مامۆستا دە هەڵسە با بڕۆین دەك ماڵم وێران مامۆستایەکی وەکو تۆ بە دەسەڵات وەهای لێ بێ دوو سەعاتە بۆ یەك نانو چا ئەوەندە دەپاڕێیتەوە، دە هەڵسە مامۆستا توخوا بەسە با بمرین نامانەوێ لەوە ڕەزیلتر بت بینم، منیش هەڵسامە سەرپێ لە قسەکانی گەیشتم، هەر ئەوەندەمان خۆش بوو ناوی مامۆستا هات، کەتە پیاوێکی بالا بەرزی ریش ماشو برنج خەنجەرێکی بەبەر قەدەوە لە بەرامبەرمانەوە لە پاڵ گەمەڵە بییەکەدا هاتە دەرێو وتی دەك ماڵم کاول مامۆستا، وەڵڵا گوێم لێ بوو کرووزەم لێ دەهات توخوا مامۆستا لێمان مەگرە بەخوا ژیانمان زۆر خراپەو شوێنەکەشمان سەرە رێیە میوانێكو دوان نییە شەوو رۆژ کاروان سەرایەو هەرچی چاوی بە دەوارەکانمان دەکەوێ لا دەدا هەندێکیان برسی نین هەر بۆ پشوودانو چا خواردن لادەدەن حیساب بۆ خراپی وەزعی ئێمە ناکەن، توخوا مامۆستا بمان بوورە. دەفەرموو دوو لبادی راخستو هەموومانی داناو خۆشی بە پێوە دەنگی لە کیژەکان کرد دۆو نان هات، خێرا چاشیان پێ گەیاند فریایان خستین، ئێمەشو کیژە بە ویژدانەکانیش شێوەمان رۆشن ببۆوە، خاڵەی خاوەن ماڵ هەندێ سەرینی گەورە گەورەی هێنایە ئەمدیو ئەودیومەوە، ژێر پیاڵەیەك شەکری کولاوی لەبەردەمم داناو خێرا چایەکی دامێ، وتم: حاجی گیان دەست خۆش من چا ناخۆم وتی: نابێ دوو سێ جار پیاڵەکەی رەت دەکردەوە، ئاخری وای زانی من عاجز بووم وتی: هەر شەش تەلاقم کەوتبێ ناڕۆی تا چا نەخۆی ئەزانم لێمان دڵگرانی، بێ سوود بوو لەبەر ئەوەی سوێندی خوارد چایەکم

خوارد. کە زانیم حاجی لەگەڵمان تێکەڵاو بوو وتم: حاجی گیان برادەرێکمان لەو نزیکانە لەبرسا کەوتووە لەسەر ڕێگاکە، ئەگەر منداڵێك بە وڵاخێکەوە بنێری بۆ ئێرە بیهێنێ بەڵکە تیکەیەك نان دەخواو دەبووژێتەوەو نامرێ، وتی: بەسەر چاو مامۆستا، خێرا گەنجێکی لە دەروازەکەی نزیکەوە بانگ کردو ناردی حەبیبیان هێناو تێر نان‌و دۆی خوارد، ئەویش کەوتەوە سەر قاچ ماڵیان ئاوابێ کاتێ ڕۆیشتین هێستریکی بۆ مامۆستا ئامادە کردو بە زۆر وتی: هەر دەبێ هەتا فلان شوێن کوڕەکەم لە گەڵتا بێ ڕێگاکە کەمێ هەورازە. زۆرمان سوپاس کردو ئێمەش هەندێ لەو دوور کەوتینەوە، نەخۆشەکەمان سەر خست تا ئەو شوێنەی بۆی دەست نیشان کردبووین.

ئەو سەفەرە گێرمەو کێشەی زۆرمان تووش بوو، بەڵام هەمووی هی گێڕانەوە نییە، لە هەندێ شوێن چایخانە دانرابوو بە پارە نانیان دەفرۆشت بەکڕین‌و بە خۆگرتن گەیشتینە چۆمان، بازاڕی چۆمان شوێنەواری فرۆکەکانی دوژمنی پێوە دیار بوو، تۆپی لوولە درێژی دوای جێب دەبیندرا بەڵام دوکان‌و بازاڕ هەبوو بە تایبەت ئێواران لە سەعات چوار بەدواوە هاتوچۆ زۆر گەرم بوو، لەوێ هەموومان لێك دابڕاین هەر کەس بەلایەکا، من سەرم دا لە شوێنێك کە خاڵە شهابی شێخ نوری‌و شەهید ئارام (شاسوار جەلال)ی لێ بوون. هەندێ ڕاسپاردەی کۆمیتەی باڵای ناوچەکەم پێ بوو، پێم داو ئەویش وەڵامەکانی دامێ، پاشان چوومە وەزارەتی بەلەدیات لەوێش داوای نیوە یارمەتیم بۆ کاکە عەبدولڕەحمانم کردو نامەیەکیان دامێ کە لە سنووری چەمچەماڵ بۆی سەرف بکەن‌و گەڕامەوە، لە چۆمان هەندێ کولێرەی ئەستوورم کڕی بۆ ڕێگاو لە پەڕۆیەکا لە پشتم بەست، چونکە تەنها بووم زۆر خێرا ڕێگاکەم بڕی‌و بێ موشکیلە چونکە نانم پێ بوو، چام نەدەخوارد توانای ڕۆیشتنم زۆر چاك بوو، چونکە هەموو تەمەنم بەو شاخەوە بردۆتە سەر مار ئاسا ڕێگاکانم قەدبڕ دەکرد. بە هەمان ڕێگا هاتمەوە دارەشمانە لەوێوە بۆ هێرۆو لەوێشەوە بۆ زودان کاتێ بەدیوی گەناودا شۆڕ بوومەوە لام دایە شوێنێك هەندێ تەماتەم بینی پەڵەیەك پیازی لێ بوو، بەڵام کەس لەوێ نەبوو لەبن ساباتی باخەکەدا قاپی لێ بوو بەهەندێ تەماتەو پیاز زەڵاتەیەکم دروست کردو نانێکی بەتام‌و چێژم خوارد. پاشان وردە وردە گەڕامەوە، کاتێ هاتمەوە چەمی ڕەزان تووشی هەندێ ناسیاو بووم بە دەمە تەقێوە چوومەوە بۆ عەسکەر، زۆر دڵم

خۆش بوو دیاریم بۆ کاکەم کڕی بوو پاشان نامەم بۆ هێنابوو نیوە یارمەتی بدەنێ، خۆم زۆر بە سەرکەوتوو دەزانی، کاتێ گەیشتمە ماڵەکەی خۆمو شەهید ئازاد لە ماڵ نەبوو، چوومە ماڵی عومەری برازام لە هەیوانەکەیاندا جێگا داخرابوو بەوە دەچوو میوان بێت دانیشتم مڕومۆچ بوون کاکەشم دیار نەبوو، لێم پرسین کوا کاکە؟ لەساڵی (١٩٦٤) بوو جوابیان نەدامەوە، پاشان تینم بۆ بردن بە گریانەوە وتیان: چەند رۆژێ لەمەوبەر بۆ پشوودان لە گەرما چۆتە بن ئەو دار تووەی بەر ماڵەکان لەوێ راکشاوە، کاتێ خەڵکی بەسەردا چوون لەوێ خوێنێکی زۆری هەڵهێنابۆوەو هەر بە ئاستەم روحی تیا مابوو، هاواریان هێناو چووین هێنامانەوە، داوو دەرمانو دکتۆر نەبوو، رێگای شارو بەرەش نەبوو هەر بەو خوێن هەڵهێنانەوە گیانی دەرچوو. سەرەتا ویستم دان بە خۆمدا بگرم، بەڵام پاش رۆیشتنی خەڵکی زامی خۆشەویستی ئەو کاکە وشیارو دڵسۆزو ژیرەم کولایەوەو کەوتمە هەنسک هەڵدان هەر ئەوەتا بوو گیانم لەگەڵیا دەرنەچوو.

# هەرەسی شۆڕشی ئەیلول

ڕۆژگـاری کوردسـتان تـا دەهـات ڕوو لـە ئـاڵۆزی دەچـوو، کۆمەڵـەش چـالاکانە کـەوتبووە تێکۆشـان بـۆ وشـیار کردنـەوەو سـازدان و ڕێکخسـتنی خـەڵکی و لـەناو هێـزی پێشمەرگەشدا تـۆوی بـڕوا بـوون بەگـەل خـۆی دەچاندو پێشبینی ئەوەشـی کردبوو کە ئەگەر کورد خۆی کۆنەکاتەوە شۆڕشی ئەیلول بە سـەرۆکایەتی بارزانی بـەرەو کۆتـایی دەڕوات. لـەناو خـەڵکا ئـەوە دەوتـرا زۆری نەخایانـدو لـە ئـازاری (١٩٧٥)دا بە ڕێکەوتنێکی شای ئێران و ڕژێمـی عێراقی بە نوێنەرایـەتی صدام لـە پایتـەختی جـەزایردا ڕێکەوتننامـەی دۆسـتایەتی ئـەو دوو دەوڵەتـە لەسـەر لاشـەی گەلی کورد مۆرکراو پێیان خستە سەر ڕیزی ملـی سـەرکردایەتی ئەوسای کـورد کـە ئاش بـەتاڵ بکـەن. ئـەوانیش زۆر بەگورجی داوای دوژمنـەکانیان جێبـەجێ کـرد لـە کاتێکا زیاتر لە (١٥٠) هەزار پێشمەرگەی کورد بـۆ خـۆ بـەخت کـردن ئامـادە بـوون، لـەپێناوی ئـازادی کوردسـتاندا. ئەوسـا سـەرکردایەتی مسـتەفا بـارزانی داوای لـە هێزی پێشمەرگەو گەلی کوردسـتان کـرد چـەك فڕێ بدەن، ئـەوەی ئەڕواتـەوە خـۆی بداتـەوە دەسـت ڕژێمـی عێراقـی بـا بـڕوات و ئەوەشـی دێتـە ئێـران بالـەوێ ببـێ بـە پەنابـەر، بـەو بڕیـارە دوژمنکارانەیـەی دژی گـەلی کوردسـتان شۆڕشـی زۆر مـەزنی (١٩٦١)کیان بەچۆکدا هێنا و گەنم گرت و جۆ بڵاویان لێکرد.

# شۆڕشی زیندان

ئەوسا کۆمیتەی سەرکردایەتی کۆمەڵە چەند کۆبوونەوەیەکیان کردو بارودۆخەکەیان هەڵسەنگاند، چیبکەن.؟ شەڕ درێژە پێ بدەن بە شێوازی خۆیان، یان هاوڕێکانیان هان بدەن بڕۆنەوە لەگەڵ خەڵك بۆ ناو شارەکان، ژمارەمان لە (١٥٠) ئەندامی دڵسۆز تێ نەدەپەڕی، لەناو هێزی پێشمەرگەش ژمارەمان ئەوەندە نەبوو تابتوانین هێزێکی لێ پیك بهێنین‌و رای بگەیەنین کە ئێمە بە ئاش بەتاڵ رازی نابین. هەر بۆیە سەرکردایەتی کۆمەڵە بە نهێنی هاوڕێکانی ئاگادار کردەوە چەکەکانیان لەزەوی کوردستاندا بشارنەوەو خۆیان تێکەڵاوی ئەو خەڵکە بکەن ئەڕۆنەوە شارەکان.

رۆژگاری ئاش بەتاڵ شتێکی هێندە ناخۆش‌و دڵتەزێن بوو دڵ بە ئاستەم خۆی پێ دەگیراو نەئەتەقی، هەرچەندە هەندێ دڵی زۆر بە پەرۆش‌و ناسك تەقی‌و خۆی پێ نەگیرا لەبەردەمی ئەو رۆژە رەشەی بەسەر کورددا هات.

ئەو شەوو رۆژانەی جاڕی ئاشبەتاڵی شۆڕشی ئەیلولی (١٩٦١) تێدا درا من لە گوندی شێخانی سوورقاوشان خەریکی مشوورخواردنی رێکخستنی هاوڕێکانی کۆمەڵە بووم، لەگەڵ جەماوەر بۆ شارەکان دوای ئەوەی بێ هیوا بووم لەوەی بتوانین ئالآی شۆڕش بگرینە دەست‌و نەهێڵین ئاش بەتاڵ بکەین، لەناخۆشترین رۆژەکانی ژیانم بوون.

خەڵکی کەم مابوونەوە خۆیان بە (نادیم) بنووسن ئێمەش چەند هاوڕێیەکی کۆمەڵە بووین نەمان وێرا لە ئاغجەلەر خۆمان بدەین بە دەستەوە، بۆیە چووینە ناوچەی رێداری شوان‌و لەوێ برادەرێکم هەبوو کۆن لە پارتیدا بەیەکەوە کارمان دەکردو پارتی کردبووی بە مفەوەز شورتە، بەڵام مدیری ناوچە ئەوسا ئەویش زۆر برادەرم بوو کۆن ئەویش هەر لە هاوڕێکانی پارتی شۆڕشگێڕ بوو، کاتێ چوومە لای هیچ بە جوانی پێشوازی نەکردم هەر بە لا لووتێکەوە ناردمی بۆ لای هاوڕێ مفەوەزەکەی لە ژوورەکەی هاتە دەرێ لەبەر کۆشکی ناوچەکە چاوەڕوانی هاوڕێکانی ترم بووم. مفەوەزەکە بە مدیر ناحییەی وت ئۆخەی دامان بەئەرزا، واتا شۆڕشەکەیان دا بەئەرزا. بۆ دەبێ کورد ئاوات بەوە بخوازێ شۆڕشی گەلەکەی بە چۆکدا بێ‌و بە سەرکەوتنی خۆی بزانێ، زۆر رقم هەڵسا بەڵام بێ دەسەڵات بووم،

تەنها بمزانیایە سەد کەسێك بە شاخەوە هەیە خێرا دەگەڕامەوە شاخ و لەوێ چەکم بەکار دەهێنایەوە بۆ داواکەم، هەرچۆنێك بوو چوومە لای (ساڵح بەفر فرۆش)ی کۆنە برادەرم لە مەرکەزی دارەمان بوو، زۆر ڕێزی لێگرتم، لەگەڵ خۆی و بە سەیارەی خۆی من و هەموو هاوڕێکانی کە لەگەڵم بوون بردمانی بۆ ناحیەی پردێ و لەوێ خێرا وەرەقەی تەسلیم بوونی بۆ کردین و بەڕێیان کردین بۆ ئەمنی کەرکوك، بەڕاستی هەڵوێستێکی چاکی وەفاداری هەبوو هەرچەندە ئەویش ببوو بە بەعسی بۆ ئەوەی لەکارەکەی کە مفەوەزییە لای نەبەن.

کاتێ چووینە ئەمنی کەرکوك هەندێ وێنەیان لێ سەندین و فۆرمێکیان پێ پڕ کردینەوە و بە (نادیم) نووسراین، لەمێژووی ژیانمدا بە ناشیرینترین وشەی دەزانم چونکە من پەشیمان نەبووم و هەمیشەش پەشیمان نیم، لەوەی بۆ کوردم کردووە بەڵام ڕۆژگارو نەبوونی سەرکردایەتی بەتوانای بزوتنەوەکەش وەهای کرد هەموو شۆڕشگێڕانی کورد (نادیم)بن چ لەئێران یان لە عێراق.

پاش ئەوەی ئەمن وەرەقەی داینێ بگەڕێین بۆ کار کردن، چوومەوە ماڵی کاکە عەبدوڵڵام ماوەیەکی چاك بێ کار بووم، پاشان گێڕامیانەوە بۆ دائیرەکەی خۆم لە چەمچەماڵ، لەوێ لەگەڵ کارەکەم خۆم گونجاند و لەژێریشەوە سەرپەرشتی ڕێکخستنی چەمچەماڵی کۆمەڵەم دەکرد و بۆ کۆبوونەوەی کۆمیتەی ئەستێرەی سوور لە کاتی دیاریکراودا ئەرۆیشتم چونکە دەوامی کارمان (٨) سەعات بوو ئێمەش کرێکار بووین بەدیار مەکینەی کارەبای چەمچەماڵەوە لە (٨) بەیانی بۆ (٤) دوای نیوەڕۆ لەچوار بۆ (١٢) شەو لە (١٢) شەو بۆ (٨) بەیانی ڕێکەوتم لەگەڵیان ئەگەر فریای دەوامەکەم نەکەوتم یەکیان کارەکەم بەڕێوەبەرێ و نەهێڵێ بەلەدێ بزانێ ز بۆیە هەموو جار بە ئاسانی دەرۆیشتم بۆ کەرکوك + هەولێر + بەغدا + سلێمانی بڕیاری کۆبوونەوە لە هەر شوێنێکا بوایە منیش ئەچووم بۆ ئەوێ.

زۆر لەسەر کارەکەم نەمابوومەوە کە ڕێکخراوەکەمان خەڵکی لێگیراو سەرکردایەتی کۆمەڵە ناویان هات لە ئەمنی بەغداو ئێمەش بڕیارماندا خۆمان بشارینەوە، بۆ ئەوەی کۆمەڵە لە لەناوچوون بپارێزین، چونکە کۆمەڵە ئەوەندە لامان پیرۆز بوو بۆ ئەو قۆناغەی بزووتنەوەی کورد ئەبوو لە بیلبیلەی چاومان زیاتر بیپارێزین.

## جارێکیتر کوردستان بەجێ هێشتن

پاش زنجیرەیەك كۆبوونەوەو راو تەگبیر، بڕیارماندا لە کوردستانیش دوور بکەوینەوە بۆ ئەوەی لەسەر دەستی ئێمەو بەهۆی ئێمەوە کۆمەڵە دووچار نەبێ بەڕۆیشتنی ئێمە، بەڵکو نەڵقەی نێوانی گیراوەکان و کۆمەڵە دەپسێ، لەهەر شارێکا کۆمیتەیەکی سەرکردایەتیمان دانا و پێمان وتن: تا سێ مانگی تر ئێوە خۆتان سەرپەرشتی رێکخستن دەکەن و ئێمە بە هیچ شێوەیەك دەنکمان ناتان گاتێ. بۆ سەرپەرشتی هەموو کۆمەڵەش کۆمیتەیەك دانراو ئێمەش بەڕێی قاچاخدا چووین بۆ شاربازێرو بە پشتی چوارتادا روو لە شیوە کەڵ و لەوێوە بۆ لێواری سنووره دروست کراوەکەی نێوانی کوردستانی سەروو کوردستانی خواروو لە گوندی سیرێن لەنگەرمان لەباخێکا گرت، کەنموونەی جوانی باخی کوردستانە لای پیاوێکی بەساڵاچوو ناوی مامە قالەبوو چەند شەوو رۆژێ چاوەڕێی قاچاخچی بووین کە بمان گەیەننە تاران و لەوێوە بڕۆینە سەفارەتەکان و داوای پەنا بەرییان لێ بکەین. پێمان وابوو زوو دەگەین و خێراش وەردەگیرێین و بەرێ دەکرێین بۆ دەرەوەو لەوێشەوە لەگەڵ مام جەلال یەکتری ئەبینین و پاش تەواو یەکخستنی بیروڕامان لەسەر هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێی دیموکراتی گەلی لە کوردستان و پەیداکردنی کەمێ پول بۆ ئیدارەدانی. ئەو ماوەیەی دەستەی پێشمەرگەی بچوك بچوك دادەمەزرێنن بەش بکات، بەڵام نەخشەکەمان لە بنەوانەدا سەرکەوتوو نەبوو، قاچاخچییەکانی لەسلێمانییەوە هێنامانیان نەوەستان تا قاچاخچییەکانی ئێران بێن بمان بەن، گەڕانەوەو وتیان: ئەمشەو یاسبەی دێن، بەڵام هەر نەهاتن و ئێمەش پاش ئەوەی زۆر پەژارەمان خوارد ئەوجا زنجیرەیەکی تر کۆبوونەوەو مشت و مڕمانکرد لەسەر (چی بکەین؟) ئاخر بڕیار ئەوە بوو خۆمان بڕۆین بۆ ئێران ئەگەر گیراشین بڵێین هاتووین بۆ پەنا بەری شەوی (١٩\٢٠ ئەیلولی ١٩٧٥) بوو لەسیرێنەوە بەرەو چەم پاراو بەرێ کەوتین و نەمان توانی دەرباز بین چونکە کەسمان شارەزا نەبووین و چووینە مەرکەزەکەی چەم پاراو لەوێ کەوتینە ژێر پرسیارو رای پۆلیسی ئێرانییەوە. ئەو شەوە ژیانێکی زیندانی ژیاین و بەیانی بە نامەیەکەوە پۆلیس بردیانین بۆ بلەکێ و لەوێشەوە بە جێبێکی سەربازی براین بۆ

شاری بانەو سەربازگاکەی بەر گردی ئەربابە، ئەم ژوورو ئەو ژووریان پێ دەکردین هـیچ رێزیـان لێ نـەگرتین، ئێمـەش زۆر مانـدووو ژاکـاو بـووین بـە تـەواوەتی بـە دەموچـاومانەوە دیـار بـوو دڵەڕاوکێمانـە. نـانێکی سـەربازییان دایـنێ و بـۆ شـەو ناردیـانین بـۆ ئـەمنی بانـە، لـەوێ داوامـان لەپۆلیسـەکان کـرد بمـان بەنـە حـەمامێك کەمێ خۆمان بشۆرین، ئەوجا بمان بەن، بە قسەیان کردین بردیانینە حەمام، لـەوێ خۆمان پاك شۆری ئەوە ئاخر خۆشۆرین بوو هەتا نیسانی (١٩٧٦) لە ئـەبو غریـب جارێکی تر خۆمان شۆری وەکو زیندانی.

# زیندانی ئێران

پاش حەمامکردن بردیانین بۆ زیندانێك بە بەری شاخی کەلی خانەوە بوو، لەناو شـاردا هـەر کـە گەیشـتین رووبـەڕووی چـەند کـوردێکی زینـدانی بووینـەوە پێشوازیەکی کوردانەی چاك کراین، خێرا هەر پاش دەورو تەسلیم لەگەڵ پۆلیسـی زیندانەکـە چـووینە ژووری زینـدانی خۆمـان نـان‌و چێشـتی هـیچ جـار نـەدیوی (پاستۆریزا)مان بۆ هات لەگەڵ چاو قەندی سپی ئێرانی، بەڕاستی هەڵویستێکی جوامێرانەو کوردانە بوو ئەو چەند کوردە زیندانییە لەوێ بەرامبەرمان نواندیان.

رۆژی (١٩٧٥/٩/٢١) بوو هەر پێنجمانیان برد بۆ ئەمن بۆ لێپرسینەوە شەڕێکی دەروونـی گـەورەیان دەکـردین، وێنـەی زۆریـان لەسـەر لاو رووبـەڕوو لـە پشـتەوە گرتین، پاشان هەزارو یەك قسەی جۆراو جۆری ناماقوڵیان دەپرسـی هـەتا ژمارەی خانوویان لە سلێمانی دەپرسی. تائێوارە لەو هۆدە بچوك بچوکانەدا بە تەنها تـەنها رایـان گـرتین‌و شـەو بردیانینـەوە بۆنـاو زیندانەکـە، پـاش (٥) رۆژێ بردیـانین بـۆ شاری سەقزو لـە زینـدانی شـارەبانی سـەقزدا زینـدانیان کـردین بـووین بـە زینـدانی تـەواو. جێگایـان بـۆ دیـاری کـردین لـە سـالۆنێکی گـەورەدا، کـەپڕی بـوو لـەجۆرەها زیندانی کورد کە زۆربەیان چەقۆ وەشێن‌و شەڕکەرو جۆری تـری لـەو بابەتـە بـوون، کەسانێکی وای تێدا نـەبوو لەسـەر سیاسـەت گیرابێ، ئیـدارەی زیندانەکـە هـەمووی پۆلیسـی کوردی بـوون، بـەڵام خـەڵکانی نیشـتمان پـەروەر نـەبوون، لـەو زیندانەشـدا کاری ناجوامێرانەی زۆر دەکرا زۆر بەشی ئیدارەی زیندان لێی بەرپرسیار بوو.

شـاری سـەقز سـاردترین شـاری ناوچـەکەیەو ئێمـەش بـەو هۆیـەوە دووچـاری سـەرمایەکی یـەکجار زۆر ببووین. لـە نووسـراوێکی ترمـدا باسـم لـە چۆنێتی ژیـانم کردووە لەو زیندانە بەتایبەت لە (کوانوی بەرگری)دا بۆیە بە پێویستی نازانم لێرە باسـی بکەمـەوە. ئێمـە تـا ئـاخر رۆژانـی مـانگی (١٢) سـاڵی (١٩٧٥) لـە زینـدانی سەقزدا بووین.

# گێڕانەوە بۆ عێراق

ماوەیەك لە زیندان ماینەوە، پاشان دادگاییان کردین‌و دواتر بردیانین بۆ سنەو چەند شەوێکیش لەوێ ماینەوەو شەوی (١٩٧٦/١٢/٣١) براین بۆ شاری مەریوان‌و لەوێوە تەسلیم بە عێراق کراینەوە. لەمەرکەزی پۆلیسی بناوە سوتەی ناوچەی پێنجوین‌و پاشان براینە پێنجوین. شەوێکیش لەمەرکەزێکی پۆلیس لەپێنجوین زیندانی کراین‌و پاشان بە کەلەپچە براینەوە بۆ سلێمانی‌و ئەمنی سلێمانی‌و ماوەی پێنج رۆژیش لەوێ هێڵدراینەوەو براین بۆ ئەمنی عام لە بەغدا. لە ئەمنی عامیشدا (٥١) شەوو رۆژ لەژێر ئازاردانـدا بووین، پاشان بۆ ساڕێژ کردنی زامەکانمان براین بۆ فەزیلیەو لە زیندانێکی داڕزاودا ماوەیەك ماینەوەو پاش ئەوەش براین بۆ دادگای شۆڕش (محکمە السورە) لەوێ دادگایی کراین‌و شەش ساڵ زیندانی بۆ هەندێکمان بڕایەوەو هەندێ ئازاد کراو سێ پاڵەوانی کوردیش شەهید کران. کە بریتی بوو لە(شهاب شێخ نوری‌و جەعفەر عەبدولواحیدو ئەنوەر زۆراب).

هەموومان بەیەکەوە براین بۆ زیندانی ئەبو غریب بەشی قورس (السقیلە) چەند مانگێ لەوێ ماینەوە لە پاشاندا براین بۆ (احکام خاصە) لەوێ دابەش کراین بەسەر بەشەکانی زینداناو پاش ماوەیەك خراینە بەشەکانی کارکردنەوە، من لە بەشی (چنین) کارم کرد ماوەیەکیش چوومە دەورەی فێربوونی کارەبا کاری‌و دواتریش چوومە بەشی قەلاچۆکردنی نەخوێندەواری‌و لەوێ شەهادەی شەشی سەرەتاییم لە زینداندا وەرگرت. لەماوەی شەش حەوت مانگێکدا من هەر بۆ ئەوە چووبووم سەر لە دائیرەی ئەمن تێك بدەم، چونکە لە تەحقیقدا وتبووم خوێندەواریم نییە، هەرچەندە کەڵکی باشم لێ وەرگرت بەهۆی رۆژانە چوون بۆ قوتابخانە ئەمتوانی خەڵکان‌و هاوڕێکانی بەشەکانی تری زیندان ببینین‌و دەنگ‌و باسەکانی ناو بەشەکانی زیندانی کۆبکەینەوە.

رۆژگاری زیندانی عێراق بەوردی نووسیومەتەوە لە کۆپلەیەك بیرەوەریدا، بۆیە بە پێویستی نازانم لێرە دووبارەی بکەمەوە.

# شادبوونەوە بەشاخ

پاش تەواو کردنی چوار ساڵ زیاتر، لەتەمەنی شەش ساڵ بڕیاری دادگا بەلێبوردنی گشتی کە کاتێ (ئەحمەد حەسەن بەکر) لادراو صدام بووم بە سەرۆك کۆماری عێراق، بڕیاری گشتی لێخۆشبوون بۆ زیندانی سیاسی دراو ئێمەش بەرکەوتین‌و لە (٨/١٨)دا ئازاد کراین. ساڵی (١٩٧٩) گەڕاینەوە ناو ژیانی دەرەوەی زیندان، کاتێ ئازاد بووم هێشتا پرسەی شەهید عوسمانی برازام تەواو نەکردبوو، هەواڵی نەخۆشی عومەری برازمیان دامێ کە ئەو کاتە پێشمەرگەی دەستە سەرەتاییەکان بوو لە چەمی رەزان. کاتێ گەیشتمە سلێمانی ئازاری زۆر بوو دکتۆرم پێکرد، دکتۆرەکان لەکارەبایان دابوو بۆ هاتنەوە حاڵەتی ئاسایی بەلاّم سوودی نەبوو ئاخر جار لە نەخۆشخانەی کۆماری خەواندمان بە نهێنی‌و لەوێش کۆمەڵێك دکتۆری چاکم لەسەر کۆکردەوە، لەوانە د. نەوزاد صالح‌و د. نەجاتی حەمە رەق‌و عەمەلیاتیان بۆ کردن بەلاّم سوودی نەبوو گیانی بەخاکی پاکی کوردستان سپاردز تەرمەکەیمان بردەوە گوندی باوو باپیرانمان عەسکەرو لەوێ پرسەکەیمان تەواو کردو گەڕامەوە کەرکوکن هێشتا دۆست‌و ناسیاوەکان بە تەواوەتی نەهاتبوونە سەردانمان، لە فرقەی کەرکوکەوە نەقیب حارس ئەفسەری سیخوڕی عێراقی سەعیدی مەحمود باریکی ناردو هات وتی: نەقیب حارس وتی: ئەگەر عەلی نەیەت بۆ لام بۆ ئیستیخبارات ئەنێرم بەدوای سەیاردا رای کێشن هەتا فرقە، منیش بۆ دۆزینەوەی چارە وتم: جارێ پرسەم هەیەو ئەم چەند رۆژەی جەژنیش لە بەردەممان دایە، کاتێ ئەوە تەواو بوو خۆت وەرە بە دوامداو بەیەکەوە ئەچین سەری لێ ئەدەین بەوە سەعیدم دڵنیا کرد پاش ئەو کەوتمە تەگبیرو رای خۆکۆکردنەوەو لە یەکەم رۆژی جەژندا بەرەو سلێمانی رۆیشتم‌و لەوێش لەگەڵ شەهید ئەنوەر حەسەن خۆم ئامادە کرد بەرەو چەمی سوورقاوشان کەوتمەڕێ. پاشان فەرەیدون عەبدولقادریش هات‌و لەوێوە دەستەیەك پێشمەرگە لەگەڵماندا هاتن چووین بۆ یاخسەمەر، پاشان براین بۆ دێی مالوومە لەوێ شەهید جەمال عەلی باپیر سەرتیپ بوو، هاتە پێشوازیمانەوەو کۆمەڵەی ژمارە (٥)ی بە دەستەوەبوو وتی: ئەوە لەسەر ئێوە نووسراوە کە بتانەوێ‌و نەتانەوێ بەزیون.

## هەرێمی دوو

ئێمەیش بە دەروونی خۆشەویستی کارکردنی کوردانەو هاورێیانەوە گوێمان بەوە نەداو هەنگاو بەرەو بارەگای سەرکردایەتی یەکێتی بۆ ناوزەنگو زەڵێ کەوتینەرێ.

سەرەتا چووینە بارەگای مام جەلال خۆشحاڵ خۆی نیشانداو دەفتەری یاداشتەکەی دەرهێناو وتی: ئەنووسم ئەمڕۆ لەنوێ دەست بە شۆڕش دەکەین، چونکە پۆلێ لەسەرکردە ئەسڵییەکانی شۆڕشو کۆمەڵە هاتنەوە گۆڕەپانی خەباتە سەختەکەمان.

پاش ماوەیەك گفتوگۆ ئەوجا دابەش بووین بەسەر مەقەڕەکانی کاك مەلا بەختیارو کاك سالارو کاك نەوشیروان داو ماوەیەکی یەکجار زۆر بەبێ چەك لەو ناوزەنگە بەفراویە ژیانمان بردەسەر. بەڵام لە یەکەم کۆبوونەوەی سەرکردایەتی کۆمەڵەو یەکێتی بەشداریان کردینەوە وەکو ئەندامی سەرکردایەتی بەو حیسابەی لە بەردەمی دەزگای لێکۆڵینەوەی ڕژێم چۆکمان دانەداوەو هیچ شتێکمان بەدەست دوژمن نەداوە. هەر لە یەکەم کۆبوونەوەماندا مام جەلال درکاندی کەمنیان داناوە بۆ فەرماندەی هەرێمی (٢) لەناوچەی قەڵاسیوکەو شوانو شێخ بزێنیو سورداش، ئەو سەردەمە کاك صەلاح چاوشین فەرماندەی هەرێم بوو، تا ئەویان هێنایە سەرەوەو منیان ناردە خوارەوە، ماوەیەکی زۆری پێچوو لە ساڵی (١٩٨٠ ) بوو من چووم بۆ هەرێمی (٢) ئەوسا ژمارەی چەکدارو بێ چەکی هەرێمی (٢) پەنجا کەسێ دەبوو، هەر ئەو سەفەرە بوو شەهید ئەنوەر حەسەن داندرا بە لێپرسراوی سیاسیو شەهید بێستون مەحمود دامەزرا بەلێپرسراوی ڕێکخستنی کۆمەڵە.

ئەوسا هێشتا پێشمەرگە ئەوەندە گەشەی نەکردبوو ناوچەکەی نەگرتبۆوەو هێشتا تەپوتۆزی ئاش بەتاڵ ناوچەکەی بەرنەدابوو، جموجوڵی پێشمەرگانە کارێکی زۆر زەحمەت بوو، بەڕۆژ نەمان دەوێرا بڕۆینە گوندەکان، تەنها ئێوارانێ درەنگ ئەچووینە گوندو تا شەو کاتی خەوتن لەناو گوند دەماینەوەو دوای دابەش بوونو نان خواردن ئەبوو هەڵپەی ئەوە بکەین شتێ بۆ ناو نانەبەرەکانمان پەیدا بکەین بۆ ژەمی خواردنی بەیانیو سبەی نیوەڕۆ. نەئەبوو ئەوشەوە لە

نزیکی ئەو گوندە یان چەند گوندی دەورو بەری بمابایناپە چونکە بۆ سبەی (٨٠٪) جاش و فرۆکەی کۆپتەری جەنگیمان بۆ دەهات، بۆیە هەرچۆنێ دەبوو مەسافەیەکی زۆرمان دەبڕی و لە شیوو چەمو قامیشەلانێکی چڕ، یان دۆڵو هەڵەتێکی دوورو بێ گومانـاوی خۆمان دەدا بە زەویدا جا شەو ئەوەندە دەڕۆیشتین زۆر ماندوو دەبووین، بەڕۆژەکەش زۆرجار لە بەر هەتاو لەناو ئاودردا رادەکشاین دووچاری حاڵەتێکی دەروونی خراپ دەبووین، ئەبوو هەتا ئێوارانی درەنگ خۆمان نیشانی خەڵکی گوندەکانیش نەدەین، بۆ چا لێنان و نان خواردن زۆربەی جار کەڵکمان لە قوتووی یەك کیلۆی ئاوی تەماتە وەردەگرت و هەر لە شووشەی یەك کیلۆیی و نیو کیلۆیی ئاوی تەماتەو مرەبادا چامان دەخواردەوە، پێشمەرگە هەبوو دوو سێ دانە شووشەی یەك کیلۆیی چای دەخواردەوە. خواردنەکانیشمان، مرەبا، ماست، پەنیری کۆز کۆز. پیازو تەماتە، هێلکەی کولاو بوو، زۆرجار زۆر وەزعمان بەدەست مێشوولەوە خراپ دەبوو بە تایبەت لە بناری گەبەو گولیجەو لە شەوانی دەوری گەورەدێ و کەڵەشێرە لە هەمووی ناخۆشتر هات هاتی جاش و کۆپتەر بەڕاستی هەراسانیان کردبووین، چونکە هێشتا خەڵکی سادەو ساویلکەو جاسوس زۆر بوون هەموو رۆژێ دەنگ و باس و جموجوڵمان دەگەیشتەوە دوژمن و هەموو رۆژێ دوژمن بۆمان دەردەچوون. بە تایبەت جاشە درەکانی قالە فەرەج و حەمەی شێخ حەسەن و تەحسین شاوەیس لەودوا دواییەشدا کاوە بازیانی، ئەمانە هەمیشە ماندوویان دەکردین و بە دوامانـدا دەگەڕان، چونکە ئەم سێ چوار سەرۆك جاشە لەپێشدا پێشمەرگە بوون و زۆر شارەزاو زۆر ئازاو شەڕکەر بوون و شارەزای هەڵسوکەوتمان بوون.

# چوونم بۆ هەرێمی دوو

سەرەتا کە چوومە هەرێمی دوو، من دەمێك بوو لە ناوچەکە دابڕابووم بەتایبەت ماوەی دوای ئاش بەتاڵ من چوار ساڵو (٩) مانگ بوو لە زیندانی عێراقدا بوومو پێش لەویش چوار مانگ لە زیندانی ئێران، پێویستم بەوە هەبوو کەمێ شارەزا ببمەوەو خەڵکەکە بناسمەوە. بۆیە هەوڵم ئەدا زۆربەی کات لەچەمی سوورقاوشانو چەمی رەزانو گوندەکانی زەرزیو عەودەڵانو پیرانو شێخ زەینەڵو دەرەناردو گەرمكو سردو سورقاوشانو شێخانو عەسکەرو سۆتکەو مایلەو بۆڵقامیش ببین. بەڵام کاتێکم زانی دووچاری رەخنەیەکی زۆری پێشمەرگە گەنجە تازە نەفەسەکان بووم لە پەناو لەناو خۆیاندا کەوتبوونە مینگە مینگو ئەیانوت: ئەم پیاوە لەم چەمانەدا بۆچی خۆی مەڵاس داوە.؟ برادەر هەبوون قسەی برادەرانیان بە دڵسۆزییەوە دەگێڕایەوە لە پێناوی زانینەوەو چارەسەری پرتەوبۆڵەکە. رۆژانە هەموو ئێوارانێك پێش چوونە گوندەکان قسەم بۆ دەکردن لەسەر چوونە ماڵانو پارێزگاری لەماڵو باخو شەرەفو هەڵسوکەوتن لەگەڵ گوندییەکان لەرێگاش لا نەدانە ناو پەڵە نۆكو بێستانو چوونە ناو باخچەی قەیسییەوە. پاش ئەوەی بە ناوچەکەی خۆم ئاشنا بوومەوە، بڕیارمدا هەموو رۆژێ لەشوێنێکی ناوچەکەوە مەفرەزە بنێرمە سەر رەبایەکانی دەوروبەری گوندەکان، ئەوەبوو لەچەند رۆژێکدا کۆمەڵێك تەقو تۆقمان کردو سەدا بەرز بۆوە کە پێشمەرگە گەشەی کردووە، بەوەوە نەوەستام جەولەیەکی گشتی قەڵاسێوکەو شێخ بزێنی سەروو ئەم دیوو ئەودیوی خاڵخاڵان بکەین هەموومان، بە دوو رۆژ جەولەکەمان گەیاندە کارێزەو هەموو گوندێکمان شەوان لە مزگەوتدا کۆکردەوەو قسەمان لەسەر (ی.ن.ك)و شۆڕشی نوێ بۆ دەکردن. کادرەکانیشمان خەریکی خەڵك رێکخستن بوون بۆ کۆمەڵە لە لایەكو بۆ یەکێتی لەلایەکی تر.

ئێوارە رۆژ لە ئاوابووندا بوو، هێشتا نەگەیشتبووینە گوندی کارێزە لە نێوانی مۆردخواردەی سەروو کارێزەدا ئوتومبیلێکی پڕ لە جوتیار لە کەرکوکەوە هاتبوو توشمان بوونو پاش چاكو خۆشی تکامان لە شۆفێری ئوتومبیلەکە کرد کە سبەی چووە شار ناومان نەهێنێ، شەو چووینە گوندی کارێزەی خاڵخاڵان لە

ماڵەکان دابەش بووین‌و شەویش لە مزگەوتەکە خەڵکەکەمان کۆکردەوەو تێرو پڕ قسەمان کردو ئێمە هەر لە مزگەوتەکە خەوتین‌و ئێشکچیمان دانا. ئاگاداری ئێشکچیم کرد چارەك بۆ چواری بەیانی هەڵم بستێنێ، بۆ چواری بەیانی لە کارێزە دەرچووین روو لە شوێنێ هەتا ئەو رۆژە زۆربەی زۆری پێشمەرگەکان ناوەکەیان نەبیستبوون بەڵام من لە شۆڕشی ئەیلولدا یەك دوو جار رێگام کەوتبووە ئەوناوە زۆر چڕو دۆڵ دۆڵ‌و عاسی بوون پیاوێ زۆر شارەزا نەبوایە رێگای دەرنەدەکرد. لەوێ کەپێی دەوترا (گلەکە مردوو) رێك سێ چارەك لە گوندی کارێزە دوورەو یەم ماڵە جوتیار لەوێ ئەژیان‌و خەریکی مەڕداری بوون. بەیانی هێشتا خەڵکی بۆ ئیش‌و فەرمانیان لەماڵ نەهاتبوونە دەرێ‌و چۆلەکە نەکەوتبووە جریوە جریو، کلاو کوڕەکان وردە وردە کەوتبوونە باڵە پرتە، بەدووربینەکە روانیم لە دەوری گوندی کارێزە جم‌وجوڵێکی سەربازی هەیە، پێدەچوو تەنها چارەکێك دوای ئێمە هاتبوونە دەوری گوندەکە، خێرا فەرماندەی مەفرەزەکانم بانگ کردو دەست نیشان شوێنم بۆ کردن‌و داوام لێکردن تا دوژمن نەیاتە سەر سەرمان کەسێك خۆی دەرنەخات‌و نابێ کەس قوتە قوت بکات، هەر کەسە لە ئاستی خۆی خۆی بشارێتەوەو چاودێری ئەملاولای خۆی بکات‌و دوژمن فەرامۆش نەکەن‌و لەکاتی هاتنی فڕۆکەشدا خۆ دەرنەخەن.

هێشتا رۆژ خۆی نیشان نەدابوو بە ناوچەکە، سوپای عێراقی داگیرکەر کەوتنە پەلاماری گوندی کارێزەو ئوتومبیلەکانیان لە ئۆمەرمەندان‌و تورکمان باخەوە ریزیان بەست بەدوای یەکداو کەوتنە تەقەو زرمە. لە ئاسمانیشەوە فڕۆکە دەرکەوتن بە هەڵهاتنی تیشکی رۆژەکەو لەسەر ئاسمانی هەموو گوندێکی شێخ بزێنی لەنگەریان گرت‌و جاش‌و سەرباز ماڵەو ماڵ دۆڵ‌و لوتکەو باخچە دەگەڕان بە شوێن پێشمەرگەدا. ئێمەش بەهانەسە کوتێ‌و ترس‌و لەرزەوە چاومان لە چاودێری دوژمن نەدەتروکاندو کەسمان ورتە لە دەممانەوە دەرنەدەهات، تا بەتەواوی کارێزە پشکێندراو لەوێش جاش‌و سەرباز سەریان کرد بە رووکاری ئاوبارەو ناسرو میسرو مورد خوادەکاندا، کەمێ هێور بووینەوە. بۆمان دەرکەوت دوژمن قسەی نەزانیوە لەپاش دەرچوونی ئێمە لە کارێزە، بۆیە وردە وردە پەیوەندیمان بە یەکەوە کردو ئاگاداری تاکە ماڵەکەمان کرد ساوەرێکی زۆریان بۆ لێناین‌و مەشکە دۆیەکەشیان ژەندبوو بە ماستاوو دۆو ساوەر تێر تێریان کردینن

ئەوان لە ئێمە زۆرتر ترسابوون، بەڵام پاش دەرکەوتنی ڕەوتی پێشەنگی سوپای دوژمن ئەوانیش خۆشحاڵ بوونو هەر بە خێریان دەزانی ئەو خزمەتەمان بکەن.

ئێمە پاش نان خواردن لە شوێنەکانی خۆمان نەجوولاین، تا ئێوارە سوپای دوژمن گەڕایەوە. ئێوارە بوو دوژمن گەڕایەوە منیش سێ دەمانچەی بێ دەنگو هەندێ ڕاسپاردەی ناوەندی کۆمەڵەم پێ بوون، بە شەهید وریا سوورو شۆڕش قەرەهەنجیریدا بەڕێمکردن بۆ گوندی مام ڕەش بۆ ئەوەی لەوێوە بۆ کۆمیتەی ئاگری کەرکوکی کۆمەڵەی بنێرێ لەوێ ڕێکخستنمان هەبوون کە خۆم دەم ناسینو هەروەها گوللەیەکی قازیفەمان توقیت کردن غەریب سەعید شارەزابوو بە سەعات دای دەنایەوە، ماوەی نیو سەعاتێ شۆڕشو وریا سورمان پێی فێری نانەوەی (دانان کرد) بۆ مەرکەزی ئەمنی چەمچەماڵ، ئەوانمان بەڕێکردو هێزەکەمان بەرەو دوا بۆ چەمی ڕەزان گێڕایەوە، چونکە ئەو ڕۆژە جاشو سوپایەکی زۆر هاتبوون لەگەڵ (٦٠) دانە فڕۆکەی کۆپتەری بارهەڵگرو جەنگی، برادەران بە دیوێکی تردا کەوتنە بۆڵە بۆڵ ئەیان وت: ئەم برادەرە لەم دەشتەدا بەکوشتمان ئەدات، زۆرم قسە پێگەیشتەوە، کۆمکردنەوەو بۆم باسکردن ئەوان بە هیچ رازی نین، لەچەم دەبین، پێیان خراپە، جەولە دەکەین پێیان خراپە، ئەی دەبێ چی بکەین؟!

## شۆڕش قەرەهەنجیری و شەهید وریا سوور

هەر چۆنێ بوو پاش ئەوەی ئەو برادەرەمان بەڕێکرد بۆ کارەکەو ئێمەش بە بەرنامە گەڕاینەوە بۆ دەوروبەری چەم، ئەبوو پاش دوو شەوی تر ناڵە لە مەقەڕی ئەمن هەڵسێندرێ لە چەمچەماڵ، کەئەوە خۆی لەخۆیدا نیشانەی گەشەی شۆڕشێ بوو ئەگەر ئەنجام بدرایە، ئێمە جەولەکەمان بەشەوێك کۆتایی پێ هێناو بۆ سەر لەدوژمن شێواندن گەڕاینەوە دەوروبەری گوندی بۆڵقامیش، بەڵام لە ئەسکەندەر بەگی نانمان خواردو تێشووی سبەینێمان لەکۆڵ بەستو بە نێوانی رەبایەکانی سەر جادەی گۆپتەپەو ئاغجەلەردا رووماں کردە (قەلایگان)و لەوێ چووینە گەچوورەکان کە پڕبوون لە ئاودڕی گەورە گەورە. تاڕۆژی دوای ئێوارەکەی و شەوەکەیشی چووینە بۆڵقامیش کە گوندێکە لە ئاغجەلەرەوە دوورەو کەمێ چڕە بۆ شەڕی پێشمەرگانە دەست دەدات، ئەو شەوە لەوێ ماینەوەو نەمان هێشت خەڵکی بڕۆن بۆ شار بۆ رۆژی سێهەم چووینە دەوارەکانی بەردەعازەبانی کوردە کۆچەرییەکان لەوێش بە ئاسوودەیی تێرمان نانو کەشكو رۆن خواردو بۆ رۆژی چوارەم خۆمان خستە چەمو رەزەکانی دووئاوانو بە ماسی گرتنو خۆشۆرینەوە لەو سەر رووبارە رۆژەکەمان بەڕێ کردو هێشتا سەعاتێ دووانی مابوو رۆژ لەو چەمە ئاوابێ پێش ئەوەی بگەینە سوورقاوشان، هێمنە بچکۆلی شەهید کەکاری ئەوەبوو بارو بنەمان بۆ تاقەت بکات. ئەبوو هەر لەو چەمە بێ هەر کاتێ چووینە ئەوێ بێتە لامان بۆ بەردەستو کاری نهێنی، جا خۆی لاوێکی منداڵکاری چوار شانەی سپی پێست بوو لە دوورەوە دەناسرا هەمیشە خێرا خێرا هەنگاوی دەناو سەری بەبەر خۆی دەناو دەڕۆیشت، هەر کەسێ بیدیتایە نەی دەوت ئەمە هیچ کاری لە دەستدێ بەڵام لەڕاستیدا لاوێکی وشیارو وریاو زیتو بەتوانابوو. ئەوەی بەو دەکرا بە دە پێشمەرگەی تر نەدەکرا، بەڕاستی کادرێکی سیاسیو ئیداری چوستو چالاك بوو لەو چەمەدا چەندان بنکەی ژێر ئەرزی کردبوو، ئەگەر هێزی عێراق هەمووی بهاتایە نەیان ئەتوانی بیگرن، بەس چەند چرکەیەك پێشتر ئاگادار بوایە، دیمان هێمن هات بروسکە ئاسا رووی خۆش نەبوو، دەم بە خەندەییەکەی نەمابوو خۆیشی لەکەس نەدا سڵاوی گشتی کردو ئیشارەتی بە مندا، بردمیە لاڕێ

وتی: دوێنێ شەو قومبەلە بە شۆڕش و وریا سووردا تەقیوەتەوە، وریا شەهید بووەو شۆڕشیش زامدارەو جوتیاران بردوویانە لە گوندی گورگەیی شاردوویانەتەوە، رەنگە سبەی بگاتەوە چەم منیش لە فلانە شوێن دەوا و جێگام بۆ سازداوە.

بەڕاستی هەواڵێکی زۆر ناخۆش بوو چونکە یەکەم هەوڵی من بوو، دووەمیش، یەکەم پۆلی پێشمەرگەو یەکەم جار بوو لەپاش ئاشبەتاڵ کاری وەها بکات، زۆر دڵگران بووم پێشمەرگەکان هەستیان کرد شتێ هەیە لێم نەشاردنەوە بۆم باس کردن ئەوانیش بەشداری پەژارەم بوون. هەر لەو چەمانەدا جەولەمان دەکرد لە پڕێکا هێمن وەکو پەری هەواڵ هێن گەیشتەوەو وتی: مژدەتان بدەمێ، وتمان چییە.؟ وتی شۆڕش و وریا هەردووکیان ماون و شەهید نەبوون، بەڵام هەردووکیان قومبەلەکە سووتاندونی و وریا زۆر مەترسی لێ دەکرێ بمرێ، بەڵام شۆڕش تەنها پێستەکەی رەش بووەو دەتوانرێ هەر لێرە چاك بکرێتەوە. کەوتینە سۆراخی دکتۆرمان نەبوو تەنها مامۆستا شێرکۆو شێرزاد حافز دوو لاوی خوێندەواری گورج و گۆڵ بوون تەواوی برینداره‌کانیان گرتە ئەستۆو پاش هێنانەوەی زامدارەکان بە پەلە وریامان بەڕێکرد بۆ سەرکردایەتی فەردە کامان بۆ هەڵبەست و دەستەیەك پێشمەرگەی ئازامان لەگەڵدا نارد بۆ ناوزەنگ و شەویش لە تەلانەوە بە بن رەبایەکانی سەر جادەی دوکان، کانی خاندا پەڕاندیانەوەو شۆڕش قەرەهەنجیریشمان لە شوێنێکی پەنادا دانا و رۆژانە ئەم برایانە بە هاوکاری شەهید هێمنە بچکۆل سارێژی زامەکانیان بۆ دەکرد.

هێشتا بە تەواوەتی ماندوومان نەحەسابۆوە کەوتینەوە دانانی پیلانی سەردانێکی تر بۆ دێهاتەکانی ناو شوان و ساڵەیی و کردنی زنجیرەیەك کۆبوونەوەی بە پەلە بە جوتیاران و باسکردنی سیاسەتی ی.ن.ك بۆ یان.

## جەولەی یەکەم

ئێوارەیەك لە زەرزییەوە بەناو رەبایەکانی سەر جادەی گشتی قەلاسێوکە پەڕینەوە گوندی مامەلیسی و لەوێ نانی شەومان خواردو خەلکەکەشمان کۆکردەوە، هەرچەندە زوربەی جوتیارەکان لەخەودا بوون کە ئێمە گەیشتین بەلام ئێمە هەر ئەبوو دابەش بین بۆ نان خواردن بۆیە ئەوانیش هەلسان و پاش نان خواردن قسەمان بۆ کردن و بۆ رۆژەکەی بێ ئەوەی خەلکی بزانن چووینە ئاودرەکانی ئەولای مالەکانیانەوە، شوێنەکەمان چەپەك بوو کەمتر ریگای خەلکی بەسەرەوە بوو، ئەوسا دوو جیهازی هۆکی توکی سەربازی دەستی وردی شرمان هەبوو، بۆ لەیەکتری گەیشتن لەگەل کەرتەکان یان لەکاتی حەرەسیاتدا قسەمان پێ دەکرد. ئێوارەکەی ئەو رۆژە بەسەلامەتی رزگارمان بوو بەرەو گوندێکی تر بەرێ کەوتین لە نیوەی رێگا بووین هەوالی جیهازەکانم پرسی، کاتێکم زانی یەکێکیان بەجێماوە، کەوتمە سۆراغی لای کێ بوو کێ دای بەکێ دۆزیمەوە، برادەرێکی خۆم بەناوی وریا ئاغجەلەری کە لە راستیدا ناوی عومەر حاجی عەلی بوو خەلکی گوندی بلوکین بوو لاوێکی خوێندەواری شەرمنی ناوسك ئاوەدان بوو، بانگم کرد وتم: ئەبێ بڕۆی بیدۆزیتەوە یان نەیەیتەوە لامان.! ئەوسا جیهاز بۆ ئێمەی بێ ئیمکانیات زۆر گرنگ بوو، بۆیە کاك وریا خێرا گەرایەوەو پاش سەعاتێ هاتەوە شوێنی دیاریکراوو جیهازەکەی هێنابۆوە.

ئێوارە چووینە گوندی قەسرۆك ئەوسا هێشتا شەهیدان ئەحمەد بەگ قەسرۆکی و رەشید توتە قەلێ شەهید نەببوون و شارەزاو چاوساغمان بوون، خێرا دابەشیان کردین و نانێکی شوانیمان خواردو یەك دوو تراکتۆریان بۆ پەیدا کردین پێی رۆیشتین بۆ نزیکی گوندی کانی رەش و، لەوێ دابەزین و بە پێ بە نێوانی رەبایەی سەربازەکانی عێراقدا پەڕینەوە بۆ شێخ بزێنی خواروو شەو چووینە دەوروبەری مەرزیخەی سەروو لەوێ خۆمان لە شوێنێکدا مەلاسداو هەندێ برادەری رێکخستن ئازووقەی دوو ژەمیان بۆ هێنایین تا دوای نیوەڕۆ تۆزێ زوو بوو دوو تراکتۆرمان لە بەرزیخە سەندو بەرەو توركی و قەرەسالم رۆیشتین و لەوێش سەیارەی ئێوارانی لادێ لە شارەوە هاتبوونەوە، سێ سەیارەمان بە (سوغرە)

گرتو سوار بووین بۆ گوندی بیره سیانی سەروو خوارو، کە لەسەر جادەی سەرەکی کەرکوك هەولێره. ئەو ناوەش جگە لە قەڵا گەورەکەی دارەمانو حەسار جۆرەها ئۆردوگای سەربازی گەوره گەورەی لێ بوو، ناوچەیەکی ستراتیژی ئابوورىو سەربازی زۆر گرنگی دوژمن بوو. هێشتا رۆژ ئاوا نەببوو خۆمان کرد بە هەردوو گوندی سەرجادەی بیره سیانی سەروو خوارو، خێرا پێشمەرگە دەوری گوندمان گرتو باقی چووینه مزگەوتەکانو خێرا داوامان کرد خەڵکی کۆببنەوه، یەکەم جاری دوا ئاش بەتاڵ بوو پێشمەرگە بە چەکەوه بێتەوه ئەو ناوچەیە، بە دە دەقیقە دوژمن ئەیتوانی لەوێ بمان فرێنێ، چونکه ناوچەیەکی دەشتانیەو دوژمنیش بەهەر چوار دەورییەوه بوو، بە سەعاتێ بە تەواوی لە سیاسەتی شۆڕشی نوێو ی.ن.ك مان گەیاندن، تا ئەو کاتە لە زۆربەی ماڵەکان مریشك سەربڕابوو سوور کرابۆوه لەگەڵ تەماتەو خەیارو سەوزەدا، نانێکی پێشمەرگانەی خێرامان خواردو خێرا سواری سەیاره بووینەوه هەر ئێواره بوو خۆمان هەڵدایەوه شێخ بزێنیو تا مەرزیخەی سەروو سەیارەکانمان بردو بۆ خەوی بەیانی چووینەوه کارێزەو تورکمان باخ. جەولەکەمان هێنده سەیرو پەلەو نەترسانە بوو دوژمن بڕوای بە هەواڵ دەرەکان نەکردبوو کە پێشمەرگە وەهای لێ هاتبێ بڕواتە ناوجەرگەی سوپاکەیەوەو ئاوا بێ تۆز دەرباز ببێ.

رۆژی دوایی بەپەلە خۆمان گەیاندەوه قەڵا سێوکەو دەوروبەری سوتکەو مایلە، پێشمەرگەکان ئاهێکیان هاتەوەبەر ئەوه دوو جەولەی ناوچەکەو ناو خەڵکەکە بکەینو زیانیشمان نەبوو، ورده ورده لەگەڵ پێشمەرگەکان شارەزای نەخشەکەی من بووین پرتەو بۆڵە کەم ببوو، نەخشەمان دروستکردنی دەستەی پێشمەرگەی هەر ناوچەیەك خۆی بوو. کۆم کردنەوه پێشنیارمکرد کێ ئەتوانێ پێشمەرگە لە ناوچەکەی خۆی پەیدا بکات ئاگادارم بکاتەوه، زۆرم حەز دەکرد ناو شوان مەفرەزەیەك بۆ خۆی لە کوڕی شوانی هەبێ، بۆ ئەوەی شەوو رۆژ لەناویاندا بێنو شۆڕش لەوێ دەست پێبکەن. حەزمدەکرد بۆ دەوری ساڵەی، بۆ عەلی بەیانیەکان دابمەزرێنم کە لە شۆڕشی پێشوو زۆرم دەناسینو پێشمەرگەشیان هەبوو. چاوم دەگێڕا بۆ کۆنە ناسیاوەکانی خۆشیان دەویستم، هەوڵمدا لەڕێ تەپە کوڕەییەکانەوه دەستەیەك بۆ دەوری تۆمارو مام رەش دروست بکەم، ئەمە لە مێشکمدا دەخولایەوەو ئەمزانی تا پێشمەرگەی ناوچەکە دروست نەکەین

شۆڕشمان پێ نابرێته ئەو ناوچانەی کە پێشمەرگە بە ئاسانی دەستی نایگاتێ.
هەرچەندە ڕێکخستنی کۆمەڵە لەهەموو گوندێکا جێگای خۆی کردبۆوە، هەروەها
یەکێتی نیشتمانیش وردە وردە ڕێکخستنی خۆی دامەزراندبۆوە، ئەو ڕۆژانە تاکە
کەس دەوری دەبینی بەمەرجێ لەناو جەماوەردا کەسایەتی کۆنی نیشتمان
پەروەری‌و پێشمەرگانەی هەبووبێ، منیش لە شۆڕشی پێشوو لەساڵەیی‌و لە
شوانەکان‌و لە شێخ بزێنی‌و لە قەڵا سێوکەو لە سورداشدا ناسرا بووم، تاڕادەیەك
خەڵك بڕوایان پێم هەبوو، بۆیە بەشێوەی فەردی دەورم دەگێڕا بۆ هاتنی لاوی نوێ
بۆ ناو پێشمەرگەو دەست بەجێ کارم دەدانێ‌و دەم ناردەوە بۆ ناوچەکەی خۆی.

# بکوژەکانی من

بیروباوەڕەکەم تا دەهات زەمینەی چەسپانی زیادی دەکرد، شەوێکیان لە پشتی ماڵەکانی سوتکەوە خەوتبووین لەسەر ڕێگای ماڵە کوردە کۆچەریەکانی پشتی گوندی سوتکە، شەو ببوو بە نیوە هاوین بوو هێشتا سەرما ڕێگای لێ نەئەگرتین، لە دەرەوە بخەوین حەرەسەکە بە دەنگێکی بەرز هاواری کردو میلی تفەنگەکەی هێنایەوەو وتی: ئێوە کێن.؟ تێکڕامان خەبەر بووینەوەو خۆمان نووساند بە زەوییەکەوە، هاواریان کرد خۆمانین خۆمان خێرا خێرا خۆیان بە ناسیاو دەدایە قەڵەم، گوێم لێ بوو وتی: هاتووین بۆ لای مام عەلیو ئێمە خەڵکی عەلی بەیانین، ئای بە خەبەرێکی چەند خۆشمزانی، دەنگی یەکێکیانم ناسی وتی من حسێن فەقێ محەمەدی عەلی بەیانیمو هاتووم بۆ لای مام عەلی بچکۆل. بانگم کردن هاتنە پێشەوە سێ چەکدار بوون حسێنم ناسییەوە ئەملاولام ماچ کردن بەخێرهاتنی گەرمم لێکردن. لەو شاخە بووین هیچ نەبوو تا بیاندەینێ نە ئاو نەچا نەڕاخەر هەر لە تەك خۆمەوە داوام لێ کردن هەلاژێن تا بەیانی زوو دەڕۆینو سبەی قسە دەکەین. من لە خۆشی ئەوەی هەوێنی دەستەیەکم بۆ پەیدا بوو نەم دەزانی چۆن خەو لەخۆم بخەم، ئەوانیش لەخۆشی ئەوەی ئێمەیان دۆزیوەتەوە نەدەخەوتن، بەڵام هەر چۆنێ بوو بۆ ئەوەی برا پێشمەرگەکانی ترمان خەویان لێ نەزڕێ من پاش شەو باش نەم دواندنو سبەی زوو چووینەوە بۆ چەمی ڕەزان. لەوێ دەستمان کرد بە خۆ شۆرینو مەلە کردنو جل شۆرین، هەندێ مژو مورەی هەنارە قلیشاوی ناو پەناو پەسێرمان کردو دانە دانەش گوێزمان دەدۆزییەوە.

ئەو سێ برادەرە بەهاریان بۆ هێنامە ئەژنۆ، ئەوسا نە شۆڕش چەکی هەبوو نە خەڵکی، نەمزانی چۆن ئەم سێ برادەرەی من بە سێ کلاشینکۆفی چاکەوە هاتوونو چۆن بەم شەوە ئێمەیان دۆزییەوە.؟ هەندێ شت گلۆپی دادەگیرساند چونکە دوای ئاش بەتاڵو پاش شۆڕشی پێشوو خەڵکی لە ترسی بەعسیو لەبەر خاتری ئیشو کارو بەدەست هێنانی پارەو ژیان گۆڕابوونو نەخشەی زۆڵانەی بەعسیان جێبەجێ دەکرد لەلایەکی ترەوە دەموت لادێ سەبارەت بە ئاستی زانیاری زۆر دوورترن لە خیانەتو ئەمانەش لە پێشتریشدا مریدو دۆستی

بنەماڵەی شەهید عەلی عەسکەری‌و دۆستی نزیکی خۆشم بوون لەکاتی مەلایی‌و جەلالیدا.

دوو رۆژ بوو ئەو برادەرانە هاتبوون شەو چووینە گوندی سەرد، کاتێکم زانی نامەیەکی کۆمیتەی ئاگر هات‌و خوێندمەوە ئەڵێ حسێن‌و عومەر هەیتەو قادر عەلی هەرسێکیان لەلایەن بەعسەوە ناردراون‌و یەکێك لە برادەرەکانی خۆمان چەکەکانی بۆ کڕیون لە رەحیم ئاوای کەرکوك بەوەندە... نامەکە یەکێك لە هاوڕێیەکی زۆر نزیکی خۆمەوە نووسرابوو لاَم سەیر بوو دونیا بۆچی وەها گۆڕاوە، تۆ بڵێی ئەمە راست بێ یان نا.؟ سەرنجی هەندێ ناکۆکی ناو هەندێ پیاوی عەشایەری ناوچەکەم ئەدا لەوە ئەترسام لەژێر ئەو کاریگەریدا راپۆرتی غەرەزی شەخسی هاتبێ، چونکە دوژمن ئەیدەویست پێشمەرگە گەشە بکاو بۆ ئەو مەبەستەش ناکۆکی نێوانی جوتیارانی بەکار دەهێنا. هەر جوتیارێ ببوایە بە پێشمەرگە یەکێکی تری راست دەکردەوەو راپۆرتێکی ئەوەندە شەیتانانەی دەنووسی بڕوابکەی ئەوە پیاوی دوژمنەو ئەبوو هەڵسی خێرا بیکوژی‌و لاشەکەی بخەیتە کەندرە شیوێکەوە، کە ئەمەش لای من بە کارێکی هەڵەشەو ناڕاست دەژمێردرا، بۆیە زۆر گوێم بە ڕاپۆرتی هاوڕێکانم نەداو هەر ئەو شەوە هەرسێکیانم بانگ کردە دووری پێشمەرگەکانی تر لە کاتێکا تەنها یەك حەرەس هەبوو ئەوەی تری خەوتبوون، پێم وتن: دەنگ هەیە ئێوە بۆ ئەوە هاتوون من بکوژن‌و بگەڕێنەوە، گوایە حکومەت ئێوەی ناردووە، کلاشینکۆفەکەم لەسەر رانم دانابوو ئەوانیش هەر یەکێکیان لە بەردەممدا بە چەکەوە گوێیان بۆ دەگرتم. زۆرم قسە بۆ کردن‌و لە کۆتاییدا وتم: ئەگەر یەك زەرە پیاوەتیتان تێدایە دەی من تەنهام‌و ئێوەش سێ دەست بکەنەوە، هەرسێکیان وتیان: بەوەندە سوێندو قورئانە ئێمە لە دڵسۆزی هاتووین‌و هیچ نیازێکی خراپمان نییە، بەوە کۆتاییمان بە قسە هێناو ئەوان چوونە پەنایەکە هەڵاژان‌و منیش چوومەوە دەوری حەرەسەکانی خۆم، نەمهێشت بزانن لە کوێوە خەوتووم، هەر لەو رۆژەوە کە نامەکە هات کەوتمە گومانەوە بەڵام بەڵگەی بڕوا پێ هێنراوم نەبوو، بۆیە رۆژانە شەوان چاودێریم دەکردن.

## شەوی کوشتنی من

شەوێك لەسەر زێی دوکان بەرامبەر گوندی کڵێسە شوێنێکە پێی ئەڵێن بەرشاخ پەنایەکی چڕبوو بۆ ئەوەی جاش دەستی نەمان گاتێ، لەوێ بڕیاری مانەوەو خەوماندا مانگا شەو بوو هەر سێ عەلی بەیانیەکان هاتنە دەورو پشتم‌و خۆیاندا بە ئەرزاو دەستیان کرد بە قسەی زلزل‌و ئەیانویست دڵنیام بکەن‌و نیازیشیان هەبوو لە دەورەی من بخەون، منیش هیچ وام نیشان نەدا گومانیان لێ دەکەم هەتا ئەوان بە درۆ خۆیان خستە خەو. ئەوسا بە هێواشی دوور کەوتمەوەو پێشمەرگەیەکم لەگەڵ بوو ناوی شێخ سەلام بوو بە خزمایەتی دەگەیشتینەوە یەکتری لە راستیدا سەلام زۆر چاودێری دەکردم، کە هەڵساین وتی مامە ئەم ئێوارەیە لەم سێ برادەرە کەوتوومەتە گومان، بۆچی وا هاتنە نزیکی ئێمەوەو خۆیان کردە خەو.؟ کەئێمە هەڵساین ئەوان نەخەوتبوون، منیش وتم: ئەوەندە لای خۆت گەورەی مەکە، بەڵام با لە شوێنێکدا بخەوین ئەوان نەزانن، شوێنێکی دوزییەوە بە وشکە کەڵەك هەڵچندرابوون بۆ ژێر دەواری کۆچەری‌و پوشێکی زۆری تێدابوو لەوێدا خەوتین. چەند رۆژێ لەم حاڵەتە دەروونیەدا ئەژیاین، لەم ماوەیەشدا چەندان نامەی یەك لەسەر یەکی دۆست‌و براو بەشی رێکخستنی کۆمەڵە لەسەر گومان لێکردن لەمانە، بەڵام بەڵگە هەر راپۆرتەکان بوو نەم دەتوانی دەست بەکاری سزایان بم، چونکە وەکو وتم زۆر نامەی تۆڵە سەندنەوە ساز دەکرا، باش بوو زۆری نەخایاند خۆیان ماوەی کارەکەیان تەواو ببوو، لە هەوڵی کوشتنی هەندێ پێشمەرگەدا سەرکەوتوو نەبوون‌و شەوێك هەڵهاتن‌و چوونەوە ئاغجەلەرو پاشان گەیشتنەوە رەحیم ئاوای کەرکوك. لەوێ عومەر خۆی بە کوشتدا، پاش ماوەیەکی تریش قالەش خۆی دووچاری موشکیلە کردو ئەویش کوژراو ئاگاداری وەزعی حسێن نیم.

رۆژانە شۆڕش روو لە گەشە کردن بوو، ئا لەو کاتانەشدا شەڕی نێوانی یەکێتی‌و حسك‌و یەکێتی‌و پارتی ناوە ناوە روویدەدا، بەڵام شەڕەکان بچووك بچووك‌و کەم‌و کورت بوون. زۆرجار ئەبوو لە ناوچەی شوانەوە پێشمەرگە بەرین بۆ ناوزەنگ‌و زەڵێ بۆ پارێزگاری لە بارەگاکانی سەرکردایەتی، هەر لەم کاتانەدا

هەندێ چەکمان لە سەرکردایەتیەوە بۆ هات بەگەورەترین سەرکەوتنمان دەزانی چونکە چەکمان کەم بوو پێشمەرگەمان زۆر بوو، چەکیشمان بۆ نەدەگیرا ئەوە وای کردبوو هەمیشە کەرتی (هەرێم) بریتی بوو لە (١٨)چەکدارو (٢٠)و بەرەو ژوور کە بێ چەك بوونو بۆ زۆریان لە خەڵکانی ئەندازیارو مامۆستاو خوێندەوار بوون زۆرجار کە دووچاری شەڕ دەبووین ئەبوو ئەوانە هەمیشە بخەینە دوای خۆمانەوەو ئاگاداریان دەبووین کە بە دیل نەگیرێن. بۆ نموونە کە دووچاری شەڕی رۆژی (١٩٨٠/١٢/٢٢) نێوان عەسکەرو سوتکە بووین بەشێکی زۆری بێ چەکەکانمان لەماڵە کوردەکاندا دانابوو کەچی سێ کۆپتەری جەنگی هاتو یەکسەر چووە سەر ئەوانو کارێکی پێ کردن بە سودفە رزگاریان بوو، لە کاتێکا چەکدارەکان دووچاری ئابلۆقەی بەهێزی سەربازو جاش ببووینو شەڕی مەرگمان دەکردو هەر لەو شەڕەدا بەشەو رزگارمان بوو. سێ شەهیدو چەند زامدارماندا بەڵام تا بێ چەکەکانمان نەهێنایەوە خەتی کشانەوە مەیدانی شەڕەکەمان بەجێ نەهێشت، هەر چەندە لە ئێوارە درەنگانێکا لە پاشەڵی ئەو هێزەماندا کە هێرشی هێنابوو بۆ گوندەکانی گۆپتەپەو هەیدەر بەگو عەسکەر.

# سەرەتای هەشتاکان: باوکایەتی، راپەڕین، ئێران
# لەشکری ئیسلامی

کاتێکمان زانی ئێرانیەکان هێزێکی کوردیان پەیدا کرد بەناوی (لەشکری ئیسلامی کورد)ی (حاجی شێخ قادرو عەباس شەبەك) سەرپەرشتییان دەکردن، زۆرجار داوامان لێدەکرد با بەیەکەوە پەلاماری بنکەی سەربازیو جاشی ناوچەکە بدەین، بەڵام ئەوان چونکە مانگانەی چاکیان هەبوو چەکی نوێو چاکیان هەبوو وەکو (R.P.G و B.K.C)و کلاشینکۆفی بێ قۆناغی چاك هاوکاریان نەدەکردینو زۆر فەرماندەی کەرتو دەستەیان لێهەڵگێڕاینەوە. ببوون بەهۆی لاوازی هەرێمەکەمان، رۆژگارێکی زۆری نەبرد بنکەیەکی گەورەیان لە سەرگەڵوو بەرگەڵوو داناو ژیانێکی نوێی چاکیان بۆ چەکدارەکانیان دامەزراندو جیهازێکی راکاڵی گەورەشیان لابوو، سەعات سەعات لەگەڵ تاراندا قسەیان دەکردو هەندێکیشیان پارتی بوونو بەو ناوەوە هاتبوونە ئەو ناوە. لەشکری ئیسلامی زۆر مەغرووڕانە کاریان دەکردو وەکو گۆلێك ئاویش بوون کە ماسیو سەرەمێکوتەو بۆقو قرژاڵو کیسەڵیشی تێدابێ، ئەوانیش پڕ بوون لە خەڵکانی سەر بە عێراقو بە ئێرانو بە سوریاو بە لیبیاو بە پارتیو بە رێکخراوو پارتە سیاسیەکانی تری کوردستان، پارەو چەك کۆی کردبوونەوە، لە هەرەتی گەشە کردنندا بوون یەکێتی پەلاماریدان، لەکاتژمێری سفراو لەماوەی یەك دوو کاتژمێردا چەند هەزار چەکداریان لە چەك داماڵدرانو هەندێ کوشتاریش لە هەردوولا روویدا، بەوەش ساحەی یەکێتی فراوانتر بوو ئەو چەکانەش کەوتنە شانی ئەو پێشمەرگانەی کە بە دڵسۆزییەوە پەلاماری دوژمنیان ئەداو هەنگاوێکی چاك هەرێمەکانی بردە پێشەوە. ئەوسا، ژمارەی پێشمەرگەش چاك گەشەی کرد ئەوەی دەبوو بە لەشکری ئیسلامی بوون بە (پ.م)و ئەچوونە سەنگەری دژی داگیرکەرانەوە.

من بەهۆی ژن هێنانەوە چوومە بارەگاکانی سەرکردایەتیو ماوەیەك لەوێ مامەوەو شەهید ئەنوەر حەسەن بوو بە جێگری منو، هەرێمەکەی لەگەڵ هێزێکی گەورەی رێکخراوی یەکێتی کەبۆ مەڵبەندی سیو چوار دەنێردرا بەرێکەوتنو زۆر بەداخەوە لە پشتی قەڵادزێ لەلایەن هێزێکی ئاسمانی دوژمنەوە بۆردومان کرانو خەڵکێکی زۆر شەهیدو زامدار بوون لەوانە شاعیرو مامۆستا (جەمیل رەنجبەر)

شـەهید بـوو ئەنـدامی سـەرکردایەتی کـاك (عومـەری سـەید عـەلی) زامـدار بـوو سـکرتێری گشـتی ڕەزامەنـدی لەسـەر داو ناچـار لـە بارەگاکـانی سـەرکردایەتی خانوویەکم کردو تا کاروانی کوڕم لەدایك بوو هەر لەوێ بووم. پێش ئەوەی کاروان لەدایك ببێ روناکم نارد بۆ شاری سنەو لەوێ چاوەڕوانی لەدایك بوونی کاروان بکاو خۆیشم بەکاری دەزگای ڕێکخستنی کۆمەڵە چوومەوە بۆ ناوچەی خۆمان. ئا لەو کاتانەدا ڕاپەڕین لە شارەکان دەستی پێکردبوو بەهۆی پەلامارو شەڕی ئێرانی عێراقی لەگەڵ شەهیدان شێخ شەماڵو شەهید سەربازو شەهید مولازم خولەو چەند هاوڕێیەکی تر چووینە ناو شاری کۆیەو شەوێك تا نزیکی بەیانی چووینە کۆڵانەکانو بە جیهاز قسەمان بۆ جاشەکان دەکردو پەیوەندیمان کرد بە هەندێ خەڵکی نیشتمان پەروەرەوە لەوانە شێخ جەنگی برای مام جەلالو مامۆستا عوسمانی باوکی نەرمین خانو شەهید ئازاد.

ئەو شەوە کە چووینە گەڕەکەکانی شاری کۆیە شەهید سەرباز چاوساغی بۆ دەکردینو دابەشی دەکردین، چووینە هەر گەڕەکێك لەبەر دەرگای هەر ماڵێکا دوو سێ کچو کوڕ پیاوو ژن ڕاوەستابوون بەکاسەی پڕی بەفرو دۆو ماستاوو بەفر بەڕوو خۆشیو پەرۆشەوە فەرمووی ماڵەکانی خۆیان دەکردین. بەڕاستی لەوێدا تامو چێژی خەباتی خاوێن بۆ ڕزگاری جەماوەر دەردەکەوێ.

هەر لەو ساڵانەدا بوو تازە شەڕی نێوانی عێراق وئێران دەستی پێ کردبوو من بـە هەرێمەکەمـەوە پـەلاماری گونـدی گۆپتەپەمـدا، کـە گـەورەترین سـەربازگەی حکومەت بوو، ڕاومان نانو چووینە ناو دێیەکەوە، هەموومان دەناسینو وتمان: کێ بووە بە بەعسی خۆی بێت پێمان بڵێت.؟ ئەزانین لە ترساندا بوون بە بەعسی بەڵام ئـەوەی پێمـان نـەڵێ پاشـەڕۆژ موحاسـەبەی تونـدو سـزای تونـدی ئـەدەین، خەڵکەکە خۆی لەبەردەمی مزگەوتو قەڵاکەی گۆپتەپەدا کۆببوونەوە، تەماشامکرد لەو گوندەدا چەند کەسێکی بەعسی هاتە دەرێ، هەندێ حاشایان دەکردو بانگمان - کردن بۆ ئەوەی ئاگادار بێ کە دەزانین یەکێك لەجیاتیێ یەکێکی تر تەلاقی خوارد کە نەبووە بە بەعسی، بەڵام کاتێ بانگمان کرد ناوی خۆی ئاشکرای کرد کە چەکێکی لایەو بەعسییە زۆر لە کۆنەوە، ئەوسا وابوو لەپاش ئاش بەتاڵەوە خەڵکی لەبەعسی زۆر ئەترسان خۆ ئەگەر ڕەبایەیەك یان سەبازگەیەك لەدەوریان بوایە ئەوە زۆر بەئاسانی بەعسی جێگای خۆی لەوێ دەکردەوە. خەڵکی لەناوچەی خۆیان دەگونجاند.

## شەڕی هێزی پشتیوان

ساڵی (١٩٨٢) بوو شەڕێکی گەورە لە نێوانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و کۆماری ئیسلامی ئێراندا ببووە هۆی ئەوەی زۆربەی ناوچەکانی کە لە راپەڕینی ئێران دژی شاە رزگار کرابوو بگرنەوە، یەکێتی بەناوی هێزی پشتیوان هێزەکەی خۆی ناردە هاوکاری حیزبی دیموکراتی ئێران و منیش لەلایەن سکرتێری گشتی مەکتەبی عەسکەرییەوە بانگکرام و راسپێردرام چەند تیپێ بەرم و بڕۆم لە ناوچەی سەردەشت و رەبەت بەرگری بکەم، منیش بۆ ماوەی دوو مانگ سەرپەرشتی ئەو هێزەمکرد کە پێك هاتبوو لە تیپی (٤٣)ی ئاسۆس و تیپی مامەندە قادر ئاغا و تیپی کوڕە کاژاوو ئۆمەر ئاغا و تیپی شێخ سەدرەدین و تیپی جوتیاران. بەڕاستی هەموویان ئەوەندە بە پیاوانە کاریان لەگەڵ کردم سەربەرزی بەردەمی حیزب و یەکێتییان کردم و ئێران لای ئێمەوە هەنگاوی پێ نەهاوێژرا هەرچەندە لەو هەڵوێستەی یەکێتیدا شەهیدی چاکدرا بەڵام هەڵوێستێکی کوردانەو دڵسۆزانەبوو.

ئێمەیش مانگی ١١ ساڵی ١٩٨٢ بوو بەفرێکی چاك باری و نێوان ئێمەو ئێرانی دیوارکردو برادەرانی حیزبی دیموکرات وتیان ماڵتان ئاواو شەڕ بەتاڵە جەرناڵ بەفر هاتووە.

گەڕامەوە (ناوزەنگ و زەڵێ) لەوێ لە(بنەوخەڵەف) شەهید (قاسم لوو مام جەلال)م تووش بوو، شەهید د. قاسم لوو زۆر سوپاسی کردین و رێزی بۆ هەموو سەرتیپ و تێکڕای پێشمەرگەکان هەبوو.

هەر لەو ماوانەدابوو گۆڕانکارییەکی سیاسی هەبوو (مام جەلال) لەدەرەوەبوو بە ئێراندا هاتەوە یان چووبوو بۆ ئێران و دەگەڕایەوە، من هێزێکم بردو چووم بەدوایدا بۆ بۆکان، ئەوسا شەهید حەسەن کوێستانی سەرتیپ یان مەسئوولی عەسکەری بوو، بردم لەگەڵ خۆم و چەند رۆژێ چاوەڕوانی (مام جەلال)مان کرد. پاشان لای ئێمەوە نەهاتەوە و ئێمەیش گەڕاینەوە ناو زەنگ، ئەوسا هێشتا شەڕمان لەدژی کۆماری ئیسلامی ئێران نەکردبوو، حیزبی دیموکراتی کوردستان هەر لە بۆکان و مهاباد بوو.

## مەڵبەندی دوو

ساڵی (١٩٨٣) بوو کۆنفرانسی دووهەمی کۆمەڵە کرا لە ناوزەنگ لەوێدا هەڵبژێردرامەوە بۆ سەرکردایەتی کۆمەڵەو لەکۆبوونەوەی یەکێتیدا داندرام بۆ مەسئوولی مەڵبەندی دوو کە یەکەم جار ناوی مەڵبەند هاتە پێشەوەو یەکێتی سنوورەکەشی بەسەر چوار مەڵبەنددا دابەش کرا کە گەورەترین مەڵبەند ئەو مەڵبەندەبوو کەبە من سپێردراو هەندێ لە ئەندامانی شۆڕشگێڕانو خەتی گشتی یان لەگەڵ دانام مەڵبەندەکەم بەم شێوەیە بوو:

١- عەلی بچکۆل مەسئوولی مەڵبەندی دوو.
٢- مستەفا چاوڕەش لێپرسراوی عەسکەری.
٣- دارا شێخ جەلال مەسئوولی دارایی.
٤- ئاوات مەسئوولی سیاسی مەڵبەند.
٥- شێخ محەمەد شێخ مەحمود کۆمەڵایەتی.
٦- عەبدولکەریم حاجی مەسئوولی ئیعلام.
٧- دکتۆر فایەق – بەشی تەندروستی
٨- حاکم سەمەد – حاکم عەزیز- حاکم عمران- بەشی دادگا

پاش تەواو بوونی کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی خۆم کۆکردەوەو بە دەشتی قەڵادزێا بەرەو گەرمکان رۆیشتم پاشان بە ئاسۆسدا هەڵگەڕام، بۆ بەری مەرگە لەو رێگایەدا زۆر ماندوو بووین، جگە لەوەی باران دەباریو تاریکە شەو بوو رەبایەی جاشو سەرباز لەسەر رێگا زۆر بوو.

کاتێ گەیشتینە مەرگە دەستم کرد بە نامە نووسینو پەیوەندی دروستکردن بە خەڵکانی ریش سپیو پیاوە ناودارەکانی ناوچەکەوە، بۆ ئەوەی هاوکاریمان بکەن لەوەی پارتی رێگای یەکێتی بدات هێزی بڕواتە بادینان بۆ ئەوەی یەکێتیش تەنگ بە هێزەکانی ئەوان لە ناوچەی سۆران هەڵنەچنێ، بەڵام پاش رۆژێ لەم کۆششەی ئێمە لە ناوچەی مەرگە، کاتێ بەرێ کەوتین بۆ سەرگەڵوو لە گوندی سێدەر هەڵوێستەیەکمان کرد بۆ هەندێ قسە کردن لەگەڵ دوو سێ خەڵکی گوندەکە لەسەر رێگاکە بووین، تەتەرێکی یەکێتی لە ئەنجومەنی سەرگەڵووەوە هات وتی:

ئەمشەو هەموو ئەو خانوانەی شۆڕش لە بەرگەڵوو بوو سوتێندراوە، ئێمەیش مەسەلەکەمان بۆ خەڵکەکە باس کردو نیاز پاکی خۆشمان پێ راگەیاندن. بە بەردەمی قۆمرغان‌و قەرەنگۆی‌و مەولاندا کەوتینەڕێ‌و لەلای حاجی مستەفای مەولان لاماندراو لەڕێ شێخ محەمەد سەرگەڵوویی ناوسێلێکی بۆ کردین ئەو زیاتر لەگەڵ حاجی مستەفا دۆست بوو بە هەردوکیان گیسکێکیان سەربڕی‌و نانی (١٥) کەسیان بۆ ساز داین‌و لەوێش مەسەلەکانمان بەحاجی مستەفاش راگەیاندو تکامان لێکرد وەکو مرۆڤێکی ناسراوی ناوچەکە قسەکانمان رابگەیەنێ بە خەڵکی وتمان: زۆرمان پێ خۆشە کوردستان بۆ کورد ئازاد بێ، پارتی‌و یەکێتی لەگەڵ هەموو پارتە بچووکەکانی تر مافیان هەبێ لە هەر شوێنێکا شەڕ هەبوو لەگەڵ دوژمنی داگیرکەر بجەنگێن‌و لەکوێ بیانەوێ بارەگاو بنکەو سەنگەر دروست بکەن. بەڵام پارتی رێگای یەکێتی نادا لە بادینان کاربکا لەم ناوچەیەش یەکێتی هێزی سەرەکییە، ئەگەر پارتی ئەو بڕیارە جێبەجێ نەکا چاکتر وایە ناوچەکە بێ شەڕ چۆڵ بکا بۆ ئەوەی شەڕمان نەبێ.

پاش نان خواردن بەرەو سەرگەڵوو بەڕێ کەوتین، کاتێ گەیشتینە بەرگەڵوو هێشتا کەلاوەکان دوکەڵیان لێ هەڵدەستا یەکسەر خانوو سووتانەکەی سەردەمی بەعس‌و حەرەس قەومییەکانم هاتە بەرچاو.

ئێوارە بوو چووینە لای مزگەوتەکەی سەرگەڵوو خەڵکەکە زۆر خۆشحاڵ دیار نەبوون بە گەیشتنی ئێمە هەندێ برادەری خۆمان هەبوو هاتن بەرەو پیرمان‌و هەندێکیش لە شێخ محەمەدو شێخ عەبدولکەریم کاکە حەمە کۆبوونەوە چونکە ئەوان خەڵکی خۆیان بوون، پرسیم بۆچی خەڵکەکە گرژ دیارن، وتیان: زۆریان پێ خۆشە بڕیار دراوە سەرگەڵوو ببێ بە مەڵبەند بەڵام لەوە ئەترسن هێزەکانی پارتی‌و حسک‌و پاسۆک‌و حشع لەم ناوەن دووچاری شەڕ بین‌و لەم نێوانەدا خەڵکی بکوژرێ. زۆر نەوەستاین لە ماڵی هاوڕێکانی خۆمان دابەش بووین ئاگادارمان کردن ئەگەر کەسانی لایەنەکان هاتن ئێوە خۆتان تێك مەدەن، ئەگەر ویستیان شەڕ بفرۆشن خۆتان دوور بخەنەوە، بۆ ئەوەی پەیامەکەمان بە خەڵکی بگەیەنن‌و وردەو وردەش ئەنێرین تیپەکانمان هێزمان بۆ بنێرن نەکو ئەوان بیانەوێ پەلامارمان بدەن، رۆژی دووهەم بوو گەیشتبووینە سەرگەڵوو هێشتا خەڵکمان بۆ قسە بۆ کردن کۆنەکردبۆوە لەمزگەوت، هاوڕێکان هاتنە لام وتیان: حسك هاتوون‌و

حەرەسـیان لـە هــەر چــوار دەوری گوندەکــە دانــاوە، جــارێکی تــر داوای ددان بەخۆگرتنمان لێ کردن‌و پێمان وتـن: ئێوە حەرەس دامەنێن، باش بوو ئەوان زۆر نەمانەوەو سەرگەڵوویان چۆڵ کرد.

رۆژی سـێهەم خـەڵکی سـەرگەڵوومان کـۆکردەوەو قسـەمان بـۆ کـردن لـە بابـەت وەزعەکەو ناکۆکیەکانمان لەگەڵ ئەو هێزانـەو وتمان: تـەنها پارتی بۆی نییـە لـەم ناوچەیە بێ، بەڵام هێزەکانی پارتەکانی تر ئازادن. چونکە پارتیە ناهێڵێ برۆینـە ناوچەی بادینـان. لـە کۆبوونەوەکەدا بۆمـان دەرکـەوت زۆربـەی خـەڵکی سـەرگەڵوو لایـەنگری ئێمــەن‌و قســەکانیان پــێ راســت‌و پەســەندبوو، داوامــان کــرد لــەرێی خۆیانەوە راستییەکان بۆ جەماوەری دۆڵێ رۆشن بکەنەوە.

چـەند رۆژ تێپـەڕی هێـزی تیپـی ۲۱+ ۲۵+ سـورداش+ ئاسـۆس‌و جوتیـاران‌و تیپەکانی مامەندەو کورە کاژاوو تیپی شێخ سەدرەدین‌و تیپی ٤٧و تیپی ٥٧ی سەگرمەش گەیشتن، هێزەکانی ئێمـە ناوچەکەی تـەنی، بەفرێکی زۆریـش دۆڵـێی گرتبوو، وشکە سەرمایەکی زۆر بوو ئەبوو بجوڵێین، بنکەو جیهازێکی گەورەمان لە سەرگەڵوو داناو بە دوو (رەتڵ) کەوتینـەرێ لـە سـەرگەڵوو بۆ یاخسـەمەرو بنـارەو بنار بۆ قەیوانەکان. لـە بەرگەڵوو بۆ مالوومـەو لـە مالوومـە لووتمـان بـوو بـە لـووتی هێزەکانی ئـەو پارتانـەی لـە پێشـەوە ناومـان بردبوون، مالوومـە گوندێکی خزمـەت گوزارو پان بۆوەی ژێر پێی پێشمەرگە بوون، بەڵام جۆرەهـا مرۆڤی شـێتیان هـەبوو هەیان بوو بەهەر چوار دەوری خۆیدا دەسووڕایەوەو نوێـژی دەکرد، هـەیان بـوو لـە دوای نــان خــواردنی ئێــوارە نامەیــەکی دەگرتــە دەســتەوەو هەواڵــەکانی چــالاکی پێشمەرگانەی دەخوێندەوە، هەشیان بوو دیوەخانی دانابوو. هەر لەوانەی بە شێت ناو دەبرا وەکو حاجی قادر دێگەڵی مالوومـە، هـەر کـەس بیوتایـە: دێ، ئەو ئەیوت دایکت، بیوتایە گەل، واتە (دی گەل) ئەو ئەیوت: دایکت وا لێبکەم. جا هەر کەسێ بوایە، لـەم گونـدە کـەزەوی دەوروبـەری هـەمووی چیلکەی باخچـە بـوو هـەمووی بۆ شـەڕە تفـەنگ سـەنگەر بـوو. چـووینە مـاڵی حـاجی قـادر لـەوێ ناردمـان نوێنـەری حسـك، حشـع، باسـۆك، هـاتن ئەوەنـدەی لـە یـادم مابـێ محەمـەدی حـاجی مـەحمود نوێنــەری حســك بــوو، لەگــەڵ قــادر چاوشــینی گــەلاڵی‌و قــادر چاوشــینەکەی تــر، عوسمانی قالەی منەوەر، نوێنەری حشع (حەمە سالّح) قەرەچەتانی بوو، نوێنـەری پاسۆك لە یادم چۆوە کێ بوو، من‌و شێخ سـەدرەدین‌و ئـاوات عەبدولغـەفورو شێخ

محەمەد سەرگەڵوویی و رۆستەم و کۆمەڵێکی تر بوون لە کادرەکان لە یادم نەماون. من نانم نەخواردبوو لەگەڵ حاجی قادریش زۆر دۆست بووین لە کاتی خۆی شەهید (جەمال عەلی باپیر) بە یەکتری ناساندین، کاتێ لە زیندانی ئەبو غرێب ئازاد بووم لەگەڵ شەهید ئەنوەر حەسەن و کاك فەرەیدونندا چووینە ماڵیان و شەهید جەمال باسی ئێمەی بۆ کردبوون، پێشووتر کە لە زیندانین. حاجی قادر زۆر رێزی لێگرتم و هەندێ گاڵتە و گەپی لەگەڵ عوسمان قادر منەوەر کرد، ئەو وتی: دی گەل ئەویش وتی: دایکتان وا لێدەکەم ئەی (سیك و تیکەن) هەموو کەوتینە پێکەنین، لەو ژوورەی سەرخانەکەی حاجی قادر کە کەم پێشمەرگە هەبووە نانی لێ نەخواردبێ یازدە، دوازدە مەسئوولی هەموو لایەنەکان کۆببووینەوە بۆ دۆزینەوەی چارەسەر. سەرەتا رێکگایاندا من قسە بکەم بە حیساب مەسئوولی مەڵبەندی دووم و ئەو ناوچەیە من لێی بەرپرسیارم، قاپێك برنجی بێ شۆربیام لەبەردەم بوو گرتمە دەستمەوە و بە کەوچکێ وردە وردە دەستم کرد بە قسە کردن، سەرەتا هەندێ گلەیی دۆستانەم لە محەمەدی حاجی مەحمود کرد، پاشان دەستمان کرد بە قسە لەسەر رێکگاچارە.

١- ئێمە وتمان: ئێمە کوردستان بە موڵکی خەڵکی کورد دەزانین کە هەمووومان دەگرێتەوە.

٢- بە مافی هەموومانی دەزانین سەنگەر لێبدەین لە هەر شوێنێکا هەین و دوژمنی لێ هەیە، هەروەها بنکەی حەسانەوەش لەگەڵ محازەسەی سیاسی و کۆمەڵایەتی پێشمەرگانەی لێبکەین.

٣- داوا لە ئێوە دەکەین هەوڵبدەن پارتی رێگا بە هێزی یەکێتی بدات بڕواتە ناوچەی بادینان و لە ماوەی (٢٤) سەعاتدا هەمووتان بروسکەیەك بکەن بۆ پارتی و سەرکردایەتی بارزانی بڕیار بدات ئێمە هێز بنێرین بۆ ناوچەی بادینان، ئەگەر رێکگایدا ئێستاش ئێمە رێگای پارتی ئەدەین بۆ هەر شوێنێك ئەیەوێ جەولە بکا، ئەگەریش رازی نەبوون ئەوە ئێوە لە پارتی دوور بکەونەوە و ئێمە و ئەوان نێوانی خۆمان جێبەجێ دەکەین.

٤- من پێشنیارم کرد ئەگەر پێشتان چاکە پێشمەرگە ئازاد بێ لای یەکێتی ئەچێ بۆلای هەر پارتێکی تر بە چەکەکەیەوە بڕوا و چەکی

نەکەین و لەسەری نەیکەین بەشەڕ، هەروەها لەلای هەر لایەنێکی تریشەوە پێشمەرگە هات بۆ ناو یەکێتی با مافی خۆی پێ بدرێت.

هەموویان ئیمزایان کردو نوێنەریان نارد بۆ ولاخ لوو، (قادر قادر) لەو ناوەبوو، خەبەرەکەیان پێدا، زانیاریمان پێگەیی هەر ئەو شەوە هێزەکانی پارتی بەرێکەوتن بەرەو شارباژێرو ناوچەی مەڵبەندی دوویان بەجێهێشت.

ئەو رۆژە پاش ئیمزاکردن، کاتێ لە ژوورەکە هاتینە دەرێ هەر چوار لای ئەو تەنها هۆدەیە بە ئارپیجی و بیکەیسی گیرابوو، ئەگەر تەقەیەك بکرابایە ئێمە هەموومان نوێنەری هەموو لایەنەکان ئەکوژراین. کەچی لەژوورەوە زوو زوو کاك(.....) ئیشارەتی ئەدامێ ئەیوت: با بە مەغزەنی ٧٥یەوە ڕەمییان لێبکەم منیش رووم نەئەدایەو نیشانم ئەدا واز لەو هەڵوێستە بهێنێ.

لەو بڕیارەی ژمارە پێنج عوسمانی قالەی منەوەر زۆر خۆش حاڵ بوو، نەمدەزانی بۆچی کاتێ بڵاوەمانکرد منو شێخ سەدرەدین و ئاوات هەر لای قادر دێگەل مابووینەوە، یەکێك لە شێتەکانی مالوومە خۆی کرد بە باڵەخانەکەداو وتی: مام علي فریا کەوە شەڕ دەست پێدەکا ئەوە رۆستەم و عوسمانی قالەی منەوەر سەنگەریان لێك گرتووە. ئێمەش خێرا رۆیشتین هەر لە پەنای ماڵی قادردا شەهید مەلا ئارازی رەحمەتی ساڵحە سووری هەڵەدنی چەك کردبوو، کە یەکێك لە هەرە کورە ئازاکانی حسکی ئەو ناوە بوو. ساڵحم ئازاد کردو چەکەکەم دایەوە، نامەیەکی محەمەدی حاجی مەحمود هات دووسێ وشە بوو وتبوی: ئێوە شەڕ ئەکەن یان ئاشتی پێم بڵێن.؟ وەڵامم بۆ نارد شەڕ نەکەی، ئێستا دەگەمە لات. رامکرد رۆستەم و عوسمانم لێك جیاکردەوەو بەرەو لای کاك محەمەد رۆیشتم، ئەبینم هەر چوار دەوری گیراوە ئەویش لەسەر ئاخر سەربانی مالوومە روو لە سەرگەڵوو وەستاوە. لە دوورەوە تووڕەبوونی پێوەدیاربوو. لێی نزیك بوومەوەو قسەم بۆ کردو ئەمویست دڵنیای بکەین ئەوە سیاسەتی یەکێتی نییە بەڵکە هەڵچوونی فەردییە، کاتێ لەمە کۆڵاینەوە دەرکەوت عوسمان کەڵکی لەو بڕیارەی ژمارە (٥)ە وەرگرتووەو خێرا پێشمەرگەیەکی نوێی یەکێتی هەڵخەڵەتاندووە کە ئارپیجی یەکەی لابووە لە تیپی (٢١) کەرکوك کە هەموو تیپەکە دوو ئارپیجییان هەبوو. ئار پی جیش بۆ ئەوان زۆر بە کەڵك بوو، چونکە لە دەورووبەری کەرکوك سەنگەریان لێدابوو، کاتێ رۆستەم ئەمەی زانیبوو وتبوی: ئەو کوڕە چەکی نییە

ئەوەش ئارپیجی تیپەکەیە، چەکەکەمان بدەنەوە یا لای ئێوە بێ. عوسمانیش لەخۆشی ئارپیجییەکە ئەوەی کردو لەوەوە (سمر سمر) دەستی پێکرد بوو، کاتێکم زانی جۆرەها لوولە رووی لەپشتی من بوو، لەسکی محەمەدو لەپشتی محەمەدبوو سکی من کردووە، لە هێزی هەردوولامان تەنها یەك تەقە ئەو رۆژە زیاتر لە (٣٠٠) کەسی تێدا دەکوژرا. هەر چۆنێك بوو کاك محەمەدم ئاشتکردەوەو بەرەو سەرگەڵوو هێزەکەی ئەومان بەرێکرد، ئێمە ماینەوەو نیازمان هەبوو ئەگەر وەڵامی باشی پارتی نەیاتەوە نەهێڵین پارتی لە ناوچەکەمان جەولە بکەن، بەڵام هەر ئەو شەوە (سوارە فەتاح) جاسەنەیی بە خۆی و(١١) چەکدارەوە لای پارتییەوە هاتنەوەو وتیان: پارتی رازی نین لەسەر چوونی (ی.ن.ك) بۆ بادینان و خۆشیان بێ شەڕ چوونەوە بۆ ناوچەی مەڵبەندی یەك لە شارباژێر. ئەم خەبەرەم زۆر پێ خۆشبوو چونکە کوشتارەکە هەمووی هەر لەکیس میللەتەکەمان دەچوو، بەراستی شتێکی سەر سوڕهێنەر بوو کە ئەمڕۆش خەڵکێکی زۆر نەکوژرا. ئەگەر لەسەرخۆ نەبومایە کارەساتێکی هەرگیز لەیاد نەچوو دروستدەبوو.

بەم شێوەیە توانیمان ناوچەی مەڵبەندی دوو رزگار بکەین لە شەڕی ناوخۆیی، بەڵام زۆری بەسەردا نەچوو هێزەکانی ئەو لایەنانەی باسمانکرد لەگەڵ پارتی پەلاماری مەڵبەندی چواریانداو لە زۆر لاوە هاتوچۆیان بڕی بۆ مەڵبەند. من لای خۆمەوە دوو سێ هەزار دینارێکم بەرێگای نهێنیدا نارد بۆ مەڵبەندو هێزێکی چاکم ساز کردو بەرەو مەڵبەند کەوتمەڕێ من لەلای کانی ماران چوومەوە سەر دۆڵ و چیوەکان، بەڵام نەوشیروان لەو دۆڵەدابوو بڕیاردرا من پەلاماری ناوچەی نازەنین بدەم. پەلاماری چیای پشتی سماقوڵیەکانمدا لەهەموو دۆڵی سماقووڵی هێزەکانی حسك کەزیاتر لەوێ بوو هەڵمان بڕی بۆ دەشتی هەولێرو بەلای دێگەڵەدا شۆڕ بووینەوەو لە بیرەرو باوەقوبەوە چوینەوە گۆپتەپەو گۆمەشین و لەوێشەوە بەستی شەرغەو پاشان پەلاماری دێدەوانەکانمانداو لە باغەمرەوە روو لە کەڵەکی یاسین ئاغا هەڵمان بڕین و ئێمە هەتا دارەتوو کونە گورگ چووین و شەوێك دارەتووم کۆکردەوەو قسەم لەسەر وەزعەکە بۆ کردن. پاشان گەڕامەوە بۆ مەڵبەند.

ساڵانەدا لە هەموو رووەکانەوە مەڵبەندی دوودا یەکەمی مەڵبەندەکانی یەکێتی بوو، ئەو ساڵانە

چوار مەڵبەند هەبوو لەناوچەی دەسەڵاتی (ی.ن.ك)دا كە مەڵبەندی دوو زۆربەی شاری سلێمانی و هەموو ناوچەی كەركوكی دەگرتەوە.

لە كاتێكا مەڵبەندمان دامەزراند زۆر گرنگیماندا بە كاروباری كۆمەڵایەتی، كێشەو گرفتە گەورەكانی ناوچەكانمان هەموو هەڵسەنگاندو هەوڵێكی زۆرماندا كێشەكان بەشێوەی ئاشتیانە چارەسەر بكەین، بەڵام هەندێ كێشەی زەوی لەهەندێ شوێن هەندێك كادرە هەڵەشەكانی كۆمەڵە زۆریان ئاڵۆزكاندبوو، چارەسەری ئاسان نەبوو، هەروەكو موشكیلەی زەوی لە ناوچەكانی ساڵەیی خواروو شێخ بزێنی خواروو سەروو هەندێ لە ناوچەكانی شوانو هەندێ ناوچەی قەڵاسێوكەو هەندێ لە ناوچەی سورداش كەیشتبووە ئەوەی زەوی تۆو كراوی سەوزیان هەڵدەگێڕایەوە، یان بە گوریس زەوییان دابەش دەكرد. ئەگەرچی ی.ن.ك ئەیوت: یاسای كۆماری ژمارە ٩٠ جێبەجێبكەن، جارێكیانم لەیادە چوومە شێخ بزێنی خواروو لە گوندی پەلكانە، جوتیارێكی زۆرمان لێهەڵگەڕانەوە كە ڕوانیم كادرەكانی خۆمان لە ناوەڕۆكا كاریان تێكردووە، ئەنجامی ئەوەی بە قسەی ئێمەیان نەكرد كوشتو كوشتار لە نێوانی جوتیاران خۆیاندا روویدا. كاتێ شۆڕش لەناوچەكەش نەما خاوەن زەوییە دابەش كراوەكان بەپاڵپشتی حكومەت ئەوانەیان دوچاری دەردەسەری دەكرد كە كادیرەكان بەگوریس زەوییان دابوونێ.

تا مەڵبەندی دوو بووین چەند جارێ هێزم برد بۆ دەشتی هەولێرو بە هاواری مەڵبەندی سێو چوارە چووم. بۆ مەڵبەندی یەكیش هەر لە سەرەتاوە هێزمان بۆ ناردن.

دواجار چوومە بالیسان بۆ كۆبوونەوەی ساڵانە لەگەڵ كاك ئەرسەلان بایزو مامۆستا جەمال تایەر، لە بەلالوكاوای دۆڵی بالیسانەوە چووینە مێرگەسەرو گەڕاینەوە بۆ بالیسان. لەوێ سەیارەكەمان لایداو وەرگەڕاو مامۆستا جەمال تایەر شەهید بوو، منو كاك ئەرسەلانیش زامداربووین، لەگەر زۆربەی پێشمەرگەی دەستەكەم، بەتایبەتی سەفین قادرو جوتیار حەمە شوان.

هەر ساڵ ١٩٨٣ بوو لە بالیسانەوە چووم بۆ وەرتێ و لەوێ لەگەڵ شەهیدان (سەید كەریم شەهید حەسەن كوێستانی شەهید ئەحمەد مەولود)و كۆمەڵێك كادری سیاسیو عەسكەری یەكێتی لەماڵی حەسەن كوێستانی كۆبووینەوەو نەخشەی ڕەودانەوەی هێزەكانی پارتیمان دانا كە لە مەڵبەندی سێ نزیك

ببوونەوەو هەموو بەرزایی قەندیلیان گرتبۆوە دەست.

شەڕێکی زۆر سەختمان دەست پێکرد، ماوەی دە پانزە رۆژێك زۆر ئازارمان چەشت، بەلام پاشان بەهیمەتی هەموو پاڵەوانە شەهیدەکان، هێزەکانی پارتیو هاوکارانیمان راونا و لەهەمان کاتا هێرشێکی جاشمان بۆ هات لە (لوتەرە)وە ئەویشمان تێك شکاند.

هەر ئەو سەفەرە لەگەڵ نەوشیروان لێك عاجز بووینو من گەڕامەوە بۆ سوورقاوشان، کەئەوسا ماڵەکەم لەوێ بوو. لەسەر ئەوە دڵگران بوو، گوایە من لەوەرەقەی بچووکا نامەم بۆ ناردووەو داوای شەکرو چام کردووەو لەدوابەشی یەکێك لەکتێبەکانیدا ئەم مەسەلەی باسکردووە.

# وەڵامی نەوشیروان

## عەلی بچكۆڵو چایی

كاك نەوشیروان مستەفا لەنووسینی یادەوەرییەكانیدا لەچەند شوێنێكدا باسی منی كردووە بەناوی عەلی بچكۆڵو چای(مەبەستی ئەو لەو ناوهێنانەدا بریتیە لەبوختانێك كەمن لەپێناوی چا خواردن بەرەكانی جەنگم بەجێ هێشتبێت) بەڵام من وەڵام دانەوەی ئەو بوختانەم بۆ كاتێكی گونجاو هەڵگرتبو چونكە ئەو بەرێزە هەر بەو بوختانەیشەوە ناوەستێ‌و لەداخی من وەك سوكایەتی پێكردن باسێكی شەهید د. مارف برازام دەكات كەگوایە بەكوێخا محەمەدی وتووە هاوڕێ كوێخا بەخێر بێیت. بەڵام وا كاتی ئەوە هاتووە لەم بیرەوەرییەدا بۆ راستكردنەوەی هەڵەكانی خودی كاك نەوشیروان لەلایەك‌و دیاریكردنی راستییەكان بۆ مێژوو خوێنەری میللەتەكەم لەلایەكی ترەوە بەپێویستم زانی ئەم روونكردنەوەیە بنووسم بۆ ئەوەی بەهەڵە لەمێژوودا شوێنی خۆی نەگرێت.

لەشەڕە نەگریسەكانی ناوخۆدا من‌و كاك نەوشیروان لەبناری قەندیل بووین كەبەزیانی میللەتەكەمان تەواو بوو. پاش كۆتایی شەڕەكە لەوەرەقەیەكی بچوكی دەفتەری بیرەوەرییەكانمدا لەسەر داوای هەندێ لەلێپرسراوانی كەرت‌و تیپەكان نامەیەكم بۆ نەوشیروان نووسی كەناوەڕۆكی نامەكە بریتی بوو لەچەند خاڵێك لەوانە كەرێگا بدرێت بەپێشمەرگەكان برۆنە گوندەكانی زارگەلی‌و رەژوكەران‌و ئەو ناوچەیە بۆ ئەوەی ئەوبرا پێشمەرگانە چەند رۆژێك پشوو بدەن‌و هاوكات خۆیان‌و جل‌و بەرگیان بشۆرن. لەنامەكەدا نووسیبووم ئەوە ئێستا شەڕەكە كۆتایی هاتووە شەڕ دوور كەوتۆتەوەو ناكرێ دووبارە بێتەوە. هەر لەو نامەیەدا هاتووە كە جگەرە، شەكرو چاش یەكێكە لەپێداویستییەكان‌و پێشمەرگەكان داوای دەكەن.

ئەو كات من ماوەیەك چاوەڕێم كرد بێ ئەوەی كاك نەوشیروان وەڵامی ئەو نامەیەم بداتەوە، بەڵام لەرێگای برایانی ترەوە رای سپاردبوو كەمن برۆم بۆلای بۆ چیای قەندیل كەبۆ پشودان لەوێ بوو لەزارگەلییەوە سەرپەرشتی شەڕەكانی دەكرد. لەسەر داوای كاك نەوشیروان چووم بۆ زارگەلی، بەڵام هەر كەگەیشتمە لای كاك نەوشیروان بەزمانێكی رەق وتی: ئەو نامەیە چییە بۆت ناردووم لەوكاغەزە بچكۆلەیەدا؟!! منیش وتم: تۆ بۆخۆت لێرە دانیشتووی‌و هەموو شتێكت

لەبەردەستدایە، بەڵام من لەم شاخ و داخە دەفتەر یان کاغەزی نامەنووسین لەکوێ بهێنم تا نامەیەکی دوورو درێژت بۆ بنووسم. دواتر لەو قسەیەک و لەمن قسەیەک گفتوگۆکەمان توندی پێوەدیاربوو، بەڵام من دەمزانی نەوشیروان لەبەر ئەوە تووڕە بووە کە وەڵامی پرسیارێکی ئەندام مەڵبەندێکی مەڵبەندی سێم دابۆوە. لەوەڵامەکەدا باسی هەڵوێستی ئەو کاتەی خۆمانم بۆ کرد، بەڵام نەو وت کاك نەوشسیروان وادەڵێت. هەر بۆیە رقی هەڵساو کردی بەشەڕی ئەو نامە بچکۆلەیە. ئەمە چیرۆکەکەی عەلی بچکۆل و چاییە، لەکاتێکدا من لەژیانمدا هەرگیز خۆم بۆ نەفس شلنەکردووەو زیاتر لەچواردە ساڵیش لەژیانمدا لەچا دور کەوتوومەتەوە، ئەگەرچی داواکردنی چایی تاوان نییە، هەر وەکو بۆ کاك نەوشیروان تاوان نییە رۆژی نیو گلۆز جگەرەی رۆسمەنی دەکێشا. لەسەر ئەو ململانێیە من بەنەوشیروانم وت ئیتر قەت لەگەڵ تۆ کارناکەم لەبەرامبەریشدا ئەو وتی: لەژیانمدا کارنادەم بەتۆ، دواتر بەو هۆیەوە من قەندیلم بەجێ هێشت و گەڕامەوە شێخان. راستی شەڕی چای و عەلی بچکۆل ئەوەیە کەلێرەدا باسم کرد.

هەروەك چۆن بۆ گاڵتەپێکردن ناوی شەهید مارف برازام دەهێنێ کە نەوشیروان وەهای نیشانداوە کە بۆ خۆی بڕوای بەئاغاو کوێخا نەبوبێت و هیچ موجامەلەیەکی ئەو توێژەی نەکردبێت. د. مارف واتا عوسمان عەبدوڕەحمان کەلەگەڵ شەهید مەلا عەلیدا لەدەوروبەری گوندی کۆکە لەلایەن ناپاکێکەوە ئیخباری کران و دەستگیرکران. پاش جۆرەها ئازارو چەندین شێوازی ئەشکەنجەی دڕندانەو دوور لەڕەوشتی مرۆڤانە ئەو پاڵەوانانە لەقەسابخانەی موسڵ ئیعدام کران، بەڵام کاك نەوشیروان لەڕقی من رێگە بەخۆی دەدات سوکایەتی بەپاڵەوانێکی وەك شەهید د. مارف بکات لەیاداشتەکانی بەو شێوەیە ناوی بهێنێت. جا نەوشیروان لەجیاتی ئەوەی باسی ماندوبوون و دڵسۆزی ئێمە بکات بەپێچەوانەوە وەك سوکایەتی پێکردن تەنانەت باسی شەهیدە سەرەتاییەکانی بنەماڵەکەیشم دەکات هەر بۆ ئەوەی لەئاستی قوربانی و خەبات و خۆڕاگری من کەم بکاتەوە.

لە ١٩٨٤/٧/٤ گوندی سەرگەڵووم بەجێ هێشت و مەڵبەندمدایە دەست فەرەیدون عەبدولقادر. ماڵەکەم برد بۆ سوورقاوشان و ئەو ساڵە چەمی سوورقاوشان وشکی کردبوو، ئێمەش چووینە گوندی شێخان و لەوێ خێمەیەکمان لێهەڵدا.

# رۆژانی پێش ئەنفال

شـەڕەكانی داسـتانی رزگـاریی، قـەیوان مـاوەت، زنجـیرە چـیای چـەرماوندو دامێنـەكانی چـیای پیرەمـەگروون، قوولـە سـەوز، قولـمـەوزە سـپێلكو بنارەكـانی شـەدەڵە، ئۆمەرقـەوم، جاسـەنە، قەمچـوغەو دەشـتی مەرگـە بەسـەری دەروو گـەورە قـەڵاو پشـتی هـەنجیرەو تـا دەگاتـە تۆكلی گـەورەو تۆكلی بچووك. دامێنـی گونـدی شارەسـتێنەو هەڵدەگەڕێتـەوە بـۆ دامێنـی هـەوارە بـەرزەو داری زەكـەریای دامێنـی خوڕخوڕەو یاخیانو دادەبەزێتەوە بۆ پشتی قۆمرغانو قەرەنگویو مـەولانو زرمو كوتی ئاسەنگەر ئاسایی هێزی دوژمن، لەسەر سەری حەسەن بەگو دەوروبـەری ولاخلـوو برزودو بالۆسـەو بەرزایی كەژۆسـتیش، هـەمووی شـتیكی بـەركولْ بـوون كەدوژمنی داگیركەر خۆی بۆ زنجیرەی ئەنفاله مرۆڤ قركەرانەكەی ئامادە دەكرد.

لەولاشەوە شەڕێكی گەورەی نابەرامبەری وەها دامەزرابوو لەنێوانی دووهێزدا.

یەكەم:

١. رژێمێكی رەفتار فاشیی داپڵۆسێنەری خاوەن بیری سێكوچكەی بەعسیان بۆ هەڵوەشانەوەو لەبەریەك بردنی مۆركی نەتەوایەتی كوردو داگیركردنی خاكەكەی بـەبوونی هێزێكـی سـوپایی جـەنگی زۆرو زەبەنـدو بـەبوونی جاشـێكی خۆمـاڵی یـەكجار زۆرەوە، كەهەمیشـە لەپێشـەوەی سـوپای داگیركـەربوون لەپـەلامارو كاولكردنی كوردستاندا.

٢. دارایی ئامێرەكانی جەنگی سەردەم بەچەكی دوورهاوێژو كیمیاویشەوە.

٣ـ خـاوەنی سـوپایەكی مەشـق پێكـراوی ئامـادە بـۆ هـەموو جـۆرە جـەنگێكی ناوخۆیی و دەرەكی.

٤. خاوەنی رادیۆو بێسیمو تەلەفزیۆنو رۆژنامەو هەواڵبەری گەورە گەورە.

٥ ـ خاوەنی پڕۆژەی نەوتو بووجەیـەكی ئـەوتۆ كەلەئاسـتی جەنگی ناوخۆیـدا هەر نركەی نایات.

دووەم:

١ـ هێزێكـی بـەرگ بـۆری كـەمی بەمەشـق و شـارەزایی لەجـەنگی سـوپای بەرامبەریدا.

٢ ـ خاوەنی بیری "لێدەو برۆ لێرەو لەوێ خۆت مەلاس بدە" بەچەند مەغزەن فیشەكو یەكدوو نارنجۆكی دەستیو مەتارەیەك ئاوو نانە بەرەیەكی پڕ لەنان لەپشت.

٣ ــ نەبوونی عەمباری تەقەمەنیو چەكی قورس بۆ درێژەدان بەجەنگی ڕووبەڕوو بوونەوە.

٤ . نەبوونی هۆكانی بەهێزی ڕاگەیاندن لەبەرامبەر پڕوپاگەندەی هێزەكانی دوژمندا.

٥ ــ دەواو دەرمانی پێویست، شوێنو بوارێكی وەها بۆ سارێژكردنو پارێزگاریی لەزامدارو پەك كەوتەكانی جەنگەكە نەبوو.

٦ـ نەبوونی جۆری ئەو چەكانەی لانی كەمی هێزە ئاسمانییەكانی دوژمن لەهاتنە سەر سەنگەری پێشمەرگە سڵ بكاتەوە لێی.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش بارودۆخێكی وەها هاتبووە پێشەوە بووبوو بەهۆی ئەوەی یەكێتی نیشتمانی ناچار بێت هێزەكانی لەگەرمیانو لەكوێستان بخاتە گەڕەوە، بەشێكی بۆ وروژاندنو تۆقاندنی دوژمن لەسەرجەم ناوچەكانی هێزی پێشمەرگەو هەوڵدان بۆ ئەوەی پەكی پەلامارەكەی دوژمن بخەن، بۆ ناوچەكانی سەركردایەتی، دووهەمیش چاوەڕوانی گەیشتنی هێزەكانی (دوژمنی دوژمنم دۆستمە)و هەر نەگەیشتن بوو بەهۆی ئەوەی چەندان جار نەخشەی پەلاماری سەر هێزە هێرش هێنەرەكانی دوژمن سەرنەگرێو ببێ بەهۆی ماندوبوونێكی بێهودەی هێزی پێشمەرگە.

ڕۆیشتنەوەی گەرمیانو جارێكی تر بانگكردنەوە پێش لەوەی پێشمەرگەكان بگەنەوە شوێنەكانی خۆیانو سەردانیماڵو منداڵو كەسكاریان بكەن، كارێكی وەهای كردبوو خۆی لەخۆیدا لەبڕشتو تەوژمی هەرگیز لەبڕان نەهاتووی تێكۆشەرانی كەم دەكردەوە، پرتەو بۆڵە دروست دەبوو، لەمەش ناخۆشترو كاریگەرتر ئەوەبوو جەنگەكە كۆنترۆڵی بەدەست دوژمنەوەبوو، هەر ڕۆژەو سەعاتە لەشوێنێكەوە پەلاماری ئەدا، بۆ بەرپەرچدانەوەشی هەندێكجار نەخشەی ئەوە دادەنرا ئێمەیش لەقوڵێكی كاریگەرەوە پەلاماری بارەگای هێزەكانی دوژمن بدەینو بۆ ئەوەش لەسەرجەم ئەو تیپو ئەو هێزانەی لەناوچەی جەنگەكەدابوون بۆڵ بژێ دەكراو زۆرجاریش ئەم بۆڵ بژێریە دەبوو بەهۆی:

١ . سەرنەکەوتنی ئەو نەخشەیەی بۆسەر دوژمن دیاریکرابوو سەبارەت بەوەی لەهەر تیپ و کەرت و دەستەیەك کوڕە شەڕکەرو ئازاو لێزانەکان هاتبوون، بەلآم ئەو دەستەو کەرت و تیپانەی خۆیان کەشارەزای یەکتربوون لەکاتی شەڕدا لەگەڵیان نەبوون و لەگەڵ هێزە بۆڵبژێرەکەشدا شارەزایی و لەیەك گەیشتنیان کەمێك ئاسان نەبوو.

٢ــ ئەو پاش ماوەیەی هێزەکەی لێپێکهاتبوو بێ فەرماندەو لێپرسراو مابوونەوەو وەهای لێهاتبوو بەکاری ئەوە نەدەهات لەکاتێکدا دوژمن پەلاماری ناوچەکەیدا بتوانێ وەکو ئەو کاتەی فەرماندەو کوڕە ئازاکانی تری لەناودابوو بەرگری بکات، ئەمەش وەهایکردبوو کاتێ دوژمن شوێنی شەڕەکەی هەڵدەبژارد پاش شەڕێکی گەرمو ئاگر بارانێکی ئەرزی و ئاسمانی چڕ مەبەستەکەی خۆی دەپێکا و هێزەکانی ئێمەش لەدوولاوە نەخشەی سەری نەدەگرت.

دوژمن تا دەهات مەرکەزی هێزی لەناوچەی بنکەکانی سەرکردایەتی لەپارێزگای سلێمانی چڕترو بەهێزتر دەکرد، بۆ دەستپێکردنی زنجیرەی ئەنفالە بەد ناوەکەی، شان بەشانی ئەمەش بەفرو باران و زریان لەناوچەکەدا یارمەتی دەربوو بۆئەوەی دوژمن سەرکەوتووتر بێ چونکە وەکو وتمان دوژمن لەهەموو رووەکانەوە دەوڵەمەندبوو، هەتا لەڕووی ورەی جەنگیەوە وەها پڕکرابوون بەهەڕەشەو گوڕەشەو پارەو پول، زۆرکەمتر نەبوو لەورەی هێزەکانی ئێمە، جاران بەفرو باران و سەرما ڕێگای لەپەلاماری سوپای دوژمن دەگرت، بەلآم ئەمجارەو بۆ ئەم دەستپێکردنی ئەنفالانە دوژمن بەسەر ئەوەشدا بازیدابوو. کام رۆژ زۆر زۆر ساردبوو، بەفر دەباری، باران چڕوو، چاوچاوی نەدەبینی، دوژمن ئەو کاتە هێرشی فراوانی بەپاڵپشتی بارانی تۆپ و گوولەی دوور هاوێژو سوپای بێ ژمارەوە دەست پێدەکردو زۆربەی جارەکانیش سەردەکەوت.

لەم شەڕانەدا دوژمن زۆری زیان دەکرد، بەلآم پێوەی دیارنەبوو، ئێمەش زیانمان هەبوو، هەرچی زیانەکانی ئێمەبوو شوێنێکی کاریگەریان هەبوو، چونکە سەروەتی ئێمە پێشمەرگەبووە کاتێ پێشمەرگەیەك شەهید دەبوو، کەلێنەکەی بەئاشکرا دیاربوو، تا شوێنی پڕدەکرایەوە کاتی دەویست، کاتێ ناوچەیەك لەدوژمن دەگیرا، دوژمن ئەیتوانی دووشوێنی تر لەئێمە بگرێتەوە، بەلآم کاتێ شوێنێ لەئێمە دەگیرا کاری روخێنەری زۆر دەکردە سەر ورەی سەرجەم

شوێنەكانی ترمان‌و دەبوو بەهۆی دابەزینی وورەی خەڵكی ناوچەكەو خەڵكی ڕەویاندەكردو ماڵ‌و خاوو خێزانی هەندێ پێشمەرگەشی تێدەكەوت‌و ئەوەش هەندێ كاری خراپی دەكردە سەر پێشمەرگەو وایدەكرد وەكو پێویست لەئاستی جێبەجێكردنی فەرمانەكانیدا نەتوانێ سەركەوتن بەدەست بهێنێت.

هێندە پەلامارو شكان‌و پەلاماردان دروستبووبوو لەزۆربەی شوێنەكان دوژمن دەهاتە پێشەوە، چونكە هێزەكانی ئێمە لەبەردەوامی بوونیان لەجەنگ‌و لەگەرمیان‌و كوێستانكردندا بەتەواوەتی شپرزەبوو بوون، وای لێهاتبوو نەفریای گەرمیان دەكەوت‌و نەكوێستانی بۆ دەپارێزرا، هێزی دوژمن بەڕۆژ بەدل دەكرا، بەڵام هێزی ئێمە هەر ئەوەبوو كەقاچێكی لەكوێستان‌و یەكێكی لەگەرمیان بوو هەرگیز نەدەگۆڕدران.

ڕۆژگارەكان وەها چڕببوون پێشبینی ئەوە نەدەكرا سەركەوتنی ئەوتۆ لەوشەڕەدا بەدەست بهێندرێ، شەهیدو زامدارمان زۆر زۆر ببوو، خەڵكی تووشی كۆچ‌و كۆچ بار ببوون، پاڵەپەستۆی هێزی دوژمن تا دەهات لەزیادبووندابوو، تەقەكردن‌و بۆردومان لەئەرزو لەئاسمانەوە سەرجەمی ناوچەكەی كێلاْبوو، وەهای لێهاتبو لەچاوتروكانێكاو لەپانی یەك مەتری چوارگۆشەییدا چەند تۆپ دەی پێكا لەهەر شەڕێكاو لەهەر لوتكەو گوندێكا كەشەڕ دادەمەزرا چاوەڕوانی دەربازبوونی تاكە مرۆڤێكی لێنەدەكرا، ئەگەرچی پێشمەرگە خاوەنی بڕوایەكی پۆڵایین بوو بەكێشەكەی‌و بەبەرنامەكەی، بەوەی مافی خۆیەتی لەسەر خاك‌و نەتەوەو شەرەف‌و بوونی خۆی بەرگری بكات. بەڵام هێزو توانای داگیركەرەكەمان ئەوەندە زۆربوو هەرچەند ئێمە بەرگریمان دەكردو ئەوەندەی دەكرا بەربەرچی دوژمنمان دەدایەوە بەڵام باڵادەستی هێزەكانی دوژمن لەئەنجامدا دەبوو بەهۆی ئەوەی ئێمە پاشەكشە بكەین‌و دوژمن دەستبەسەر شوێنەكانی ئێمەدا بگرێ. ئەمەش وەهایكرد دوژمن بگاتە ئەو بڕوایەی هەرچی دەكرێ بیكا بۆئەوەی لەدەست ورەی پۆڵاینی كوردایەتی رزگاری بێ‌و بەخەیاڵی خۆی كەمرۆڤی كوردی لەكوردستان دەربەڕاند ئیدی وڵاتێكی دەوڵەمەندی ستراتیجی چاكی بۆ نەخشەی گڵاوی خۆی دەستگیربووە، هەر ئەوەش وەهای كرد زنجیرەكانی ئەنفال بەتەواوەتی جێگیر بكاو لەناوچەكانی سەركردایەتی ئەنفالی یەكی دەست پێكردو پاشان پەلاماری ناوچەی قەرەداغی داو دواتریش بۆناوچە گەرمەسێرەكانی كەلارو سەنگاوو زەنگنەو

جەباری‌و قادرکەرەم‌و قەرەحەسەن‌و لەیلان بەبەربلاوی دەست پێکردو هەر لەسەرگرمەوە بەبازیانداو بۆسەنگاوو زەنگنەو داوودەو کەلارو ناوچەکانی کفری‌و خانەقین‌و تا دێتەوە دەوروبەری کەرکوکی کێومالکردو داری بەسەربەردیەوە نەهێشت‌و بەسووتان‌و هەڵتەکاندن‌و گرتن‌و کوشتن‌و ئاوارە بوون، وێرانەیەکی گەورەی لەو سنورەدا دروستکرد.

پاشان هێرشی بۆسەر ناوچەکانی شوان‌و شێخ بزێنییەکان‌و قەڵاسیوکەو دەشتی کۆیەشی بەناوچەی سورداشەوە دەست پێکردو لەوێش کوندە پەپوو هێلانەی کرد.

دوژمن نەخشەکەی وەهابوو وەکو باڵندە لەسەرەوە دەست بەخواردنی بکات پاشان باڵ‌و پاشان قاچ‌و ئەوجا سنگ‌و باقی لەشی بخوات. بۆیە شوێن بەشوێن پاکسازی دەکردو پاش چۆڵکردنی لەمرۆڤی کورد، ئاگرباران‌و کاولکردنی بنکەی بەتۆپەڵ جاش‌و سەربازی لەسەر رێگاو شاخ‌و دۆڵ‌و دەشتەکان دادەمەزراندو وەکو پەپو دەیخوێند.

ئەنفالەکان سەرجەم کوردستانی گرتەوەو تاکە تاکە گوندی سەر سنوورەکان ئەگەر بەرێکەوت یان رێگای نەکەوتبێتە ئەوێ ئەگینا سەرجەم کوردستانی داگیرکرد بەسۆران‌و بادینانیشەوە.

خوێنەری بەڕێز: لەسەر ئەنفال نووسین لەزۆر لاوە دەستی پێکردووە، زۆر کەس ئاماری باشی دەست نیشانکردووە، بەڵام چونکە تۆماری زیندوو لای ئێمە نییەو بەڵگەکانیش ونن رەنگە بەدەیان ساڵی تریش وەکو پێویست لایەنەکانی ئەنفال هەموو نەدۆزینەوە، تەنهاو تەنها کامێرای مانگە دەستکردەکان کەچاودێری کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دەکەن رەنگە لەدواڕۆژدا بکەوێتە بەردەست، ئەگینا وەکو روویداوە هیچ نووسەرێك ناتوانێ برێ بەسەر هەموویدا بشکێ‌و هەمووی وەکو خۆی دەست نیشان بکات. هەر بۆیە منیش بەنیازی نیشاندانی چەند رۆژێکی چڕ لەمێژووی ئەنفالی چوار کەخۆم لەوێشدا ژیانێکی سەختم بردەسەر، بخەمە بەرچاوی خوێنەری بەڕێز بەوهیوایەی لەتۆمارگا گشتییەکەی کوردەواریدا جێگای خۆی بکاتەوە، رۆژە سووتاوەکانی ئەنفالی چوار کەبوونەتە یادگارێکی هەرگیز لەیاد نەچووم‌و هەموو کات‌و ساتێك دووکەڵە لوول‌و سپی‌و باریکە روو لەئاسمان چووەکانی سەرجەم ناوچەکەم لەبەرچاو لاناچێ.

## ڕۆژژمێرەکەم لەکوورەی ئەنفالی چواردا

دوای شالاوی بەرفراوانی هێزەکانی دوژمن بۆ ناوچەکانی ئەنفالی (٣) خەڵکی گوندەکانو ناوچەکە هەرچی ڕزگاری دەبوو لەئابلۆقە بێ ئامانەکەی دوژمن، لەشەقامی سلێمانی ـ چەمچەماڵ دەپەڕییەوەو ڕووی دەکردە ناوچەکانی شوانو شێخ بزێنی سەروو بەونیازەی خۆی بگەیەنێتە سنووری مەڵبەندی چواری یەکێتی نیشتمانی کوردستانو لەوێشەوە سواری کۆڵی قەندیل ببێ بۆ لێوارەکانی سنووری ڕۆژهەڵاتی کوردستان. خەڵکەکە زۆر ماندببوو، خەم بەتەواوەتی گەشیی لەدەمو چاوی خەڵکیدا نەهێشتبوو، هەموو چڵکنو گرژو مۆن، داخ لەدڵ، چاو بەفرمێسك، هەموو بەوە دەچوون تازە لەشینو شەپۆڕی کەسێکی خۆشەویستیان هەڵسابنەوە.

ڕۆژی (١٢ ی نیسان) لەگەڵ دەستەیەك لەپێشمەرگە چووم بۆ سەردانی ناوچەی شوانی سەروو، ڕووم کردە گوندی مۆرد خوادەی خواروو، لەوێ کۆمەڵێك پێشمەرگەو لێپرسراوی مەڵبەندی یەکی یەکێتی نیشتمانی لەدەوری گوندەکە لەسەر گردۆڵکەیەکی سەوز دانیشتبوون، یەکێك لەوانە لەیادمە کاك ئەنوەر دۆلانی بوو، لەگەڵ ئەو برایانەی لەوێ ئامادەبوون هەندێ قسەو باسمان کردو باسی چۆنێتی هێرشەکەیان دەکرد بەجۆری کەنەپێشمەرگەو نەخەڵکی بواری ئەوەیان پێنەدراوە لەچەند شوێنێکا و لەڕووی هێرشەکە بووەستنەوە، چونکە پەلامارەکەی دوژمن لەناخافڵو بەربڵاو بەبەکارهێنانی جۆرەها چەکی ترسناکەوە بووە. هەر لەوێو لەکاتی قسەکردندا پیکابێك خەڵکی دەربازبوو کەزۆربەیان ژنو منداڵوون، دایان بەلاماندا و بەرەو ناوکەڵی گەڕا ڕۆیشتن، ئەوەندە بەپەلەبوون پێدەچوو هێشتا دوژمنیان بەدواوەبێ، چونکە ئەوان دیبوویان دوژمن چۆن بێبەزەییانە ئاگری لەدوا ماڵ بەرداوەو چاویان لەئەوەبووە چۆن بەزەییان هەتا بەئاژەڵو پەلەوەرەکانیشدا نەهاتۆتەوە. تەنانەت کولانەی سەگو مریشکەکانیشیان ئاگرداوە، ویستمان داوایان لێ بکەین شەو لەو گوندە لابدەنو لەوێ کەمێ پشو بدەن، بەڵام ئەوان لەوە ئەترسان لەئانو ساتدا هێرشکە لای ئێمەش دەگرێتەوە بۆیە چاکتر وایە خێراتر بپەڕینەوە. بەعسییەکان ئاوی دوکانیان بەردابۆوە، زۆر

زۆر ببوو، پەڕینەوە لەوەش خۆی لەخۆیدابیبوو بەکارێکی سەخت، ئەوان ڕۆیشتن، خەڵکی گوندەکانیش کاتێ خەڵکی ڕەوکردووی بەری هەمەوەندو سەنگاوو جەباری و قادر کەرەم و زەنگنەو کەلارو تێکڕای ناوچەکەیان دەدی، رووخابوون، لەڕەنگ و روویاندا گۆڕانێکی زۆر پەیدابیبوو، خەڵکەکەکانی کەم تر گوێڕایەڵی شۆڕش بوون، وردە وردە شەوان بەدزییەوە خۆیاندەکرد بەشارو بەردەوام ماڵ و حاڵیان سوك دەکرد. ڕۆژگارێکی ترسناك چاوەڕێ ناوچەکەی دەکرد، پێشمەرگەش لەوە دەترسا دوژمن تەنها بەپڕوپاگەندە خەڵکی دەرپەڕێنێ بۆیە لەزۆر لاوە دژی پڕوپاگەندەی دوژمن، پێشمەرگە ورەی خەڵکی بەرزدەکردەوەو ئەو خەڵکانەی چەکیان هەبوو زیاتر گوێڕایەڵی شۆڕش بوون، لەدەرەوەی گوندەکانیان ئازوقەیان خستبوو بۆ بنکەیەکیان دەبردە ئەوێ، خەڵکی و پێشمەرگەش پێیان وەهابوو کەدوژمن هات تەنها دێتە دەوری گوندەکان و لەهەموو لایەکەوە جەنگی لەگەڵدەکرێ و ئەنجام دوژمن پاشەکشە دەکا، پڕوپاگەندەی گازی کیمیاوی زۆر توندبوو، خەڵکەکە بەتەواوەتی تینی بۆ هاتبوو بەلام ملکەچکردن و ڕووکردنە شارەکانیشی بەدژایەتی شۆڕش دەزانی بۆیە ئەو ڕێبازەیان هەڵنەدەبژارد.

ڕۆژی ١٢ ی نیسانمان لەلای ئەو برادەرانە بردەسەرو شەویش چووم بۆ گوندی کارێزەی خاڵخالان، کەرتێکی تیپی (٢١ی کەرکوك) لەوێبوو لەگەڵ ئەوان ماینەوە، خەڵکێکی زۆر هاتنە لامان و قسەمانکرد لەسەر ئەوەی ئەگەر هێرش هات چۆن بەرگری بکەین و باخەڵکەکەش لەگوندەکان دووربکەونەوە بۆئەوەی لەپەلاماری کوتوپڕیدا تیا نەچن، هەندێ کێشەش هەبوو لەنێوانی خەڵکەکەدا چی تواندرا چارەسەرمان کردو شەویش تا سبەینێ لەوێ ماینەوە.

ڕۆژی (١٨ / ٤) لەکارێزەوە گەڕامەوە بۆ مۆرد خوادەی سەروو، لەوێش هەندێ کادرو پێشمەرگەی لێبوو لەگەڵ ئەوانیش تەگبیرو رامان کردو پێش نانی نیوەڕ بەرەو گوندی دارەقوتە لەشێخ بزێنی سەروو کەوتینەڕێ. نیازم وابوو سەر لەکوێخا قادر بدەم چونکە لەڕێگای پەڕینەوە لەتەلانەوە بۆ قەمچوغە کەوتبووە کەمینی جاشەکانی (سوارە فەتاح) جاسەنەییەوەو عەلی تەلانی شەهیدببوو، ئەویش کرابوو بەسەرەند، ئەوەندەی فیشەك بەرکەوتبوو، شانسی هێناو شەهیدنەبوو. کەهێندرابۆوە سەرگەڵو، لەبەرگەڵو دکتۆرەکانی شۆڕش چارەسەریان کردبوو. کوێخا قادر پێشمەرگەی خۆشدەویست و پیاوێکی نان بدەش بوو، کاتی

چـوونه بنـەبانی ماڵەکـەیان کەبەلاپاڵێکـەوەبوو دیـتم خـەڵکێکی زۆر لـەدەوری ماڵەکەیانـەو ئێمـەش وتمـان: سـەر پێیـی سـەری لێـدەدەینو ئـەڕۆین، رێککـەوت وەهـابوو مـلازم تـاریق ئەحمـەد لـەوێبوو، لەگـەڵ کوێخـا قـادر هـاتن بـەرەو پیرمـانو ئـەملاو ئـەولای یـەکتریمان ماچـکرد، هـەلێکی چـاکبوو چـونکە مـن کـاک تـاریقم لـەدوورەوە دەناسـی، سـاڵی (١٩٦٣) لێپرسـراوی پارێزگـاری هێزەکـانی چـەمی رەزانبـوو، لەڕەقـەم یـەكو لەپشـتی سـۆتکەوە تـا دەگاتـەوە چـەم، ئەوسـا هێـزی کۆماندۆمان هەبوون، ئەو هێزە ئەفسەرەکان بەڕێوەیان دەبرد. کاتێ هێرشـی گوللـە زەرد ئاسـای سـاڵی (١٩٦٣) ی بەعسـییان روو لەناوچـەکە هـات، سـەرکردایەتی ئەوسای شـۆڕش بڕیایـدابوو بێتەقە چەم چۆڵبکات هـەر بۆیـە لـەپاش شـەڕەکانی شـوانو سـاڵەیی، هێزەکـان هەڵکشـێنران بـۆ دەوروبـەری چـەمو پاشـان بـەبڕیارێك کـەملازم رەشـید بـەدەمی سـەرکردایەتییەوە رایگەیانـد لەشـەوێکا هەرچـی هێزمـان هـەبوو روو لەشـەدەڵەو بنـاری ئەوبـەر کەتنـەڕێ. خەڵکەکە ئەو چۆڵکردنەیان بـەوە ناو دەبرد گوایە ملازم تاریق فرۆشتوویەتی، بەڵام لەڕاستیدا ئـەوە بـەو شـێوەیەبوو کەباسمانکردو بڕیاری سەرکردایەتی وابوو بۆ کەمترین قوربانیدان ئـەو نەخەشـەیە جێبـەجێکرابوو. پاشـان سـاڵانی (١٩٧٤ و ١٩٧٥) مـلازم تـاریق کەوتـەوە بـەرەی دوژمـنو هێزێکـی (مغـاوير)و جاشـی لـەژێر دەسـتدابوو، لەگـەڵ دوو سـێ ناقیلـەو چـەند پێشـمەرگەی پەراگەنـدەو خـەڵکی تێکۆشـەری راودەکـرد، دووجـار کەوتمـە ئابلۆقـەی هێزەکەیـەوە لەگوندی تۆمـار، ئەوسـا مـن لێپرسـراوی کـاری کۆمەڵـەبووم لەقەڵاسێوکەو، مـانگی دووجار تـا تـۆپزاواو تۆمارو جولحـانو پـاپیلان دەچووم بـۆ بەسـەرکردنەوەی ئەنـدامانو حەلقـە رۆشـنبیرییەکانی کۆمەڵـە. ئەوسـا دوو کـادری وشیارمان لەتۆمارو لەتۆپزاوا هەبوون بەناوی مەلا ناسیح مەجیدو حامید محەمـەد کاکە مەدو پاشان عەلی مغاویریش رایکردو هاتە ئەو ناوە، دەبوو سەردانەکانم زوو زوو بکـەم، شـەوێکیان دوای (١٢)ی شـەو گەیشـتمە تۆمـار لەهـەمان کاتـدا عومـەری برازام پێشمەرگەبوو، ماڵو منداڵی لەکەرکوکبوون، هاتبوون لەوێ یـەکتری ببینـین، شـەو لەسـەریان بـووین. بـەیانی دنیـا رۆشـن ببـۆوە کەهێزەکـەی مـلازم تـاریق دای بەسەرماندا و بواری ئـەوەی نـەداین دەرباز ببین، بەڕێکـەوت ئـەو چارەش ئیحسـان نـەجم( ئـەبو شـەهاب) ئەوسـا لێپرسـراوی شـاری کـەرکوکی کۆمەڵـەبوو، هـاتبوو بۆئـەوەی لەنزیکـەوە لەسـەر وەزعەکـە قسـە بکـەین، گوللـە سـەربانو بـن بـانی

دەگرتەوە، گیزو هوڕو مرقە مرقی دۆشکاو دەنگی ناقیلەکان مرۆڤیان دەلەرزاند، تۆماریش تەنها چەمێکی هەیەو لەوە زیاتر شوێنی نەبوو خۆمانی بگەیەنینی، ناسیح پێشمان کەوت، خۆیکرد بەگەمەڵێك توتڕکداو پێی وتین بێ خشپە وەرن بەدوامدا. سەری شوێنێکی هەڵدایەوە کەخۆی دروستییکردبوو، چاڵێکبوو سەری بۆ کردبوو لەناو چڕیی گەمەڵە توتڕکەکەدا، هەمووماں واتە منو ئەبو شەهابو ناسیح نووساین بەیەکەوەو سەری دادایەوە زۆری نەخایاند جاشو سەرباز لەهەر چوارلاوە هاتنە ناو گوندەکەوەو دەستیانکرد بەپشکنینو یەك دوو سەربازی راکردوویان لەگەڵ خۆیان بردبوو، سەعات پێنجی ئێوارە هێزەکە رۆیشتنو ئێمەیش هاتینە دەرێ، سۆراخی عومەری برازام کرد وتیان: نەگیراوە ئەگەر نەکوژرابێ، ژنەکەی هەر دەنوزایەوە، بەو ئێوارەیە هەرچی زۆنگاوو گۆلە ئاو هەیە لەدەوری تۆمار هەتا عەلی موساکان، پشکنیمان سۆراخی نەبوو، باشبوو رۆژی دوایی هەواڵمان زانی کەگەیشتۆتە لای خۆمانو دەربازببوو.

هەر هەمان ساڵو هەمان هێزی کاك تاریق لەناو ئاشەکەی تۆماردا ئابلوقەیان دام لەگەڵ عەلی مغاویر، چارە هەر ئەوەبوو هەڵبێین، رووماںکردە گوندی قەفارو بەغار رامانکرد، رەنگە سەدجار بەتینی گوللە درابین بەزەویدا، بەڵام چارە مردن یا راکردنبوو بۆیە ترسمان لا نەمابوو. دەربازبووین چووینە هەڵەتەکانی ساتی، لەوێ لاوێکمان دۆزییەوە کەبورابۆوە چەپکێ لەوتەکانی ماوتسی تۆنگی بەکوردی لەباخەڵدابوو، من بەناو دەمزانی چەند حەڵقەی رۆشنبیریی مان هەیە، بەڵام سەرو چاویم نەدەناسی، ئەوەی وەهای کرد دڵنیابم هاوڕێی ئێمەیەو ئەو کتێبەبوو، ئاومان پێداکردو بەهۆشمان هێنایەوە، تا ئەم کەینو بەینەمان کرد، هێزەکەی تاریق لەقەفارەوە روو لەسوورەدێ سەروو هاتو ئێمەش لەپاڵ شێوەڵۆچکەیەکدا خۆمان مەڵاسدا تاگەڕانەوە بۆ ناو شارو ئەوسا ئەو کوڕە کەناوی (زامن) بوو بردینیی بۆ سوورە دێ، ماڵی پوری لەوێبوو، لەوێ نانی ئێوارەمان خواردو گەڕاینەوە تۆمارو پاشان من سەرکەوتمەوە بۆ قەڵاسێوکە. ئەوسا لەلای پارتیش جێگای چاودێری بوومو لای رژێمیش، ئەوە حاڵم بوو ئەبو شەو لەعەسکەر دەرچم ئەگەر رۆژ بوایە، برایانی پارتی لەوێ چاودێرییان دەکردمو بەتەواوەتی لێم بەگومان بوون.

لەگەڵ کاك تاریق زۆر مجامەلەی یەکتریمان کردو هەر لەوێ نانی نیوەڕۆمان

خـوارد، بـەکاك تـاریقم وت: (میـوان میـوانی خـۆش نـاویۆ خانـەخوێنیش هەردووکیان) پێکەنیتینو کوێخا قادریش زۆری لاخۆشبوو کەئێمە بەینمان رێکە، پـاش نـانخواردن هەنـدێ پیاسـەی دووقۆڵیمـان کـردو رێککـەوتین لەسـەر ئـەوەی هێزەکەی پارتیش شان بەشانی هێزەکانی یەکێتی لاشانێك بگرێو ئەگەر هێرش هات هەوڵ بدەین دوژمن سەرنەکەوێ بەسەرماندا. کردمان بەڕاستیو وتمان: هـەر هێزی شوێنێ خۆی چۆڵکرد ئـەبێ سزای تونـد قـەبوڵ بکـات، وا رێکـەوتین هێـزی پارتی لـەبناری خاڵخالان لەتەنیشت تیپی (٢١ی کـەرکوك) شوێن ئامادە بکەن بۆ بەرگریو پاشان رووم کردە گوندی گڵناغاج.

رۆژی (٤/١٩)گـەڵناغاجم بەجێهێشتو چووم بـۆ کـانی هـەنجیرەی بـرایم ئاغـاو پاشـان چـوومەوە بـۆ گۆپتەپـەو لـەوێ عـادل شـەریفم بینـی، ئـەو لێپرسـراوی کـەرتێکبوو لـەتیپی (٢٥) ی (خاڵخـالان) لەگونـدەکانی ئـازادیو چـنارتوودا دادەنیشـتو تـازە بووبـوو بـەزاوای مـەردانی بـرای حـاجی کاکـەولاً لەگـەڵ ئـەودا رێکـەوتین وشـیارانە چـاودێری جموجـوڵی دوژمـن بکـات، مـن گەڕامـەوە بـۆ چـەم، ئەوسا لەترسی تۆپ بارانو بۆردومان خانووەکەی خۆم بەجێهێشتبوو کەلەشێخان دروستمکردبوو دوو خێمەم هەڵدابوو لەهەوار سوور لەگەڵ ماڵەکانی شێخ فـەرهادو براکانیدا.

رۆژی (٤/٢١) سـەرم لـەبناری گـەورەدێو کەڵەشێرەداو هـەر لەوێشـەوە پرسـەی برای کوێخا نـەریمان هـەبوو، ئەویشـمان بەسـەرکردەوە، رۆژی (٤/٢٣) جارێکی تـر چـووم بۆ گونـدی گۆپتەپـەو لەوێشـەوە پەڕیمـەوە بـەری کـانیبی بـۆ لای حەسـۆی قەرەنی، ئەوسا ئـەو جێگری تیپـی کەلکەسماق بـوو سـەر بەمەڵبەنـدی دوو، لەگـەڵ حەسۆ قسەمانکرد لەگەڵ کاك هاوڕێ کەلکەسماقی وەهـا بکـەن لانـی کـەمی کـەرتێ دووان (پ.م) بنێـرن بـەدیار قەشـقەوڵیەوە بیکـەین بەچـاودێری بـۆ ئـەوەی دژومـن لەسـردو تەلانـەوە زەفـەرمان پـێ نەبـەن، هـەر لـەوێوە رووەمکـردە دامێنـی گونـدی ئەلیاسە سوور لەلێواری زێیەکە. کاك رەهبەری سەید ئیبراهیم کەلێپرسـراوی تیپـی (٢٥ی خاڵخالان) بـوو بارەگایـەکی پـەنای بـۆ رۆژانـی پشـووی دامەزرانـدبوو لـەوێ میوانداری ئەومان کردو پاش نانخواردن بەو کەڵەکەی کەخۆیان دروستیان کردبوو بەهاوبەش لەگـەڵ جوتیـارێکی خـەڵکی گۆپتەپـە پەڕاندیانینـەوە بـەری قەڵاسێوکەو پاشـان رووەمـانکردە گونـدی کـانی هـەنجیری ئیبراهیم ئاغـا لەشێخ بزێنـی سـەروو،

بەڕێکەوت کاك قادری حاجی عەلی و شێخ جەعفەر مستەفاو کۆمەڵێك کادرو لێپرسراوی مەڵبەندی یەك لەوێبوون، سەرم لێیانداو ماوەیەك بەیەکەوە لەسەر وەزعەکە قسەمانکرد، ئەوان وەهایان نیشاندا خۆیان دەپەڕنەوە بۆ مەڵبەندی چوارو لەوێ کۆبوونەوەیان هەیە لەگەڵ مەکتەبی عەسکەری.

ڕۆژی (٨٨/٤/٢٦) هەندێ جاش لەدەربەندەوە بۆ تاقیکردنەوەو سام نواندن لەتەوەکەلی گەورەوە هاتنە کەلی قەیماسەو دوای خۆ نواندن کشانەوە بۆ تەکێ.

ڕۆژی (٢٧ ) جارێکی تر چوومەوە بۆکانی هەنجیرو هەر لەوێ بروسکەی کاك ملازم عومەر هاتبوو بۆ مەڵبەندی (یەك) ئەڵێ هێرشدەکرێتە سەر ناوچەی مەڵبەندی دوو لەشوان و شێخ بزێنی و قەلاسێوکە، وشیاربن.

هەمان ڕۆژ چوومەوە گەڵناغاج لەوێ رابەری سیاسی تیپی کەڵکەسماق (کرمانج تەهاو شێخ هاوڕێ حاجی کاکە حەمەی کەلکەسماق)م بینی کەسەرتیپ بوو، لەڕووی پارێزگاریی ناوچەکەوە قسەمان کردو پاشان گەڕامەوە بەپەلە بۆ چەم بۆ شاردنەوەی هەندێ شتی پێویست بۆ کاتی پێویست، لەوانە ماتۆڕێکی (٥٠٠وات) کارەبا بۆچاککردنی باتری جیهازە راکاڵەکەو چەند فەردە ئاردو برنج و ڕۆن و شەکرو چاو شتی لەو بابەتە.

ڕۆژانی (٤/٢٨ هەتا ٤/٢٩) هەر لەچەم بووم بەجیهازە گەورەکە پەیوەندییەکانمان دەکردو ناوە ناوەش لەملاولاوە پێشمەرگە دەهاتن بۆ ئیش وکار چونکە ئەوێ ببوو بەبارەگای سەرەکیم.

ڕۆژی (٨٨/٤/٣٠) ڕووناکی هاوسەرم و خێزانی شێخ فەرهاد کەچووبوون بۆ شار، ناردمان هاتنەوە لامان بۆئەوەی لەخەڵکەکە دانەبڕێن.

# رۆژی ٥/٣ رۆژی بۆردومانی کیمیاوی ناوچەکەمان.

ئێوارەبوو، سێبەری گردۆڵکەکان گەیشتبوونە خێوەتەکانمان، کابانەکانی هۆبەکەمان چەند رۆژێك بوو لەشار هاتبوون و جل و بەرگێکی زۆری چڵکنیان کۆکردبۆوەو لەسەر رووبارەکە شۆریبوویان و بەدەوری هۆبەکەدا هەڵیان خستبوو، سەوزو سوورو سپی و رەنگاو رەنگ ئالآی بیّ ئالآیان دروستکردبوو، خۆشمان لەگەڵ کۆمەڵێك پێشمەرگەو هاوماڵەکانمان بەدیار پێچی رووبارەکەدا لەسەر رازەکە پێمان شۆڕکردبۆوەو چاوە چاوی ئەوەمانبوو کەی ماشەی ماسی گرتنەکە چەند ماسییەکی پێوەدەبیّ و بۆ ئێوارە بیکەینە پێخۆر، هەوایەکی خۆش لەسەر ئاوەکەوە دەهات، دەیدا بەدەموچاوماندا، بەتەواوەتی لەهەوای ئازادی دەچوو، بیرمان لەوە دەکردەوە شەوەکەی بەئوتومبیل سەردانێکی دەشتی قەڵاسێوکە بکەین و لەوسەریشەوە لەرەنەکانی گۆپتەپە هەندیّ شووتی بهێنین و بگەڕێینەوە، لەپڕێکا یەکێك لەژنەکان هاواری لێهەڵسا " تەیارە، تەیارە هات" سەرمان هەڵبڕی هەشت فڕۆکەی میراج لەبەرزیی ئاسمانەوە وەکو قازو قوڵینگ ریزیان بەستبوو. چریسکەی ژێر سکیان دەهات، بێدەنگ هەندیّ شتیان روو لەعەوردەڵان و چەمی رەزان و قەڵای جولندی فڕێدا، نەمانزانی چی بوو، چونکە دەنگی لێوە نەدەهات، ژن و منداڵ پەلاماری پەڕۆو پاتاڵیانداو هەموویان فڕێدایە ژێر چادرەکان و هاتنەوە پاڵ رازە بەردەکان، سەگەکانیش هەستیان بەگۆڕانکردبوو، روو لەپەناو پەسێر جووڵان، چاودێری ئاسمانیان دەکرد لەپڕێکا لەرێگای گوندی عەسکەرەوە ماین سوارێك بەشڵەژاوی روو لەهۆبەکەمان ولآخەکەی تاودەدا، گەیشتە ئەو سۆندە ئاوەی هێنابوومانە بەردەمی چادرەکان، دابەزی و سۆندەکەی رژاندە سەرسەری و جەمەدانیەکەی لەئاوهەڵکێشا و ئالآندی بەسەرو ملیداو هەر خەریکی ئاوکاریی بوو، لێی چوومە پێش بەو نیازەی هەواڵی دیوی عەسکەری لێبپرسم، ناسیمەوە، (وریای کوڕی مەلا سالح عەسکەری)بوو، ئەفسەری راکردووبوو، لەماڵە خزمەکان لەگوندی عەسکەر ژیانی بەسەر دەبرد، بەچرپە وتی: با کەس نەزانیّ، کیمیاوی رژاندووەو خەڵکێکی زۆر زامدارو شەهیدە، بەڵام با ژن و منداڵ پێی نەزانن، کاتیّ ئەم هەواڵەمزانی خێرا هەندیّ لەخزمان و دەستەیەك پێشمەرگە مەتارەی

ئاوەکانمـــان پڕکردبـــوو ڕوو لەدەشـــتی قەڵاســـێوکە جـــووڵاینو چـــەند پێشمەرگەیەکیشمان ڕاسپارد چاودێری ماڵو بارەگاکە بکەن، چونکە مەترسی ئـەوە هـەبوو جـاش بـدەن بەسـەر بارەگاکەمانـدا. هێشـتا(٥٠٠) مـەتر دوور نەکەوتبووینـەوە، خـەڵکێکی زۆرمانـدی بـەرەو لای ئێمـە ڕادەکـەن، تـەنهاو سـەڵتە خێزانی بۆنی گازی کیمیاوی لەدەمو لووتیانەوە سەریدەکرد، هەندێکیان چاویان ئاوسـابوو، پێسـتیان ڕەش هەڵگـەڕابوو، سـیمایان وا گۆڕابـوو، نەدەناسـرانەوە، گریانو نوزە نوزو دووعاو جنێو بەبار ڕوو لەدوژمن لەدەمیانەوە دەهاتە دەرێ. هی ئـەوە نـەبوو کەلەکـەس پرسـیار بکـەین، زۆر شـپرزە بـوون بـۆ ئـاو. هەرچـی لەمەتارەکانماندابوو دابەشمانکرد، بەڵام هەستمان بەسەرگرانبوون دەکرد، پێمان ڕاگەیاندن پەلە بکەنو بچنە هەوارەکەی ئێمەو لەسەر ڕووبارەکە خۆیانو جلو بەرگیان لەئاوەکە هەڵکێشنو ئەگەر بکرێ خۆشیان بگۆڕن.

هەر ڕۆیشتنو پۆل پۆل، ئاخر وەجبە بەتراکتۆر هاتن تا سەردارو شەخسەکەی سـەر ئاوەڕێژەکـەی دیـاری قەڵاسـێوکە، ڕوو لەعەسـکەر بـەغار دەڕۆیشـتین، دڵمـان ئـازاری پەیـدا دەکـرد، کـەس بەکـەس نـەبوو، خێزانـەکان کـێ بـۆی کرابـوو لـەماڵ ڕایکردبوو، نەدەزاندرا شەهید کێیەو چەندە.

لـەدیار مـاڵانی عەسـکەر تادەهـات شـەماڵ بـۆنی گازەکـەی چـاکتر دەدایـە هەناسەمان، لەوێدا چەند پێشمەرگەیەکمان توشبوو کەبریتی بوو لەعەبدولکەریمی هەڵەدنی کادری کۆمەڵەو مەلا فەرمان ئەندامی کەرتی ڕێکخستنی کۆمەڵە لەتیپی (٢٣ی سورداش)و مامۆستا جەمال محەمەد لێپرسراوی تیپی (٣١ی سلێمانی)و هەندێ پێشمەرگەی تـرو کاك غـەریب سەعید لێپرسراوی تیپی (٢٣ی سورداش) ئەوان لـەناو گونـدی عەسکەربوونو چاکتر هەواڵەکانیان دەزانـی، دوای لەیـەکتری پرسـین وتمـان: ئەڕۆینـە نـاو گونـد، وتیـان: مەچـن ئێمـە ئـاخر کەسـین هـاتووین. کیمیاییەکە هەنـدێ خـەڵكو ئـاژەڵو سـەگو پەلـەوەرێکی زۆری کوشـتووە، یـەکێك لەشـەهیدەکان کەهەواڵیانـدامێ (نـوری حەمـە نـەخۆش)بـوو کـەزڕ برازای خـۆم بـوو وەهاوڕێی کۆمەڵەو خۆشەویستی منبوو، بەڕاستی خەفەتێکی زۆری دامێ، پاشان بۆیان باسکردم تاشەش شەهیدی تـر هـەن بـەڵام بەتـەواوەتی نـەیان دەزانـی ناویـان چییە، تەنها یەك دوانێکیان وتیان: ماڵو منداڵی حاجی سەعیدی سمە قیت.

لەو بەرزاییە لێی دانیشتینو جیهازە هۆکی تۆکیەکانماکردەوە، لەهاشە زیاتر

چیتر نەدەهات، تومەز دوژمن پاڵپەستۆی خستۆتەسەر جیهازەکان بۆئەوەی پەیوەندی نێوانمان بپسێنێ، تاچاو بڕی دەکرد لەدەشتەکەدا لایت بەدەستوچاوی تراکتۆر دەبیندرا، روو لەشارو لەدەشت جەنجاڵێك بوو کەسی سەری لێدەرنەدەکرد، هەواڵمان زانی لەڕێی ماموستا جەمالەوە کە(ڕەهبەری سەید ئیبراهیم) لەدۆڵی ئاغجەلەرو (ئەنوەر دۆڵانی) لەقەیماسەیەو بڕیاربوو تیپی (٢١)و هێزی پارتی لەخاڵخالان بنو هەندێکی تریش لەهێزەکانی مەڵبەندی یەك لەدەورووپشتی تلیانو فەقێ میرازبن، تومەز کاتێ فڕۆکەکان لەکەرکوك هاتوون بەسەر خاڵخالاندا لەڕێوە بۆردوومانێکی چڕی کیمیابارانی گازی ماتسەرو خەردەڵیان کردووەو ئەوجار هاتونەتە سەر عەسکەرو لەوێشەوە سەرچەمی قەڵاتو چەمی رەزانو لەو ناوەش چی لەدەبۆکەیاندابووە هەڵیان رشتووە، پاش ئەم بۆردومانە خەڵکی ورەی لەدەستداوەو تەنها پێشمەرگە لەشوێنی خۆی بووە پاشان ئەوانیش لەترسی تەنها مانەوەو لێبڕانی خۆراك لەشوێنەکانیان جێهێشتووەو پەیوەندی دەستە بەکەرتو کەرت بەتیپو پێشمەرگە بەدەستەوە نەمابوو. رۆژگارێکە بێ سێو دوو، مەگەر حەشر وەکو باسدەکرێ وەهابێ، کێ ئازایەو سەری خۆی دەربکات. هەندێ لەهێزەکان خێرا پەڕیبوونەوە بۆ بەری کۆیەو هەندێك ڕەویانکردبوو بەرەو کەوەڵەو قەرەحەسەنو هەڵەتو دەشتی جەباریو هەندێ روو لەشێخ بزێنی خوارو، هەندێ بۆ بناری ئاغجەلەرو هەموو خەڵكو پێشمەرگەکانیش ئەو شەوە لەشوێنەکانی خۆیان جوولابوون، چونکە هات هاتو پڕوپاگەندەی دوژمن دوای ئەنفالی سێ مێشکی هەموو کەسێکی تێکدابوو، خۆی لەخۆیدا روحیەتێکی دروستکردبوو، تەنها بەوەشاندنی کیمیاوی لەگۆپتەپەو عەسکەرو بەم هەموو پڕوپاگەندەیە کاری دەرونی زۆری کردبوو، تێکڕا لێك هەڵوەشایەوە، ئازاو ترسنۆكو دڵسۆزو نادڵسۆز، دنیادیدەو نادیدە، بەدوای خۆ رزگارکردندا دەگەڕان.

هەرچی قسەمانکردو چاوەڕوانیمانکرد تەنها یەك جیهازمان دەست نەکەوت قسەی لەگەڵ بکەینو لەهەواڵیان پرسین، لەگەڵ ماموستا جەمالو مەلا فەرمانو غەریب سەعیدو عەبدولکەریم هەڵەدنیو شێخ فەرهاد کەهەموویان لێپرسراوبوون رێککەوتین لەسەر ئەوەی هەر چۆنێکە ئەم شەو لەئاسۆگەو گردۆڵکەکانی دەوری چەم خۆمان لەسەنگەر نێینو پارێزگاری ئەو خەڵکە زۆرە کیمیاوی خواردووەی گوندی عەسکەر بکەین.

هێزەکانی (٣١ی سلێمانی) مان دانا لەقەڵاچۆغان، شاخو بەردەڵانێکە لەچەم لەویێ سەنگەر بگرن، دەستەی ئێمەو ئەوبرادەرانەی تریشو مامۆستا جەمالیش لەگەڵ ئێمە بیێ بۆ بڕیاردان لەسەر کاری سبەینیێ لەپشتی قەڵای جوڵندیو پشتی زیخەڵان کەدەڕوانێتە ئەمبەروبەرو بەسەر هەموو دەشتی قەڵاسیۆکەدا ئەڕوانن، لەسەنگەردابین و ماڵو منداڵە دەرمانخواردووەکەش بڕواتە ئەشکەوتی حاجیلەو چەمی ساچوغ، وردە وردە شۆڕبووینەوە بەرەو چەم هەمووومان هەستمان بەبرسێتی دەکرد، بڕیاربوو ماڵی ئێمە برنجمان هەبیێ، ماوەیەکی زۆربوو کاك (محەمەد بارزانی) فەردەیەك برنجی کوردی بۆ هێنابووم، هێشتا لێمان نەخواردبوو، ئەو ئێوارەیە بەرنامەمان هەبوو، وتم: کوڕینە ئەڕۆینە بن چادرەکەی ئێمەو لەویێ چیمان هەبوو دەیخۆین، هەر نەبوو شووتی گۆپتەمان هەیە نانی پێوە دەخۆین، لەخێمەکان نزیکبووینەوە، سیروانی برازامو عەبدوڵڵای شێخ صدیقی کوزەبۆرەیی بەرەو پیرمان هاتنو هەواڵیاندایننیێ کەلەقەشقۆڵییەوە چوار پێنج تۆپیان گرتۆتە خێمەو هۆبەکەمانو کیمیاوی تێدابوو، هەندیێ لەژنو منداڵەکان بەرکەوتوونو هەموویان دوورخستۆتونەتەوە بۆ ساچوغ. ویستمان نان بخۆین کاتیێ روانیمان هەمووی بۆنی گرتووە بۆیە خێرا ئەوێمان بەجێهێشتو روو لەساچوغ کەوتینەریێ. چەم بەگشتی بۆنی گرتبوو، رۆژگارێکی ترسناكو شەوێکبوو نەمان ئەزانی سبەی چی روودەدات، سەردانی خاوو خێزانەکانمان کرد، بەکەڵکی ئەوە نەدەهات سەربکەینە ئەشکەوتەکەوە، بۆنی گازی کیمیاو گریانو زیقو هوڕی منداڵو بۆگەنی سکچوونی منداڵان خۆی لەخۆیدا کیمیاوییەکی نوێترو قورستری دروستکردبوو، خەڵکێکی زۆر چاوەکانیان لەدەستدابوو، هەرکەسە لای خۆیەوە هاواری دوکتۆرو دەوای دەکردو ئێمەش تەنها عوسمان عەسکەرییو یەك جانتا دەرمانمان لابوو کەئەوەش نەعوسمان زانیاری ئەوەندەی هەبوو نەدەرمانەکانیش بۆ ئەو مەبەستە دەشیان، ئەوەی هەبوو تەنها ئاوی رووبارەکەبوو خۆیانی تێفڕیێ بدەن بەجلەوە زوو زوو.

پاش دڵنیابوون لەسەرجەم خەڵکەکە، سەرکەوتینە سەر شاخو شوێنمان دەستنیشانکردو دوو دوو پێشمەرگە چوونە سەنگەرەوە، لێپرسراوەکانیش لەدەوری دە پازدە مەتریێ لەیەکتری، دوو دوو چووینە ناوسەنگەرو چاوەڕوانی رووناکیی رۆژی دوایی بووین.

## ڕۆژی (٥/٤)... ڕۆژی هێرش و کاولکردن.

خەومان لێنەدەکەوت تا کلاوکوڕە کەوتە خوێندن و جریوە جریوبوو، خۆمان باشتر پەناداو دووربینمان گرتە چاو، ئەو شوێنەی ئێمەی لێبووین بەهەر چواردەورماندا ناوچەی قەلاسێوکەو کۆیەو سورداشی لێوە دیاربوو بەتایبەت ئەو شوێنانەی گومانی هاتنی هێزی دوژمنی لەسەربوو، چوومە ناو دەوەنێکی پڕەوە، دووربینێکی بچکۆلەی ئەلمانیم هەبوو گرتمە دەست و کێومالمکرد بەدوای دوژمندا، هێشتا بەتەواوەتی دەوەن و مرۆڤ باش لێك نەدەکرایەوە کەسەری (سێکانیان) ڕەشاییەکی زۆری پێوەدیاربوو، نەم دەخوێندنەوە مرۆڤن یان دەوەن، بەپێی زانیاری ناوچەکەم، ئەوێ ئەوەندەی دەوەن لێنەبوو، بۆیە ئاگاداری هاوڕێکانم کرد بۆ ئەو مەبەستە باش سەرنجبدەن، لەو مقۆمقۆیەدا بووین وردە وردە ڕۆشنتر دەبۆوەو دەرکەوت مرۆڤن، هەموو پێشمەرگەکانمان ئاگادارکرد خۆیان دەرنەخەن ئەگەر بێتو دربکەوین تەنها دەبابە لەوێ هەلمان دەکەنێ، چونکە شوێنەکانمان رووتەنبوو تەنها ڕێزێ ڕازە بەردو چەند دەوەنێك دار بەرووی کورتی هەبوو، ئەویش ڕازەکە رووی لەدوژمن بوو، شوێنی گومانی بوونی پێشمەرگەی لێدەکرێ، تا دەهات مەڕەکانی دوژمن زۆرتر دەردەکەوتن ، بەمیگەلی مەڕو گاڕان دەچوو، جاش خۆیان دەجوولاندو سێ بازیان دەکرد لەخۆشی ئەوەی ولاتی خۆیان وێران دەکەن!!

دنیا بەتەواوەتی ڕووناك بۆوە، خەتی تەکیێ ـ ئاغجەلەر . غاغجلەرە . گۆپتەپە بەرۆشنی ڕیزی لەسەریەکی دەبابەو ناقیلەو ترومبێلی پێوە دیاربوو، دوکەڵ بەرزبووبۆوە لەگوندەکانی دامێنی ئاغجەلەرو شێخ بزێنی سەروو، تا چاو بڕیکا دوکەلی سپی و گرمە گرمی دەبابەو هاژەی سەیارە گوێی جیهانی کەڕ دەکرد، لەولایشەوە لەسەری کەلکەسماقەوە ئوتومبێل ڕیزببوون بەرەو کانی سوورو دەشتی کۆیەو جاش گەیشتبوونە کلێسەو بۆگد، لەبەری شێخ زەینەڵ و بیران و سێکانیان و سردو گەرمك و پشتی دەرەنارو چەم بەبەربلاوی هێزی دوژمن بن بەردو دەوەن دەگەڕان و تەقەیان دەکرد، هەرچی چۆنێ چاوو دووربینمان

هەڵدەخست تەنها جاش‌و سەربازو دوکەڵ دیاربوون‌و تەقەش لەهیچ شوێنێکدا دەنگی رووبەرووی دوژمن نەدەهات، تەنها لەشاخی گەورەدێ هەندێ دەستڕێژی تێکەڵاوبوو هات، تومەز کەرتێکی تیپی (۲۳ی سورداش) بەسەرپەرشتی (عەبدوڵڵا بەکرەجۆیی)و سابیر کۆکەیی لەوێ دەبن‌و دەست لەدوژمن دەکەنەوە، ئەویش ماوەیەکی کەم بوو پاشان برادەرەکان روو لەچەم کشابوونەوە.

لەنزیکمانەوە، لەسەری خورما حاجی‌و لەڕەقەم یەکی چەمی رەزانەوە هێزی دوژمن بە پیادە بەزۆری هاتن، وردە وردە دەکەوتینە ئابڵوقەوە، چونکە هێزەکانی دوژمن هەیدەربەگیان سووتاندو بەرەو عەسکەر هەڵکشابوون، هەر جارێ دوژمن هاتبێتە گوندی عەسکەر، تەکانی ئەو شوێنەی داوە کەدەڕوانێتە دیار چەمی قەڵای جوڵندی کەئێمە لەوێ خۆمان لەسەنگەر نابوو، بۆیە ئەبوو بیرێکی لێبکەینەوە، بڕیارماندا پاشەکشە بکەین‌و بڕۆینەوە دەوری ماڵ‌و منداڵەکە کەلەقولایی چەمدا بوون، بۆئەوەی ئەگەر ناچاربووین شەڕ بکەین، تا درەنگتر بێ چاکترەو پاشان لەوشوێنەی لێی بووین پێویستی بەڕەسەد نەدەکرد بۆ دەبابەو بۆ تۆپە دوور هاوێژەکان جگە لەوەی لەوێدا شەڕێکی خۆترێنی دۆڕاومان دەکرد، بەتێداچوونی خۆمان تەواو دەبوو.

خێرا دوو کوڕی ئازای تیپی (۳۱)و پێشمەرگەیەکی شارەزای دەستەکەی خۆمان نارد بەدوای تیپی (۳۱ی سلێمانی) لەقەڵاچۆغان‌و خۆشمان یەکە یەکەو بەقنگەخشکێ وەکو دەوەن شۆڕبووینەوە بۆ ناو چەمی ساچوغ‌و لەملاولای رووبارەکەو لەناو قامیش‌و گەمەڵە بیدا خۆمان مات کرد.

هەر لەوێ عوسمان عەسکەری ئازایی خۆی نواندو وایەری جیهازە راکاڵەکەی بەزەویدا بڵاوکردەوەو جیهازەکەی کردەوەو بەبەرچاوی ئەو هەموو هێزەی دوژمنەوە کەیەکەیەکەی جاش‌و سەربازو چەکەکانی دەستیانمان دەناسی، پاش ئەوەی هاتنە سە رازەکانی نزیکمان، هەواڵەکانمان گەیاندە سەرکردایەتی‌و پەیوەندیمان لەگەڵ هێمنە رەشی تیپی (۵۱ی گەرمیان) کرد کەلەناوچەی خاڵخاڵان گیری خواردبوو، هەروەها لەگەڵ شۆڕش قەرە هەنجیری کەپەڕیبۆوە بەرەو بەری خاڵەبازیانی، پێمان راگەیاندن کەئێمە لەچەم داین.

رۆژ لەنیوەڕۆ سەرکەوتبوو، بوو بەچرپە چرپ، وتم: چی روویداوە؟ وتیان: برادەرانی لای مامۆستا جەمال جاشیان دیوە لەچەمداو بەرەو لای ئێمە دێن‌و زۆر

نزیکن، لەئان‌و ساتیَ ئەوەدان بەلوتماندا بتەقنەوە، وەها ڕێکەوتبوو من‌و شەهید مەریوانی برازام بەپاڵ یەکەوە، لەبن بنە بییەکدا دانیشتبووین‌و شوێنەکانی سەرشاخمان دەدۆزییەوە کەجاش‌و سەرباز بۆی هاتوون، ئەم هەواڵە بەتەواوەتی وروژاندمی، لەوە ترسام فریای دەربازکردنی ئەو هەموو ژن‌و منداڵە نەکەوین‌و تەقە دەست پیَ بکات، هەر بەرد غل بکەنەوە هەموومان لەناو دەبەن.

تفەنگەکەم مەغزەنێکی (٧٥)ی لەسەربوو، بەهێواشی سوارم کردو خۆم دانوساند، چرپە زۆر لێمان نزیکبوو بەلاَم ئێمە لەم بەربووین‌و ئەوان لەوبەری ئاوەکەبوون، لەوەدابووم پێش لەوەی ئەوان تەقە بکەن من تەقەیان لێبکەم، مامۆستا جەمال گەیشتە لام وتی: تەقە نەکەی دووبرادەری (٣١ی سلێمانین)و دابڕاون، بەڕاستی هەواڵێکی خۆشبوو لەو بەلاَیەش رزگارمانبوو، سەعات گەیشتە چوار، چەم بەتەواوەتی سێبەری بەسەردا هات، جاش‌و سەربازیش هەڵسابوونە سەرپیَ‌و دوورە تەقەیان دەکرد، لەگەڵ مەریوان‌و عوسماندا روو لەئەشکەوتی ماڵ‌و منداڵ بەچەمداو بەماتە مات رۆیشتین، لەبن گابەردێکدا تۆزیَ بۆشایی هەبوو، روانیمان لاشەی پێشمەرگەیەکی تێدایە، لێی چووینە پێشەوە، رامان کێشا نوزەی لێوەهات، کیمیایی لێیدابوو، سەروچاوی رەش هەڵگەڕابوو، بۆنی زۆر لێدەهات، ئاومان دایەو پێمان وت: کەوا لێوەی نزیکین، سوودی نەبوو خۆی لیَ راکێشایەوە، ناوی ئەحمەد برنەوبوو خەڵکی گوندی عەسکەربوو، لەو بەلاَیە رزگاری بوو بەلاَم بەداخەوە لەشەڕی ناوخۆدا شەهیدبوو.

نەمان دەوێرا زۆر بڕۆینە رووتەنەکە هەرچەندە سێبەریشی بەسەردا هاتبوو، چاوەڕێمان کرد تا جاشەکان ئاسۆگەکەیان چۆڵکرد، ئەوجا لەگەڵ دوو سیَ پێشمەرگەو غەریب سەعیدو شێخ فەرهادو براکانی‌و حاجی سەمەدی حەمە پەری چووینە ناو ئەشکەوتەکە، ئەوەی ئێوارە دیبوومان زۆر کەمتربوو لەوەی هەبوون، بەڕۆژ لەترسی ئەوەی دەرنەکەون هەرچی منداڵ هەیە لەئەشکەوتەکەدا خۆیان بەتاڵکردبوو، بۆگەنی کیمیاویی‌و پیسایی ئەوەندەی تر ئەوانەی کەمیَ ساغ بوون ئەوانیشی خراپتر کردبوو، داوامان کرد هەموو بێنە سەر ئاوەکەو لەویَ تەگبیرو را بکەین بۆ سبەینیَ و داهاتوو. لەسەر رووبارەکە سەروچاوشۆراو منداڵ پاککرایەوە، ژمارەیەکی زۆر کەلەنزیکەوە کیمیاوی لێیدابوون ئاوسابوون‌و رەشهەڵگەڕابوون‌و چاویان نەیدەبینی، هەموو خۆیان بەجلەکانەوە فڕێدایە

ئاوەکەوە، خەڵکەکە برسی بوو، چاڵێندراو نان خورا، لەگەڵ کاك غەریب سەعید عەسکەری پێمان راگەیاندن کەئێمە ئەڕۆین بەرەو ژوورتر واتە چەمی رەزان و ئێوەش وەرنە گردە گڕوێ، وتیان: ئێمە پێمان چاکە ئێوە لێمان دوور بکەونەوەو خۆمان چارەسەری خۆمان دەکەین، بەلاّم ئەگەر ئێوەمان لەدەوربن دووچاری شەڕ دەبن و ماڵ و منداڵ بەو هۆیەوە تێدا دەچن. ئێمەش لەگەڵ غەریب سەعیدو ئەو پێشمەرگانەی ژن و منداڵیان لەگەڵبوو ریکەوتین هەر کەسە ماڵ و منداڵەکەی خۆی بهێنێ با لەگەڵ خۆماندا بن تا دەرفەتێ دەست دەکەوێ و رەوانەی شارو بەرەیان دەکەینەوە.

هەرکەسە پەلی ماڵ و منداڵی خۆمان گرت و لەپاشەڵی هێزەکەوە روو لەپێچی قەلاّی جوڵندی جوولاّین، بەکری برازام و روناکی هاوسەرم چاویان نەی دەبینا، من پەلم رادەکێشاو مەریوانیش پەلی کاکی تا گەیشتینە گردە گڕوێ بەگیاڕەشی ئەوچەمەدا، دەیانجار کەوتن و هەڵسانەوە روویدا.

لەشوێنی چاوەڕوانی لەگەڵ مامۆستا جەمال و کاك غەریب یەکمان گرتەوە، کاك غەریب عەسکەری ماڵ و منداڵەکانی نەهێنابوو، وتبویان: لەگەڵ خەڵکەکە دەبین و ئەگەر پەیوەندیکرا بەشارەوە ئێمەیش لەگەڵ ئەوان دەڕۆینەوە، قسەو باس زۆرکرا" لەکوێ بین و چۆن و بەچەند بەش؟" تەنها غەریب سەعیدی رای وابوو بلاّوەی لێبکەین، باقی پێیان وەهابوو بەکۆمەڵ خۆمان لێك دانەبڕین چونکە جگە لەدەستەکەی من و هەندێ لەخزمانم ئەوانی تر شارەزایی ناوچەکەیان نەبوو. ئەگەر بلاّوەمان بکردایە هەموو دەفەوتان، بۆیە بەکۆمەڵ چووینە دار گوێزەکەی چەمی رەزان و لەوێ پرسورامان بەغەریب کرد بەهۆی ئەوەی ماڵەکەی لەو چەمەدابوو، خۆشی سەرتیپی (٢٣ی سورداش) بوو کەبەشی زۆری هاوینەکەی لەوناوە بەسەر دەبرد، رێك نەکەوت لەگەڵمان و تەنها خۆی و پێشمەرگەیەکی خزمی لێمان دابڕان. ئێمەش گەڕاینەوە بۆ ناو زاخیرە بەردەکانی گردەگڕوێ، برادەرانی تیپی( ٣١ی سلێمانی) کوڕی گورج و ئازایان لەگەڵبوو، هەر بەوشەوە لەئەشکەوت و بن بەردا ئازوقەیان دۆزیبۆوەو لەشوێنێکی تردا بۆ خۆیان شاردبویانەوە، بەیانیش شوێنی زۆر قایمیان بۆ خۆیان دەست نیشان کردبوو، ئێمەیش لەگەڵ دەستەکەی خۆم و ماڵە خزمەکان لەنێوانی سێ چوار بەردو دەوەنی گەورەدا لێی پاڵکەوتین و نیازومان نەبوو هیچ بکەین، خەوم لێکەوتبوو، شێخ فەرهادو عوسمان و خالیدی

برای شەهید بێتون هاتنەلام ، وتیان: شوێنێکی زۆر چاکمان دۆزیوەتەوە ئەگەر هەموو سوپای عێراق بێت، خۆمان پێ پەنا دەدرێ، لای خەبەرێکی چاك بوو چونکە بەلای منەوە تەنها پارێزگاری‌و مانەوەی خەڵکەکە خۆی لەخۆیدا شتێکی گرنگبوو، هەر بەوشەوە رۆیشتینە چاڵێکەوە، هیچ شوێنێکی لێوە دیار نەبوو، داری زۆر بەدەورەوەبوو، گابەردو لاشاخ حەوشەیان بۆ دروستکردبوو.

## رۆژی (١٩٨٨/٥/٥)و ئێمەو مغاویر.

بەیانی تاریك‌و روون لەخەو هەڵساین، خۆمان کۆکردەوە، حاجی کەریمی تەلانی چووە سەر رووبارەکە، دەست نوێژی هەڵگرت‌و هەندێ مەتارەو شت هەبوون پڕی کردبوو لەئاو، پاشان دوو دوو سێ سێ چووین بۆ سەر ئاو، دواجار ئافرەتەکانمان بردە سەر ئاوەکە سەروچاویان شۆری‌و جموجوڵمان قەدەغەکرد، چونکە سەر رازەکان دەرکەوت‌و جاش‌و سەرباز وەکو دالآشی دەوری کەلاکی مردارەوەبوو بەپێوە وەستابوون‌و بەدووربین تەماشای جموجووڵی ناوچەکەیان دەکرد.

یەکێك لەپێشمەرگەکان بەسکەخشکێ هاتە لامەوەو وتی: راست بەرامبەرمان بەدووربین تەماشاکە لەبن فلآن تاشە بەردا مغاویرێك سەیری ئێمە دەکات، منیش زۆر روانیم نەمدۆزییەوە، وتم: "شتی وەها نییە تۆ چاوت رەشکەو پێشکەی کردووە" یەك دوو دووربین بەدەستی تر کەوتنە روانین، لەئەنجامدا خۆم لایەکی قۆڵیم بەدیکردو بۆم رۆشن بۆوە کەئەوە بەرگی مغاویرییەو رەنگە بەیانی حاجی کەریم‌و ئەوانەی چوونەسەر ئاویان بینی بێت‌و چاوەڕێی ئەوە دەکەن هێزیان بۆ بێ‌و دەستمان لێبکەنەوە. بۆیە شێخ فەرهادو خالیدم بانگکرد کەهەوڵبدەن ژنەکان‌و هەندێ لەو پێشمەرگانەی کەمتر دنیای شەڕو شۆڕیان دیوە بخەنە ئەشکەوتەکەو خۆشمان چوار پێنج کەس لەشوێنەکانی خۆمانەوە چاودێری وەزعەکە بکەین. ئەشکەوتەکە لەپێشەوە بەدرێژایی یەك مەتر شاخەکەی بەسەردا هاتبۆوە، پاشان درزی بردبۆوە، بەردەکەی ژێرەوەی زەلامی ئاسایی پێوە دەچوو، بەلآم بۆ خوارەوە چەند قوڵە نەمان دەزانی، سەرەتا بەپشتێنی حەلاوەخانی خێزانی شێخ فەرهاد لەهەموو ژنەکان قەد باریکتربوو، شۆڕیان کردبۆوە،

پشتێنەکە پسابوو، پەراسووی ئازاری ببوو، پاشان ژنەکانی تریان شۆڕکردبۆوەو لایتی دەستیان دابوونی، دەرکەوتبوو ئەشکەوتیکە وەکو قەیسەری پێچاو پێچ دەرواو هەتا ئەگەر دوژمن (ئارپیجی) یان رومانەشی تێ بگرێ پەنای تێدایە ئەتوانن خۆیان بپارێزن. ژمارەیەکی زۆر چوونە ژووری، هاتنە سەرەوەش ئەگەر کەس لەسەرەوە یارمەتی نەدا ئاسان نییە.

سەرمان لەسەر مغاویر هەڵنەگرت، دوای دوو سێ سەعات لەدڵەڕاوکێو روانین، ئاسیمانەوە کەخولە درێژی شێخ عەبدوڵڵا قوچی عەسکەرییەو سەربازی راکردووەو لەوێدا خۆی مەڵاسداوەو چاوی لەهەموو جموجووڵی هێزەکانی دوژمنە لەسەری پلەی بەردە عەلیو زیخەڵانو خورماحاجی.

ئێمە ئەومان ناسییەوەو ئەویش ئێمەی تێگەیاند کەدوژمن ئابلۆقەی داوینو لەدەورمانن، دەنگە دەنگ نەکەین، جارێکی تر گرژبووینەوە، پاشان خۆی شۆڕکردەوەو وردە وردە هاتە سەر رووبارەکەو بەپەناوە هاتەوە لامان، ئەو بۆی گێڕاینەوە کەدوژمن تەنها لەسەر راز نین بەڵکە دەوروبەری قەڵای جوڵندیشیان پشکنیوەو لەئێمەیشەوە زۆر نزیکن، تا سەعات (١٢) ماڵو منداڵو هەندێ پێشمەرگە لەئەشکەوتەکەدابوونو پاشان هەڵمان کێشانەوە بۆ سەرەوە.

ئێوارە مەترسی هاتنە سەرمان کەم بووبۆوە، پەژارەی ئەوە دایگرتبووم چۆن هەواڵێکی گوندی گۆپتەپە بزانم، ئەو کارەساتە دروستبووبوو، هێزی دوژمن تادەهات لەزیادبوون بوو، ئێمە لەناو ئابلۆقەی زیاتر لە (٢٠) تا (٥٠) هەزار سەربازو جاشدا بووین، بەتەواوەتی دابڕابووین. پەژارەی ژنو منالی خەڵکی عەسکەریش لەولاوە بوەستێو رزگرکردنی ئەو سێ چوار ئافرەتەی لەگەڵ ئێمەیشدا بوون خۆی لەخۆیدا کەللەپچەبوو کرابووە دەستو پێمان، نەماندەتوانی نەخشەی رۆیشتنی رێگای دە سەعاتی بکێشین. بەدەم ئەم بیرکردنەوانەوە لەپاڵ دەوەنێکدا لەسەر قەمسەڵەکەم راکشابوومو کڵاوو جامانەکەم کردبوو بەسەرین، لەولاوە حاجی کەریمی تەلانی کەلەگەرمك دەژیا لێم نزیکبۆوە، ئەو پێشمەرگە نەبوو بەڵکە دۆستی شۆڕش بوو، بەڵام دەرباز نەببوو، لەوچەمەدا کەوتە لای ئێمە، هەڵسامە سەر چیچکانو بەخێرهاتنم کردو وتم: "ئەوە چۆنە هاتی.؟ " وتی: "پرسێکم هەیە" وتم "بفەرموو" وتی: "نیازم هەیە ئەم شەو لەگەڵ عەبدولڕەحمانی خزمم بڕۆمەوە بۆ تەلانو لەوێ ماڵو منداڵەکەم هەوێم بۆ دەهێننو دەچمەوە شار،

تۆ چ ئەمریٚ کاریٚکت هەیە" خەبەرەکە خۆش‌و ناخۆشبوو، ناخۆشبوو رۆیشتنی دنیادیدەیەکی وەکو حاجی‌و گورج‌و گۆلێکی وەکو عەبدولڕەحمان، خەسارەیەکی گەورەبوو، بەلاّم رۆیشتنی کاریٚکی زۆر چاکبوو ئەگەر بیتوانیایە رووناکی هاوسەرم‌و خیٚزانی شیٚخ فەرهادو منیرەی خیٚزانی سەعدەی برای شیٚخ فەرهادو ناهیدەی خیٚزانی حاجی سەمەد لەگەلّ دایکی سەمەد، واتە خیٚزانی حاجی محمدی پەری کەرکوکی رزگار بکات‌و بیانباتەوە ئەوا گەورەترین سەرکەوتن دەبیٚ بۆ من، بۆیە رووم لەحاجی ناو وتم: "بەڕاستی زۆرم پیٚناخۆشە چونکە پیاویٚکی بەورەو دنیادیدەی، بەلاّم کاریٚکی زۆر گرنگم هەیە ئەگەر بۆم بکەی، خۆم بەقەرزارت دەزانم " زۆر جوامیٚرانە وتی: " باشە بەسەر چاو بفەرموو" وتم: روناک‌و ئەو دوو سیٚ ژنەم بۆ بگەیەنە لیٚواری جادەی قەشقۆلّی " ئەم شەوو سبەی خۆیان دەڕۆنە سەر جادەو سواری سەیارە دەبن بۆ سلیٚمانی" زۆر پیاوانە ریٚککەوت لەسەر ئەوەی وتم. منیش ژنەکانم بانگکردو ئامۆژگاریم کردن کەشویٚن‌و ریٚگای ئیٚمە نازانن‌و خۆیان لەوە بەدوور دەگرن‌و هەریەکە شتیٚ پارەمان دانیٚ‌و حاجی رۆیشت لەگەلّ تاریکبوونی رۆژداو ئیٚمەش خیٚرا هەلّساین بەرەو چەمی رەزان کەوتینەوە ریٚ. ئەمبەروبەری ئەو ریٚگایەی لەگردەگرِویٚوە ئەچوو بۆ چەم گازی کیمیاوی سوتاندبووی، لاشەو کەلاکیٚکی زۆر لەو ناوە کەوتبوو، سەرداری بیٚسەر دەکرد بۆگەنی، کەدەچووینە سەر رووبارەکە بۆ ئاو خواردن، دەمان بینی ماسییەکی زۆر گاز کوشتبووی، چونکە چەند قومبەلەیەکی لەدوو ئاوانەکەی زەرزی‌و چەمی رەزاندا بوو، ماسی کوژراو لیٚوارەکانی رووبارەکەی پڕکردبوو، ئاوەکەش تامی گۆڕابوو.

رۆژی (١٩٨٨/٥/٦) رزگارمان بوو لەدەست مالّ‌و مندالّ‌و روو لەچەم جوولاّین لەبۆن‌و بەرامی کەلاکی کیمیاوی‌و کوژراوی گاو کوتالّ‌و هیٚسترو گویٚدریٚژو درندەی کیٚوی‌و ماسی کوژراوی ئاوەوە بۆ خانووە سووتاوەکانی بەردەمی ئەشکەوت حەوای چەمی رەزان.

ئەمڕۆ واتە (٧ـ ٥) جاش هاتنەوە هەوارەکانی هاوینەی خەلّکی قۆچبلاّخ‌و عەودەلاّن‌و دەستیان کردەوە بەسووتاندنی ئەو تۆزە دارو درەختەی سەر خانووەکان‌و هەرچی قاپ‌و قاچاخ‌و شت لەویٚ مابوو هەموویان بەنووکی قەمە کونکون کردبوو، بۆ ئەوەی ئیٚمە کەلّکی لیٚوە نەگرین، هەندیٚ سەگی بەوەفاتر

لەجاش لەو ناوە پارێزگاری خانوەکانیان دەکرد، درانە بەر گوللەو ئەوەی نەکوژرا تەراندرا، ( ئاڕپیجی) یان روو لەلای ئێمە دەهاویشت، زۆرمان نەمابوو بتەقینەوە بەیەکدان بەڵام ئێمە دانمان بەخۆماندا گرتو خۆمان ئاشکرا نەکرد.

ئەمڕۆ لەکاتێکا وەزعمان زۆر نادیاربوو، فەرماندەی دەستەکەم بەناوی عزەدین سەدرەدین خەڵکی هەیدەربەگ لەگەڵ عەبدوڵلای شێخ صدیق کۆزەبۆرەیی کەخزمێکی نزیکم بوو داوایان کرد ڕێگایان بدەم سەر لەناوچەی قەڵاسێوکە بدەنو سۆراخی ماڵو منداڵیان بکەن، ئەمە لەکاتێکا دووبراو هەندێ خزمی عزەدین لەچەمی قەڵاتدا وەکو سەربازی ڕاکردوو خۆیان مەڵاسداوەو ناوچەی قەڵاسێوەکەش دەرزی بهاوی بەر جاشو سەرباز دەکەوێ. زانیتم ورەیان نەماوەو ئەڕۆن بۆیە بەخۆشی ڕێگام دانو داوام لێکردن شوێنو ڕێمان نەڵێن، وەزعمان وەهای لێهات مانەوەمان لەچەمی رەزان تادێت مەترسی زیاتر دروست دەکات بۆیە دەبوو هەر چۆنێکە رووبکەینە پیرەمەگرون، بەڵام ڕۆیشتن بۆ ئەوێش کارێکی یەکجار دژواربوو، ڕۆیشتن بەو ناو چڕیو دووریو ئەو هەموو هێزانەی دوژمندا هەر بەدەم خۆشە. ئەوە بەمەرجێ ناشزانین تا دەگەینە پیرەمەگرون چەندان رەبایەمان لەسەر ڕێیەو ئەبێ بەشەویش بڕۆین کەبەڕۆژ ڕێگاکەی بەسانایی نابردرێ، ئینجا وەرە بەشەو ، تەنها چارەمان ئەوەبوو داوامان لەکاك غەریب عسکەری کرد، ئەو زۆر شارەزابوو، شەوە های شەو پێیدا ڕۆیشتبوو، خۆی لێمان دابڕیبوو بەڵام شوێنەکەمان دەزانی لەچەمی حەمە خرەی زەرزیدا لەدووبەش بوونی رووبارەکە دوورگەیەکی چڕی لێبوو چوو بووە ئەویو ئازوقەو شتی زۆری بردبوو. خۆیو کوڕێکی منداڵی خزمی لەگەڵدابوو بۆ هاودەنگی، هەرچۆنێ بوو پەیدامان کرد، بەرنامەکەمان بۆ باسکرد، پێی چاك نەبوو، داوای کرد بڕۆینە پشتی دووریيانەکەی کەلەپاشو لەناو گەمەڵەبییەکەدا ئەو هێزە مۆڵ بدەین کەسەرەڕێ هاتووچۆی ڕۆژانی جاشو دوژمنە، کەسمان داواکەیمان پەسەند نەکردو وەکو شتێکی زۆر پێویست داوامان کرد چاوساغیمان بکات تا سوسێی سەروو، ڕێگای لەگەڵ نەگرتینو نەهات، ئێمەش لەبافلەکەی چەم کۆبووینەوەو بڕیارماندا ئەگەر تێدا چووین هەر دەبێ شوێن بگۆڕین چونکە خەڵکمان لێ ڕۆیشتووەو کەمو زۆر ژمارەمان دەزانن لەگەڵ شوێنەکانمان. بەهیممەتی عبدالکریمو شێخ فەرهاد کەماوەیەك لەو ناوە کادربوو بوو لەگەڵ مەلا فەرمانو

عەبدولکەریم هەڵەدنی بەناو ئەو هەموو دڕکەزیو ڕەبایەی جاش‌و سەربازو ئەو هەموو زۆنگاوو زەلکاوەی بەهاری دامێنی قۆچبلاخ و عەودەلان‌و کانی هەنجیر روو لەکەلەباشی سەروو، لەوێشەوە روو لەپیری، بەلام دەدانە سەعات قوڕاو قوڕمان شێلاو لەگەڵ هەر تەقینی تەلقە تەنورەیەکدا هەموومان خۆمان دەدا بەزەویدا، هەتا تفەنگەکانمان زۆربەی پڕ لوولەکەی ببوو لەقوڕو زەلەوردە. ئاوەکەی کرژەمان بڕی، تۆزێ ڕەت بووین، خالیدی بری شەهید بێستون هاتە لام‌و وتی: ئەو نامەیە بگرە، وتم: بەم شەوە ئەمە چییە.؟ وتی: پێشمەرگەی دەستەکەی من بوو رۆیشتبوو لەچەرمەگا خۆی بداتە دەست عومەری حەمە عەلی رۆستەم‌و داوای بوردنی کردبوو، نووسیبوی وەعدبێ خیانەت ناکەم، شەو نزیکبوو تەواو بێ و هێشتا لەجادەکە نەپەڕی بووینەوە، ریزێ تەقەیان لێکردین، هەموومان لەناو پەلەگەنمێکدا خۆماندا بەزەویدا، ئێمە جیهازێکی راکاڵ‌و ئیمپلیفایەرێك‌و باترییەکی سەیارەو یەك بیکەیسی‌و یەك (ئارپیجی) مان پێبوو، عوسمان‌و مەریوانی برازام و سیروان‌و شوانی برازام، بەرپرسی جیهازو کەل‌وپەلەکەی بوون، مەریوان مندالێو دونیانەدیدەبوو، بەلام وتو وریاو ئازاو گورج‌و گۆڵبوو، جیهازەکەی نەدەدا بەکەس. پێش دونیا رۆشن بوون گەیشتینە دامێنی چیای پیرەمەگرون لەخوار پەلە هەنجیرو پیازەکانی سوسیی سەروو، پێمان وابوو رزگارمان بووە، هیلاکیمان پێوە دیاربوو، ئەمانویست بڕۆینە ناو پیازەکان هەندێ پیاز هەڵکێشین‌و پشوویەك بدەیەن، ئەوجا چنگ لەشاخ بدەین، لەپڕێکا لەهەنجیرەکانەوە تێیان راخوڕین "ئێوە کێن؟"

دەنگەکەمان ناسییەوە، سابیر کۆکەیی بوو، ئەوان لەئێمەیان پێ خۆشتربوو چونکە دابڕابوون‌و زۆر کەم ببوونەوە، ئێمەیش لەوان زیاتر، ئەملاولای یەکترمان ماچ کرد، سابیر و فەقێ وشیار بوون‌و دوو پێشمەرگەی دڵسۆزو زۆر دێرین بوون، هەرچی فەقێ وشیارە لەسەرەتای شۆڕشەوە (قیادە واحیدە) بوو جەولەی لەدەشتەکانی شواندا دەکردن لەکاتێکا هێشتا دەستەو کەرت لەوێدا دروست نەببوو.

چاوساخیان کردین‌و بردیانیان بۆ دۆڵە باریك‌و لەوێ پێشمەرگەی تری لێبوون، ئەوان حەرەسیاتیان داناو ئێمەیش خەوتین تا سەعات پێنجی ئێوارە، پاشان داوام کرد پشوودرێژبن تاڕێگای دەربازبوون پەیدا دەکەین‌و هەر ئەمڕۆ واتە

(٥/٩) رۆژەکـەی لەدۆڵـە بـاریکی پیرەمـەگرون بـووین‌و ئێـوارە هەنـدێ سـەربازی ڕاکردوومان لابوو، تەگبیرمان بۆ کردن بنێرن کەس‌وکاریان وەرەقەیان بۆ بهێنن‌و بیان بەنەوە شار یان دەربازیان بکەن بۆ بنکەکانی سەر سنوورو پاش بەڕێکردنی ئەوانە روو لەدۆڵەبی پیری بەڕێ کەوتین کاتێ شەو داهات بەیانی سەعاتی هەشت (٩) دەبابەو سێ کۆپتەری جەنگی‌و ژمارەیەکی زۆر سەیارەی پڕ لەجاش‌و سەرباز هاتن‌و گوندی بیرانیان سووتاند. دووره تەقەیان لەلای ئێمە کرد بەڵام کوێرانەو ئێمەیش لەجێگای خۆمانەوە هاتووچۆی سەرجادەکەو جەنجاڵی ئۆردوگای تازە دروستکراوی کۆکەو کرژەمان دەژمارد.

ئێـوارە ئـەوان رۆیشـتنەوە، رێکخـراوی سـلێمانی برادەرێکیـان نـاردبوو، جگـە لەوەش لەڕانیەوە بەشێخ نەوزەڕدا سەید حاجی جوابی ناردبوو کەئەگەر بمانەوێ بمان پەڕێنێتەوە بۆ مەڵبەندی چواری یەکێتی.

ئێمە لەگەڵ شار نامەمان گۆڕییەوەو نامەشمان بۆ مەکتەبی عەسکەری نووسی، بۆ مـلازم عومـەر لەمەڵبەنـدی چـوار لـەوەزع‌و لـەژمارەی خۆمـان ئاگادارمـان کـردن‌و داواشمـان کـرد شتێ پارەمـان بـۆ رەوانـە بکـەن، بەشێخ نـەوزەڕدا بـۆ بەردەسـت‌و یارمەتی مانگانەی پێشمەرگەکان.

هـاتنی وەفـدی شـار بەهـەر دوو بەشـەکەیەوە دەروویـەکی خۆشـی بـوو لێمـان کرایەوە.

(١٩٨٨/٥/١٠)دوژمن دوو رۆژبوو لەسەر یەك دەهاتە پشتی سوسێی سـەروو تا دەگەیشتە گوندی بیران‌و سەرلەنوێ کولانـە مریشك‌و شتی وەهـا مـابوو ئەوەشیان سووتاندو هەندێ شرەخۆری تریـان کـردو تـا ئێـوارە بەدیارمانەوە مانـەوە چونکـە هەواڵ گەیشتبۆوە دوژمـن کـەمن لەگـەڵ (٥٠٠) پێشـمەرگە لەپیرەمەگروونـدا عاسـی بووم، هەر بۆیە دڵنیابوون کەئێمە لەوێین چونکە لـەماوەی ئـەم دوو رۆژە خـەڵکێکی زۆری ڕاکـردووی سـەربازیی لـەوێوە دەچـوونە سووسـێ‌و پاشـان سـواری سـەیارە دەبوون‌و دەچوونەوە شار، بەڵام پیرەمـەگرون هێنـدە چڕە جاشـەکان نـەیان دەوێـرا خۆیـانی لـێ بـدەن بەڵکـە فەرمانەکـەیان بـەدوورە تەقـە جێبەجێـدەکرد. هەرچـەندە ئەمڕۆ وەزعی دەروونـی بـرادەران زۆر خـراپ بـوو بەتایبـەت تیپـی (٣١ی سـلێمانی) جگە لەوەش هـەر لەخۆیـەوە نائـەمینی پەیـدابووبوو لـەنێوان هەنـدێ لەهێزەکـەمان، هەنـدێ پێشـمەرگەی تیپـی (٢٣ی سـورداش) پێیـان وابـوو ئەوانـە عەشـایەرن‌و هـەر

دەقەیەك بڕۆنەوە دەڕۆنەوە لای دوژمن، لەڕاستیدا وانەبوو بەلاّم سەختی بارودۆخەکە وایکردبوو مرۆڤ لەیەکتری بکەوێتە گومانەوە. هەرچۆنێك بوو هەر لەدۆڵەبی و لەئەشکەوتەکەی پیرەمەگروندا ماینەوە.

ڕۆژی ٥/١١ جارێکی تر جاشگەل هاتنەوە، لەگەڵی ڕاهاتبووین، گوێمان پێی نەدەداو دەستەیەك پێشمەرگەم ناردە سەر شاخی پیری بۆئەوەی لەوێوە بڕواننە دیوی مێرگەپان و پشتی هەڵەدن و بزانن ڕێگا دەبێ ئەگەر ڕووبکەینە ئەو ناوەو بەژیلواندا سەر بکەوین و لەویوە ڕووبکەینە دۆڵی شێخ محەمەدو پاشان بەسەفەرەو زەروندا بچینەوە بۆ ئێران و لەوێوە بگەڕێینەوە ناوزەنگ، برادەران شەو گەڕانەوەو هەرچی چاویان هەڵخستبوو هیچ دەروویەکیان نەدۆزیبۆوە، دوژمن بەچڕی کەلێنەکانی پڕکردبۆوە.

ڕۆژی (٥/١٢/ لەگەڵ سابیر کۆکەیی و مامە سەعە تەلانی کەفەرماندەی کەرتبو لەتیپی (٣١ی سلێمانی)و بەکری برازام بەشاخەکەدا هەڵزناین، لەخواریشەوە جاش هاتنەوەو هەر باسی کولێرەی خۆیان دەکرد، برادەرانی ئێمەش بەبەربلاّوی لەناو تلیشەبەردو پاڵ دەوەنەداردا چاویان لەسەر سێرەبوو، ئێمەیش هێواش هێواش پێیدا هەڵگژاین، ناوە ناوە پەڵە ڕێواسی گوڵ سوورو سپیمان دەدی، چەپکمان لێدروستدەکردو خوێمان دەکردە نێو لەپی دەستمان و بەمژین و خواردنیەوە هەنگاومان دەنا. تا گەیشتینە پشتی ڕەنوو، ڕووبەڕووی مێرگەپان و دیار هەوارەکانی ماڵی مام خورشید، پێموایە هەرچی ڕێی کەوتبێتە مێرگەپان لەوێدا تێر تێر دۆی خەست و ماستاوی کوڵکنی خواردۆتەوەو دەبێ ناوی ماڵی مام خورشید بزانێ، کاتێ گەیشتینە سەرەوە، پاش تۆزێ پشوودان، دووربینمان دەرهێنا، هەموو ناوچەکەمان هەر لەقزلەرو تا دێتەوە پشت دابان پشکنی و ئەوجار لەدۆڵی گەورەدێ و چەمی چۆخماخەوە تا دەگاتە چالاّوا بەژیلواندا کاوەکانمان ڕوانی، دوژمن بەتەواوەتی ڕێگای بڕیبوو، ئۆتومبێل لەمێرگەپان و لەمالومە بۆ بەرگەڵو بەئاسایی هاتوچۆی دەکرد، بێئەوەی لەهیچ سڵ بکەنەوە. دوای ئەوەی دڵنیابووین ڕێگامان نابێ، گەڕاین لەشوێن کەڵەکە بەردی ڕاوچی، قوتویەکمان دۆزییەوەو بەبەفر شۆریمان و پڕمانکرد لەبەفرو چایەکمان لێنا، سابیر کۆکەیی پێشمەرگەیەکی بەمشووربوو، شەکرو چای هەمیشە لادەست دەکەوت، سەرو چامان خواردو پاشان وردە وردە شۆڕبووینەوە، عەسرێکی درەنگبوو، لەپشتی

ئەشــكەوتەكە دانیشــتبووین، دەمانڕوانییــە جموجــووڵی ئۆردوگاكــە، لــەپڕێكا مامۆستا جەمال سەیری گوندی قەرەچەتانی كرد، دووسیٚ ئوتومبیٚلی زیلی گـەورە پڕ لـەمغاویر بەكۆڵەپشـتەوە دادەبـەزن، هـاواری لەسـایبیركردو وتـی: "تۆ شـارەزای ئەوە كوێیـە؟" هـەر سیٚ لامـان روانیمـانو زانیمـان كەهێزێكی تایبەتـەو دوور نییـە كـاری تایبـەتیان پـیٚ سـپێردرابیٚ بـۆ سـەر شـاخو ئـەوەش سـیٚ رۆژە بەبـەردەوامی جـاش دەورمـان چـۆڵناكەن. لـەڕووی دەروونییـەوە كـارێكی ئاسـان نـەبوو رۆژانـە دوژمـن بێتـە سـەرتو تـۆش مـاوەی دەربـاز بوونـت نـەبیٚ، بۆیـە ناچـار هەرچـی فەرمانـدەكان هەیـە كـۆم كردنـەوە لەسـەر ئـەوە قسـەمان كـرد بـا دابـەش بـینو هەولبدەین بەشێك بگەڕێنەوە بۆ چەم، چونكە پێدەچوو هەندیٚ لەهێزەكانی دەوری چەم چۆڵیان كردبیٚ، بووینـە دوو سیٚ بـەش، هەندیٚ لـەو پێشـمەرگانەی سورداش كەخۆشیان مانـەوەیان لەناوچەی خۆیانـدا پێخۆشتر بیٚ، بەدوو دەسـتە شوێنمان دیاریكرد كەبریتی بـوو لەفـەقیٚ وشیارو هەندیٚ پەراگەندو محەمـەدی حاجی قـادر كەفەرمانـدەی كـەرتبوو، ئـەویش هـەر لـەبناریبیٚ، ئێمـەش كەوتینـە ریٚو بەیانی زوو لـەدەوری گونـدی زەرزی خۆمانـدا بەزەویـدا، هـەوا لەرووبارەكـەی دەداو كزەبـای دۆڵەكە تێكـەلاٚوی ئـاودەبوو، هـەموو لەسـەرما رەق بووینـەوە، بـەلاٚم مانـدووبووین، چـارەمان نـەبوو، لـەوەش دڵنیـا بـووین جـاش لەعـەودەلاٚنو قۆچـبلاٚغو زەرزی كشاوەتەوە. چەم بەڕاستی شوێنێك بوو هەر هەمووومان پێی قەرزارین هـەتا مردن، چڕو قـایمو، پڕ لەئازوقـەی هەمـە چەشـنە، پـێچو پـەنا، شـوێنی رۆژی لێقەومانو باوەشی دایكێكی میهرەبان بۆ ئێمەی پێشمەرگەی سەردەمی ئەنفالەكان.

ئــەمڕۆ واتــە (١٣/٥/١٩٨٨) یەكــەم رۆژ بــوو كەگەیشــتبووینەوە چــەم، پێشـمەرگەكان كەوتنـە گـەڕان بـەدوای پەیـداكردنی ئازووقـەدا، دوو دوو سـیٚ سـیٚ بەملاولادا رۆیشتبووین، كاتیٚ هاتینەوە وتیان هێزی دوژمن خورما حاجیو رەقەم یەكی چەمی رەزانی چۆڵكردووە، بەڕاسـتی هـەواڵێكی زۆر خۆشبوو، چونكە چـەم دەرفـەتێكی فراوانـی ژیـانی تێـدا دەبـوو ئەگـەر هێزەكـانی سەرشـاخەكانی بـڕۆن، ئـەمڕۆ بـەئازادی زۆر ئەشـكەوتو پـێچو پـەنا گـەڕاین، هـەر لـەپێلاٚوە كۆنـە هـەتا قاپەشكاو، هێلەكو جلو بەرگ، چی بەردەست بكەوتایە كۆدەكرایەوەو سـەرلەنویٚ دادەپۆشرانەوە بۆ كاتی پێویست. پێلاٚو لەشتە هەرە پێویستەكان بوو، بۆیە چۆن نانمان لەپشت دەكرد دەبوو هەر یەكێك لەئێمە جووتیٚ پێلاٚوی زیادەی لەپشت بیٚ

لەبەرئەوەی شەوو ڕۆژ خەریکی جێگا گۆڕکێ بووین.

ئەمڕۆ (٥/١٤) بەنیازی پشکنینی دەوروبەری ماڵەکانی خۆمان بە چەمدا لەگەڵ دووسێ پێشمەرگە بەرەو هەوارەکانی کۆنی خۆمان ڕۆیشتین، جاشەکان هەرچی ئازوقەو شتومەکی ماڵەکانمان هەبوو کردبوویان بەسەریەکداو هەرچی کەل و پەلی ژنانەش هەبوو بۆ بێڕەوشتی بەسەرداروو دەوەنەکانەوە کردبوویان بەئاڵا، دوای ئەوەی بەدووریین لەتەواوی ناوچەکەمان ڕوانی، بەپەلە جل و بەرگەکانمان کۆکردەوەو لەپەڕۆیەکمان گرێداو لەگەڵ خۆمان هێنامان، ئەوسا جاشەکان لەسەر خانوو ماڵەکەی من لەچەم ڕەبییەیان دانابوو، ئەو ڕۆژە هیچ شتێکمان دەست نەکەوت جگە لەو جل وبرگەو گەڕاینەوە بۆ چەمی ڕەزان.

ڕۆژی (٥/١٥) جارێکی تر لەسەربانی چەمی سورقاوشانمان دایەوە چونکە لەهەندێ شوێن شتم شاردبۆوە بەنیازی دەربازکردنی، بەلام جاش کەمینی مەحکەمیان بۆ دانابووین لەو شوێنەی ڕۆژی ١٤ بۆی چووبووین، بەوەدا زانیبوویان پەڕو پاڵەکە کۆکرابۆوە، باش بوو زوو هەستمان پێکردو لەشوێنێکدا ئێمە چاودێریی ئەوانمان ئەکرد، لەو ڕوانینانەماندا لەسەر سۆندەی ئاوەکەی هەوارەکانمان دوو ڕەشماری گەورە ئاوێزانی یەکتری بووبوون و گەردەنیان نیو مەتر هەڵکشابوو، ماوەیەکی چاکیش سەرنجی ئەوان ڕای گرتین و پاشان پاشەو پاش گەڕاینەوە.

ڕۆژی (٥/١٦) جارێکی تر چوومەوە وێزەی چەم، ئەمڕۆ جاشەکان خانووە فەقیرانەکەی باوکی شەهید مەریوانیان سووتاند لەزێڵێن لەسەر ڕەزەکەی کەبەکرێی گرتبوون بۆ ڕنینی هەنارو ترێ، دووکەل بەری چەمی گرتبوو، جاش بەدەوریدا تەق و هوریان بوو.

ئەمڕۆش چووینە ئەشکەوتەکەی لەپۆژی لێقەماندا ڕزگاری کردین لەگردەگروێ، بەیانی ترسی ئەوەمان نەمابوو جاش لەسەر سەرمان بن، بەبۆنەی جەژنی ڕەمەزانەوە برادەران بەیادی نوێژی جەژن و قورئان خوێندنی شارەوە ڕادیۆکەیان لەسەر ئیسگەیەك دانابوو پڕ بەدەنگ مەلا قورئانی بۆ دەخوێندین، خۆربوو دنیا گەرم بووبوو، سەری دامێنی زیخەلانماندا، جاش هەر لەسورقاوشان و شێخان مابوون و بۆسەر هەوارەکەی ئێمە بەردەوام بوون.

ڕۆژی (٥/١٨) چوومە سەری خورما حاجی کەبەرزترین شوێنی چەمی ڕەزانە،

بەنیازی پەیوەندی کردن لەگەڵ عەبدولکەریم هەڵەدنی کەچەند رۆژ لەوەوبەر بەهۆکی تۆکیەکەوە لەگەڵ برادەرێکی تر ناردبووی بۆ تاقیکردنەوەیەکی تری مێرگەپان و هەڵەدن، دەنگی چاك دەگەیی چونکە ئەو لەسەر پیرەمەگرون بوو، لەوە دڵنیای کردم کەناتوانرێ بەوناوەدا گوزەر بکرێ و وتی: فواد هاتۆتەوە، ئەو برادەرانەی بەڵێنی ئەوەیانداوە هەندێکمان بۆ دەربازبکەن بۆ مەڵبەندی چوار داوای یەك دوو وێنەی شەخسی دەکەن و کاتی دیاریکراومان دانا ئەوان هەر لەوێبن، ئێمە جارێکی تر هەڵدەگەرێینەوە بۆ پیرەمەگرون. هەر ئەمرۆ بوو واتە( ١٩٨٨/٥/١٨) مەولودی کوری کوێخا سەعیدی کلێسەیی کەزۆر دۆستێکی نزیکم بوو بەفێڵێکی زۆر سەیر رایکرد، تومەز لەگەڵ عزەدین لەو چەمەدا یەکیان بینیوەو بەڵێنیداوە ئەویش لای ئێمە بەجێ بهێڵێ و بڕوات بۆلایان، بەیانی وتی: ئەچم خۆم دەشۆرم و فیشەکدانەکەی بەجێهێشت و تەنها کلاشنکۆفەکەی برد لەگەڵ جامێکدا، هەر نەهاتەوە کاتێ من لەسەر شاخ گەڕامەوە لەگەڵ مەریوان و عوسمان عەسکەریدا، وتیان: کاك مەولودیش رایکردووە، جارێکی تر ئەبوو شوێن بگۆڕین.

ئەمرۆ واتا (١٩٨٨/٥/١٩) جارێکی تر رێگای پیرەمەگرونمان گرتەبەر، بەلاّم وەکو جاران نەبوو، جاش و رەبایە ئەوەندە نەمابوو، خۆشمان شارەزاتر بووین و بنکەو خەڵکمان لەپیرەمەگرون مابوونەوەو ئازوقەی ئامادەبووشمان بۆ هەفتەیەکی تر لەوێ هەبوو، وەهای لێهاتبوو چوونمان بۆ ئەوێ بۆ پشوودان بوو.

## کەرەسەکانی لەناو پەڕینەوە کەشێخ ستاری کان یەهە نجیر بۆی کڕیووین:

ڕۆژی (٥/٢٠) لەگەڵ ئەوەی داوام کرد لەو برادەرانەی شارو هەوێی (یەدەگ) دروست بکەن نەکو ڕۆژێ لەڕۆژان ڕێگای دەربازبوونمان نەمێنێ، ئەوسا بەڕێگای سەیارەدا یەك یەكو دوو دوو پێشمەرگە بەڕێ بکەین بۆ سنووری مەڵبەندی چوار یان قەندیل. هەر هەمان ڕۆژ لیستێکی بەم جۆرەم بۆ کردن، ئەم شتانەمان بۆ بکڕن بۆمان بنێرن، بۆ کاتی زۆر پێویست لەزێی دوکانو پێی بپەڕینەوە:

١. چوار چوپی تراکتۆر.

٢. گلۆڵەیەك حەبل بۆ بەستنی کەڵەك.

٣. تەوراسێكو تەشوێیەك.

٤. هەندێك بزمار.

٥. مشارێکی دار بڕین.

ئەو برادەرانەی شاریش لەگەڵ گەڕانەوەی هەواڵی ئامادەکردنی (١٠) پێشمەرگە بۆ بەڕێکردن، ئەو پێویستییانەیان بۆ هێناینو ئێمەش لەگەڵ فەقێ وشیارو ئاواتو خالید مەحمودو شێخ فەرهاددا ناردمانە ئاسارە کۆنەکەی پێی دەوترێ (قەڵای کان) ڕووبەڕووی قەڵا تێکڕوخاوەکەی پاشای کوڕە لەگوندی بۆگدی بەری کۆیەو لەوێدا شێخ فەرهادو خالیدی برای شەهید بێستون بەکارامەیی شاردبوویانەوە تاڕۆژی پێویست.

ئەمڕۆ واتە (٥/٢٠) نامەم بەباوکی فواد دا نارد بۆ مستەفا کەلەڕێگای سەید حاجی هاوڕێیەوە هەوێمان بۆ دروست بکات، تا بتوانین دەستە دەستە بەجادەدا برادەران ڕەوانەی مەڵبەندی چوار بکەین.

هەروەها داواشمانکردبوو لەفواد کەکامێرایەك لەباوکی داوا بکات ڕۆژێك وێنەی برادەرانی پێ بگرین بۆ هەوێو شەو باوکی فواد سەری لێدابووین، کامێراکەمان گەیشتە دەستو عوسمان عەسکەری یەکە یەکە وێنەی ئەوانەی گرت کە وێنەی بچووکیان لانەبوو، ئەمڕۆ واتە (٥/٢١)وەڵام هاتەوە کەدەستەیەکی (١٢)نەفەریی بەڕێی بکەین بۆ گوندی ئەڵلاقولی لەبازیانو لەوێوە بۆمان بەڕێ بکەن، بەڕاستی یارمەتیەکی چاکبوو چونکە هەندێ پێشمەرگەمان لەگەڵبوو پەکیان کەوتبوو،

نـەخۆش و زامداریشـی تێـدابوو.، بەتێکـەڵاوی ئـەوەی زانیمـان بـۆ ئـەو بارودۆخـە ناگونجێ ئامادەمان کردو عەسری ئەمڕۆ کۆبوونـەوەمان بەسـەرجەم برادەران کـردو لەسەر گرنگی خۆگرتن و مانەوەمان دوام، کاتێ کۆبوونەوەمان تـەواوکرد، برادەران هەندێکیان وەها گەرم ببوون وتیان: هەر ئەم شەو بابڕۆین بۆسەر جادەی سلێمانی . دوکان و دەستێکی باش لەدوژمن بووەشێنین.

رۆژی ٥/٢٢/) عەبدولکـەریم هەڵـەدنی وفوادمان نـارد لەبازیانـەوە بڕۆنـە شـارو ئیش و کارەکان بۆ ئەم برایانـەی دەیانـەوێ بـەڕێ بکـەون جێـەجێ بکـەن و هەنـدێ پەیوەندیو داواشمان هەبوو لەخاڵە بەکریێ دارتاش کەئەوسا ئەنـدامێکی چالاکی رێکخستنی کۆمەڵەبوو لەشارو بووبوو بەخدری زیندەو لەهەموو شوێنێکدا خەڵکی دەنارد بۆلامان و هاوکاریی دڵسۆزانەی دەکردین.

ئـەمڕۆ پـاش بـەڕێکردنی عەبدولکـەریم و فـواد لەگـەڵ سـابیر کۆکـەیی و چـەند برادەرێـك بـۆ تـاقی کردنـەوەی دۆڵـی سـەقران (لەپشـتی قەرەچـەتانەوە) چـووم و شـەویش لـەوێ لەشـیوی سـەقراندا بـەردێکی پـانی گـەورە هـەبوو لەژێرەکەیـدا کۆمەڵێك کەتریو مەنجەڵو پیاڵەو شتی لێبوو لەگەڵ شەکرو چاو ساوەرو برنج و خوێـدا، بۆیـە سـێ چـوار پێشـمەرگە لـەوێ ماینـەوەو تاسـێرە هـەڵگیرا چاودێری جادەکەمان کرد.

ئەمڕۆ (٥/٢٣) عەبدولکەریم و فواد هاتنـەوە نێـوانی گەبـەو گولیجـەو بـەبێ سیم پێیان راگەیاندین هەر ئەمڕۆ (١٠) پێشمەرگە بۆ شەو ئامادە بکەین بۆئەوەی بڕۆنـە ئەڵلاقولیو لـەوێوە مسـتەفاو برادەر سـەید حـاجی بۆمـان بـەڕێ بکـەن، بۆیـە منـیش لەگەڵ ئەو چەند بـرادەرە گەڕاینـەوە لای هێزەکـەمان لەدۆڵەبی پیرەمـەگرون و چـەند برادەرێکـی تیپـی (٣١)و ئەوەکـەی تـری لـەتیپی سـورداش و پەراگەنـدەو دوو لەدەستەکەی منیش ئامادەکران و لەشەوی (٢٣/٢٤ـ٥) پەڕاندمانـنەوە بـەری گەبـەو لـەوێوە بەژێرانـە برانـە سـەر جـادەو بەئاسـوودەیی بـەڕێکران و پـاش دوو سـێ رۆژ بـەبێ سـیم لـەدۆڵی بالیسـانەوە هـەواڵیان دایـنێ کەبەسـەلامەت گەیشـتوون. هـەمان شـەو ئێمـەیش جـارێکی تـر بـەرەو چـەمی رەزان کەوتینـەوە رێ. ئـەمڕۆ (٥/٢٥) لەخوار مالأنی زەرزییەوە لـەداری کاکـەڕەش بووین، غـەریب سـەعید کەهـەر لەچەم بوو هاتەوە لامان وەکو سەردان.

رۆژی (١٩٨٨/٥/٢٦) هـەر لـەداری کاکـەڕەش بـووین، مامۆسـتا شـێرکۆ (ئـەمین

کەریم شەریف) لەگەڵ سەرداری کوێخا نەریمانی کەڵەشێرە هاتنە لامان‌و بۆیان باس کردین کەلەڕۆژی یەکەمی ئەنفالەوە شێرکۆ تەنها ئەشکەوتێکدا بووەو لەبەر نەبوونی خوێ زەختی دابەزییوەو لەمردنـدابووە، سەردار فریای کەوتووە. ئەو رۆژە برادەرانی(٣١)ی سلێمانی مانگایەکیان لەچەمدا دۆزی بۆوە، دەوریاندابوو، هێنایان‌و سەرمان بڕی‌و بەسەر برادەراندا دابەشمانکرد، ئەو دووانەش فریای گۆشتخواردن کەوتن. دوژمن لێمان نزیك نەبوون جار جارە پێشمەرگە ئەچوونە گۆلەکانەوەو مەلەیان دەکرد، لەسەر گۆشت خواردن بووین بەدەم پرسیارەوە شێرکۆو سەردار وتیان: رەهبەری سەید ئیبراهیم و تیپی (٢٥ی خاڵخاڵان) لەدۆڵی قۆجەلەردان لەدەوری ماڵی کوێخا کاکەولای چنارتوو، ئەم هەواڵەمان زۆر پێخۆشبوو، هەر پاش نانخواردن نامەیەکی بچکۆلەم بۆ کاك رەهبەر نووسی‌و شوێن‌و جێگای خۆمانم بۆ دیاری کردو داوام کرد لەگەڵ نوێنەرەکانماندا بێنە لامان.

## مام شێرو دوژمنایەتی

یەکێك لەو پێشمەرگانەی لەتیپی (٢٣ی سورداش) بوو ناوی عوسمان شێخ عەلی، خەڵکی گوندی زێڵێن بوو، لەناو پێشمەرگەدا بەمام شێر ناسرابوو، مام شێرو بەکری برای دوو سەربازی راکردوو بوون، هاتبوونەوە گوندی زێڵێن لەچەمی سوورقاوشان لەسەر ئەرزو باخی خۆیان داینشتبوون، ئەم دوو برایە بەدووانە دەچوون، زۆر یەکیان خۆشدویست‌و هەر پێکەوە هەڵسوکەوتیان دەکرد، لەپڕێکاو لەناخافڵ ساڵی (١٩٨٦) بەکر لەنزیکی گوندەکەی خۆیان کوژراو پاش چەند رۆژێ تەرمەکەی دۆزرایەوە.

ماوەیەك شۆڕش سۆراغی کرد، پاشان لەسەر داوای شێخ عەلی باوکیان، سەرداری کوێخا نەریمانی کەڵەشێرە ماوەیەك گیراو زینـدانیبوو، بەڵام هیچ بەڵگەیەك نەبوو بۆ تاوانبارکردنی بۆیە ئازاد کرا، پاشان سەردارچووە چەمچەماڵ‌و سرێیەك جاشی دروستکردو مام شێریش بوو بەپێشمەرگە لە(٢٣ی سورداش).

پاش ماوەیەك سەردار لەسەر داوای ئێمە جاشێتی بەجێهێشت‌و هاتەوە بۆ گوندی کەڵەشێرەو هەندێ چەکیشی لەگەڵ خۆی هێنا بۆ مەڵبەندی دوو، رۆژانی

ئەنفال مام شێر دابڕاو کەوتە ناو دەستەکەی ئێمەوە، ڕۆژی( ٥/٢٦) کاتێ ئێمە لەپیرەمەگرون گەڕاینەوە داری کاکە ڕەش لەچەم، سەردارو شێرکۆش هاتنە لامان، مام شێر زۆر دڵگرانبوو، قەستی کوشتنی ناخافڵی سەرداری هەبوو، هاتە لامو وتی: من ئارەزوو ناکەم لەگەڵ بکوژی براکەم لێرەدا بژیمو پێویستە چارەسەرێ بدۆزینەوە، یان ئەو دەرکەن یان من بڕۆم، پێکەوە دانیشتین، سەرتاسەری ناوچەکە دوژمن لێی داگیرکرد بووین، پیموت: چارە بەدەستی تۆیە، شۆڕش ئەم پیاوەی گرتووەو دادگا لەبەر نەبوونی بەڵگە ئازادی کردووە، ئێستاش ئەویش وەکو ئێمە لەدەست دوژمن رایکردووە، سەرەڕای هەموو ئەمانەش سەردار بۆ شارەزایی کونو کەلەبەری چەم لەهەمووما ن شارەزاترەو ئێمە ئەتوانین کەڵکی لێوەر دەگرین جا ئەگەر تۆ دان بەخۆتا بگری کەی دەرباز بووین ئەگەر بەڵگەت هەیە کەئەو برای کوشتووی جارێکی تر ئەی دەینەوە بەدادگاو خۆت بەشداری لەدانیشتنەکاندا بکە، زۆر قسەمان کردو مام شێر هەڵوێستی چاکبوو، لەبەر بەرژەوەندی ئێمە دەستی نەوەشاند، بەڕاستی تا ئەو ڕۆژەی لەگەڵ مامۆستا جەمالو ئەوان بەرێمکرد هەر لەوە دەترسام سەردارو مام شێر یەکیان یەکیان بکوژن. سەیر ئەوە بوو هەردووکیان لەدەستەیەکدا لای مەلا فەرمان بوون بەناوی تیپی (٢٣ی سورداش).

ئەمڕۆ (١٩٨٨/٥/٢٢) ڕەهبەری سەید ئیبرایمو (٢٠) پێشمەرگە گەیشتنە لامانو زامدارێکیان لەگەڵدابوو بەناوی کاك ڕەفعەت کەکادرێکی کۆمەڵایەتی بوو، یەکێکبوو بەبنەماڵە خەڵکی تێکۆشەرو مرۆڤێکی تابڵێی دڵسۆزو ڕەوشتبەرزبوو، بەڵام حاڵەتی زامەکەی چونکە مار پێوەیدابوو زۆر دەمێك بوو برینەکەی سارێژ نەکرابوو، دووچاری گانگری ببوو، کاك ڕەهبەر ئەیوت: چەند جار پێشمەرگەم ناردووە بۆ شار دەرمان بهێنێ نەگەڕاوەتەوە، ئێمەیش مژدەمان دانێ کەلەگەڵ شار پەیوەندیمان هەیەو لەفرسەتێکی نزیکا ڕەوانەی سلێمانی دەکەینو لەوێوە دەگاتەوە سەرکردایەتی.

ڕۆژی (٥/٢٨) غەریب سەعید کەفەرماندەی تیپی (٢٣ی سورداش) بوو هەر خۆیو تەنها یەك (پ.م) مابوونەوە، داوای کرد یارمەتی مادی بدەمو ڕێگایشی بدەم لەگەڵ پەڕاگەندەی حسكو پارتی بڕوات بۆ سەرکردایەتی، منیش لەوێ یارمەتی مانگانەی دوو مانگم دایەو خواحافیزم لێکرد.

ئەمرۆ (٥/٢٩) کاك رەفعەتو عەبدولکەریمو عەتا بازیانی مان بەرێکرد بۆ ئۆردوگای کەلاش کەران، بۆ ئەوەی لەوێوە بێیان بەنە شار، هەر ئەمرۆ دوو نوێنەری شار کەمستەفاو عوزێر حەمە بەگی موغاغ بوون لەگەڵ هەتاو کەوتندا هاتنە لامان بۆ تەنیشتی بافلەکەو بڕیاربوو پارەمان بۆ بهێنن، بەلام نەیان هێنابوو، نامەی رێکخراوی سلێمانیو خاڵە بەکری دارشتاشو هەندێ نامەی تریان هێنابوو بۆ برادەران، رۆژێکی خۆشبوو، خەمی بەرێکردنی کاك رەفعەتمان نەما.

رۆژی (٥/٣١) عەبدولکەریمو ئەوانەی چوو بوون بۆ شار هاتنەوەو هەندێ پێویستی گۆرەویو پاکەتو شانەو موسو فلچەی ددانو سابوونو مەعجونی ددانیان بۆ هێنابووین.

رۆژی (٦/١)لەگەڵ رەهبەرو عەبدولکەریم تاپلەی بەردەعەلی رۆیشتین بۆ پشکنینی ناوچەکە لەهێزەکانی دوژمن، کاك رەهبەر کەمتر تاقەتی جموجوڵی هەبوو، زۆربەی رۆژەکان داوام دەکرد دوو دوو سێ سێ بڕۆین سەر کاوو ڕازەکان بگەڕێین لەوێوە دوژمن باشتر دەردەکەوێ، ئەو ئەو تاقەتەی نەبوو، زیاتر لەناو دەستەکەی خۆیدا کاتیان بەقسەی خۆشەوە بەڕێدەکرد.

رۆژی (٦/٢)هەندێ پێلاومان لەشارەوە بۆ هات، هەرچی چۆنمان دابەشدەکرد گلەییو پرتەو بۆڵەی هەر لەسەر دەبوو چونکە پێلاو لەهەمووشت زەرورتربوو.

رۆژی (٦/٣) جارێکی تر عەبدولکەریم هەڵەدنیو مەریوانی برازام بەرێکردەوە بۆ ئۆردوگای بازیان، بەنیازی چوونەوە بۆ شار، منیش لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکدا چوم بۆ کەڵەشێرە بۆ سۆراخی جێگاو رێگا بۆ کاتی پێویست.

رۆژی (٦/٥) مامۆستا عادلو ئەنوەرو کامەران عەبدولڕەحمان لەجەولە هاتنەوە لامان، چووبوونە دەوروبەری ئاغجەلەر، رۆژی (١٩٨٨/٦/٦) حاجی حەمەڕەشی کەڵەشێرە هات بۆ بەسەرکردنەوەی شوێنەوارو هەواری خۆیان کەڵەشێرە، ئەمرۆ فەقێ وشیارو ئاواتم نارد هەواڵی ناوچەی سوورقاوشانو شێخان بزانن، دوژمن ماوە یان رۆیشتووە.

رۆژی (٦/٢) لەشارەوە چاو جگەرەو دۆشاوی تەماتەمان بۆ هات بەهیمەتی عەبدو لکەریمو عەتاو عوزێرو حەسەنو سەباح حەمە بەگ.

# نەسرەدین

ئەمڕۆ ڕۆژی (١٩٨٨/٦/٨) بەیانیەکەی هەر وەکو هەموو ڕۆژەکانی تر ناردم بەدوای دەستەی تیپی سورداش‌و تیپی (٢٥)و (٣١ی سلێمانی) کەسەرو پێشمەرگە ئامادە بکەن‌و بڕۆن ئەشکەوتەکان بگەڕێن‌و هەرچی دەستکەوت‌و ئازوقە، جل‌وبەرگی پیاوان‌و بەتایبەت پێلاو کەزۆر زۆر پێویست بوو بۆ ئەو کاتەی ئێمە کۆی بکەنەوەو بەشی ژەمەکانی ئەمڕۆش بهێنن. هەرکەس بۆ دەستەکانی خۆیان، ئێمە وەکو بارەگای لێپرسراوی گشتی ئەبوو مشور بخۆین، کارەکان ڕاپەڕێنین، بۆ ئەو کارانەش هەندێ کەسمان دەستنیشان کردبوو کەئازاو گورج‌و گۆڵ‌و گوێڕایەڵ بوون‌و بەدەنگمانەوە دەهاتن لەوانە: سەرداری کوێخا نەریمانی کەڵەشێرە، کەخۆی بەخزمی من دەزانی‌و خەڵکی ناوچەکەبوو، کوڕی بێشەو چڕی کەڵەشێرەو چەم بوو، هەر لەمنداڵییەوە دەستی بەسەر پەلەپتکەی تفەنگ ئاشنابوو، بۆ ئەو کاتەی ئێمە زۆر زۆر باش بوو، ماینێکی سپی قەڵەوی گرتبۆوەو کارەکانی پێ جێبەجێدەکرد، ئەحمەد جوتیارو قاسم‌و مام شێر لەدەستەکەی مەلا فەرمان کۆمان کردبوونەوەو ناومان لێنابوون: تیپی سورداش، سێ لاوی گورج‌و گۆڵ‌و هەمیشە ئامادە بوون، زیاتریش بۆ دەستەکەی خۆیان دەستبەکار بوون، عوسمان عەسکەری‌و نەسرەدینیش لەدەستەکەی مندا هەمیشە سازو ئامادەبوون، ڕۆژانە بەفێنکی بەیانیان یان ئێواران دەگەڕان بۆ کۆکردنەوەو جارێکی تر شاردنەوەی پێویستیەکان.

نەسرەدین خەڵکی شاری کەرکوک بوو، سەربازی ڕاکردووبوو، لەدەوری بەکری برازام‌و برادەری منداڵی ئەوبوو لەعەسکەر ئەڕیا، ڕۆژی (١٩٨٨/٦/٣) کەهێرشی کیمیاوی هات بەبێ چەك لەگەڵ بەکردا هات بۆ چەم، ئەوسا بەکریش پێشمەرگە نەبوو، هەردووکیان کەوتنە پاڵ ئێمەو بەیەکەوە ڕۆژگارە چڕەکانمان بەڕێدەکرد. نەسرەدین کوڕێکی ڕووخۆشی وتو وریابوو، بەڵام ڕۆژێ لەڕۆژان نەتفەنگی دی بوو نەبەکاری هێنابوو، هەر بۆیەش خۆی لەئاستی حەرەسیات‌و شتی لەو بابەتە نەدەدا، بەڵام لەرۆژێکا چەند جارمان چا پێ لێبنایە گوێی پێنەدەدا. بۆ ئەملاولامان بناردایە سەری پێوە نەبوو، زۆریش لای سەیربوو کەمن بەو تەمەنەوە

لەو بارودۆخەدا توانای هەڵسوکەوتم زیاترە لەلاوەکان، هەر بۆیە زۆر جار قسەی بەبرادەران دەوت و منی بەنموونە دەهێنایەوە. رۆژی (١٩٨٨/٦/٨)بوو، لەخوارووی چەپی دامێنی بافڵەکە بووین، مەلا فەرمان و سابیر کۆکەیی و عبدالکریم و دوو سێ پێشمەرگە کەهێزی سورداش بوون، چەند مەترێ سەرووتر لەبن دار گوێزێکدا بارەگایان دانابوو، ئێمەیش لەناوەندی ئەوان و تیپی (٢٥) دا لەبندار گوێزێکدا جێگامان چاك کردبوو، چاومان لەلووتی شێربابەبوو کەلوتکەیەکە حەرەسی رۆژمان لەوێ دادەنا، هەروەها لوتەی خورماحاجی مان لێوە دیاربوو، زۆر جار مەریوانی برازام دوو سێ برە گەلاًدار بەڕووی لەخۆی دەپێچا و سەردەکەوت بەهەورازەکەداو تەماشای دیوی قەلاًسێوکەو دەوروبەری چەمی دەکردو بەوردی هەڵس و کەوتی رۆژی پێدەوتین.

ئەمرۆ داوای دوو برادەرمان کرد بڕۆن بۆ کەرخۆری دامێنی کەڵەشێرەو ئازوقە بهێنن، سەردارو نەسرەدین و یەکێکی تیپی (٢٥)بەڕێخران، نیوەڕۆ هات و نەسرەدین نەهاتەوە، دوای نیوەڕۆبوو من سەرم لەبارەگای تیپی (٣٥)داو لەگەڵ برادەران دانیشتبووین، دەنگە دەنگێکی سەیر لەلای بافڵەوە دەهات دووسێ جارمان وت: ئەوە کێیە بڵێن قڕەقڕ نەکەی، ئاخری کاك سەمەد کەرکوکی کەیاری چییەکی زۆر لێزانە لەتۆپی پێدا بە بێ چەك چەند مەترێ لەئێمە دوورکەوتەوەو لەپڕێکا پاشەو پاش کشایەوەو وتی: جاشە. خێرا هەڵساین، خۆمان کۆکردەوەو من گەڕامەوە چەند پێشمەرگەی گورج و گۆڵم لەگەڵ خۆم هێناو بەرەو سەر جۆگای سەر بافڵەکەوەو هەست خوستمان نەما، سەرەتا شوێن پێمان هەڵگرتن، بەلاًم چڕیی چەمی رەزان لەوەدا نییە کەیەکێك بیەوێ خۆی نیشان نەدا بدۆزرێتەوە، دووربینمان گرتە دەستەوەو پاش ماوەیەك لەبەری زەرزی بۆ لای زەوی حەمە خڕە بەرگەوەی گیچەڵ شەش حەوت جاشمان بینی هەموویان نەسرەدینیان لەنێواندا گرتبوو، بەڕێز دەڕۆیشتن، لەلای ئێمەوە بۆ ئەوی تەقەکردن سوودی نەبوو، لەوە زیاتر سەری خۆمان دەهێشاند، تۆزێ برە کاڵەك و ترۆزی لەپشتی بافڵەکە تۆوکرابوو، هی ماڵی مستەفا بەگی عەودەلاًنی بوو، زۆر مژۆمۆرەمان کرد، چەند زرکێکی نەگەیووی پێوەبوو نەمان توانی کەڵکی لێوەربگرین، هەر لەوێ خۆماندا بەزەویداو پەژارەمان لەبردنی نەسرەدین دەخوارد.

## نەسرەدین چۆن گیرا؟

کاتێ سەردار دەگەڕێتەوە لای مەلا فەرمانو ئەوان، پێشمەرگەکەی (٢٥)یش دەڕواتەوە لای برادەران، نەسرەدین ئەیەوێ گوێدرێژەکەی لەشوێنێکدا ببەستێتەوە بۆ ئەوەی وەختێکی تریش کەڵکی لێوەربگرێ، کاتێ دەزانێ سێ چوار تفەنگ لەسەر سەری رادەگرنو پێی دەڵێن: چرکە بکەی دەتکوژین، تفەنگێکی یەك لاقیی خۆماڵی پێبوو لێیان سەندبوو، وەکو مەڕێ لەترسی گورگ پێشیان کەوتبوو، بێ چربە رۆیشتن، لەنەسرەدین وایە لەو چەمەدا جگەلە پێشمەرگە کەسێکی تر توانای ئەوەی نییە ژیان لەوێدا بەرێتە سەر. ئەوەی ئەو لێی نەدەترسا هاتنی جاشبوو، ئەوەی نەدەزانی خەڵکی شارەزا ئەتوانێ لەو جۆرە شوێنانەدا دەست بوەشێنێتو بڕوات.

کاك رەهبەری سید ئیبراهیم لەڕۆژژمێری بیرەوەی پێشمەرگانەیدا ئەم باسەی نوسیوە، بەلآم من بەپێویستم زانی گشتییەکەی بنووسمەوە، چونکە کاك رەهبەر چاکدەزانێ من لەو کاتەدا لەگەڵ مەریوانی برازام تەنها کلاشینکۆفێكو یەك مەغزەنی (٧٥)م لابوو، هەتا پشتێنو جەمەدانەکەشم نەبردبوو لەلای ئەوان دانیشتبووینو یادگاری پێش ئەنفالمان دەگێڕایەوەو منیش بەتورەیی بەکاك سەمەدم وت: "ئەرێ برا بزانە ئەوە چییە بۆچی وەها دەنگە دەنگ دەکەن؟" کەڕۆیشتین بەدووی جاشدا تەنها کاك رەهبەرو برادەرەکانی دەستەکەی نەبون بەڵکە ژمارەیەکی چاك لەهەر سێ بەشەکە چووین، جگە لەمامۆستا جەمالو ئەوان کەکەمێ لێمانەوە دوورتر بوون، ئێوارە بۆمان گێڕانەوە.

## بۆق و ورده ماسی

شەهید جەلالی برای مامۆستا جەمال و هەندێ لەپێشمەرگەکانی تیپی (٣١ی سلێمانی) زۆر وت و وریاو کارامەبوون، خەڵکی ئەو ناوە نەبوون بەڵام لەپێش سێ گروپەکەیتردا سەریان بەهەموو کونێکدا دەکردو دووری و پانی و چڕی چەم دەگەڕان و لەهەموو شوێنێکدا ئازوقەو هەر جۆرە شتێکیان دەست لێگیر بوایە عەمباریان دەکرد. هەر بۆیە تیپی ئەوان هەمیشە تێرو تەسەل تر بوون، هەرچەندە سەردارو ئەحمەد جوتیارو مام شێرو قاسم و عوسمان عەسکەری و بەکری برازام و شێخ فەرهاد بەهۆی شارەزایی یان لەناوچەکە مشووری گشتی هێزەکەیان دەخواردو رۆژانە لای ئێمە ئازوقەیان وەردەگرت. تیپی (٣١)ئەوەندە وت و وریابوون لەگەڵ رۆژگارەکە چاك چاك گونجا بوون، لەو ئاوە روون و ساردەی چەمدا رۆژانە خەریکی راوی بۆقی قەڵەو ورده ماسی بوون، دەیان گرت و دەیانخوارد، چەند جارێك داوام کرد دەعوەتێکی بۆقم بۆ بکەن، وەعدیان دامی بەڵام هات هات و ترس و لەرزی لێرە بۆ ئەوێ رێگای نەداو بۆق و ماسییەکەم هەر نەخواردو ئێستایش هەر چاوم لەدوویەتی.

## سیرو ریخۆڵە

بەرماڵانی عەودەڵان و قۆچەبلاخ پەڵە سیری زۆری تێداکرابوو، هەرچەند بەهۆی نەمانی ماڵەکان و خاوەندەکان، ئاو نەدەدران، زۆر زوو وشکبووبوون و سەلکی باشیان نەکردبوو بەڵام بەشی ئەوەی تێدابوو ئێمە بتوانین کەڵکی لێوەربگرین چونکە خواردنی ئێمە زیاتری کولێرەی رۆن بوو، ورده ورده هەر لاواز دەبووین، سەوزەو میوەی وەهامان نەبوو، هێشتاش هەنارو ترێ و هەنجیر پێنەگەیشتبوون. هەندێ رەشە ولاخ مابوونەوەو پاش تاڵان و بڕۆ، ناوە ناوە برادەران دانەیەك لەدووانیان دەست دەکەوت و دەمانکرد بەقەسابی و لەنێوانی هێزەکەدا دابەشمان دەکرد، رۆژێکیان مانگایەکی گەورەیان سەربڕی و دابەشکرا، ورگ و ریخۆڵەکەی مابۆوە، عوسمان لەکتێبدا خوێندبوویەوە شۆڕشگێڕ دەبێ ریخۆڵەکەش فڕێنەداو

کەڵکی لێوەربگریٚ، لەگەڵ بەکری برازامدا قاچیان لێهەڵکردو هەموویان پاك پاك کردو کردیانە مەنجەڵێکی گەورەوەو پڕیان کرد لەسیرو داریان لەبەردا، شەو حەرەس بەحەرەس دەبوو ئاگرەکە پێش بکات، بەیانی خۆیان ملیان پێوەنا، دواجار فەرمووی دەستەکەی خۆمانیان کرد، زۆر دڵمان خۆشبوو، ئاوی سەروپێ‌و ورگ بەسیرەوە لەم کاتەدا زۆر نایاب‌و دانسقەیە، کاتێ یەك کەوچکمان بۆ برد، هەر سیرو ریخاوێکی رووتبوو، بەڕاستی شتێکی ناخۆش‌و بێلەزەت بوو کەچی لەو مەنجەڵە گەورەیە هیچیان نەهێشت‌و خواردیان، شەویش مێشوولە زۆر سەغڵەتیان کرد بووین لەرووتەنی سەر بافڵەکەبووین، بۆن دەهات، بۆنی سیرو شتی تر! مێشوولەکەم لەیادچوو، هاوارم لێهەڵسا، کاتێ روانیم عوسمان‌و بەکرن لەدەروپشتم، هەر هەڵسام‌و لێیان دوورکەوتمەوە، کەمێ پشوومدا، نەمزانی ئەم دوو پێشمەرگەیە چۆن ژیان. سیر وەهای لێهاتبوو بەتایبەتی عوسمان‌و بەکر بەچاوە، بەنانەوە بەرووتی، دەیانخوارد، کاس‌و وڕیان کردبووین گوایە ئەمە بۆ تەسفیێ خوێن باشە، سیر بەو هەموو کەڵکەیەوە وای لێهاتبوو کەهەر کەسێ باسی دەکرد هێڵنجمان دەهات.

## لەشکری بەدر

هێزێکی ئێرانی هەبوو، زیاتر لەو کەسانە پێکهاتبوو لەشەڕی ئێرانی ـ عێراقی دا گیرابوون‌و پاشان لای جمهوری ئیسلامی تۆبەیان کردبوو، لەکاتی ئەنفالی چواردا خەڵکێکی زۆریان سەرگەردان بوون و بووبوونە تەپکەوە چونکە یان عەرەب یان تورکمان بوون‌و لەکوردستاندا شارەزاییی ئەوتۆیان نەبوو، بۆیە لەمانگی پێنجدابوو، ژمارەی (١٦)کەسیان لەبەرامبەری گوندی کلێسە کەوتنە بۆسەی جاشەوەو بەدیلی گیران‌و برانەوە بۆ عێراق‌و دواڕۆژیان نازانرێ.

لەکاتێکدا ئێمە ئەم بەروبەری پیرەمەگرون‌و چەمی رەزانمان دەکرد، لەخوار ماڵانی زەرزیەوە شوێنی ژیانی دوو مرۆڤمان دۆزییەوە، وردە وردە کەوتینە چاودێری‌و لەئەنجامدا دووانمان لەو گروپەی لەشکری (٩)ی بەدر دۆزییەوە، یەکیان تورك‌و ئەوی تر عەرەب، هەرچی عەرەبە کەبوو زۆر دیکتاتۆرو زاڵم بوو

بەسەر تورکەکەدا، کاتێ دۆزیمانەوەو لەئێمە دڵنیابوون کەیەکێتی نیشتمانی کوردستانین هاتنە لامان و وەکو پێشمەرگەکانی خۆمان لەگەڵماندا هەڵس وکەوتیان دەکرد، ئێمەش لەهەموو روویەکەوە هاوکاریمان دەکردن، بەچاوی مرۆڤایەتی نەك شتی تر، ئەم دووانەمان لەمەرگ رزگارکردو لەگەڵ دووهەم پۆستەی پێشمەرگە بەرێمان کردنەوە بۆ مەڵبەندی چوارو لەوێشەوە چوونەوە ئێران، ئەوەندەی لەیادم مابێ یەکیان ناوی سەلاح بوو.

ئەمڕۆ واتە (٦/٩) چوبووینە بەرمالآنی کەڵەشێرە، لەو شوێنە بووین کەپێی دەوترێ کەرخۆر، فەقێ وشیارو مەجید بازیانی و ئاوات لەلای بۆڵقامیش، گەڕانەوە لامان کەچەند رۆژێ لەوەوبەر ناردبوومانن بۆ سەرنجدانی ناوچەکە بەنهێنی چونکە ئەو کاتە سورقاوشان و شێخان هێشتا جاشێکی زۆریان تێدابوو.

دوو سێ رۆژبوو مامۆستا جەمال بۆ گۆڕینی هەواو شوێن لەگەڵ کاك رەهبەرو هەندێ لەبرادەرانی تر چووبوون بۆ دۆڵی قۆجەلەرو لەرۆژی (٦/١٠) هەواڵیاندا کەدوو جاشیان گرتووە لەخزمانی حاجی کاکەولآی چنارتوو، یەکیان چەکی پێ بووە بەلآم سەبارەت بەدۆستایەتیان لەگەڵ شۆڕش و ماڵە خەزورانی مامۆستا عادل شەریف، پاش قسەبۆکردن ئازادیان کردبوون، رۆژی (٦/١١) تەتەرمان لەشار گەڕایەوە واتە کاك عەبدولکەریم هەڵەدنی و عەتا شێرانە لەشار گەڕانەوەو هەندێ پێڵآوو جگەرەو وردەواتی بۆ هەموومان هێنابوو.

رۆژی (٦/١٢)لەگەڵ دوو سێ پێشمەرگەی دەستەکەی خۆم چووین بۆ چەمی قەلآی جوڵندی بۆئەوەی پاتریی جیهازە راکاڵەکەمان بەو ماتۆڕی کارەبایە چارج بکەین کەلەگردە گڕوێ شاردبوومانەوەو تەنها خۆم و عوسمان شوێنەکەمان دەزانی، ئەوسا دوو باتریمان هەبوو، هەرجارە یەکی یەدەگمان پڕ دەکردو دەمان شاردەوەو کاتێ یەکیان تاقەتی نەدەما خێرا ئەڕۆیشتین پڕمان دەکردەوە، بەو کارەمان وامان کردبوو لەو هەموو بارودۆخە دژوارەشدا بێ جیهاز نەبووین، ئازایەتییەکەی زۆری دەگەڕایەوە بۆ عوسمان عەسکەری و شەهید مەریوان.

رۆژی (٦/١٣) لەگردەگروێوە گەڕامەوە ناو برادەران و کاك عەبدولکەریم مان نارد بۆ بازیان، چونکە دوو جیهازی راکاڵمان هەبوو لەسەر داوای رێکخراوی سلێمانی یەکیانم سازداو کاك عەبدولکەریم و عەتا کافرۆشی بردیان بۆ ئۆردوگای بازیان و لەوێوە بۆیان بردنەوە بۆ شار. ویستم مەریوانی برازاشم بنێرم لەشار

فێری کارکردنیان بکات پێی، بەڵام خۆیان خەڵکیان پەیداکردبوو، پێویستی بەچوونی ئەو نەکرد، ئێستایش ئەو نامەیە ماوە کەبرادەرانی شار لەناردنی راکاڵەکەدا سوپاسیان بۆ ناردبووین‌و دڵنیایان کردین کەبەدەستیان گەیشتووە.

رۆژی (٦/١٤)کەلەسەرچاوەی چەمی رەزان بووین، بەباشم زانی شوێن بگۆڕین، بەڵام شوێنەکە ئاوێژەو خۆشبوو، هەموو برادەران لەشانیان گرانبوو بۆیە منیش گوێم پێنەداو هەر لەوێ ماینەوە. ئەمڕۆ واتە رۆژی (٦/١٥) بروسکەیکمدا بەدارایی گشتی کەمامۆستا نازم لێی بەرپرسیاربوو، شوێن‌و جێگای خۆمان بۆ باسکردبوو، ئەویش بەهەلیزانی بوو، (دلسۆز بەکرو هەژار مەغدید) دوو پێشمەرگەی خەڵکی کۆیە بوون‌و دۆستی کاك رەهبەر بوون بانگی کردبوون، شوێن‌و رێی ئێمەی پێ وتبوون‌و داوای کردبوو ئەگەر بتوانن سەردانێکی چەمی رەزان بکەن لەدەشتی کۆیەوە بۆ ئەوەی رێگای دەرباز بوون بۆ ئێمە ئاسان بکەن.

هەر ئەمڕۆ چووم بۆ تەنگی ساچوخ، لەوێ لوتمان تەقی بەلووتی جاشداو لەشوێنی خۆماندا خۆمان مەلاسدا هەتا جاش پاشەکشەیانکرد، پێدەچوو هەستیان بەشتێ کردبێ، ترسان‌و زووگەڕانەوە، ئەمڕۆ لەدامێنی بافڵەکەبووین لەسەرجەم‌و لاپاڵ ئەشکەوتێکدا جاشەکانی سەری زەردو بیران‌و شێخ زەینەڵ زۆر هاتبوونە ئاسۆگەکە، پێدەچوو شتیان بەدەستەوەبێ بۆیە نەمان دەوێرا ئاگری دوکەڵاوی بکەینەوە بەنیازی جێگا گۆڕینیش بووین. ئەبوو لانی کەمی نانی سێ رۆژ ئامادە بکەین بۆ کۆڵە پشتەکانمان.

شێخ فەرهادو خالیدی برای شەهید بێستون نانەواییان دەزانی، بەرمیلێکی ژەنگنیان دۆزی بۆوە، هێنایان‌و شۆردیان‌و کردیان بەفڕن، بەدارو چیلکەی وشك گەرمیانکردو بەشی دوو سێ ژەمیان نان بۆ کردین، هەر ئەمڕۆ مامۆستا شێرکۆ قوڵی لێهەڵکردو تەشتێ هەویری شێلاو بەردێکی پانی داناو ساجی خستەسەر ئاگرو نانی تیریی بۆ کردین. بڕوام وایە لەماڵاندا نانی هیچ کابانێ لەوە گەورەترو جوانتر دەرنەچووە، هەموو سەرمان کردە سەری‌و دووسێ وەجبەمان پێکردو قەدو نوشتمان کردو دابەشکرا بەسەر گروپی خۆماندا، ئا لەوبارودۆخەو لەو شوێن‌و ئابلوقەیەدا شتی لەوجۆرە زیاتر بەخەیاڵ دەچێ، نەك کردەوە، بەڵام لەڕاستیدا ئەمە وابوو.

رۆژی (٦/١٨) لەگەڵ دوو سێ برادەری تردا سەرمان لەساچوغدایەوە،

ئەمجارەش جاش لەرێمان بوو، نەمانتوانی بڕۆینە ناوچەی ئازوقەی شاردراوەی کۆنی خۆمان، پاشان گەڕاینەوە جەزیرەکەی غەریب سەعیدو لەوێ چێشتێکی ساوەرمان لێناو باش باش پشووماندا.

یەکدوو رۆژ بوو دڵسۆزو دڵزار شێرانە گەیشتبوونە لامان، لەچەم دەرووی خێریان لێکردبووینەوە، بڕیارماندا هەرچی پێشمەرگەی تیپی (٢١ی سلێمانی) هەیە لەگەڵ مامۆستا جەمال‌و شێخ فەرهادو خالید و شێرکۆو بەکر عەبدوڵڵاو فەقێ وشیارو کۆمەڵێکی تر لەهەر سێ چوار بەشی هێزەکە سازبدەین‌و رەوانەیان بکەین بۆ سەرکردایەتی. سابیر کۆکەیی ئەندامێکی زۆر بەکەڵکبوو بۆ ئەوکاتە بەلاَم ئەیووت: "من دەزانم دوای هیلاکی‌و خۆ بەکوشتدانێکی زۆر پیاو خراپ دەبین، بۆیە من خۆم ماندوو ناکەم‌و ئەڕۆم" هەرچەندە زۆرم پێناخۆشبوو بەلاَم چار نەبوو، رێگامدا ئەویش بڕوات، مامۆستا جەمال کۆڵەکەیەکی چاکبوو بۆ بڕیاردان‌و تەگبیرو رای ئەو رۆژانە، ئەویش لەبەرئەوەی خەڵکی ناوچەکە نەبوو لەوەش دەترسام رۆژێ لەڕۆژان بارودۆخەکەمان ئاڵۆزتربێ‌و زیانێکی زۆر بکەین، بەتایبەت ئەوان کەشارەزا نین، بۆیە خۆم پێشنیارم کرد خۆی‌و هێزەکەی دەبێ بڕۆن، ئەوەبوو رۆژی (٦/١٩) لەگەڵ دڵسۆزو دڵزارو مەجید بازیانی‌و هەندێ شارەزایانی تری دەشتی کۆیە ئەوانمان بەرێکرد بۆ بۆڵقامیش‌و لەوێوە بۆ بەری کۆیەو بڕیاربوو بڕۆن، بەلاَم کاتێ دەگەنە بۆڵقامیش لەرۆژی (٦/٣٠) جاش دەدا بەسەریانداو کلاشینکۆفێکی یەکلاق لەهەگبەی سەر پشتی ماینەکەی سابیرو کۆڵەکەیدا دەبێ، دایدەگری‌و لەشوێنێکا دایدەنێ، جاش دەیدۆزنەوەو ئەڕۆنە سەر ئەو شوێنەی برادەرانی ئێمە لێی دەبن کە(٤٠) پێشمەرگەبوون، بەلاَم ئەوجاشەی شوێن پێیان هەڵدەگرێ پێدەچێ توزی نوزەی کوردایەتی لابووبێ، دەنگ ناکات‌و بەسەلامەت رۆژەکە تێدەپەڕێ. شەو بەو کەرەسانەی ماوەیەکی زۆربوو لەسلێمانیەوە هاتبوون بۆمان، کەڵەك هەڵدەبەستن‌و دەپەڕنەوەو ئەوان بەسلامەتی گەیشتبوونە مەڵبەندی چوارو بارەگای دەزگای پێشمەرگایەتی، ئێمەش هەمان رۆژی (٦/١٩) چووین بۆ ئەشکەوتی عەلی شاڵی لەپشتی قۆجەلەر بەو نیازەی لەوێوە مەفرەزەیەك بنێرین بەدوای شۆڕش قەرەهەنجیری سەر تیپی (٢١ی کەرکوك)دا کەبەجیهاز قسەمان لەگەڵدا دەکردو لەبەری خاڵۆبازیانی گیری خواردبوو، بەجیهاز وتمان: وەرە دەوری کانی عارەبان‌و گەزەلاَن، هەرچی کردمان‌و

کۆشاین ئێستاو ئەوسا شۆڕشمان پێنەدۆزرایەوەو باش بوو خۆی هەرچۆنێکبوو گەیشتبووە بەری هەولێرو لەوێوە بۆ مەڵبەندی چوار، کاك رەهبەرو مەلا فەرمانو ماموستا عادلو برادەران چوونە شوانو شێخ بزێنی سەروو، هەر لەوناوە هەندێ ئازوقەیان کۆکردبۆوە، ئێمەیش لەدەورو بەری قۆجەلەر لەبناری کانی ساردی دامێنی کانی بی گەورەدێ ئازوقەیەکی زۆرمان دۆزیەوەو هەموو شەوێ شوێنەگۆڕکەمان پێدەکردنو لەو لاشەوە کاك عەبدولکەریمو عەتامان نارد بۆ سلێمانی هەر نەهاتنەوەو لەو مەوعید تێپەڕیبوو، زۆر دڵمان سەغڵەت ببوو، نەماندەزانی گیراون یان چی.؟

رۆژی (٦/٢٣) دەستەکەی خۆمان چوینە (مەکۆ) لەخوار ماڵی کەڵەشێرەو لەوێدا دوو هۆدە خانوو لەشوێنێکی نادیاردا دروستکرابوو، پڕی بوو لەقاپو شتی پێویستی، لەوێدا ژیانێکی بێ ئاوی ناخۆشمان لەگەرمادا دەبردەسەر. لەناو یەکێك لەهۆدەکاندا توتکێکی بچکۆلەی تازە چاو پشکتووی جوان هەبوو ناوم لێنابوو (کارزان)ی کوڕم، دەهاتە ناومانو پێماندا هەڵدەگڕا، زۆرمان پێخۆش بوو.

رۆژی (٦/٢٤) کەشەوەکەی چووینە کەرخۆری کەڵەشێرە، سەرکەوتینە نزیکی رەبایەکانی جاشەکانی گەورەدێ، شوێنێکی لێ هەیە پێی دەڵێن بیرەکە، ئەو شوێنە لەهاویناندا گاگەلو حەیوانی کەڵەشێرەی لێ ئاو دەدرا، کاتێ جاشەکان بۆسەر پێشاو لەڕەبایەکان دەهاتنە دەرێ لێمانەوە دیاربوون، بەلام شوێنێکی بێ شکبوو بۆیە ویستمان لەوێوە کەبەرزبوو پەیوەندی هەمیشەیمان لەگەڵ مەلا فەرمانو کاك رەهبەر هەبێ لەشوانو شێخ بزێنیو لەهەمان کاتدا لەگەڵ رەبییەلەکانی سەری جوانەگاو پشتی دەرەشێریش پەیوەندی بەردەواممان هەبوو. زۆربەی جار لەگەڵ زۆربەی جیهازە جیاجیاکاندا دەنگمان دەگەیشتە یەكو هەواڵی شەڕو شۆڕەی سنوری مەڵبەندی چوارمان وەردەگرت، لەلایەکی ترەوە چاوەڕێی عەتاو عەبدولکەریم بووین کەی دەگەڕێنەوە لامانو دڵمان وەستاو ئەوان هەر دیار نەبوون.

رۆژی (٦/٢٥) کاك ملازم عومەر وەکو فەرماندەی دەزگای پێشمەرگایەتی بروسکەی سوپاسی بۆخۆڕاگریو مانەوە بۆ لێدایـن، لەهەمان شوێنی دوێنێ بووین، رۆژی (٦/٢٦) نامەم نووسی بۆ شارو داوام کرد باترییەکی تری بەدەگمان بۆ بنێرن چونکە باترییەکی تری چارج خراپببوو، رۆژی (٦/٢٢) هەر لەسەر

بیرەکانی کەڵەشێرە بووین، ئەمڕۆ مێشوولە سەغڵەتی کرد بووین، ڕۆژی (٦/٢٨) هەر لەسەر بیرەکان بووین، بروسکەیان داینێ کەئەو قەرزەی لەشاردا بوویان بەئێمە، سەرکردایەتی بۆی بڕاردووینەتەوە.

ڕۆژی (٦/٣٠) هاتینەوە مەکۆکەی کەڵەشێرە چونکە مێشوولە سەغڵەتی کردبووین لەوێ، ڕۆژی (٧/١) مەلا فەرمان و کاک ڕەهبەرو برادەران لەشوان و شێخ بزینی گەڕانەوە مەکۆکە بۆ لامان.

ڕۆژی (٧/٢) عەتا لەشار هاتەوەو هەندێ دیاریی شاری بۆ هێنا بووین، لەگەڵ پڕوپاگەندەی گفتوگۆی نێوانی شۆڕش و ڕژێم، هەر ئەمڕۆ کاتێ یەکمان گرتەوەو عەتا هاتەوە، چووینە سەرچاوەی چەمی ڕەزان لەسەر ئەو شاجۆگا ئاوە ڕۆشن و فێنك و سازگارە، لەچەند شوێنێك بارەگامان دانا.

ڕۆژێ لەم ڕۆژانە پێمواییە (٧/٥) بوو کاتێ هەژار مەغدیدو دڵسۆز برادەرانیان گەیاندبووە، سنووری مەڵبەندی چوارو بەکۆیەدا هاتبوونەوەو بتڵێ ویسکی تایبەتیان بۆ کاك ڕەهبەر بەدیاریی هێنابوو، ئەویش بەیادی ڕۆژی بوونی بەپێشمەرگە بانگی من و مەلا فەرمانی کرد، لەیادم نییە عەبدولکەریم لەوێبوو یان مامۆستا عادل، چووینە ناو توترکێکەوە لەسەر جۆگا ئاوەکە، قاچمان خستە ناو ئاوەکەو بەکوپ هەریەکە بەپێی ویستی خۆی خواردییەوە. من هەمیشە لەژیانمدا گیرۆدەی داوی خواردنەوە نیم، بەڵام لەهەر شوێنێکدا بموو هاوڕێو دۆستم بیانەوێ بخۆنەوە، لێم تێك نەداون و بەشێکی کەم بەشداریم کردوون. ئەمڕۆش کوپێکی سێ بەش لەئاوم بەشێنەیی خواردەوەو هەندێ گاڵتەو گەپ و قسەی خۆشمان بەپاڵ دوو سێ شیعر خوێندنەوەی ڕەهبەرەوە بەڕێکرد، ئەمڕۆ مامۆستا عادل و هەندێ لەبرادەران چوون بۆ دامێنی ماڵەکانی عەودەلان و قۆچەبلاخ بۆئەوەی دوو سێ ماین و ئەسپ بگرنەوە بۆ بار بارکردن و جەولەکردن، بەلام لەوکاتەی ئەوان ئەڕۆن لەنیوەی ڕێدا گەڕانەوەو وتیان: ئەم شەو هێرشمان بۆ دەکەن، چونکە ئێمەیان بەدی کردووە، کاك ڕەهبەر باش باشی خواردبۆوە هەر ئێوارە خەوتبوو، مەلا فەرمان هەروەها، منیش چاوەڕێی ئەوەم دەکرد شەو بێنە سەرمان، بۆیە لەگەڵ هەموو حەرەسێکدا بەشدار دەبووم. سەعات چواری بەیانی بوو برادەرانم هەڵسان بڕۆین بۆ کەڵەشێرە چونکە شوێنەکەی چەم وەهابوو ئەگەر دووچاری شەڕ بووینایە، زوو دەورمان دەگیراو ڕێگای پاشەکشەمان نەدەبوو، جگە

لەوەی هەر لەسەر رازەکانەوە بەردیان بەر بدایەتەوە ئێمە پەرێشان و زیاندار دەبووین، برادەران خەواڵبوبوون، هەندێکیان ئارەزوویان دەکرد لەبن گوێزەکاندا بخەون، جا خەوی بنداری گوێز خۆی گرانە، سەرەڕای ئەوەش یەکێك کەمەشروب بخواتەوە.

کاك رەهبەر زۆر دژی رۆیشتن بوو، پێی وەهابوو ترسنۆکییە، هەندێ بۆڵەبۆڵی کرد بەڵام من سووربووم لەسەر جێ گۆڕکێ، دوو شوێنی گرنگ هەبوو، چ بۆ شەڕو چ بۆ خۆشاردنەوە، ئەوەش سەردار فێری کردبووین، بەکاك رەهبەرم وت: ئێوە وەکو تیپی (٢٥)لەمەکۆو کەرخۆر کامیان هەڵدەبژێرن بڕۆنە ئەوێ، بەڵام نابێ بەهیچ شێوەیەك خۆتان دەربخەن، ئێمەیش لەهەر کام شوێن بووین تەنها بەجیهازەکان ئاگاداری یەکتری دەکەینەوە، ئەو بەیانیە بەزۆرەملێ جیهازە راکاڵەکەمان لەگەڵ باترییەکەی بەسەرە گەیاندە شوێنی دیاریکراو.

تیپی (٢٥)بۆ مەکۆو ئێمەش بۆ کەرخۆر، لەوێ جێگاو رێگامان سازداو دوو دوو حەرەسمان لەدوورو نزیك دانا، لای ئێمەوە چەم نزیکبوو، گومانی هێرش لەوێوە دەکرا، بەیانی هەتاو کەوتبوو، دەنگی تەقە دەهات، بەحەرەسەکانی دیار سەرمانم وت: دەنگی تەقە دێ، وتیان: دوورە لەبەری شێخ زەینەڵ و سردە، جیهازم بۆ حەرەسی دیار چەم کرد وتی: دوورە، هەرچەندە گوێم هەڵدەخست تەنها بەوە دەچێ لەپشتی بافڵەکەو روو لەسەرچاوەی چەم بێ، مەریوانی برازام هەڵسانددو دووربینەکەی خۆم دایەو ناردم بۆ دیار حەرەسەکەی چەم، هەر کەگەیشتە سەرازەکەی دیار بەدیاری ئەشکەوتی دوو کون، جیهازیکردو وتی: مامە خۆت وەرە، جاش و سەربازێکی یەکجار زۆر لەمبەرو ئەوبەری چەمەوە گەیشتوونەتە شوێنی دوێنێ و خۆمان و وا ئاگریان لەبەتانیەکانمان بەرداوەو زۆر بەترسەوە دابەش بوون بەم بەراو بەری سەر رازو بەر رازو پەلاماری هەموو بن بەردێ دەدەن.

بەرەولای مەریوان کەوتمەڕێ و هەنگاوەکانم خێراترکرد، گەیشتمە ئاسۆگەکە لەپاڵ دەوەنێکدا دانیشتم و بەشارەزایی لەبافڵەکەوە ئەمبەروبەرم نیگاکرد، ئەو هێزەی هاتبوو کەزۆربەی جاش بوو لەقوڵی چەمەوە تەقدیر دەکرا بە (١٥٠٠) جاشێك، بەڕاستی کیومالیان کردبوو، پەلاماری دەوەنی گەورە بەردی گەورە، ئەشکەوت، قامیشەلانیان دەدا، دەستڕێژی بێهودەیان دەکرد، (ئارپیجی) یان

بەئەشکەوتەکانەوە دەنا، خێرا داوای قەندیل ژمارە دووم کرد، کەکاك رەهبەرو مامۆستا عادل بوون، پێم راگەیاندن هێرشەکە گەیشتە ئەشکەوتە سەحراو، بەرەو لای (کەرخۆر) دێن، تکایە ئێوە خۆتان مەڵاس بدەن‌و رێگا مەدەن برادەران دەنگە دەنگ‌و ملەقوتە بکەن بەڵام.باجیهازەکانتان هەمیشە کراوەبێ.

خێرا حەرەسەکانم کۆکردەوەو چووینە بن بەردەکەی (کەرخۆر) ئەوسا دەستەی ئێمە بریتی بوو لە ١ـ مەلا فەرمان ٢ـ ئەحمەد جوتیار ٣ـ قاسم ٤ـ عوسمان عەسکەری ٥ـ مەریوانی برازام ٦ـ ئاراز حەمە ئەمین ٧ـ حەمەی شێخ حسین دەرەناری‌و عەتا خۆشم‌و یادم نایات کەسێکی ترمان لەلامابێ، هەموویانم خستە بن بەردەکەوەو دارێکی زۆر گەورەی لق ئەستورو پڕ لەگەڵا لەسەر بەردە گەورەکەبوو، چوومە سەر لقێکی‌و دووربینەکەم لەملم کردو جیهازەکەشم بەکراوەیی دانا. ناوە ناوە لەقەندیل یەکەوە بۆ قەندیل دوو هەواڵەکان ئاڵوگۆڕ دەبوون‌و ئێمە پێمان وابوو یەکەم تەقەلای ئێمەوە دەست پێدەکات، چونکە رێچکەیەك لەئەشکەوتی سەحراوە راست دەهاتە کانی‌و ئاوەکەی (کەرخۆر) کەئێمە لەوێدا خۆمان پەنادابوو، هەر لەسەعات (٩)ی بەیانی هەتا سێ‌و نیوی پاشنیوەڕۆ، جاش دەرنەکەوتن کەنێوانی دووریی ئێمەو جاش بەپێ لە(٢٠)دەقیقە تێ نەدەپەڕی، ئەوەندە دەترسان خۆیان دەخافلاند. لەسەعات سێ‌و نیو تەماشامکرد لەبەرامبەر (مەکۆ) ئەو شوێنەی قەندیل دووی لێبوو کانی‌و ئاوی هەبوو کەپێی دەوترێ کانی شێخ ئەولا، راست لەڕەقەم یەکی چەمەوە جادەی سەیارەی دێتەسەر، جاشەکان وەکو کۆمەڵێ قەلەموون بەمل یەکدا دەهاتن، بەهێواشی بەقەندیل دووم وت: خۆتان دەرمەخەن، رۆژ درەنگە، هەندێکی تر جاشەکان دەڕۆن، وتیان: ئێمەش دیومانن‌و خۆمان دەرناخەین.

بەهەرچوار لادا دەمڕوانی، پێموا نەبوو تەنها (١٥٠٠) جاش بوێرن بێنە چەمی رەزانەوە لەکاتێکدا دڵنیان ئێمە لەو ناوەین، لەپڕێکا دوو دەستدرێژکرا، لەمەکۆوە جاشەکانی سەر ئاوەکە بەملاولادا بڵاوەیان لێکرد، پێش تەقەکان ئارام بوو بوونەوەو پێمانوابوو لەم هێرشەش رزگارمان بوو، وتمان ئێستا روو دەکەنەوە بازیان‌و دەڕۆن، بۆ ماوەیەکی چاك لەچەم پشوو دەدەین.

هەلوو قەندیل: .."هەلوو، هەلوو قەندیل" ئەوەچی روویداوە، ئەو تەقانە لای ئێوەن " بەڵێ ئێستا (٣) جاش خۆیان کردە ناومان‌و ئێمەش ناچار بووین

هەرسێکیان بکوژین، چونکە ئەوان هەوڵیاندا ئێمە بکوژن" پاشان پرسیم راستی مەسەلەکە ئەوەبوو کەحەرەسەکەی قەندیل خۆی دەرخستووەو ئەم سێ جاشە بودەڵەیەش بەسەربازی راکردوویان زانیوە، نیازیان هەبوو بەدەست بییان گرن‌و خۆیانی پێ بەرنە پێش لای رژێم.

تەقە گەرم بوو، هەر ئەوەندەمانزانی لەگەورەدێوە لەلای کانی بی‌و جاش‌و سەرباز دابارین، روو لەلای شەڕەکە، نێوانی ئێمەو شەڕەکە کلاشینکۆفێك بەئاسانی خەڵکی لێدەکوشتن.

"هەلوو قەندیل یەك... هەلوو قەندیل یەك " بەڵێ، بەڵێ ئەوە چەند جاشێك چوونەتە بن بەردێکەوە، ئەڕۆین دەیان گرین " نەکەن برا نەکەن، نابێ لەشوێنی خۆتان بجوڵێن هەر ئێستا من هێز دەنێرم لەهەموو قۆڵەکانەوە پەلاماری هێزەکانی تری دوژمن بدەن، ئێوە ئەوە هەڵگرن بۆ شەو، بەشێنەیی دەیانگرین، نەکەن بەهیچ شێوەیەك بێنە دەرێ" هەلوو قەندیل، بەڵێ کاکە فەرموو " " لەگەڵ سەرەك جاشێکا قسەمان کردووەو خۆمان لێگۆڕیوە بەنیازین بیخەینە داو " " باشە براگیان بەلأم ئێوە مەڕۆن با ئەوبێت بۆ لاتان، نابێ بڕۆن تکایە شوێنی خۆتان بەرمەدەن، هەر ئێستا تەماشا بکەن چۆن ئەو سرێ سەربازەی بەردەمی خۆمانتان بۆ پشتەوخوار دەخەین".

لەملاوە ئەحمەد جوتیارو قاسم‌و مەلا فەرمان، لەولاوە ئارازو حەمەو عوسمان عەسکەری‌و مەریوانی برازام بەدوو قۆڵی هێرش دەستی پێکردو هێزە سەربازییەکەی هاتبوو لەچاوتروکانێکدا هەڵمانگێڕایەوەو نەمان هێشت فریای فلأن لەسەرەوەو کەرتی فیسار لەملاوە بکەوێت‌و هەر دنیا تاریکبکات هەموویان بەدیل دەگرین‌و دەرسێکیان دادەن هەتا مێژوو ماوە لەیادیان نەچێ. بەچاوو راو سەرمان لەهێزەکانی دوژمن شێواندبوو، لەهەموو قۆڵەکانەوە دوژمن هەڵوێستەی دەکردو نەی دەوێرا هەنگاو بهێنی بۆ پێشەوە، بەبەردەوامی لەگەڵ قەندیل دوو، کەجیهازی دووهەمی قەندیلی دوو لای دڵزار یان رەهبەر خۆی دەبوو، هاواریان لێهەڵسا "هەلوو قەندیل یەك، هەلوو قەندیل یەك " " بەڵێ کاکە " گوێم لێنەبوو هاواری کرد" ئەوە لۆ دەنگی ناکەی لۆ.؟ دە دەنگی بکە " جارێکی تر لەسەر خۆ بەڵێ کاکە فەرموو، دوژمن روو لەکشانەوەیە، ئێوە دێنە لای ئێمە یان بێین " نەخێر لەلای خۆتان بن ئێمە دێین... ئێمە دێین، مەجووڵێن".

حەمەی شێخ حسێن هات بۆلام و وتی: دوژمن شکا، بەڵام مەلا فەرمان زۆر زامدارەو گوللەیەك بەر سنگی کەوتووە، عوسمان دەڵێ دەرمانەکان مام عەلی شاردوویەتییەوە بەتۆدا بۆم بنێرێ تا دەرزییەکی گەزازی لێ بدەین و برینەکەی تەداوی بکەین، جێگای داخە بەڕاستی شەڕێکی قارەمانانەبوو، خۆزیا ئەوەشمان نەدەبوو، دەرمانەکانم بەحەمە نیشانداو جیهازە راکاڵەکەم خستە ناو توتڕکەکەوەو بەرەو لای ئەوان رۆیشتم. عوسمان بەنووکی زمەی تفەنگەکەی لەفی لەدەرمان دەپێچاو لەسەر ملییەوە پێی دادەکرد، لەسنگییەوە دەهاتە دەرێ، ئەم کردەوەیەی دووسێ جار کردو خێرا پێچایەوەو دوو دەرزی لێدا، خێرا ماینەکەی سەرداری نەریمانمان هێناو هەگبەیەکی لەگەڵبوو، جیهازە راکاڵەکەمان و جانتا دەرمانەکەمان لەسەر ناو، مەلا فەرمانمان خستە سەری و دوو پێشمەرگە لەملاولایەوە دەیان گرت و یەکێك رایدەکێشا. چووینە مەکۆ، لەوێ تا ئێمە چووین کاك رەهبەرو مامۆستا عادل هەندێ جاشی نوێیان گرتبوو، لەو کەسانە بوون لەترسی ئەنفال چووبوونە شارو خۆیان لەناو جاشدا حەشار دابوو، هەر بۆیەش لەوێش شەڕیان نەکردو زوو دەستیان هەڵبڕیبوو، من پێم وابوو (١٤) کلاشینکۆفی مزلی سینیمان دەستکەوتبوو، بەڵام کاك رەهبەر باس لەو دەکات هەر چۆنێکبوو بەتەنگەبەرێکا مەلا فەرمانمان برد کەهەندێ کەلاکی سەربازو جاش کەوتبوون لەبەردەمی لوولەی تفەنگی کوڕە ئازاکانی مەکۆدا. چووینە سەرکانی و ئاوەکەی بەرۆژ جاشەکان لێی بوون، لەوێ برادەران دەموچاویان شۆری و ئاومان خواردەوەو جاشەکانیان لەشوێنێکدا بۆ کۆکردمەوەو چووم هەندێ قسەم بۆ کردن و رینوێنمیانکردن، وتمان ئێستا دێینەوە بۆ بافڵەکە، ئێوە خێرا بڕۆن بۆئەوەی بگەنە لای زەرزی و عەودەڵان، لەبەر چەند هۆیەك ئازادمان کردن:

١. لەو کات و لەو شوێنەدا دادگا و دادوەرمان نەبوو تا بیان دەین بەدادگاو سزا بدرێن جا زیندان یان خنکاندن.

٢. هەندێ لەوانە کەس وکاری پێشمەرگەو خاوەنی شەهیدبوون.

٣. شوێنمان دەگۆڕی، پاشان حەرەسیات گرتن بۆ ئێمە شتێکی زۆر دژواربوو، زۆرجار هەتا برادەرێك مان دەناردو سەرەی حەرەسیاتەکەی خۆی تەواو دەکرد شەیتان شەقی دەبرد.

٤. ئەمانەش کوڕی کوردن هەرچەند بارودۆخ ناچاری هەڵەی کردوون بەڵام لەو

جاشانە نەبوون دەستیان بەخوێنی کورد سووربووبێ، هەر بۆیە پاش هەندێ قسە بۆکردن و هەڕەشە لێکردن ئەوانمان ئازادکردو خۆمان نەخشەمان دانا بڕۆینە شوێنی کەجێگای گومان نەبێ و ناوەندی هێزەکانی دوژمن بێ. چەند برادەرێکی شارەزامان پێش خست و مەلا فەرمانمان خستە ناوەندی ریزەکەوە، لەدوای دواشەوە دووبرادەرمان دانا هەریەکە هەڵەژگێکی گەورە ببڕن و بەدوای خۆیاندا بەڕێگاکەدا رایبکێشن بۆئەوەی شوێنی پێی ئێمەو ژمارەمان و ڕووکارمان ئاشکرا نەبێ. بەیانی رۆژی (٧/٢) چووینە ناو رەزو باخەکەی گوندی قۆچەلەرەوە کەبەسەیارە هەر(٢٠) دەقیقە لەمەرکەزی ئاغجەلەرەوە دوور بوو، جگە لەوەی لەگەڵ رەبایەکانی سەری لوتك زۆر ئاشكراو دیاربووین لەیەکەوە، بەڵام ئێمە دەمانزانی ئەوان جاشن و ئەوان وایاندەزانی ئێمەش هێزی رژێمین.

کوڕە ئازاکانی دەستەکان کەوتنە ناو خانووە سووتاوەکانی قۆچەلەرەوە، ئازوقەو قاپ و قاچاخێکی زۆریان لەگەڵ خۆیان هێنا بۆ ناو رەزەکان و مەلا فەرمانیشمان لەگەڵ خۆمان لەژێر هەنارێکا راکێشاو عوسمان جارێکی تر تەداوی کردەوەو دەرزی تری لێدا.

مامۆستا عادل زۆر گوج و گۆڵبوو، خێرا یەك مەنجەڵ چێشتی لێنا، لەیادم نەماوە گەنمە کوتاوبوو یان شۆربای ساوەر، بەڕاستی شتێکی بەلەزەت بوو چونکە دەمێکبوو شۆربا و شتی شل و سەوزەواتمان نەخواردبوو. زۆربەی کات ناوساجی و چای خۆراکمان بوو، عەسری ئەو رۆژە بەعەبدولکەریم هەڵەدنی و عەتادا مەلا فەرمانمان بەڕێکرد بۆ ئۆردوگای بازیان بەشەوەکەی و لەوێشتەوە لەڕێی عوزەیری حەمە بەگی موغاغەوە برایەوە بۆ سلێمانی و برادەرانی شار خێرا شوێنیان بۆ دیاری کردبوو، چاك سارێژیان کردو پاشان گەیاندیانەوە سەرکردایەتی.

ئەمڕۆ بەئاسودەیی لەقۆچەلەر ماینەوەو شەوەکەشی لەدەوری کانی و ئاوەکەی گوندەکە ناوساجیمان کردو مێش هەنگوینێك لەکەلاوەیەکدا دووکەڵ سەغڵەتی کردبوو، هەنگوینەکەی دەڕشا، هەموو کوڕەکان سەرو شووشەی ئاوی تەماتەیان پڕ کردبوو لەهەنگوین تا چەند رۆژێك هەر هەنگوینمان لابوو، بەیانی رۆژی (٨٨/٧/٨) زوو هەڵساین و چوینەوە هێشتا هەندێ سەرە نێرگەی خانووەکان ئاگرو دوکەڵی لێهەڵدەستا.

ئەمڕۆش وەکو رۆژی پێشوو چێشت لێندرابوو، کەتری لەدەوری ئاگرەکەبوو،

هێوربوو بووینەوە، هەرچەندە ڕۆژی پێشوو دوژمن لەهەموو لایەکەوە پەلاماری کوندی کەڵەشێرەو چەمی ڕەزانیداو بەفڕۆکەش تێزابی بەچەمدا ڕژاندو هەرچی پوش‌و پاوانی دەوری چەم هەیە بەناو چەمیشەوە نێڵەنێڵی ئاگری وەکو دەگێڕنەوە بەئاگری جەهەنەم دەچوو، بەڵام بەنیسبەت گوندی قۆجەلەر، جێگای گومان نەبوو ئێمە ڕوومان کرد بێتە ئەوێ چونکە ناوچەرگەی دوژمنەو شوێنەکەیش عاسی نەبوو، هێشتا بەتەواوەتی چامان نەخواردبۆوە، دوو حەرەسی سەر یاڵەکەی پشتی کانی پونگەڵە، وتیان: دوژمن گەیشتە سەرمان، وتنی ئەوان‌و ڕاکەڕاکی جاش لەگەڵ ئێمە تێکەڵاوبوو، ئەوان هاتنە سەر مەنجەڵە چێشت‌و کەتری چا و ئاگردانی پڕ لەپشکۆ، شك لەوەدا نییە کەهەر ئێستا خەڵکی لێبووە، بوو بەمقۆ مقۆ لەنێوان جاشەکان، سەربازەکانیش بەجادەو جادەداو هەندێ بەسەیارەو هەندێ بەپێ دێن، ئێمەیش هەندێك لەگەڵ کاك ڕەهبەر بەدۆڵی ڕەزەکاندا بەرەو لوتەی بەرامبەری گردە قارەمان هەڵکشاین، من‌و دەستەکەم هەر لەچەمەکەداین، عادل شەریف لەگەڵ ئێمە بوو کوڕێکی گورج‌و گۆڵ‌و لێزانبوو، ڕامسپارد لەدوای برادەرانەوە بێت‌و لەچەمەکە دەریان کەین ڕوو لەلای کاك ڕەهبەرو ئەوان. کاتێکم زانی لەدوامانەوە دوکەڵ بەری دنیای گرت، لام سەیربوو چونکە ئاگر خستنەوەکە لەبەرژەوەندی ئێمە بوو، لەژێر سێبەری دوکەڵدا زۆر لەسەرخۆ بەگوێ گرتن لەهات‌و هاواری جاش‌و سەربازو سەرباز بەرەو بەرزی دەڕۆیشتین، مامۆستا عادل وتی: من شخارتەم بەپوشەکەوە ناوە بۆئەوەی جاشەکان نەمان بینن، بەڵێ دوورو نزیك هەمووومان لەسەر گردۆڵکەی پشتی قۆجەلەر کۆبووینەوە بەڵام هەندێ بەردی گەورەو دەوەنی داری زۆری لێبوو. ئەو ساڵە پاوانەکان مەڕو ماڵاتی تێنەچو بوو، زۆرو زەبەندبوو، ئاگرەکە با دەیهێناو دوکەڵ بواری نەدەداین‌و بەهیچ شێوەیەك گومانی لای جاش نەهێشت کەئەو گردۆڵکەیە پێشمەرگەی پێوەبێ، چونکە ئاگر گەیشتە سەرمان، برادەرانمان ڕاسپارد دەستکاری ئاگرەکە نەکەن تا دێتە بەر قەمچی دەستیان‌و سەروو لق داری بەڕوو بشکێننەوەو تا جاش‌و سەرباز گوندەکەیان جارێکی تر پشکنییەوەو ئەگەر کولانە سەگی مابێ سووتاندیان‌و گەڕانەوە ئاغجەلەر. ئێمەیش ئارامتر لێی پاڵکەوتین‌و ڕەبایەکانی سەر لوتکی دەربەندی بازیان‌و دەوروبەری ئاغجەلەرمان دەژمارد، ئاگرو دووکەڵی کەڵەشێرەو چەمی ڕە زانیش لەهەموو ناوچەکانەوە

دیاربوو، هەر لەمارو پەپوولەوە تا هەرچی زیندەوەر هەیە لەو چەمو دەوروبەرەی دەربازی نەبوو.

سەعاتمان راگرت، ئەمانویست ببیٚ بەچواری ئێوارەو برۆینەوە سەر کانیو ئاوەکەو چایەك لێبنێین‌و هەندیٚ ناوساجی بکەین‌و بیخەینە نانەبەرەوە، بۆ توێشووی رێگای سبەینیٚو تا دەگەینە شوێنێکی تری وەها جێگای حەوانەوەی هەبیٚ، بیست دەقە تەواو دەبوو جاش‌و سەیارەکانیان گەیشتنەوە ئاغجەلەر، بەلاّم لەویٚ رانەگیران‌و خێرا هاتنەوە بۆ سەرو گوێی چەم‌و گوندی قۆجەلەر، ئێمەش ئارام ئارام دەمانڕوانی هەر لەئاغجەلەر هاتنەوە ناو قۆجەلەر، دەوری نیو سەعاتیٚ مژۆ مۆرەیان کردو تۆزیٚ دوکەڵی کەیان کردو سەرلەنویٚ گەڕانەوە بۆ ئاغجەلەر.
ئێمەیش کات خۆیدا لەچوار، چوینەوە ناوگوند بەرچاوی رەبایەکانەوە دەستمان کردەوە بەناوساجی‌و چالێنان، دووکەڵی یەکێك لەئاگرەکان برادەرێکی کۆیی زۆر سەغڵەت کردبوو، هەرچی ناشیٚ ئەوەی لەگەڵ ئاسماندا کردووە، زۆر بەداخەوەم ناوەکەیم لەیاد نییە، گەنجێکی دڵسۆزو بەکەڵکبوو.

ئەو ئێوارەیە قسەمانکرد لەسەر ئەوەی ژیان لەم ناوچەیە بۆ ئێمە نەماوەو ئەبیٚ جێگا بگۆڕین، بەلاّم شوێنێکی وەها نەبوو بۆی بڕۆین، چەممان لەدەستچوو، پیرەمەگرون دوورەو لێمان دابڕاوەو دوژمن کەوتۆتە نێوانمان. شوان‌و شێخ بزێنی خەڵکی زۆر هاتوچۆیان دەکردو هەر یەکێك چاوی پێمان بکەوتایە بەسبوو بۆ ئەوەی لەوێش پەلامارمان بدەن.

برادەرانی دەشتی کۆیە پێشنیاری ئەوەیان کرد بڕۆینە دەشتی کۆیە، ئەوان شارەزان‌و لەو ناوچەیە جەولە دەکەین تا وەزعی ئەهۆن دەبیٚ ئەوسا یان ئێمە دەگەڕێنەوە یان ئەگەر سەرکردایەتی هێزی تری نارد، جێگیریان دەکەین‌و ئێمەیش دەچینە مەڵبەندی چوار، پێش ماوەیەك کەمامۆستا جەمالمان بەڕێکرد پێمان وت: بەبرادەران بڵێن ئێمە زۆر ماندووین ئەگەر بکریٚ هەندیٚ برادەری تر بنێرن‌و ئێمە بگۆڕن، ئەوەبوو بووبەباس گوایە کاك رۆستەم‌و سیروانی کوێخا نەجم‌و کاك ئازادی سەگرمە دێنەخواریٚ بۆ جێگای ئێمە، هەر بۆیە من پێشنیاری برادەرانم زۆر بەلاوە باشبوو، دە پانزە رۆژێك خۆمان پەنا دەدەین‌و کەی ئەو برادەرانەش هاتن لەگەڵیان دەگەڕێینەوە ئەم ناوچانەو بنکەی ئازوقەی شاراوەکە بەشی سیٚ مانگی (١٠٠) پێشمەرگەمان عەمبار کردبوو لەسەرجەم شوێنەکان.

شەوی (٩/٨ـ٧)چووینە زاخیرەکانی پشتی کانی بۆگەنەو لەشوێنێکا خۆمان مەلاسدا، لەگەڵ گۆڕینی هەر حەرەسێکی مەعسکەرەکەی ئاغجەلەر کەدەگۆڕدرا، چاومان لێدەبوو، ئەمڕۆ عەبدولکەریم هاتەوەو خەبەری ئەوەی بۆ هێنام کەماڵو منداڵەکانم و لەئۆردوگای بازیان چاوەڕێم دەکەن بۆیە برادەران چوونە دۆڵە درێژو کانی دڕکەو ئێمەش لەگەڵ عوسمان عەسکەری و مەریوانی برازامدا چووین بۆ ئۆردوگای بازیان لەوێ کاروان و کارزان و دایکیان لەماڵی عوزێر چاوەڕێی دیدەنی من بوون، هەر ئەمڕۆ شەو گەیشتمە ئۆردوگاو منداڵم بەجێهێشت، دوو سێ ژەم بوو خواردنی تەڕو چەورمان دەخوارد، ئێمە وەکو مان گرتوومان لێهاتبوو، مەعیدەمان وشکبووبۆوە لەئەنجامی ئەو خواردنە نوێیە. دووچاری ڕشانەوەو هێڵنجدان بووم، ئازارێکی زۆرم پەیداکرد، برادەران لەوە دەترسان ژەهر لەخواردنەکە کرابێ، بەلام بەپاڵو بەکۆڵو بەزۆر خۆم گەیاندە کەلاوە رووخاوەکانی سەرچاوەی بازیان و لەوێ ماوەیەك درێژ بووم و پاشان وردە وردە بەرێکەوتین تا پشتی گردۆڵکەی بێژەنگ بەسەرو لەوێوە چووینەوە بۆ کانی ساردو دوو سێ پێشمەرگەم لەوێ دانا بوو چاوەڕێیان دەکردین. ڕۆژێکی تریش لەکانی سارد چاوەڕێی عەتاو عەبدولکەریم هەڵەدنیمان کرد هەر نەهاتنەوە، هەموو جارێ لەکاتی خۆیدا دەهاتنەوە لەشارەوە، بەلام جاری پێشوو تۆزێك دواکەوتن و ئەمجارەش هەر نەهاتنەوەو دەرکەوت لەوێوە ڕاستەوخۆ خۆیان چووبوونەوە بۆ سەرکردایەتی، بەتەواوەتی دڵم سەغڵەت ببوو، لەوە دەترسام گیرابن، یان لەڕێ شەهید بووبن.

ڕۆژی (٧/١٣) مامۆستا عادل و مەریوان و چەند برادەرێکم نارد بۆ ئۆردوگا بۆ پرسینەوە لەکاك عەبدولکەریم و عەتا، بەلام دووچاری کەمین ببوون و نەچووبوونە ئۆردوگاو گەڕانەوە لامان. هەر ئەمڕۆ بەرێکەوتین بۆ کۆنە هەوارەکانی کانی دڕکەو لەوێ لەگەڵ کاك ڕەهبەرو ئەوان ڕێکەوتین لەسەر ئەوەی بڕۆین بەرنامەمان جێبەجێ بکەین.

## ڕۆژی (١٩٨٨/٧/١٥) حەمەو بەشە هەنگوینەکەم.

رووبەڕوی شارۆچکەی ئاغجەلەر لەبن ریزە بەردێکدا خۆمان مەڵاسدابوو، بڕیارماندا تا شەو دادێ ، کەس خۆی دەرنەخات چونکە نێوانی ئێمەو دوژمن تفەنگ هاوێژی بوو، لەوێدا لێمان بقەومایە شەڕێکی خۆتڕێن بوو بەس، کوڕێك لەدەستەکەی ئێمە بوو ناوی محەمەد شێخ حسێن زێڵێنی بوو، زۆر لاسارو بێ گوێ بوو، بەلاَم لاوێکی دڵسۆز بوو لەبەرئەوە چاوم لەهەندێ هەڵەو کەمو کوڕی دەپۆشی. ئەو رۆژەی لەقۆجەلەر بووین دوو سێ شووشەی هەنگوینی بچکۆلەی پڕکردبوو لەکۆڵ پشتەکەیدابوو، ناوی لێنابوو بۆ خۆی و بۆ من، ئەمڕۆ کەلەباروودۆخێکی زۆر ناسکدا بووین ئیلتیزام شتێکی زۆر گرنگبوو بۆ پارێزگاریی لەگیانی هەموومان، حەمە هیچ گوێی پێنەدەدا، چەندجار تکام لێکرد سوودی نەبوو، هەر ئەچووە سەر ریزە شاخەکەو تەماشای ئاغجەلەری دەکرد، منیش چەکەکەم لێسەندو بەبرادەرانم وت: هەر کەویستی هەڵسێ ئاگادارم بکەن، حەمە چووبووە لای عوسمان عەسکەری و گلەیی کردبوو، عوسمان هاتە لامو وتی: چەکەکەی بدەرەوە من ناهێڵم خۆی دەربخات، دڵی عوسمانم نەشکاندو چەکەکەم دایەوە، بەلاَم قسەی لەگەڵ نەدەکردم، کات لە(١٢) لایدابوو مەترسی تا دەهات کەم دەبۆوە، وتم : "عوسمان بەشێخ محەمەد بڵێن هەرچەن قسەم نییە لەگەڵی با بەشە هەنگوینەکەم بداتێ" ئەویش خێرا هەڵیدایەو وتی: "ئەگەرچی منیش قسەی لەگەڵ ناکەم، بەلاَم بەشەکەی ماوە" بوو بەپێکەنین و لەوێدا حەمەمان ئاشت کردەوە.

هەمان رۆژی (٧/١٥)ئاخر رۆژی مانەوەمان بوو لەبەری چەمی رەزان و قەڵاسێوکەو هێشتا سەعاتێ رۆژی مابوو، لەپشتی کانی دڕکەوە بۆ مالاَنی کانی بۆگەنە بەرێکەوتین و لەوێوە روو لەمایلە بەبەرچاوی هەموو ئاغجەلەرو رەبایەکانی پشتی هەیدەربەگو دەوروبەری گردی بۆڵحانەوە، گەیشتینە مایلەو ویستمان بەناو دێیە سووتاوەکەدا بڕۆین، بەلاَم بۆمان دەرکەوت رەبایەی تێدایە بۆیە کەوتینە پشتی گوندەکەو ڕوومانکردە گردی بۆڵحان و بەرۆژ دەست نیشانمانکردبوو لەکوێو لەکوێ لەسەر رێگاکان رەبایە هەیە، ئێمە لەجادەی ئاغجەلەر ـ عەسکەر نزیکبووینەوە، جاشەکان تەقەیان دەکرد، ئێمە بەناو پوش و

قەسـەڵدا دەڕۆیشـتین بـەڕیز خشـەو قرچـە قرچـی دەهـاتو شـەویش باشـتر دەنـگ دەڕوا، روو لەسەر ئێمە، هەندێ گوللەی گڕداریـان هەڵدا بـەلآم بەسـەرماندا دەڕۆی، هەرچـی چـۆنێك بـوو رووەمـان كـردە شـوێنێك لـەوێش ئـاگری جگـەرەی جـاش دەسووتاو دیاربوو لـەوێ كـەمین هـەبوو، ناچار بووین بۆئەوەی زوو بگەینـە سـەر زێو خێرا بپەڕینەوە بەری كۆیە، نەدەبوو خۆمان دوابخەین، چووینە شوێنێ پێـی دەڵـێن: (دەشـتی ئەسـحابە) لـەنێوانی گونـدی هەیدەربـەگو عەسـكەردا لەسـەر بـەرزایی گردبـەرانی عەسـكەرەوە، رەبایـە هـەبوو بـەدووربینی شـەو ئێمـەیان بەدیكردبوو، دوو سێ هاوەنی گرێ دووریان تێگرتین، هەر بەڕێككەوت زۆربەمانی شـەهید نـەكرد، هـەنگاومان نـاو مـن پێشـیان كـەوتم، شـارەزابووم بـەرەو گونـدی شـۆڕیجە، هێشـتا مابوومـان بەچـەند هـەنگاوێ بڕۆینـە نـاو دێیەكـەوە، ئـاگرێ چریسـكەی دەهـات بـەئاگری جگـەرە دەچـوو، دووسـێیەكمان بـەپارێز رۆیشـتین، تەماشـامانكرد ئـەمرۆ جـاش هـاتووە، جـارێكی تـر چـی نەسـووتاوە ئاگریـان تێـەردابوو، بـۆن كـرووزی لێـدەهات، رانەوەسـتاینو رووەمـانكردە سـەر زێ، كۆنـە ئاساری (قەلآی گان) كەبەشێكە لـەو قەلآیانـەی سـەردەمی پاشای كۆرەو لـەو نـاوە هەندێ هەواری ماڵە كلێسەی هەبوو سوتێندرابوون، برادەران لەسـەرخۆ دەڕۆیشـتن بۆ رەنە رووت چونكە جاری پیشوو (٤٠) پێشـمەرگە لـەوێوە پەڕیبوونـەوە، حەمـە هـەژار و دڵـزارو هەنـدێكی تـر لەپێشـەوە چـوون كەڵەكەكـە ئامـادە بكـەن لەسـەر زێیەكە، دوو زەلامیان دەستگیركردبوو بەبێ چەك، ئەوانیش كـەزانی بوویـان ئـەمان پێشمەرگەن یەكسەر ناوی منیانـدابوو، وتیبوویـان ئـەو دەمـان ناسـێ، هێنایـانن بـۆ لای من، منیش ناسیمنەوەو لێم پرسـین لـەكوێن، وتیـان: لەكۆیـە، ئـەی بـۆ هـاتوون؟ بـۆ هەنـدێ هـەوێو شـتمان كەشـاردومانەتەوە، ئەمانـەوێ بیبـەین بۆئـەوەی لەشـار نەمان گرن، لەگەڵ خۆمان بردمانن، ئەوانـە مەلـەوانی چاكو كەڵەكـەوانی چاكبوون چونكە خەڵكی كلێسە بوون، بەهاوكاریی ئـەوان بەچـەند سـەفەرێ هـەموومان لـەزێ پەڕینەوەو رووەمـانكردە كۆنـە گوندی رووخـاوی كـانی بـیو لـەوێش رانەوەسـتاین، چووینە دۆڵی كـادیران، لەوێدا هەندێ خـانوو كرابوونو تایـتو زەخیرە، خێـرا لـەو ئاوە شۆڕاوەی شیوەكە جلەكانمان شۆریو چێشتمان لێنـاو پاشان سـێ كۆپتـەری جەنگیمان بۆ هات لەسەرمان دەسوڕایەوە، بەلآم لەڕاستیدا بۆ ئێمە نەهاتبوو بەڵكـە مەبەستیان پشكنینی ناوچەكەبوو، هیچ تەقەی نەكردو رۆی.

# پەڕینەوەمان بۆ بەری کۆیە

ڕۆژی (٧/١٤) لەکانی دزانی قۆچەبلاخ کۆنەوە دڵزارو دڵسۆز لەپێشەوە چووبوون بۆ ئامادەکردنی کەڵەکەکە لەسەر زێیەکە، ئەو شوێنەی پێی دەوترا دۆڵی کادیران دامێنی شیوی کاولان بوو، ئێوارەی (٧/١٦) لەدۆڵی کاولانەوە هێشتا سەعاتێ ڕۆژی زیاتر مابوو بەڕێکەوتین بەرەو نزیکی کۆیەو شەو درەنگ چووینە شیوەکەی بەرماڵانی سوورە قەڵاتەوە. لەوێ خەڵکی زۆر دەهاتن بۆسەر ئەرزو شتی شاراوەیان، ڕەهبەرو هەندێ لەکۆییەکان قسەیان لەگەڵکردبوون لەبابەت ژیان‌و مانەوە، ئێوارەی ڕۆژی (٧/١٥) هاتنەوە لامان‌و وتیان ژیان لەدەشتی کۆیە لەتوانادا نییە بۆیە بابڕۆین بۆ میر سەیدو لەوێوە پەیوەندی دەکەین لەگەڵ مەڵبەند، منیش کەزانیم لەوە ترازاوە چاوەڕێی برادەران بکەین بێنە شوێنمان بڕیارماندا هەر ئەو شەوە واتە (١٦/١٥ ـ ٧) بەکوڕانی شاری کۆیەدا سەرکەوتین بۆ کانی‌و ئاوەکەی کانی بی سەرشاخ زۆر ماندوببووین، وزەمان تێدا نەمابوو، پێش ئەوەی سەرکەوین، لەشیوە لۆچکەیەکدا گۆماوێکی بچکۆلە هەبوو ڕەنگە دە دوازەدە گلاس ئاوی تێدا بووبێ، پڕی لەسەرەمێکوتەو قەنگەلاشکەو پیسی بوو، زۆر لەو برادەرانەی نەشارەزاو توونی بوون خواردیانەوەو منیشیان بردە سەری، کاتێ قوومم لێدا بڕوا بکەن لەژەهراو نەبێ لەهیچی تر نەدەچوو، چارمان هەر ڕۆیشتن بوو چونکە نزیکی ڕۆژبوونەوەبوو، تەکانماندا بۆسەر کانی بییەکە لەوێ خۆماندا بەزەویداو سەروچاومان شۆری‌و ئاومان خواردو خەریکبوو خەو دەی بردینەوە، برادەران وتیان: بگەینە میر سەید لەوێ لەمەترسی ڕزگارمان دەبێ، لوژەلۆژ ڕێگامان بڕی، لەترمان دەبرد، ئەو تۆزە ڕێیەمان لێ ببووە ساڵێك، چووینە میر سەید، کۆییەکان بای قوڵیان خۆشبوو، ناوچەی خۆیان بوو، خێرا خەڵکیان ڕاسپارد بۆ خەیارو تەماتەو گۆشت یان کەباب‌و نان.

ئێمە لەناو دارەکانی میر سەیددا خۆمان دابوو بەزەویدا، لەپڕێکابوو بەهات هات، هەندێ لەبرادەران بڕوایانکردبوو، شوێنەکە لەهات هات دووربوو، تومەز کاك ڕەهبەر دڵی خۆشەو ناوچەی خۆیەتی، گاڵتەی لەگەڵ برادەران کردبوو، نیوەڕۆ هات، خەیارو تەماتەو گۆشت هات، بەشی ئێمە درا، ڕۆژی (٧/١٨) بوو، گەیشتینە

میر سەیدو هەر ئەمڕۆ ئێران ڕەزامەندی خۆی دەربڕی بۆ ڕاگرتنی شەڕ لەگەڵ عێراق، ڕۆژی (٧/١٩) میر سەیدم بەجێهێشت لەگەڵ دەستەکەی خۆم و چووم بۆ مەڵبەندی چوار، بروسکەم کرد بۆ شەهید حەسەن کوێستانی ئێوارە، شەو خۆم لای ئەحمەد کوردە مامەوە لەبارەگای سکتان. ڕۆژی (٧/٢٠) چوومە چیوەی سەروو، سەیارەی کاک حەسەن کوێستانی هات، بردمانی بۆ ماڵی خۆیان لەتوتمی و چوومەوە ناو بارەگاکانی شۆڕش و جەولەکەم کۆتایی پێهات.

## وریا ئاغجەلەریی و عادل شەریف

ماوەیەکی زۆربوو هانی هانی لەسەر عادل شەریف پەیدابیوو، سەبارەت بەوەی ببوو بەزاوای ماڵی حاجی کاکەولای چنارتوو، وای لێهاتبوو هەر لەخۆڕایی خەڵکی گومانی ئەوەیان دەکرد لەهەر ئان و ساتێکا بێ عادل دەستێ دەوەشێنێ و دەڕوات، ڕۆژانی ئەنفال هاتە پێشەوە، ئەو ڕۆژانە بوو مرۆڤی لەخۆ بوردوویی و دڵسۆزی کوردایەتی نەبێ خۆی بۆ نەدەگیرا، ڕۆژی (٨٨/٥/٢٨) کەتیپی (٢٥ی خاڵخالان) هاتنەوە لامان بۆ چەم، کاک وریا ئاغجەلەری کەیەکێکبوو لەو لاوانەی ساڵانی ( ٧٤) کەوتە ناو حەلقەی ڕۆشنبیری کۆمەڵەوەو پاشانیش بوو بەئەندامێکی بەردەوامی ئاگای لەکاری ڕێکخستن هەبوو لەگەڵ هەندێ لەهاوڕێ قوتابییەکانی ساڵی (١٩٧٦) فەرمانی گرتنیان بۆ دەردەچێ و ڕوو دەکەنە لادێ و لەگەڵ مەفرەزەکانی سەرەتایی کاردەکەن. خۆشی کوڕی جوتیاو لادێ بوو بەتەواوەتی جێگای خۆی کردبۆوە، بەڵام کاک وریا لەگەڵ ئەوەی زۆر ئاوەدان بوو لەمێشکا، بەڵام لەدوان و ناو کۆڕو کۆمەڵدا زۆر بەئەدەب و شەرمن بوو، حەزی لەتەنیایی دەکرد تا بوو بەئەندامی کەرتی ڕێکخستنی کۆمەڵەش هەر وەهابوو، بەڵام کاتێ نامەیان پێشنیارێکی دەنووسی هەر ئارەزووت دەکرد بیخوێنیتەوە لەئەنجامی ئەوەی هەست بەوە دەکات لەشۆڕشدا بڕوای لەسەر نەماوە، جا من پێشنیار ئەکەم لەم هەلومەرجە دژوارەدا دڵی بدیتەوەو ئەوەی لەلا بسڕیتەوە باتوانای خۆی بۆ ئەم ڕۆژگارە بخاتە گەڕو ئێمەیش خۆمان لەهەندێ زیان بپارێزین. هەر چۆن زۆربەی جارەکان پێشنیاری کاک وریام لا چاکبوو ئەم جارەش دوو قۆڵی عادل شەریف مان بانگ کردو بەتەواوەتی دڵنیام کرد کەشۆڕش و

بەتایبەت کۆمەڵە لاپەڕەی نوێی لەگەڵ دەکاتەوە، هەر لەم رووەوە ماوەیەکی چاك گوێم گرت بۆ سکالاَکانی و خۆشی هەندێ هەڵەو تاکرەویی و رارایی خۆی بۆ باس کردین و بەڵێنیدا پێشمەرگەیەکی دڵسۆز دەبێ لەمەولا. بەڕاستی کاك وریا دەوری بینی و لەو رۆژگارە چڕانەدا سوودی چاکمان لەخۆشی و عادل و شەید ئیسماعیلی برای عادلیش وەرگرت کەبەداخەوە هەر لەسەردەمی ئەنفال لەلای ئێمە رزگاربوون لەسەفەرێکدا ئیسماعیل بەدەستی جاش شەهید دەبێ.

رۆژانی ئەنفال لەبەرئەوەی رۆژگارێکی وەهابوو نەدەزاندرا چ چرکەیەك تەواو دەبێ، ئیلتیزامات زۆر کەم بووبوو، لەکاتێکا بەیەکێکت دەوت هەڵسە سەرەی حەرەسیاتە لەوسەر لوتکەیە، زۆرجار بەگوێی نەدەکردین و نەشدەکرا ئیجرائاتی لەگەڵ بکەی، چونکە دەزاندرا ئەو برادەرە لەحاڵەتی ئاساییدا وەها نەبووە، بەڵام رۆژگار تینی بۆ هێناوەو وزەی تێدا کەم بووەتەوە، هەر بۆیە کاك وریا زۆر ژیرانە بۆ مەسەلەکان دەچوو، زۆرجار ئاگاداری دەکردمەوە لەزۆر رووەوە.

## بۆردومانی گوندی گۆپتەپە

رۆژی (١٩٨٨/٥/٣)کاتێ لەکەرکوکەوە باجەرەکانی دوژمن هاتن، یەکەم پێنان بەکللاجی کردنەوەی بۆمبی کیمیاویدا لەگوندی گۆپتەپەبوو، گۆپتەپە کوێیە؟

گۆپتەپـە گوندێکـە دەکەوێتـە سـەر زێـی دوکـان، لەدەشـتی ئاغجەلـەردا لەشـوێنێکدایە لای سـەرووی زێـی دوکـان، وەکـو مـارێکی هـار لـوولی خـواردووەو جۆرەها پێچ و پەنای تێکەوتووە. هەر ئەم مارە هارە هەندێ تلی داوە چەندان رەنی دروستکردووە، کەبووە بەهۆیەکی گرنگی ئابووری و دەرامەتی خەڵکی گوندەکە بەتایبەت لەبەهارو هاوین و پایزدا جۆرەها بەرهەمی کشتوکاڵی لێ بەرهەم دەهێندرێ هەر لەتووتن، پەموو، کونجی و پاقلە، خەیار، شووتی، کاڵەك، باینجان و بامێ، توورو سلق، جگە لەوەی جۆرەها پەڵە هەنجیرو قەیسی و هەلوژەو قۆخو هەناری تێدا رواندراوەو هاتونەتە بەرهەم.

ژیانی ئەم گوندە ئەوەندە چوو بووە پێشەوە بەتەواوەتی سیمای شارۆچکەی لێنیشتبوو، شارێکە بەجادەیەکی قیرتاو دەبەستراوە بەئاغجەلەرو کەرکوك و سلێمانیەوەو لەسەرێکی ترەوە دەگەیشتەوە شێخ بزێنی سەروو وەلقی لێدەبۆوە

بۆ شوان، لەکاتی راکەراکی کورد لەترسی سەربازیو بۆئەوەی خزمەت بەدوژمن نەکەن، زۆربەی ئەو سەربازانە لەپێشەوە دەهاتنە گۆپتەپەو پاشان بەناوچەکەدا بڵاودەبوونەوە، چەمەکانی گۆپتەپە بەهۆی بوونی چەولمی خاوێنەوە لەهەردوو شاری کەرکوكو سلێمانیەوە لەگەڵ رۆژ دەبۆوە لۆریو گەلآبەو ئاخچەم ریز دەبوون روو لەگۆپتەپەو هەمیشەو لەهەموو حاڵەتەکاندا پەیوەندی شارو ناوچەکە لەگۆپتەپەوە دەکرا.

گۆپتەپە گوندی شێخ عەبدوڵڵای باوکی شەهید عەلی عەسکەری قارەمانەو گوندێکە لەو سەردەمەی مامە عەبدوڵڵاش کەگەورەترین دەسەڵاتی بووە، مەرکەزی پەیوەندی کۆمەڵایەتی ناوچەکانی شێخ بزێنییەکانو شوانو قەڵاسێوکەو دەوروبەری بووە، دیوەخانی مامە عەبدوڵڵا بووە بەشتێکی مێژوویو جۆرەها بەیتو گۆرانی کۆنی لەسەر وتراوە.

گۆپتەپە خاوەنی چەندان بنەماڵەی شەهیدە تەنها لەبنەماڵەی عەبدولقادری مامە عەبدوڵڵا (٢١) کەس شەهیدی کیمیاوی هەیە، حەسۆی قالە داودو براو کەسی، عەلی مەجیدە جافی کادری سەرەتایی کۆمەڵەو رێبواری کەریم جاف، حەمیدی مەلا ئەحمەدو مەجیدی برایو کۆمەڵێکی تری براو کەسوکاری، شەهید قالە سوورو ئیسماعیلی برای، جەمیلی ئەحمەد جەمیلو چەندان شەهیدی تری هەیە کەلای من ناواکانیان رۆشن نینو تەنها لەرۆژی کیمیابارانەکەدا زیاتر لە(٣٦٠)شەهید بەمەزەندە لەرۆژێکا شەهیدبووە. گۆپتەپە خاوەنی داستانی شەری ساڵی (١٩٨٦)ە کەپاش تێکچوونی گفتوگۆ دەستی پێکرد، گەورەترین ژمارەی دوژمن هات، لەگەڵ تۆپی دوورهاوێژو دەبابەیەکی یەکجار زۆردا، ژمارەی جاشو سەرباز لەژمارە نەدەهات، هێزی پێشمەرگە لەپاڵ خانوو ماڵی ئەم گوندە خۆگرەدا گەورەترین داستانیان تۆمارکردو شوورێکی هێندە توندیان لەلووتی دوژمندا پاش شەوو رۆژی شەر، بەلووتی شکاوەوە پاشەو پاش کشانەوەو خوێنی حاکم کەمالو چەند پێشمەرگەیەکیشی خەنەبوو کەلەدەستو پێی گوندە قارەمانەکەی گۆپتەپە درا. ئێستاش پاش ماوەی رزگاربووی کیمیاویو ئەنفال جارێکی تر گۆپتەپەو گۆرستانی بەکۆمەڵی شەهیدانی کیمیاوی بارانەکەیان لەنوێ دامەزراندۆتەوەو لەسەنگەری بەرگری لەبوونی کوردان، هەر بەو بۆنەیەوە هەزاران سڵاو لەو گوندە قارەمانەو رۆڵە زیندو شەهیدەکانیشی، داخەکەم لەبڵاوکراوەی

شۆڕش لای یەکێتیو لەلای لایەنەکانی تریش هیچ بایەخێکی نێونەتەوەیی نەدرا بەکیمیابارانی گۆپتەپەو چەند جاریشك هەوڵدا سوودی نەبوو، لەم دوایانەدا پارێزەر مستەفا عەسکەریو کاك رەهبەری سەید برایمماڵیان ئاوابێ یادیان هاتۆتەوەو هەرکەسە لای خۆیەوە چی لەچۆرگەکەیدابووبێ پێشکەشی خوێنەرانی کوردیان کردووە لەرۆژنامەکانی سەکۆو بێواردا.

## بۆردومانی کیمیاوی گوندی عەسکەر لە

عەسکەر گوندێکە لەنێوان چوار پێنج لوتکە، گردۆڵکەدا، توند خۆی قایم کردووەو لەوێوە تەواوی قەڵاسێوکە، شێخ بزێنی، سەروو هەموو دەشتی کۆیەو بەشێکی شوان دەبینی.

ئەم گوندە جگە لەوەی خاوەنی کۆمەڵێك کەڵەپیاوی ناسراوی وەکو (بەکر سدقیو جەعفەر عەسکەریی کۆنە سەرۆك وەزیرانی عێراقو شێخ عبدالرەحمانو کاکە رەزای عەسکەریو مامە عەبدوڵڵای باوکی شەهید عەلی عەسکەریو شەهیدی نەمر کاك عەلی عەسکەریو صالح عەسکەری ئەندامی سەرکردایەتی پارتی کۆمۆنیستی عێراقو شەهیدانی وەك عەبدوڵڵا مەجیدو دوکتۆر مارفو بێستوون مەحمود)و چەندان شەهیدی تری نەمر کەلەگەڵ ئەم لیستەیەدا بەرچاو دەکەونو لەکاتی خۆیدا برای تێکۆشەرو ماندوو دڵسۆز کاك غەریب سەعید لەرۆژنامەی (کوردستانی نوێ)دا بڵاوی کردنەوە. بەداخەوە کاك غەریب عەسکەریش کەوتە لیستەکەوە.

لەرۆژی (١٩٩٨/٥/٣) دا کاتێ گۆپتەپە پێکراو دێراوە توتن بەمرۆڤی شەهید لەمنداڵو ژنو پیرو جوان پرکرا لەخوێن، ئەوسا چەند مشتێ ژەهریشی لەم گوندەدا هەڵرشتو بوو بەهۆی زەرەو زیانێکی ئابووریو گیانی زۆر، زۆر بەداخەوەم ناوی شەهیدەکانی نازانم بەلام (٣تا ٥) کەسی لەژنو منداڵو لاو شەهیدبوون. پاشانیش هەموو خەڵکی گوندەکە لەگەڵ ئێمە هاتنە چەمی ساچوغو قەڵای جوڵندیو چەند رۆژێك مانەوە، خۆیان پێیان باشبوو نوێنەرێکیان نارد بۆ دەربەندی بازیان بۆ لای شێخ مەحمودی کارێزە کەئەوسا مستەشاری جاش بوو، بۆئەوەی لای خۆی بیان پارێزێو بیان گەیەنێتە شارەکانو هەر لەسەر ئەو

ئەساسەش ڕێگای دەربەندیان گرتو هەر لەوساوە بێ سەرو شوێن بوون، کەتەنها کۆمەڵێکی یەکجار زۆری خزمی نزیکی خۆمنو سێ کچی برازا شەهیدەکەم عومەر عەبدولڕەحمان لەگەڵ دایکو کەسو کاریدا بەر ئەو لەناوچوونە کەوتن کەناوی هەندێکیان لەم لیستەدا هەیە:

## ناوی شەهیدانی گوندی عەسکەر لەساڵی (١٩٦٣) تا ساڵی (١٩٨٨)

| ناو | پیشە | تەمەن | هۆی شەهیدبوون | ساڵی شەهیدبوون |
|---|---|---|---|---|
| ١ـ خەرمان عەلی سۆفی عەبدولڕەحمان | کچی ماڵ | ١٥ | فرۆکەی مێك | ١٩٦٣ |
| ٢. محەمەد مستەفا | سەرباز | ١٨ | فرۆکەی مێك | ١٩٦٣ |
| ٣ـ خەدیجە مەلا عەلی هادی | کچی ماڵ | ١٧ | فرۆکەی مێك | ١٩٦٣ |
| ٤ـ شوکر عەلی سۆفی عەبدولڕەحمان | کوڕی ماڵ | ١٣ | فرۆکەی مێك | ١٩٦٣ |
| ٥. غەریب سەعید مستەفا | کوڕی ماڵ | ١٦ | فرۆکەی مێك | ١٩٦٣ |
| ٦ـ ڕەمەزان جومعە کاکەڕەش | کوڕی ماڵ | ١٧ | فرۆکەی مێك | ١٩٦٣ |
| ٧. مام ئەحمەد | | ٨٠ | سەریان بڕی | ١٩٦٣ |
| ٨. مام ساڵح زەرد | | ١٠٠ | سەریان بڕی | ١٩٦٣ |
| ٩. مام شەریف زەرد | | ٩٥ | سەریان بڕی | ١٩٦٣ |
| ١٠. عەبدولڕەحمان نامیق | شوان | ٢٠ | سەریان بڕی | ١٩٦٤ |
| ١١. مەلا فاتیح حامد | نیگارکێش | ٤٢ | ونکرا | ١٩٦٥ |
| ١٢ـ محەمەد سەعید مەرحە | پێشمەرگە | ٢٠ | شەڕ | ١٩٦٥ |
| ١٣. عەبدوڵڵا مەجید ساڵح | پێشمەرگە | ٢٤ | شەڕ | ١٩٦٥ |
| ١٤. محەمەد مستەفا | پێشمەرگە | ٢٥ | شەڕ | ١٩٦٨ |
| ١٥. کەریم مام ئەحمەد | پێشمەرگە | ٢٠ | شەڕ | ١٩٦٨ |
| ١٦ـ عەبدولڕەحمان حەمەلاو | پێشمەرگە | ٢٢ | شەڕ | ١٩٦٩ |
| ١٧. حەمە دەمین بایز | کادیر | ٤٢ | نەخۆشی | ١٩٦٩ |

| ١٨ـــحەمەدەمین فـــەقێ کەریم | پێشمەرگە | ٢٥ | چەکدار کوشتی | ١٩٧٠ |
|---|---|---|---|---|
| ١٩. گوڵە کەچەڵ | کچی ماڵ | ١٥٤٠ | فڕۆکە | ١٩٧٥ |
| ٢٠ــــ عەبـــدولڕەحمان محەمەد قادر | پێشمەرگە | ٦٠ | نەخۆشی | ١٩٧٥ |
| ٢١ــ فـەقێ عـەلی سـەید ئیسماعیل | جوتیار | ٥٠ | فڕۆکە | ١٩٧٥ |
| ٢٢. ئامین حەسەن گیکەل | کابان | ١٤ | فڕۆکە | ١٩٧٥ |
| ٢٣. محەمەد حاجی عەلی | شوان | ٢٠ | چەکدار کوشتی | ١٩٧٦ |
| ٢٤. ڕەسول مام ساڵح | پێشمەرگە | ٢٣ | چەکدار کوشتی | ١٩٧٧ |
| ٢٥ـ عـەلی عەبـدوڵڵا (عـەلی عەسکەری) | ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی | | چەکدار کوشتی | ١٩٧٨ |
| ٢٦. حەمید سەعید نامیق | کرێکار | ٢٠ | چەکدار کوشتی | ١٩٧٨ |
| ٢٧ـــــــ عوسمـــــــان عەبدولڕەحمان محەمەد | دکتۆری پ٠م | ٢٠ | ئیعدام | ١٩٧٩ |
| ٢٨ــــ عەبـــدولڕەحمان محەمەد ساڵح | پێشمەرگە | ٢٢ | ئیعدام | ١٩٨٠ |
| ٢٩ـ عومـــەر حـاجی عـەلی خدر | پێشمەرگە | ٢٠ | ئیعدام | ١٩٨٠ |
| ٣٠. ئەحمەد سەعید کەریم | کادیر | ١٨ | چەکدار کوشتی | ١٩٨٠ |
| ٣١. حەسەن عەلی یەعقوب | کادیر | ٢٢ | ئیعدام | ١٩٨٠ |
| ٣٢. وەسمان خدر مستەفا | کادیر | ١٨ | ئیعدام | ١٩٨٠ |
| ٣٣ــ کوێخـــا محەمـــەد مەحمود | پێشمەرگە | ٢٥ | کۆپتەر | ١٩٨٠ |
| ٣٤ــ زرار حەمــە ســاڵح تۆفیق | پێشمەرگە | ١٨ | ئیعدام | ١٩٨١ |
| ٣٥ستار حەمە ساڵح | پێشمەرگە | ١٧ | تۆپ | ١٩٨٢ |
| ٣٦ــ حەمیـــد مـــەحمود تۆفیق | جێگری تیپ | ٣٠ | کۆپتەر | ١٩٨٥ |
| ٣٧ـ شـەریف حەمـەدەمین مەحمود | سەرباز | ٢٢ | کۆپتەر | ١٩٨٥ |

| ٣٨. كەریم حاجی مەحمود | جوتیار | ٤٨ | كۆپتەر | ١٩٨٥ |
|---|---|---|---|---|
| ٣٩ـ عوسمان سەعید ئەحمەد | خوێندكار | ١٢ | كۆپتەر | ١٩٨٥ |
| ٤٠. یاسین مەحمود تۆفیق | كادیر | ٢٤ | چەكدار كوشتی | ١٩٨٨ |
| ٤١. هەژار ساڵح كاكە رەزا | پێشمەرگە | ١٨ | ئەشكەنجە | ١٩٨٨ |
| ٤٢. تەلعەت ساڵح | | ٥٥ | لەبرسان | ١٩٨٨ |
| ٤٣. مهاباد سەلاح | منداڵ | ٥ | | |
| ٤٤. ساڵح كاكە رەزا | ئەندامی سەركردایەتی حشع | ٢٥ | لەبەغداد ونكرا | |

١. پرشنگ عومەر عەبدولرەحمان (١٣) ساڵ ئەنفاكراوە.

٢. مەشخەڵ عومەر عەبدولرەحمان (١٢) ساڵ ئەنفالكراوە.

٣. پەیمان عومەر عەبدولرەحمان (١٠) ساڵ ئەنفالكراوە.

٤. نوری محەمەد (٣٠) ساڵ شەهیدی كیمیاوی.

٥. تەمین محەمەد (٢٠) ساڵ ئەنفالكراوە.

٦. مەلەك محەمەد (٣٢) ساڵ ئەنفالكراوە.

گەرچی چەندانی تریش هەن كەناوەكانیانمان لامان نییە.

## دوو نامە

نامەی یەکێك لەو ماڵە تێکۆشەرانەی هاوکاری گرنگیان کردبووین لەسەردەمی بوونمان لەچەمی ڕەزان و لەکاتی هێرشی ئەنفالدا

### بەڕێز مام عەلی

دوای سلاوو ڕێز

ئەم ناوانەی خوارەوە کەلەئەنفالی ۳ی چەمی رەزان پاش پەیوەندیکردنی بەڕێزتان لەباینجان پەیوەندی دروستکردن لەگەڵ هێزەکەو ڕێکخراوی سلێمانی:

١. ماڵی ئێمەبوو، دەرەجەی یەکەم ئەرکی لەهەموو رووەکانەوە دەوری هەبوو لەشاردنەوەی پ.م + بریندار + چەك + جیهازو خواردن.

٢. عوزێر پەیوەندی بەبەڕێزتانەوەو ناو باینجان.

٣. نەوزاد بازیانی.

٤ـ صباح.. ئەمانە لەباینجان دەوری سەرەکیان هەبوو لەبەینی هێزەکەو ناوشار.

٥. دوای رۆیشتنی بەڕێزتان بۆ سنوورو ئێران، ڕێکخستن دروستبووەوە لەگەڵ ڕێکخراوی سلێمانی و دروستکردنی مەفرەزەیەکی سووك بەسەرپەرشتی خۆم + ڕێکخستنەکان.

٦ـ لەسلێمانی عەلی کاکەڕەش، شوێنی دووهەم بۆ شادرنەوەو بریندارو پێشمەرگە.

٧. عبدالله صابر : کەشۆفێری ئیڤایەکی سەربازی ئەو کاتەبوو، باوەڕپێکراوی خۆمان بوو وەك ئەندامێکی ڕێکخستنی خۆمان وا بوو، دەوری باش هەبوو لەگواستنەوەی مەلا فەرمان بەبرینداری بۆ ناوشا.

برات حەسەن حەمە بەگ موغانی

نامەی یەکێك لەو تێکۆشەرانەی ڕۆژانی ئەنفال لەگەڵمان بوو

## برای گەورەو زۆر بەڕێزم جەنابی کاك عەلی

دوای سڵاو.

بفەرموون ئەوەی من لەیادم بێت لەسەرمانەوەمان

لەپیرەمەگرون و چەمی ڕەزان.

١ـ دوای ئەوەی ئێمە وەك تیپی (٢٣) سورداش لەچەمی ڕەزانەوە خۆمان گەیاندە چیای پیرەمەگرون، بەسەرپەرشتی ئامر کەرتەکان کەئەم بەڕێزانە بوون کاك سابیر کۆکۆیی + کاك عبداللە بەکرە جۆیی + شەهید کەریم باخی. بەهیمەتی و پیاوەتی هەردوو شەهید سەردارو ئەنوەر کەهەردووکیان کوڕی کوێخا نەریمانی کەڵەشێرەبوون، شەوی ٣ـ١٩٨٨/٥/٤ بوو هەر ئەو شەوە گەیشتینە چیای پیرەمەگرون لەبەر نەبوونی تەوجیهی سەروو خۆمان و سەیتەرەنەکردنی برادەرانی ئامرکەرت هێزەکە بڵاوەی لێکرد بەچیای پیرەمەگروندا و نیوەی زیاتر بەرەو شارۆچکەی پیرەمەگرون _ تاسلوجە بەمەبەستی ڕزگاربوون لەمەرگ و من و فەقێ وشیارو ئاواتی پۆلیس کەلەم دواییەدا کوژرا لەگەڵ عبدالرەحمان گەبەیی ئەویش هەر لەم ساڵانەدا کوژرا بەیەکەوە بووین هەتاکو ڕۆژی ١٩٨٨/٥/١٢ لەیادم نییە کێهات بۆلامان خەبەری داینێ کەبەڕێز کاك عەلی هاتووە بەهێزێکی (٧٥) پێشمەرگەییەوە کەئەم بەڕێزانە دیارەکانیان بوون (مامۆستا جەمال کەئەوسا سەر بەتیپی (٣١)سلێمانی بە (٣٠) پێشمەرگەوە، کاك مەلا فەرمان کەئەوسا لێپرسراوی کۆمەڵەبوو لەتیپی (٢٣) سورداش، وەکاك عبدالکریم هەڵەدنی کەئەوسا لەناوەندی کۆمەڵەبووەو کاك شێخ فەرهادو کاك وریا ئاغجەلەری و لەیادم نییە کەکاك رابەر سید براهیم لەگەڵتانا بووبێ چونکە لەوێنەکەشدا دیار نییە. هەر لەوکاتەدا شەهید محمد سوسێ کۆنی کەئامرکەرت بوو لەتیپی (٢٧) تۆکمە لەگەڵ (٨) پێشمەرگە لەچیای پیرەمەگرون بوون ناوبراو لەرزگارکردنی کەرکوك شەهیدبوو لە ١٩٩١/٣/٢٠ دا. هەواڵی گەیشتنی بەڕێزتان بۆ چیای پیرەمەگرون لەوساتو

کاتـەدا، وەك جـەژن بـوو بـۆ ئێمـە، بۆیـە مـن و کـاك فـەقی وشـیارو شـەهید ئـاواتی پۆلیس یەکسـەر هـاتین بـۆ لاتـان، بەڵام رەحمـان گەبـەیی ئێـوارەی پێشـووتر بـەرەو چەرمەگا تەسلیم بووەوە.

کەهاتینـە لاتـان زۆر شـادمان بـووین بەدیـدارتان، هـەم لەبـەر ئـەوەی رزگارتـان بووەو هەم لەبەر خۆمان.

ئـەوەبوو هـەر بـۆ ئێوارەکـەی واتـە (١٩٨٨/٥/١٣) بـەرێزتان کۆبوونەوەیـەکتان بەهێزەکە کرد وەك لەوێنەکەدا دیارە، باشـم لـەبیرە فـەرموت: هاورێیـان پێشـمەرگە قارەمانـەکان، شـۆرش هەڵچـوون و داچـوونی تێدایـە، رۆژێـك بـوو ئێمـە خـاوەنی (٢٠٠٠) پ. م زیـاتر بـووین لەسـنووری مەڵبەنـدی دوو. ئـەمرۆش ناچـینە (١٠٠) پێشمەرگە، بۆیـە دەبێت ئـەم راستیانە بزانن رێگرنین لەتەسلیم بوونـەوەی کـەس، گرنگ ئەوەیە ئـەوەی تەسلیم دەبێتـەوە لـەماڵی خـۆی دابنیشـێ و خیانـەت نـەکات. دڵنیاش بن بەچاوی پێشمەرگە سەیرتان دەکەین. هەر لەو کۆبوونەوەیەدا فەرموت: ئێمـە زیـاتر نـین لەخاڵـە شـەهاب و هاورێکـانی، ئێمـە زیـاتر نـین لەشـەهید عـەلی عەسـکەری و هاورێکـانی. بۆیـە دەبێـت بـزانن قۆناغەکـە سـەختە پیـاوی دەوێـت ئێـوەش کـوری رۆژی تەنگانـەن، هیـوای میلەتەکـەتانن، کـەبووین بەپێشـمەرگە بەڵێنمانــدا تــاوەکو شــەهیدبوون خــەبات بکــەین، یــان رزگــار دەبــین یــان وەك هاورێکانمـان شـەهید دەبـین. ئەمـە چـارەنووسمانە دەبێـت خـۆراگربین خۆمـان نەدۆڕێنین لەکۆبونەوەکەدا ئەوەنـدە حەماسـەتت هـەبوو بیرمە کاك سابیر کۆکـەیی و هەندێ برادەران وتیان: کاك عەلی ئامادەین ئێستا بچینە سەر جادەو کەمین دابنێین کەسەعات (٤)ئێوارەبوو جەنابت فەرمووت کاتی ئەوەش دێت پەلەمەکەن.

دواتر جەنابت و مامۆستا جەمال و کاك عبدالکریم و کاك مەلا فرمان و کاك سابیر جیابوونەوە، بۆئەوەی هەرچۆن هەیە بتوانن هێزەکە رزگار بکەن. ئـەوەبوو جـەنابت کـاك عبـدالکریم و مـن و کـاوە هەڵـەدنیت ئاگـادارکردەوە کەبـەرەو مێرگـەپان بـەرێ بکـەوین. کـاتێ چـووینە سەرشـاخی پیرەمـەگرون بەمەبەسـتی شـۆربوونەوەمان بەودیوی مێرگەپانـدا رێگـا نـەبوو، بـەفر گرتبـووی لەبەرئـەوەی شـوێنەکە زۆر نسـێ بوو بەفرەکە نەتوابۆوەو کاتەکەش درەنگبوو تاریك داهات. بەناچاری شەوی (١٥ ـ ١٩٨٨/٥/١٦) لەسـەر چـیا ماینـەوە، دیـارە زۆر زۆر سـاردبوو تـاکو بـەیانی (١٩٨٨/٥/١٦) کەگەڕاینـەوە دۆڵـەبی چیمان دی.! لەئەشـکەوتەکەدا کـەس دیـار

نییـە، بـرنج لەسـەر ئـاگری ڕۆژی پێشـووە، هەنـدێ کـەل و پـەلیش وەك بـەتانی، مـەتارەی ئـاو، شتـی لەوبابەتـە بـەجێمابوو، زۆر سـەرمان سوڕما ئـەو ڕۆژە هـەتاکو ئێوارە سەعات(٣) بەجیهازی دەستی پەیوەندیمان کرد ئەوسا ئێوەمان بۆ وەرگیرا. کەوەرمان گرت بەقەد ڕۆژی (٥/١٣) دڵخۆشبووین، کاك عبدالكريم بەجیهاز وتـی: بۆ لەبەری عەوالأنن.؟ وتیان: جاری کاتی نییە گرنگ ئەوەیە ئەمشەو دەگەنە سەر پـردی شـیلەخان، هـەتاکو ئێـوە دێـن کـاك فـەقێ وشـیارو کـاك سـابیرو چـەند پێشمەرگەیەك چاوەڕوانتان دەبن، ئێمەیش بەپەلە دابەزین لەسەر شاخەوە بەرەو بیران. سـەعات (١٢)ی شـەو گەیشـتینە سـەر پـردی شـیلەخان کـاك سـابیرو فـەقێ وشیارو چەند پێشمەرگەیەك چاوەڕوانمان بوون.

یەکسـەر هـەواڵی ئێوەمـان پرسـی.؟ وتیـان: لەچـەمی ڕەزانـن فـەرموون بابچین بۆلایـان، ئێمـە زۆر مانـدووبووین بۆیـە کـاك عبـدالكريم وتـی: کـاك فـەقێ لەپشـتی شیلەخان لەپەنایەکدا ئەمێنێتـەوە با یـەك دوو سـەعات بخەوین.! کاك فەقێ وتـی: پەنا هەرپەنای خوایە، پەنا نەماوە بۆ سوعبەت کاك علی وتویەتی: دەبێت ئەمشـەو بگەنەوە لامان، چونکە دڵم زۆر لایانە. ئیتر لەڕێگا پرسیمان ئەری بۆ پەڕینـەوە چی بووە چـی نـەبوو کـاك سابیر وتـی: هێزێکـی زۆر قوات خاصـە لەپشـتی قەرەچـەتان دابەزیوون، ئێمەیش پێمان باشبوو شەڕیان لەگەڵ نەکەین.

دیـارە بـۆ بـەیانی حەڤدەی مـانگ گەیشـتینەوە چـەم، یـەك دوو ڕۆژێـك ماینـەوە هێزەکـە بـەو نـان و ئازووقەیـە دەژیـا کـەبرادەرانی شـارەزای چـەم دەیـان دۆزییـەوە. سێ تا چوار ڕۆژ ئاوها گوزەرەاندمان، کاك عەلی منی بانگکرد وتی: لەپیرەمەگروون قسەیەکمان کرد دەتوانی چی بکەین لەئۆردوگای باینجان.؟ وتم: هەرچی پێم بکرێ درێغی ناکەم، بەڵام لەو سێ تا چوار ڕۆژەدا، کـاك فـەقێ وشـیارت ناردبوو بـۆ مـاڵی عـوزێری حەمـە بـەگ لـەئۆردوگای باینجـان، مـن شـارەزای باینجـان بـووم، بـەڵام کەگوندبوو. بۆیە فەقێ ناونیشانی تەواوی ماڵی عوزێری حەمەبەگی پـێ وتم و کـاك عەلی تـاکو دەروپشتی سەرچاوە سێ (پ.م) لەگـەڵ ناردین بەنامـەوە بـۆ مـاڵی کـاك عـوزێر. مـن نـەمزانی نامەکـە چـی تێدایـە، بـەڵام پێداویسـتی هێزەکـەی پـێ وتم، کـەدەبێت هەوڵبـدەیت چـەند فـەردە ئاردێـك بکـڕن، بۆمـان دابنـێن لەگـەڵ ڕۆن، وەك یـەدەگ بـۆ داهـاتوو، بـەڵام لەچـوونەکەمدا زۆر تەئکیـدی کـردەوە نایەیتـەوە بـەبێ جگـەرە، چـونکە هێزەکـە پەرێشـان ببـوون بـۆ جگـەرە. هـەر ئـەو شـەوە مـاڵی کـاك

عـوزێرم دۆزییـەوە، نامەکـەی کـاك عـەلیم دایـە، بـۆ شـەوی داهـاتوو بەڕێکرامـەوە بەنامەیەك و (١٥) پارچە جگەرەی سۆمەری درێژەوە، کەدیارییـەکی زۆر بـەنرخ بـوو لەوکاتـەدا بـۆ پێشـمەرگەکان. کەنامەکـەو جگـەرەکانم خسـتە بـەردەم کـاك عـەلی زۆر خۆشـحاڵبوو، زۆر وەسـفی کـردم و وتـی: دەبـڕۆ پشـوویدە تـاکو ئاگـادارت دەکـەم، رۆژی (٢٣)ی مانگ بانگی کردم و وتی: هـەر ئـەمڕۆ لەگـەڵ مامۆسـتا جـەمال + کـاك عبـدالکریم هەڵـەدنی + کـاك سـابیر کۆکـەیی + کـاك مـەلا فرمـان دەچـنە گونـدی الله قـوڵی تـاکو ئـەوێ دەڕۆن، بـەڵام بـەدیوی سورداشـدا دەڕۆن لەگەبـەوە دەچـنە الله قوڵی. زۆر تەئکیدی کرد ئەو رێگایانـە شارەزای یـان نـا.؟ وتم: بـەڵێ زۆر شارەزام، کەچووینە الله قـوڵی دەوری سـەعات (٩) شـەوبوو گـوێ درێـژێکمان پێبـوو لـەوێ ئـەوەی مـن ناسـیم تـەنها عـەلی کاکـە رەش خـەڵکی قایکـەن بـوو، بـەڵام ماڵیـان لەسلێمانی بوو ناسراوبوو بەعەلی لادا.

لەگـەڵ عـوزێری حەمـە بـەگ دیـارە (٥) کـەس بـوون سیانەکەی تـرم نەناسـی، چونکە نەهاتنـە پێشـەوە بـۆ ئـەوەی بیـان بیـنم، خـواردنێکی زۆریـان هێنـابوو بـۆ هێزەکـە. مامۆسـتا جـەمال + کـاك مـەلا فرمـان + کـاك عبـدالکریم، کـاك مـەلا فرمـان لەگـەڵیان کۆبوونـەوە مـن و (١٠) پێشـمەرگەیەکێش پاسـەوانیمان دەکـردن. هـەتاکو لێبوونەوە ئێمە بەرەو چەم گەڕاینـەوە، ئـەوانیش بـەرەو ئۆردوگـای باینجـان. دیـارە مەبەستی کۆبوونەوەکـە بـۆ بـەڕێکردنی بەشێکبوو لەهێزەکە کەبۆ (١٩٨٨/٥/٢٧) بەرنامـە دانرابـوو لەقـەڵا بەردینەکـەی نزیـك گونـدی کوپەلـە کـە (٢٠) پێشـمەرگە ئەوشەوە بەڕێکرا لەلایەن ئەو جوامێرانەوە، هـەر ئـەو شـەوە کامێرە تەسلیم بەکاك عبـدالکریم هەڵـەدنی کـرا بەمەبەسـتی وێنـەگرتنی بـاقی هێزەکـە، بـۆ دروسـتکردنی پێناسیی (خفیفە) بۆ کاتی لێقەومان و بەڕێکردنی هێز بەناو حکومەتدا.

بەو شێوەیە لەبـەینی چـەمی رەزان و چیای پیرەمەگرونـدا گوزەرانـدمان، هـەتاکو (١٩٨٨/٦/١٥) مامۆسـتا جـەمال و ١٠/پێشـمەرگەی تیپـی سـی و یـەکی سـلێمانی لەگەڵ سابیر کۆکەیی و کاك شێخ فەرهادو کاك وریـا ئاغجەلـەریی و کـاك بـەکرو کـاك سیروانی برازات، بەهاوکاری کاك رابەرو دەستەکەی بـەڕێکران بـەرەو ئێران. دیـارە لـەو ماوەیـەدا مـن زیـاتر لـە (٢٠) جـار بـۆ پێداویسـتی رۆژانـە لەچـەمی رەزانـەوە هاتوومەتـەوە بـۆ ئۆردوگـای باینجـان، باشـتر ئاگـاداری کـەبۆلای کـێ چـووە چـی کردووە گرنگ کەسێکی بـەورەو قارەمـان بـوو، لـە (١٩٨٨/٦/٣) رۆژێـك سـێ (پ.م)

کاك رەفعەت کەرکوکیان هێنا، کەمار پێوەی دابوو، مـن و کاك عوزێر کەئەو رۆژە هاتبوو بۆلای بەڕێزتان، بردمانەوە بۆ ئۆردوگای باینجان. هەتا (١٩٨٨/٧/٦) بەو شێوەیە ماینـەوە، ئەوەبوو رۆژی (١٩٨٨/٧/٦) لەچەم بووین، ئێشکگر ئاگاداری کردین کەلەزەرزی و عەوالانەوە هێزێکی زۆر بەرەو چەم دێن، وەك سۆتکەو مایلـەوە بەرەو رەقەم یەك هێز سەرکەوتبوون + لەسورقاوشانەوە بەرەو چەم سەرکەوتبوون، ئێمـە کاتـژمێر (١٠)ی بـەیانی خۆمـان کـۆکردەوەو وردە وردە بـەرەو مەکۆکـە سـەردەکەوتین، ئـەوانیش بەدوامانـەوە بـوون. هـەتاکو سـەعات (٤)ی ئێـوارە، هەرچەندە رۆژەکـە رۆژێکـی زۆر گـەرم بـو،و لەکاتـژمێر (سـیّ و نیـو) بـەڕێزت کـاك رابەرو کـاك عبـدالکریمو کاك مـەلا فەرمانت بانگکردو وتـت: هـیچ چارمان نـەماوە بەڵکو لێرەوە دابەش بن بەمەبەستی بەرگریکردن. بۆیە یەکسەر کاك رابەرت ناردە بەرامبـەر کانییەکـەی شـێخ الله خـوار شـاخی رەقـەم یـەك کەلەگـەڵ دەسـتەکەی لەبەرامبـەر رەقـەم یـەك دابمـەزرێن، چـونکە هـیچ چـارنەماوەو کـاتیش بـەرەو درەنگبـوون دەچـێت. مـن و کـاك عبـدالکریمو کـاك مـەلا فرمـانو شـێخ عوسمـانی زێڵێن و شەهید قاسمی لای مەلا فرمانت ناردە پشتی مەکۆکە، ئەوەبوو لەسـەعات چوارو بیست دەقیقە تەقە دەستی پێکرد بەسـەر پەرشتی جەنابت کەبەجیهازەکە لـەنێوان هەردوولامانـدا بوویـت. هـاوارت دەکـرد دەسـت مـەپارێزن ئـەمڕۆ رۆژی پیاوانـە، دەبێـت دەرسـیان دابـدەین، بۆئـەوەی جـارێکیتر روونەکەنـەوە چـەم. خۆشـبەختانە عـدد جیهازەکـەیان بەرکـەوت، کەکـەوتبووە لای کـاك رابـەرو دەستەکەیەوە، کوژرا ئەگینا لەوانەبوو، هاوکێشەکە بەشێوەیەکی تربوایە. ئەوەبوو لای ئێمـەوە کـاك مـەلا فرمـان برینـداربوو، هێزەکـەی دوژمنـیش لەهـەر سـێ قۆڵـەوە شکاو ئەوەی بیرم بێت (٩) کوژراو هەبوو (١٥تا ٢٠) دیل هەبوو کەجەنابت هەوڵتـدا نەناسـرێیت، بـەلام بێسـوودبوو هـەموویان ناسـیاو بـوون و خـەڵکی ناوچـەکەبوون، بڕیارتـدا هـەموویان ئـازاد بکـرێن. لای دیلـەکان وتمـان: ئێمـە بـەرەو چـیای پیرەمـەگرون دەڕۆین ئێوە پیاوبن لای دوژمـن اخباریمـان مەکـەن. مـەڵێن چوونەتە چیای پیرەمـەگرون، ئیتر ئـەوەبوو هـەر لەوێـدا تـەگبیر لەچۆنێتی رزگارکردنی مـەلا فرمان کرا هەر بۆیە رووت لەمن و کاك عبدالکریم کرد کەچیمان پێدەکرێ ئێمـەیش؟ وتمان: هەر ئەمشەو دەیبەینەوە ئۆردوگای باینجان، جەنابت فەرموت: نابێت ئێمـە ئەمشەو دەچینە دەوری گەرگەڕ ئێوە بچن تەگبیری بکـەن. کەچۆن سبەی ئەو واتە

شەوی ٧ـ١٩٨٨/٧/٨ لەسەرچاوە وەری بگرن لێمان، کاك عبدالکریم بچێت تەگبیری سلێمانی بکات، ئەوەبوو شەوی ٧ـ١٩٨٨/٧/٨ جەنابت مەلا فرمانت بەچەند پێشمەرگەیەکدا ناردە سەرچاوە، من و کاك نەوزادو کاك عوزێرو کاك ستارو کاك جەمال لەسەرچاوە، وەرمانگرت هێنامانە مالّی حسن حمە بەگ لەباینجان، بۆ بەیانی واتە ١٩٨٨/٧/٨ سەعات دووی پاش نیوەڕۆ سەیارەیەکی ئیڤای عەسکەری هات بردی بۆ شار لەگەلّ کاك عبدالکریم هەلّەدنی. ئیتر ئەوەبوو ئێوە دوو رۆژ دواتر چاوەڕوانی من و کاك عبدالکریم تان کرد، ئێمە نەگەڕاینەوەو ئێوەش بەرەو ئێران بەڕێکەوتبوون و من و کاك عبدالکریمیش دوای جەژنی قوربانی ئەو سالّە بەڕێی قیردا گەڕاینەوە گولانی سنووری مەلّبەندی سێ. لای رانیە خەبەرمان هەبوو کەئێوە دوو رۆژ پێش ئێمە بەرەو سنوور بەڕێکەوتبوون، دواتر لەسەقزو لەمالّی خۆتان یەکترمان دییەوە.

## بۆ مێژوو ئەو هاوڕێیانەی رێکخستن کەلەباینجان

دەوری باشیان هەبوو:

١. عوزێر حەمە بەگ.
٢. نەوزاد مەجید.
٣. ستار حاجی سەعید.
٤. جەمال حاجی فەرەج.
٥. خالید خاجی صالّح.

## ئەو ماڵانەی هاوکاری تەواوی منیان کردووە

### لەئۆردوگای باینجان

١ ـ ماڵی بەڕێز حەمە شەریفی گەبە کەکوڕێکی ئەنفالە بەناوی نەبەزو (پ.م) تیپی سێ بوو.

٢ ـ ماڵی بەڕێز حاجی صالح ولاّغلوو.

٣ ـ ماڵی بەڕێز حاجی قادرو ولاّغلوو.

٤ ـ ماڵی بەڕێز حسن محمد بەگ.

٥ ـ ماڵی بەڕێز عوسمان عەلی احمد ولاّغلوو.

لەگەڵ ڕێزمدا

برای دڵسۆزت

عەتا محمد عبدالله

٢٠٠٥/٣/٢٤

# ۱۹۸۸/۵/۳

(۳/۵) ئێوارە کاتژمێری چوارو نیوی دوای نیوەڕۆ پۆلێك فڕۆکەی ڕژێمی دیکتاتۆر لەسەر لوتکەی خالْخالأنەوە هاتنە.ئەم دیوو چەند سەرێك بەدەوری گوندی گوپتەپەدا هاتن‌و شەتوکەو کیمیاویی بارانی خەڵکی بێتاوانی ئەم گوندە قارەمانەیان کرد. ئەوسا من بارەگاو ماڵەکەم بردبووە هەوارسوور لەشیوێکا، لەگەڵ ماڵی خزمانی شێخاندا چادرمان هەڵدابوو، چونکە تۆپی دووکان‌و سووسێ ژیانی هەراسان کردبووین لەگوندی شێخان. سێبەر بەسەرماندا هەڵکشابوو، مەترسی ئاسمانمان نەمابوو ناوە ناوە تۆپ دەهاتە دەورووپشتمان. ئەفسەرێکی راکردووی سەربازی خەڵکی گوندی عەسکەر بەناوی (وریا مەلا صالح) هات‌و شپرزەیی لەماینەکەی دابەزی‌و خۆی خستە سەر سۆندە ئاوەکەی بەر چادرەکانمان‌و خێرا خێرا سۆندەکەی بەسەر سەری دادەکرد. زۆر زوو دەرو دراوسێ‌و پێشمەرگەکان گومانی کیمیاوییان کرد، بەلأم وریا نەی دەدرکاندو بەچپە بەمنی وت: گۆپتەپەو عەسکەر کیمیاوی لێیداو خەڵك ئەوەی مرد مردو ئەوەی تری بەزامداری پەرتەوازەبوون‌و زۆریان بەرەو دێن. منیش خێرا دەستە پێشمەرگەکەی لەگەڵمدابوون ئامادەم کردن‌و دوو پێشمەرگەم لەبارەگا جێ هێشت‌و سەرو مەتارە ئاومان هەڵگرتبوو روو لەگوندی عەسکەر بەرێ کەوتین، رێگایەکی هەورازی ناخۆش‌و رووبەڕوو لەرۆژ کەلەهەندێ شوێندا رۆژ چاوشارکێی دەکرد. پێدەچوو شەرم دای گرتبێ لەو رۆژەی سەرەی ئەودا گیانی دەیان ژن‌و منداڵ بەژەهرو خاك تێکەڵاوبووە. وردە وردە پێشەنگی خەڵکی بەدەرکەوت هەبوو هەندێ نان لەکۆڵو گیسکێ، بەرخی گرنکی شتێکی لەپێشەوەبوو چاوەکانیان ئاوسابوو ئاو پێدا دەهاتە خوارێ، هەڵأو لەدەمیانەوە دەهاتە دەرێ، کاتێ داوای ئاویان لێدەکردین‌و مەتارەکەیان دەدانی بۆ ماڵ لێی نەدەسەندرایەوە هەمووی دەخواردەوە دەیکرد بەسەروچاویدا، ئاوەکانمان بەرگەی هیچی نەگرت، رێنوێنیمان کردن‌و روو لەهۆبەکەی خۆمان بەرێمان کردن، خۆشمان بەناو ئاپۆرەی زامدارو راکردوودا بەرەو گوندی عەسکەر سەرکەوتین. رۆژێکی ترسناکبوو کەس ئاوڕی لەکەس

نەدەدایەوە، پڕوپاگەندەی هەفتەی پێشوو خەڵکی و وەها لێکردبوو کێ ئازابێ و سەری دەرکات، ماڵ نرخی نەمابوو. ئێمەیش شتێکی وەك داوودەرمان و پزیشکمان لەگەڵ نبوو، هەبوو نەبوو عوسمان عەسکەری خۆی و جانتاکەی هەندێ ئەلەرمین و شتی پێ بوو ئەوەشی فریای کێ بکەوێ. خەڵکمان روو لەهۆبەی خۆمان بەرێکرد پێمان وابوو ناهێڵین دوژمن بگاتە چەمەکە، بەپێ ژمارەی هێزەکان لەدەشتی قەڵاسێوکەو شێخ بزێنی کەپێکهاتبوو لەهەندێ تیپ و کەرتی مەڵبەندی یەك و دوو + هەندێ هێزی پارتی و حیزبی شیوعی.

لەپشتی گوندی عەکسەر گەیشتینە هەندێ کادرو لێپرسراوی شۆڕش لەوانە:

١. عەبدولکەریم هەڵەدنی کادر، لەگەڵ دووپێشمەرگە کاك شادمان و کاك فوئاد.

٢ـ مەلا فەرمان کادر لەگەڵ شەهیدان قاسم و ئەحمەد جوتیار.

٣ـ کاك غەریب سەعید سەرتیپی (٢٣) سورداش لەگەڵ ستاری برازای و سەرپەرشتی خزمی و یادم نییە کێی تری لەگەڵ بووبێ.

٤ـ مامۆستا جەمال محمد سەرتیپی (٣١) ی سلێمانی لەگەڵ براو ئامۆزاو هەندێ پێشمەرگە، کاك عەبە رەق و مەمە سەعە دەوری١٥ تا ٢٠ پ.م دەبوون کەناوەکانم لەیاد نەماوە.

ویستم سەری لەناو گوند بدەم بزانم کێ ماوەو کێ شەهید بووە، کاك عەبدولکەریم هەڵەدنی و مامستا جەمال و کاك فەرمان و کاك غەریب پێیان وابوو جگە لەتەرمی شەهیدەکان کەسێکی تری لێنەماوەو هەواڵی شەهیدەکانم پرسی.؟ یەکەمیان نوری حاجی محەمەدی برازام بوو، دووانیان کوڕو منداڵی حاجی سەعید بوون، ئەوانی تریان نەوت. هەوڵمدا پەیوەندی بەکەرتی کاك ئەنوەر دۆڵانی و کاك عەدنان حمەی مینەوە بکەم لەدۆڵی ئاغجەلەر، جیهازەکان کاریان نەدەکردو پێدەچوو ئەنساتی دوژمن رایگرتبن.

هەوڵمدا دەنگم بگاتە رەهبەری سید برایم، ئەوانیشم بۆ وەرنەگیرا کەئەوان لەدۆڵی چنارتومابوون، هەرچۆنێك بوو گەڕاینەوە بۆ هەوارەکەی خۆمان و برادەران برسیان بوو وتم: لەماڵی ئێمەدا نان هەیە کاتێ سیروانی برازام سەری مەنجەڵی چێشتەکەی هەڵدایەوە بۆنی گازی کیمیاوی لێدەهات ئەوسا بۆمان دەرکەوت بەتۆپ ماڵی ئێمەش بۆردومان کراوە. نەمانوێرا نان بخۆین و سۆراغی ماڵی خۆمان و خەڵکەکەمان پرسی.؟ وتیان: چونەتە تەنگی ساچوغ ئێمەش هەموو روو

لەویٚ ڕۆیشتین، کاتیٚ چووین ماڵو منداڵێکی زۆر چووبوونە ئەشکەوتی حاجی، کەئەشکەوتێکە لەخوار چەمی قەلاّی جولندییەوەو لەبناری رازیکابە زۆر لەڕێگاکەوە بەرزو نالەبارە، منداڵ زریکەی دەهاتو هاوارو هەرایەکبوو لەئەرزو ئاسماندا کەس نەی دەبیست و چارەی نەبوو رەشی بوو، چاویان ئاوساو زوبان چاویان نەدەبینا، منداڵ پیسایی بەخۆیدا کردبوو، زۆربەی دووچاری سکچوون بووبوو، خۆراك کەم بوو خەو نەبوو. ترس تادەهات زیادی دەکرد. ئێمە نەمان دەتوانی لای ئەوان دەستەو ئەژنۆ دانیشین، هەموو ئەوانەی هەستمان بەلێپرسراوی دەکرد سەرمان پێکەوە ناو بڕیارماندا بەیانی هەر چۆنێکە بەرگری بکەینو هەر لەئێستایشەوە شوێنەکان بگرین. هێزەکانمان دابەشکردو لوتکەبەرزەکانی قەلاّچوغمانو سەری شیوی ترشانو پشتی ئەشکەوتی گامێشانو سەرلوتکەی زیخەلاّنمان گرتو نیازمان بوو کاتیٚ دوژمن هاتە سەر شوێنەکان شەڕی مانو مردن بکەین. بەخەڵکەکەشمان وت: ئێمە لەسەر شاخین ئێوە زۆر جموجووڵمەکەنو منداڵەکان کۆنترۆڵ بکەن تا سبەی ئێوارە بزانین چی ڕوودەدات. ڕۆژی ٥/٤ هێشتا کلاّو کوڕە بەتەواوی نەکەوتبووە جریوە جریو هەموو لای خۆمان وشیارکردەوەو هەرچی دووربینی پێبوو گرتی بەدەستەوەو ئەوە نەیبوو پشتی بەچاوەکانی بەستو دەگەڕاین بەهەر چوارلادا، شەو نزیکی ڕاکردن بوو ڕۆژی شوم خۆی هێنایە پێشەوەو وتی: نەمردنی من مەرگی ئێوەی تێدایە.

دەوەنو سەرباز، لوتکەو دەبابەو ناقیلەکە پەنا بەردو ناوکان، جاشو زۆڵە کورد ئەوەی چاوەڕوان نەدەکرا کردیانو هەرچواردەورمان ئابلۆقەدرابوو، بەهیچ شێوەیەك توانای تەقاندنی یەك دەمانچەی نەهێشتبوو، ئەمبەرو ئەوبەرو ئەمسەرو ئەوسەر وەکو شارە مێروله یەکی گرتبوو. لەسەری سردوە لەلوتکەی سێکانیانەوە لەپشتی زەرزیو سەری بیرانەوە، لەخورماحاجیو پشتی رەقەم یەکی چەمی رەزانەوە، سۆتکەو عەسکەرەوە، لەبەری کەلکەسماقەوەو لەئاغجەلەرو قەلاّسێوکە، لەشوانو شێخ بزێنییەوە، لەپانتایی دەشتی کۆیەوە، شەپۆلی دەدا. جووڵانو خۆدەرخستنی یەك لاو، یەك منداڵ مەرگی هەمووماني بەدواوەبوو.

جارێکی ترو پێش ئەوەی دەربکەوینو دوژمن بمان دۆزێتەوە هەموو کادرەکان کۆبوونەوە کەبریتی بوون لەعەبدولکەریم هەڵەدنی، مامۆستا جەمال محمد، غەریب سەعید، مەلا فەرمان، عەلی بچکۆلو شێخ فەرهاد... سەرنجێکی هێزەکانی دوژمنو

شـوێنی خۆمانـداو بڕیارمانـدا پـەنا پـەناو بـەدەوەن‌و گـەلاَ لەخۆبەسـتن بڕوینـە دەورووبەری ئەشـکەوتەکەی چەم‌و لـەوێ خۆمـان بشـارینەوەو دەرنەکـەوین تـاکو دوژمن دێتە سەرمان، ئەوسا ئـاخر پەلـە قاژەی مـەرگ بکـەین‌و دووسـێ پێشـمەرگە کەیەکیان عوسمان عەسکەری بوو ناردمان بەدووی ئەو چەند پێشمەرگەیەی لەگەڵ عەبـەرەق دابـوون. بـۆ ئـەوەی هـەموومان ئاگـاداری پاشەکشـە کـەین. هێـزی دوژمـن نزیکبووەوە دواتر زیاتر رۆشـن بووەوە کـەبڕیاری پاشەکشـەکەمان زۆر راستبووە، چونکە هیچ بواری بەرگری نەبوو لەشەڕی خۆتڕێن بەولاوە. لەخوار ئەشـکەوتەکەدا لـەناو قەمیشـەلاَن و بـن بـەرددا خۆمـان مەلاَسـدابوو، لـەپڕێکا شـپرزەیی پەیـدابوو وتـرا: لەوبەرمانـەوە جـاش روبـەرووومان دەبـن، چـەند پێشـمەرگەیەك رووبـەرووی خۆمان سازداو بەهێواشی فیشەکمان خستەبەروو ئامادەی دەرکەوتن بووین، رووح لەسەرکونە لوتمـان بـوو، تەقـەو مـەرگی بەکۆمـەڵی دەسـتی پێـدەکرد. چونکە وەکو لـەبیردابێ‌و لەسـەرەوە لوولـەی تفـەنگ‌و ئـارپیجی‌و بیکەیسـی رووی تێـدەکرد، لـەکاتی تەقینـەوەدا مامۆسـتا جـەمال هـاواری کـردو بەهێواشـی نەکـەی ئـەوە پێشـمەرگەی تیپـی(٣١)ی سـلێمانیەو لێمـان دابـڕاوە واهـات بـۆ لامـان. ئـای کەهـەواڵێکی دڵخۆشـەکەربوو هەناسـەمان هاتـەوە بـەرو درێژەمانـدا بەبێـدەنگی‌و خۆمەلاَسدان.

نزیکـی سـەعات چـواری ئێوارەبـوو تیشـکی خـۆر لەسـەر رازەکـان چریسـکەی چەکی سەربازو جاشی نیشان دەدا، بەهێواشـی لەگـەڵ مـەریوانی برازام‌و عوسمـان عەسـکەری وایـەری جیهـازە راکاڵەکـەمان بلاَوکـردەوەو خێـراو بەپەلـە مـەریوان‌و عوسمـان و جـەمال کەعـدد جهـازو سـەرەکی بـوو هەواڵیانـدا بەسـەرکردایەتی کـەماوین‌و لەحاڵـەتێکی خراپـدا ئـەژین‌و خێـرا کۆمـان کـردەوە لەترسـی ئەنسـاتی سەربازی. لەکاتی کۆکردنەوەی وایەرەدا بووین بەردێکی بچکۆلە هەبوو تەماشامان کـرد ئەحمـەد بڕنـەو کەلـەدایکبووی گونـدی عەسـکەر کیمیـاوی ئاوسـاندوویەتی‌و چاوەکانی کوێربووە، ئەجوڵێتەوەو دەستمان دایەو پرسیارمان لێکرد وتـی: مـاوم تکایە لێم بگەڕێن بالێرەبم. ئێمە چونکە لـەدەوری خۆمـان بوو دەسـتمان لێنەداو چوینەوە قامیشەلاَنەکەی خۆمان تا دنیا تاریکبوو، شەو من‌و شێخ فەرهادو سەعد عبدالرەحمان‌و حاجی سەمەدی حەمەپەری‌و کاك غەریب سەعیدچوینە ئەشکەوتی مـاڵ‌و منـداڵ پێمـان وتـن: ئێمـە تـوزێکی تـر سـەردەکەوین بـۆ چـەمی رەزان، ئەگـەر

لەگەڵمان دێن ئێرە بەجێدەهێڵین و ئەگەر نا ئێمە ئەوە جێبەجێدەکەین، ئەنجام وتیان ئێمە خەڵکمان ناردووە بۆلای شێخ محمودی سید گوڵ لەدەربەندو شەو دەڕۆین بۆ دەربەند ئێوە بۆ کوێ دەچن. ئەوسا ئێمە بڕیاماندا ژنەکانی خۆمان لەگەڵ خۆمان بەرین و بڕۆینە گەدەگڕوبێ، بەڵام کاک غەریب سەعید وتی گوڵناز وتویەتی من لەگەڵ خەڵکەکە ئەرۆم و دانابڕێم، بۆیە حاجی سەمەد ناهیدەی خێزانی و کچەکەی و دایکی، من رووناکی هاوسەرم و سەعدەو شێخ فەرهاد حەلاوە خان و منیرەخان هەرکەسە پەلی ژنی خۆی گرت و بەو گیارەشی بەهارەوە لەو چەمە سەختەدا بەرەو گردە گڕوێ و لەوێوە بۆ چەمی رەزان جوولاین، بەڵام رووناکی هاوسەرم چاوی کوێربووبوو، رەش رەشبوو، دەموچاوی هەناسەی کیمیای لێدەردەهات. بەکری برازام هەر دووچاوی کوێربووبوو ئەوەندە ئاوسابوو نەت دەوێرا سەیری بکەی هەرچۆنێك بوو پەلمان راکێشان و تاکو بن گوێزەکانی چەمی رەزان رۆیشتین لەوێ دامابووین بۆ یەکێك چاوساغی ئەو چەمەمان بکات، شارەزاترین کەسمان کاك غەریب سەعیدبوو چونکە جگە لەوەی لێپرسراوی تیپی (٢٣)ی سورداش بوو ماڵەکەی هەر لەزەرزی بوو. کاك غەریب چارەیەك.؟ وتی: من مەسئۆلیەتی کەس هەڵناگرم و بۆ خۆتان چی بەچاك ئەزانن بیکەن، ئەمەی وت و لێمان دابڕا لەجەزیرەیەك ئەرزی ئەحمەدا خۆی و دووسێ برادەری خزمی چوونە ئەوێ، ئێمە نەمان دەزانی چی بکەین، ناچار هێزەکەم گێڕایەوە بۆ گردەگڕوێ و چووینە ناو ورگی ئەو گرە ناشرینەوە، ئەوەی کەهەرگیز لەبیرم ناچێ سەگێکی زۆر ژیرو خۆشەویستم هەبوو لەکاتی ئاساییدا، شەوانی حەرەس لەکوێ بوایە ئەو لەدیوەکەی ترەوە حەرس بوو، بەپێشمەرگە نەدوەڕی و کاتێ جاشی دەبینی شێت دەبوو ئەیویست بیخوات. ئەوشەوە یەکێك لەخزمانی شێخان بەدارەوە بەستییەوە چونکە دەوەڕی و کاتێ سەگ بوەڕیایە دەۆزرایەنەوە، بۆیە نەمزانی (سەگەکە واتە قوشلانی هاوڕێم چی لێهات).

**چەپکێ ژان**

**کۆمەڵێ چیرۆك لەڕۆژگاری خەباتدا**

**پاکستان**

**١٩٩٦**

## مامۆستاو نەورۆزی گوندەکەمان

بۆ یەکەمجار لەناوچەی ئێمەدا مامۆستا ئیبراهیم خەڵکی گوندەکەمانی فێری ئەوەکرد ڕێز لە ( ٣/٢١ ) بگرین بەناوی نەورۆزەوە. شانۆگەری فێری لاوان کرد لە یادی سەرکەوتنی شۆڕشی (کاوەی ئاسنگەر) وەك شۆڕشی ڕەنجدەرو زۆر لێکراوی کورد. هەموو ساڵێك یەك دوو هەفتەی دەما بۆ نەورۆز، قوتابییەکانی دەستە دەستەدەکردو شانۆگەری •کاوەی ئاسنگەر) وسرودی نیشتمانی فێر دەکردن و ڕێکی دەخستن و لە ئێوارەی ( ٢٠/٢١- ٣ ) ی ئەو ساڵانەدا لەسەر بەرزترین لوتکەی دەوری گوندەکەمان دارو دڕی بەلاوان و قوتابیەکان کۆدەکردەوەو لەگەڵ ڕوو لە تاریکی ئێوارەدا ئاگری دەکردەوەو سرودی ( ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە) ی پێ دەوتین و پاشان ڕیزێ چەپڵەی پێ لێدەداین و بەرەو ماڵ پێشمان دەکەوت. نەورۆز واتە ڕۆژی (٣/٢١) هەمووی ئاگادار دەکردنەوە کەلە شوێنێکی دیاریکراودا کۆببنەوە، بۆ ئاهەنگی نەورۆزو هەرکەسێ خواردنی ژەمی نیوەڕۆش لەگەڵ خۆی بهێنێت.

ڕۆژی ٢١/ ٣ ئەبوو بەڕۆژی خۆشی و فێر بوون و نواندن، شەوق و جۆش و خرۆشی مامۆستا ئیبراهیم دەوری زۆری هەبوو لەوەی لەو ڕۆژەدا شتی نوێ فێرببین، لەبابەتی هەژاری و چەوسانەوەمان. دایکی مامۆستاش تاکە ژن بوو کەلە دەوری ئاهەنگەکەمان دادەنیشت و زۆر بە گرنگییەوە ئەیڕوانی بۆ بەرهەمی کوڕەکەی و لاوانی گوندەکەمان. دیمەنێکی زۆر جوانی هەبوو، بەو تەمەنە زۆرەی هەی بوو سەرو کلاوێکی پڕ لە تاسکلاوی لەسەرا بوو، لەسەرەوە سەرپۆشێکی سپی و جوتێ سرکەیی تێك ئالاندبوو. لەپێشی سەرییەوە ڕیزی تاکەی سەری بەدەورەوە شۆڕ ببۆوە، کەوایەکی ژنە کاملەکانی لەبەرابوو، زۆر خانمانە دۆشەکەڵەیەکی دوو نەفەری بۆ خۆی و کورەکەی راخستبوو، قۆرییەکی شوشەی لەسەربوو، تێر نەدەبووی لەسەیرکردنی، ببوو بەدایکی خەڵکی گوندەکەمان بەگشتی و دایکی قوتابییەکان بەتایبەتی.

ئەو جارانەی باران لێی تێك نەداینایە پێمان ڕێگای دانەدەگرت بگەڕێینەوە،

هـــەموو بـــەدەوری ســـروودو قســـەی خۆشـــی مامۆســـتاو قوتابییەکانییـــەوە ڕۆیشتنەوەمان بۆماڵەوە لە یاد دەچوو.

ساڵی ( ١٩٥٨) بوو تازە ڕژێمی پاشایی ڕوخا بوو، ڕژێمی کۆماری هاتبووە پێشەوە، ئەو سەردەمە هێشتا (عبد الكريم قاسم) بای نەدابۆوەو نەکەوتبووە وێزەی نیشتمان پەروەران، ڕۆژێکی وەها هاتبووە پێشەوە لە لادێکاندا جوتیاران تۆزێ ڕاچڵەکیبوون. شێوەیکی نوێی بەرەلایی بەناوی ئازادی هاتبووەکایەوە، جوتیاران سامیان شکابوو، کەمتر ئەترسان و لەسەر بەرژەوەندی خۆیان و لابردنی بێگار و زەویانە دامەزراندنی یەکێتییەك بۆ خۆیان ئەدوان. مامۆستاکەمان لەم کاتەشـدا دەوری خـۆی گێـرا، کۆبوونـەوەکانی زۆرترکـرد، داوای لـەجوتیاران کـەبخوێنن، بـێ خوێنـدن نـاتوانن شـتی چاك بـۆ دوا ڕۆژی خۆیـان ئـەنجام بـدەن. چونکە زۆرجار دەست نیشانی ئەوەی ئەکرد کە هێشتا ئێوە نامەتان بۆ دێت منداڵەکانتان توانایان نییە بۆتان بخوێننەوەو دەی هێنن بۆ لای من یان دەی بەن بۆلای مامۆستای مزگەوت یان دەگەڕێن بەدوای ئەو چەند کوڵکە خوێنەوارەی گوندەکە. جا گەلێك ڕادەی خوێندەوای ئەوەندە لەخوارەوە بێت من پێم وانییە بتوانێت برینەکانی خۆی پێ سارێژ بکرێت.

هەڵوێستی خۆی نیشان دەداو ئەیوت: " من ئامادەم شەوان وانە بڵێمەوە، ئەگەر بەڵێنی ئەوەم پێ دەدەن کە بۆ خوێندن ئەتوانن شەوان پاش نان خواردن لە کاتژمێری دیاری کراودا بێن.؟ منیش خۆم ئامادە دەکەم و چەند پۆل بۆ وانەکان ڕێك دەخەم و بەڵێنی ئەوە دەدەم کە بەچەند مانگێك سەرەتای خوێندنتان فێربکەم بەمەرجێك خۆتان بتانەوێت. " باسی ڕازی تەنهایی بۆکردین، کەچەند گرنگە هەموو مرۆڤێك ڕازی تەنهایی خۆی لای خۆی بێت چاکە، کەسێك نەخوێنێت ئەو مەرجە لە دەست دەدات و نهێنی دەکەوێتە بەر دەستی خەڵکی تر. کەدوور نییە دەست دوژمنەکانی بکەوێتەوەو ببێتە هۆی زیان لێکەوتنی. وشەی دڵسۆزی مامۆستاکەمان سەرنجی زۆرمانی ڕاکێشا، سەرەتا زیاتر لە ( ١٠٠ ) جوتیار چوونەپۆلەکانی فێر بوونی خوێندەواری شەوان.

چەند شەوێك مامۆستا زۆر خۆشحاڵ بوو، ئەگەر چی زۆر ماندوو دەبوو، بەلام شەوان لەبەر ماندوو بوون و تێنەگەیشتن ئەبینرا لەسەر کورسییەکان خەڵك پرخەی خەوی دێت. وای لێهات شەو لەشەو کەمتر دەبووینەوە، ئەنجام ( ١٠ تا ١٥

) لاوێك ماینەوە، کەزۆر تامەزرۆ بووین بۆ فێربوونی خوێندن من ئەوکاتە نەم دەتوانی ناوی خۆم بنووسم زۆریشم پێ خۆش بوو خوێندەواربم تا بتوانم نامە بەدەستی خۆم بنووسم و بخوێنمەوە. هەر بۆیە هەموو ئێوارەیەك پاش نان خواردن زۆر بە پەلە ئەڕۆیشتم بۆ قوتابخانە. دەوری دوو مانگێك قوتابخانەکەمان دەوامی بوو، بەلاّم پاشان ژمارەمان ئەوەندە کەم ببوّوە ئەوەی نەدەهێنا مامۆستاش وەختی خۆی پێوە بگرێ، بۆیە زۆر بەدڵسۆزی و سەر ڕاستانەوە پێی وتین: " داوای لێبوردن دەکەم من ناتوانم وەختی خۆم بۆ ئەو ژمارە کەمە تەرخان بکەم، ببورن لەمەولا خۆتان لابەلا هەوڵی فێر بوون بدەن " لەپاڵ کۆششی دڵسۆزانەی مامۆستاو بەهاوکاری برای گەورەم کاکە عبدالرحمن توانیم فێری لێکدانی وشەو حنجەکردنی ببم و سەرەتایەکم دەست بکەوێ بۆ ئەوەی لە ناوی خۆم و باو و باپیرمەوە بۆ ناوی دارو درەخت و گوڵ و گوڵزارو بونەوەری سەر زەوی دەست پێبکەم و فێری نووسینو خوێندن ببم.

نای شارمەوە بابەت سەیرو سەمەرەکانی ئەو سەردەمەی دێکەشمان هۆی چاکبوون بۆ فێربوونی خوێندنەوەو نوسینم، لاوێکی زۆری گوندەکەمان کەهاوتەمەنی خۆم بوون لەسەربازی بوون لەخوارووی عێراق، نامەو نامەکاری زۆر ببوو بەسەرەتایەکی چاك بۆ نووسین، نامەم زۆر بۆ دەنووسیتن کەبەپشوو دەهاتنەوە، دەچووم هەواڵی نامەکانم دەپرسی، دەیان وت: "گەیشتووە بەلاّم تکایە بەیەکێکی خەت خۆش بۆمان بنووسە، چونکە خوێندەوارەکانی لامان بۆیان ناخوێندرێتەوە" زۆرم پێخۆش دەبوو بەگەیشتنیان، بەلاّم گوێم بەپێشنیارەکەیان نەدەداو هەر بەردەوام دەبووم. جار دوایجار چاکتر دەبوومو هەموو نامەیەك پاش ئەوە دەمبرد بۆ کاکەم، ئەویش هەڵەکانی بۆ ڕاستدەکردمەوە. لەو سەردەمەدا کۆلکە خوێندەوارەکانمان بەتایبەت فەقێی مزگەوتەکان شەوان لەماڵاندا کتێبەکانی (ئەمیر ئەرسەلان)و (لەیلاو مەجنون)و (خورشیدو خاوەر)و (معراج نامە)و (قەلاّی خەیبەر)و (ڕۆستەمو زۆراب) بەدەنگی بەرز دەخوێندرایەوەو خەڵکێکی زۆری دەرو دراوسێ دەوریان لێدەداو بەدەوریدا دەهاتنو شەوگاریان بەشەوچەرەی خۆشەوە بەسەر دەبرد.

منیش هەوڵێکی زۆرم ئەدا فێربم ئەو کتێبانە بخوێنمەوە، بۆیە زۆر شەو تا بەیانی لەماڵی خۆمان بەدەنگی بەرز بۆخۆم ئەم خوێندەوە، کەکارێکی زۆری کردە

سەر بەهێزکردنی خوێندنەوەم. ساڵ و تەمەن هەڵکشان، شۆڕشی رزگاری نیشتمانی خەڵکی کوردستان دەستی پێکرد، نامەوێ لەسەر ئەوە بدوێم دامەزرا... سەپێندرا... ئەنجام چیبوو، بەڵام ئەمەوێ لەسەر ئەوە بدوێم تا ئەوە روویدا من نەم توانی ببمە هاوڕێی پیاوێکی رامیاری لەگوندەکەی خۆماندا، ئەگەرچی هەستمدەکرد کەکەسانێك هەبوون بە (پارتی کۆمۆنیستی عێراق) یان (پارتی دیموکراتی کوردستان) بوون، ئەو سەردەمە هەردوو پارتی بەئاشکرا لەناو خەڵکدا کاریاندەکردو راکێش راکێشیان بوو بۆ کۆکردنەوەی ژمارەی زۆری خەڵك بەلای خۆیاندا.

پارتییەکان گۆڤاری گەلاوێژ رۆژی نوێ و گزنگ و هەتاویان دەخوێندەوەو لەگوندەکەمان ئەم بینی بەدەستی هەندێکیانەوە، زۆرم هەوڵدەدا نەیان دەدامێ، بۆ خۆم لەسەرخۆ بیان خوێنمەوە، خوێندەوارییەکەیشم وەها نەبوو بەیەك دوو سەعات تەواویان بکەم، هەر خولیای تێکەڵاوبوونی کەسە رامیارییەکان بووم.

# دەست پێکردنی شەڕ لەدەربەندەکانی کوردستان

جموجوڵێکی ئاشکرا دەستیپێکرد، لەلادێکاندا زیاتر خاوەن زەوییە گەورەکان لەگەڵ هەندێ لەکادرەکانی پارتی پێی هەڵدەستان، داوایان دەکرد لەهەر ماڵێکدا نەفەرێك خۆی ئامادە بکات بۆ چوونە سەنگەرو بەرگری، بەتایبەت ئەوانەی چەکیان هەبوو هەر ئەبوو بەشداری تێدا بکەن. ئێمەیش سێ برا بووین، دووانمان چەکمان لابوو، چونکە عبدلرەحمانی برام پیاوێکی وشیارو بەپەرۆشی جوتیاران بوو، لەسەر هەندێ بەرگری لەبەرژەوەندی جوتیاران و دژی بێگارو هەقە زەوییانەو هەندێ گروگێچەڵی نێوان جوتیارو خاوەن زەوی، هەندێ کێشەمان بۆ دروستببوو. نۆکەرەکانی خاوەن زەوییەکەمان لەفرسەت دەگەڕان بۆ ئەوەی دەستی لێبوەشێنن، هەر بۆیە ئێمەیش تفەنگێکی قەسەلیمان کڕی و تفەنگێکی سێ تیری کۆڵەشمان بەئامانەت هێنایە لای خۆمان. بۆ پارێزگاری بەچەند فیشەکێکی داگیراوەوە، بەناو دوو چەکداربووین ئەبوو لانی کەمی یەکێك لەئێمە بەشداری تێدا بکردایە، بڕیاری گشتی ئەوەبوو عبدالرەحمانی برام بڕوات، چەند رۆژێك لەدەربەندی بازیان بوو، بەنۆرە خەڵك دەگۆڕدرا، منیش سەڵت بووم بەباشم زانی کاکم بگۆڕم.

ئێوارەی (١٩٦١/٩/١٠) چوومە دەربەندی بازیان، دیمەنێکی نوێی سەیرم دەبینی کەتا ئەوسا نەم بینیبوو، خەڵکێکی زۆر چەکدار لەکوێخاو ئاغاو دزو شەڕکەرو ناودارو بێناو بەیەکەوە لەلوتکەو لاپاڵەکانی ئەمبەرو بەری دەربەندی بازیان دامەزرا بوون، بۆنی ئازادی لێدەهات کۆبونەوە دەکرا، دژی دەوڵەت قسەدەکرا، قەمەرەیەکی رەشی کیسەڵی بچکۆلە جرتوفرتی بوو لەنێوانی سلێمانی ـ دەربەند ـ چەمچەماڵ . تەکێدا سەیارەی گەورە گەورە رادەگیراو بەپرس و رای دەستەی پشکنین رێگای ئەدرا. کاکم بەڕێکردو چوومە سەنگەرەکەیەوە، ئێوارە درەنگ داهات، جموجوڵ کەم بۆوە، یەك لۆری گەورە پڕ لەتەماتە لەسەر جادەی ناو تەنگەبەری دەربەنددا لەسەر پانی رێگاکەیان پێگرت، بەنیازی ئەوەی ئەگەر دوژمن هێرشی هێنا نەتوانێ بەئاسانی لەوێوە تێپەڕێ، نانێکی زۆر لەگەڵ شووتی و تەماتەش لەبارەگای سەرپەرشتی داندرابوو، دەستکرا بەدابەشکردن بەسەر گروپەکاندا، زۆر لام خۆشبوو یەکەمجاربوو لەسەر لوتکەی شاخ و

بەچەکەوە ئاوا بێترس و بەکۆمەڵ و برایانە خواردن دابەش بکرێ و بخورێ، چێژی زۆرم لێوەرگرت. منداڵترین چەکداری گرووپەکەی خۆمان بووم، شەو بەردەستی ئاوهێنان و چاگێڕانم دەکرد، هەندێ لەوانەی کارامە بوون پێشووتر کاری چەتەیی یان پیاو کوژیان کردبوو زۆر دەنگیان نێربوو، ئەوەی دەیان وت ئەبوو هەموو بۆیان بسەلمێنن، چونکە ئەوان دنیا دیدە بوون و بەنیازبوون ئەگەر شەڕ دەستی پێکرد ئەوان دەبابەو ناقیلەکان بشکێنن و لەشکاندنی دوژمندا پێش ئێمە. بەهۆی بەورەی ئەوانەوە، ئێمەیش گڤبوینەوەو هیچ حسابمان بۆ شێوەی نوێی چەك و شێوەی نیزامی بوونی سوپای دوژمن و دەست رۆیشتوویی دوژمن نەدەکرد. هەبوو پێی وابوو، دەستنوێژی خۆی و گونی ئەسپەکەی بەیەکەوە لەئاوی بەغدادا دەشۆرێ، پاش رامالینێکی بەپەلەی دوژمن، لای ئێمەیش وابوو ئەم پیاوە کارامانەی لای خۆمان راست دەکەن و دوژمن نابێ حسابی بۆ بکرێ و لێی بترسێین و شکانیشی شتێکی حەتمییەو جێگای مشت و مڕ نییە.

هەر چۆنێك بوو شەوی ١٢/١١ـ ٩ مان بەڕێکرد، بەیانی زوو ئێشك چییەکان ئەوانەیان هەڵساند کەنوێژیان دەکرد دڵخۆشی دنیا دیدەکانمان یەك گرمە گرمی دروستکردبوو، هەموومان راست بووینەوە، چونکە ئێوارەش سەرنشینیانی ناو سەیارە کیسەڵییەکە خەبەریان دابوو کەسبەی لەسەدا سەد هێرش دەکرێتە سەر کوردستان، بەتایبەت دەربەندەکان. هەموو گۆرەوییەکانمان لێهەڵکێشابوو، مەتارە ئاومان سازو ئامادەبوو، بەڵام فیشەکدانەکانمان زۆر کەم فیشەکی تێدابوو، زۆر تفەنگمان هی تەقە کردنیش نەبوو. رۆژ رۆشنی دابوو بەئاسۆگە، هێشتا بەردە قارەمانی شێخ مەحمودی نەمری خەبەر نەکردبۆوە، چەند فڕۆکەیەکی مێکی ٢١ هاتن لەڕێگاوە دەربەندی رشاند، لەپێش هەموویەوە لۆرییە راگیراوەکەی پێکاو تەماتەی کرد بەدۆشاوو لەدەست و پێی جادەی دەربەندی گرت. سام دای گرتین، هەندێك لەدنیا دیدەکانمان سلاواتیان لێدا، بەلام لەگەڵ گەڕانەوەی سەری دووهەمی فڕۆکەکان سلاوات لێدان کپبوو، خەڵکی جموجوڵی نەما، کەس نەی دەوێرا سەر هەڵبرێ، تۆپی دوکەڵ رووبەرووی ئەمبەرو ئەوبەری لوتەکانی دەربەند دەستی پێکرد. دەبابەکانیش هاتنە تەکێی کاکەمەندو ئەوانیش نەڕەنەڕیان دەست پێکرد، زۆرمان شتی وەهامان نەبینبوو، ترس لێمان میوانبوو، هەندێ پیاوی دنیا دیدەو کارامە داندرابوون لەنێوان چەمچەماڵ و دەربەند لەشێوە سوردا خۆیان

لەبۆسە بنێنو لەپێشەنگی هێزی دوژمن بدەن، بۆ ئەوەی نەتوانێ بەئاسانی بگاتە سەر دەربەند. بەڵام زۆر بەداخەوە بەگرمەگرمو دەستڕێژی کوێرانەی دوژمن ڕوو لەشیوو دۆڵەکان بەشی زۆری خەڵکەکەی ناو بۆسەکە هەڵهاتنو سێ پیاوی دنیا دیدەی بەناو بانگ کەپێیان شەرم دەبێ هەستن لەسەر جادەکە دەگیرێنو شەهید دەبن، لەوانە کاکە حەمەی تەلانیو مەحمودی حاجی شەریفی سردیو یەکێکی کیتر کەبەداخەوە ناوەکەیم لەیاد نەماوە. بەشکانی بۆسەکەمان دوژمن دڵخۆشبوو سەربازەکانی باشتر دەهاتنە پێشەوە، ئەو ڕۆژە هەتا شەو هەرچۆنێ بوو هێزی دوژمن لەئەمبەر ئەوبەری جادەو لەگوندی تەکیی کاکەمەندەوە تاکە تاکەو دوو دوو پێشمەرگەیش چ لەترساو چ لەئازایەتی بەم بەروبەری لوتکەکانی دەربەندەوە مانەوە، بەڵام ژمارەیەکی بێحساب لەو خەڵکە هەڵهاتن بەبێ ئەوەی گوێ بۆ کەس بگرن. لەژمارەی(١٥٠٠) پێشمەرگە ئەتوانم بڵێم پەنجا پێشمەرگەی لەترسی حەیا مابوونەوە. ئێوارە دنیا درەنگبوو، یەك یەكو دوو دوو بەکۆمەڵ پاشەکشەمانکرد، بێ حیساب کێ بۆ کوێ دەچێو چیدەکات خۆی بەرپرسیاربوو، هەندێ لەوانەش سەر بەرێکخستنی پارتی بوون شوێنی پاشەکشەیان دانابوو بگەڕێنەوە دەوروبەری عەودەڵانو چەمی ڕەزان، بۆ خۆ ئامادەکردنێکی نوێ بۆ دەست پێکردنی شۆڕش.

ڕۆژی شەڕ من لەدیوی تەکیەوە دانرابووم، تانەبوو بەشەو نەمتوانی سەرکەومەوە بۆ دیوی بەردە قارەمان، تۆپە دوکەڵەکان زۆر لەنزیکم دەکەوتنەوە، لوولەی دۆشکەو دەبابەو ناقیلەکان لەو تەق تەقە شاخەی ڕووی ئێمەی دەدا، تەنها یەك فیشەك چییە نەدەگەیشتە هیزی دوژمن. حاجی صاڵح شۆریجەیی تفەنگێکی بڕنەوی درێژی پێ بوو، لەچەند دەقیقەیەکدا فیشەکێکی دەگرتە دەبابەکانو پاشان ورەی دەدایە بەر منو بەڵێنیدامێ کەشەڕم لەسەر دەکاو تا ئێوارە بەجێم ناهێڵێ، بەڵێ بەڵێنی خۆی بردەسەرو ئێوارە منی دەربازکردو بەیەکەوە بەرەو گوندی بلوکێن دووقۆڵی هاتین زۆر ماندوببووین. دوکەڵی تۆپە دووخانەکان هیلاکی کردبووین، من تفەنگێکی قۆناغ خڕی پیاوێکی ترم لابوو کەئێوارە بەئیجازە چووبووە سەردانی برای لەچەمچەماڵ. دوو تفەنگو پاڵتۆیەکی سەربازی کەلەهی خۆم قورستربوو، کتریو کووپو نانێکی زۆریشم لەپشتم بەستبوو، لەگەڵ مەتارەیەك ئاو هەمووم بەکێشکردو تاریكو ڕوونی بەیانی بەپشتی ئاغجەلەردا

تێپەڕین و نانی بەیانیمان گەیاندە گوندی دالاواسەروو. کاتێ چوینە گوندەکە، خەڵکەکەی شڵەژابوون، زۆر مەترسییان لەوە هەبوو دوژمن هێرشیان بۆ بەرێ، خەڵکی خۆی قایم دەکرد، چاڵیان هەڵکەندبوو کەل و پەل و گەنم و دانەوێڵەیان تێدا قایم دەکرد و خۆیان بۆ کۆچکردن ئامادە دەکرد. پاش ئەوەی نانمان خوارد وردە وردە بەرەو دەشتی (نارنج کوژراو) بەڕێکەوتین، چونکە ئەوساڵە خەڵکی گوندی ئێمە لەوێ توتنیان کردبوو، ماڵی حاجی ساڵحیش رووبەڕووی ئەو ناوەبوو لەشۆڕیجە. هەر چۆنێك بوو ئەو رۆژە بۆ عەسرەکەی لەوێوە چوومەوە بۆ گوندی خۆمان، کاتێ لەخوار گوندەکەوە هەندێ خەڵکم بینی لایان سەیربوو کەمنیان بینی وتیان: "دوێنێ شەو خەڵك گەیشتونەتەوە ئێرەو باسی ئەوەیان کردووە کەتۆ شەهیدبووی، لەبەیانییەوە براکانت دەیانەوێ مشووری دانانی پرسەت بخۆن، بەڵام هەرچییان دەکرد بۆیان هەڵنەدەسوڕ". چەند مانگێ تێپەڕی، میری هەندێ هەڕەشەو گوڕەشەی کردو هەندێ خەڵکی لەشارو لادێ گرت، پارتی کەوتە مشور خواردنی پەیداکردنی چەك و کەرەسەی جەنگ و بەشێوەی نهێنی کەوتە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی دەست پێکردنی شۆڕش، دژی رژێم. شەو دادەهات دوو دوو پارتییەکان دەچوونە گوندەکان بۆ کۆکردنەوەی نان و پەیداکردنی دۆست بۆ خۆیان، دۆزینەوەی چەك و تەقەمەنی لەناو خەڵکداو، رۆژیش خۆیان دەخستەوە ناو بێشەکانی چەمی رێزان.

ئێمە زۆر بێدەرامەت بووین بۆ بژێووی، جار جارە ئەچووم بارێك دارم ئەهێناو ئەمفرۆشت بە (٢٥٠) فلس زۆربەی جارەکانیش ڕوومدەکردە چەمی رەزان، چونکە لەوێ داری وشك و چاکم دەست دەکەوت لەچوونم بۆ دارهێنان چەند جارێك پێشمەرگەم ئەبینی، نانی زیادم لەگەڵ خۆم دەبرد ئەمدانێ، ببووین بەبرادەر، زۆرجار رایان دەسپاردم لەدووکان بەپارەی خۆیان شتیشیان بۆ بکڕم، بەڵام بەمەرجێ نەهێڵم کەس جێگاو رێگایان پێ بزانێت. زۆرم پێخۆشبوو ببووم بەئاشنایان منیش لەلای هەندێ برادەری خۆم باسم دەکردن وامدەکرد پێشمەرگەیان خۆش بوێت. ئەگەرچی ئەو دڵسۆزیو پەرۆشییەی من بۆ پێشمەرگەکان بەخراپ گەڕایەوەو بوو بەهۆی ئەوەی هەواڵ بگاتە دوژمن و ئاگادار کرامەوە کەئەگەر بەئاغجەلەردا بڕۆم دەگیرێم بەتاوانی هاوکاری کردنم لەگەڵ پێشمەرگەدا، منیش ئەمەم بەهەلێکی چاکزانی و رۆژی (١٩٦٢/٢/٣) چووم بۆ

ئەشکەوتی دوو کون لەچەمی رەزان، ئەو سەردەمە گەورەترین بنکەی پێشمەرگە بوو دە(١٠) پێشمەرگەی تێدا دەبوو، داوام لێکردن بەپێشمەرگە وەرم بگرن، زۆریان رێز لێگرتم بەلاّم وتیان: " بەداخەوە تەمەنت رێگا نادات ئێستا تۆ وەربگرین، چونکە پێشمەرگایەتی کارێکی زۆر دژوارەو خەڵکی بەتوانای دەوێ‌و ئەرکێکی زۆر مەزنە بەهەموو کەس جێبەجێ ناکرێ". هەرچی من وتم ئەوان پەسەندیان نەکردو وەلاّمیان هەبوو لەکۆتاییدا وتم: "لێرە ناڕۆمەوە تەنها بەردەستیتان دەکەم‌و چا لێدەنێم‌و نان دەبرژێنم‌و چی دەڵێن لەبەردەستاندا دەیکەم، بەلاّم ناوم بنووسن بەپێشمەرگە. چی ئەوان هەوڵیان لەگەڵدام من نەگەڕامەوە بەرەو ماڵ. ناچار بڕیاریاندا لەبنکە دام بنێن بۆ ئیش‌و کاری بارەگاو بەوە دڵیان ئەدامەوە کەپێشمەرگە تەنها بەو کەسانە ناوترێ کەدەچنە سەنگەرەوەو شەڕدەکەن بەڵکو ئەوەی پیازیش پاکدەکا لەگەڵ ئەوەی نامە دەهێنێ‌و دەبا هەر پێی دەوترێ پێشمەرگەو هەموو ماف‌و ئەرکێکی پێ دەدرێ". لەو سەردەمەدا هەندێ رۆژژمێری کوردی کەوتبووە بازاڕەوەو لای پێشمەرگە دەست دەکەوت، منیش دانەیەکم پەیداکردو رۆژانە رووداوەکانم تێدا تۆمار دەکرد، ئەوەبوو بەهۆی ئەوەی خوێندەوارییەکەم بەردەوام کار پێبکەم ئەگەرچی هێشتا هەموو کەس نەیدەتوانی نوسراوەکانم بەدروستی بخوێنێتەوە، بەلاّم خۆم بەچاکی تێی دەگەیشتم‌و سەفەرو هەڵسوکەوتی خۆشم تێدا تۆمار دەکرد.

# یەکەم شەڕی ناوچەی (قەلاسێوکە)

تازە بنکەی چەمی ڕەزان خەریکبوو ئاشکرادەبوو لەلایەن ڕژێمەوە، بەڵام هێشتا هیچ جۆرە هێرشێکی زەمینیو ئاسمانی نەکرابووە سەر، چونکە دوژمن لەناوەوەی هێزەکەمانی نەدەزانی. چەند جارێك خەڵکی دەنارد بۆ سیخوڕی بەبیانووی ئەوەی دەبێ بە (پ . م) بەڵام بەهۆی ڕێکخستنەوە زوو ئاشکرا دەبوو، نەدەگەیشتنەوە لای دوژمن، ئێوارەیەك هێشتا باران تەواو نەبووبوو واتە باران بڕان نەبووبوو، گیاڕەشی بەهاری چەمی ڕەزان لەشەواندا تاریکییەکی بێوێنەی دروستدەکرد، ئەو ڕۆژە باڵێك دووانی مابوو خۆر ئاوابێ هێزێکی سەدو پەنجا (پ . م)ی خۆیانکرد بەچەمداو دیمەنێك دڵخۆشکەرانەی هەبوو زۆر بەشەوقو زەوق بوون. پێدەچوو سەبازەکەی ڕوو لەلوتکەی ژمارەیەك سەرکەوتبن، دیاربوو نیازیان شەڕبو، شەڕیش لەوناوە تەنها ناحیەی ئاغجەلەر هەبوو، بشێ پەلامار بدرێ. دەمانزانی، بەڵام کەسێك نەبوو بڵێ وایە. هەرچی چەکی هەبوو ئەوەی نەشی بوو خۆی سازدابوو، منو هاوڕێیەکی هاوتەمەنی خۆم مەترسی ئەوەمان هەبوو نەمان بەن، ئاخری یەکێك لەبەرپرسیاران بەئاشکرا پێی وتین: "ئێمە دەچین بۆ شەڕ، ئێوەیش هێشتا ناشێن بۆ ئەو شەڕە، دەبێ لێرە بمێننەوە خواردنو شت بۆ ئێمە ساز بکەن، بۆ کاتی گەڕانەوە" لامان خەبەرێکی ناخۆشبوو، پێی ڕازی نەبووین، چونکە پەروەردەی ئەوسا ئەوەهابوو هەر کەسێ شەهید بکرێ بنکەیەکی بەناوەوە ناودەنرێ. بۆیە زۆر کەس حەزی لەشەهید بوون دەکرد، ئێمە لەو گەنجە خوێن گرمانە بووین خەومان دەبینی بەوەی شەهید بکرێینو بنکەیەکمان بەناوە بنێن. هەوڵی زۆرماندا ڕێگەیان نەداین وتمان: گوللەی قازیفەتان بۆ هەڵدەگرین، مەتارەی ئاو، کوڵەنان، وتیان: بەهیچ شێوەیەك ڕێگاتان نادەین چونکە بنکەش خەڵکی دەوێو نابێ چۆڵ بێ، لەناچاریدا منو هاوڕێکەم دەستمانکرد بەگریان، زۆر گریاین بەدوایاندا ڕۆیشتنو لەکاتی دەست پێکردنی شەڕدا خۆمان لێ ئاشکراکردنو بەشداریمان کرد بەگوێزانەوەی فیشەكو تەقەمەنی.

یەکەم شەڕبوو، شتێکی زۆر خۆشبوو کەپێشمەرگەکان گەڕانەوەو باسی چوونە سەر دائیرەی پۆلیسو خانووی مدیر ناحیەو شتەکانیان دەگێڕایەوە، تامو چێژێکی هەبوو بەوە دەچوو بەرهەمە بەتامو چێژەکانی (مەکسیم گورگی یان عەزیز نەسین)مان بۆ بگێڕنەوەو خۆشمان پاڵەوانی چیرۆکەکەی بووبین.

## من و ئێشکگرتنی بێ چەك

لەبنکەدا هەرچی کاری بەردەستییە پێیان دەکردم هەر لەنان برژاندنەوە تا چا لێنان و تێکردنیشی، هەندێکجار ولاخ لەوەڕاندن و باراش بردن بۆ ئاش لەنێوانی چەند گوندێکدا. هەر لام خۆشبوو چونکە پێشمەرگایەتیم بەکارێکی یەکجار پیرۆز دەزانی، شەوانی چەم زۆر ترسناك بوو، لەسەعات پێنجی ئێوارەوە شەو لەوێ دادەهات ئەم بەرو ئەوبەر سەوزو رەش تێکەڵاو، لەچرپ و هاژەی ئاو، ویزەی داڵ و دەنگی چەقەڵ و درندەی تری کێوی. لەهەموویشی ناخۆشتر هەندێکجار بێچەك زۆر لەوە دەترسام جارێك بەندێك لەبەردەستم هەڵێ و بەرپرسیارێتی لەئەستۆی من بێت. بۆیە پێم بەجەرگما ناو داوای چەکم کرد، چەك زۆر رێزی هەبوو، کەس دڵی نەدەهات چەکەکەی خۆی لەخۆی دورخاتەوە، بۆیە چەك پێدان ئاسان نەبوو، بەلأم هەرچۆنێکبوو قەسەلییەکی خراپ هەبوو بۆ دڵنەوایی من ئەیاندا پێم، ئای کەدڵم پێی خۆشبوو تا سەعاتەکەم تەواودەبوو هەر ئەمڕوانی، خۆ بەتایبەت ئەگەر رۆژ بوایە ئەوە دەستێکم هەر لەسەریبوو. لەڕۆژژمێرەکەمدا یەکەم ئێشك گرتنم بەچەکەوە تێدا تۆمارکردبوو، لەپاڵ ئەو هەموو وردە ئیشەی پێیان دەکردم لەسەعات چەندو بۆ کوێ و بۆ چی و کەی دەگەڕامەوە. بەلأم بەچەند جارێ سووتاو خرایە ئاوەوەو لەناوچوو.؟

## من و ژماره گۆڕینەوەم لە( پ ـ م )دا

زۆریان هێشتمەوە لەبنکەی چەمی ڕەزان، ماوەیەکیش کردمیان بەتەتەری بەینی چەم و بێتواتە هەر بێچەك، ماوەیەکیش دانرام لەمیوانخانەی چەم، پاشان زۆر بێتاقەت بووم و گەیشتە تینم، داوام کرد بمگوازنەوە بۆ ناوکەرت و مەفرەزە گەڕۆکەکان. ڕێگایان نەدەدام، باشبوو برادەرێك لەمەفرەزەکان لەگەڕان بێتاقەت ببوو بەیەکەوە ژمارەمان گۆڕییەوە ئەو بۆ ئیدارەو منیش بۆ کەرتی ئەو، بۆ جەولەو گوند بەگوند گەڕان و هەندێکجار شەڕو شۆڕ زیاتر نووسینی ڕۆژژمێرەکەمی بەهێزترکرد. شان بەشان خوێندنەوەی بڵاوکراوەکانی شۆڕش و نووسینی ئێشکی شەوانی کەرت و مەفرەزەکان، وایکرد کە وەك خوێندەوار دەربکەوم. بەڵێ لەوساوە بەردەوام دەخوێنمەوەو دەنوسم، بەڵام زیاتر کوردی و کەمتر عەرەبی و فارسی.

# ئەمجارەیان
# باوکی منیان لەگەڵ نەبوو

### پێشکەشە بە:
**بنەماڵەی شەهید فەرهاد**

هێندەی بخوازی گوندێکی دڵکەرەوەو خۆش بوو، رازابۆوە بەچەند جۆگایەکی ئاوی سازگارو رۆشن، گوندەکەش کەوتبووە نێوان کۆمەڵێك شاخی بەرزەوە، خۆشی توند لەباوەشی بەرزی ناوچەکە داگیرکردبوو. گوندەکە چونکە زادەی باوەشی ئەو کێوانەبوو هەر بۆیەش رۆڵەکانیشی بەوە گۆشکردبوو ئازاو چاو نەترس بن، لەوەش زیاتر خەڵکی گوندەکە میوان پەروەرو بەرچاو تێربوون. لەم گوندەدا کەڵەپیاوی وەکو شەهیدان (عەلی عەسکەری، صالح عەسکەری، بێستون، عەبدولاّ مەجیدو دکتۆر مارف، مەریوان عبداللە) هەروەها خەڵکی وەکو (جەعفەر عەسکەری‌و بەکر صدقی‌و شێخ عبدالرحمان‌و کاکە رەزا عەسکەری) تێدا هەڵکەوتووە. گوندێکە خاوەندی زیاتر لە(٣٠٠) شەهیدی شاڵاوی ئەنفالەکان، ئەم گوندە زیاتر لەچەند جارێك سووتاوەو تالاّنکراوەو، دووجاریش تەختکراوە بەجۆرێکی وەها داری بەسەر بەردییەوە نەماوە. ئەم گوندە شوێنی مێژوویی هەوارگەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، شوێنی بنکەی بەتالیۆنەکانی هێزی پێشمەرگەیە. ئەم گوندە شوێنی پشوودانی کاروانەکانی هاموشۆی پێشمەرگەکانی گەرمیان‌و کوێستانە، یەکێکە لەگوندە گەورەکانی ناوچەی قەلاّسێوکەو، لەراپەرینی جوتیارانی ناوچەکە دژی خاوەن زەوییەکان رۆڵی بەرچاویان هەبووە.

ئەم گوندە وا هەڵکەوت بوو هەر چوار دەوری بەرەزو باغی جوان‌و شاجۆگەی ئاو گیرابوو، لوتەی کردۆڵکەکانی جوانی‌و رازاوەیی شاردبۆوە، جۆگای ئاوەکانی توند گوندەکەیان گرتبووە باوەش. جۆگە درێژەکانی ئاوی کانی گوزلەك‌و سەرچاوە باوەشیان توند گیرکردبوو، لەدوا ماڵی ئاوایی زۆر بەکچە شۆخێکی

کورد دەچوو لەکاتی شانەکردندا بەسەر شانوو ملیدا بهاتایە خواریٚ. کاتیٚ سەرنجی بیرهاتنەوەی کارەساتە دڵتەزێنەکانی کوردستان دەهاتە پێشەوە، بەوەدەچوو ژنە کوردێك بۆ ئەوەی منداڵە بەرمەمکانەکەی بپارێزێت لەمردن لەکاتی هەڵڕشتنی بۆنی گازی سیانیدو ماستەرو خەردەل توند دەیگرێتە ئامێز. لەسەر هەردوو جۆگا ئاوەکەی کانی سەرچاوەو گوزلەك ڕیزە ئاشێکی ئاو هەبوو کەخەڵکی گوندەکە سوودیان لێوەردەگرت بۆ هاڕینی گەنمو کردنی بەئارد. خاڵە مەحمود پیاوێکی بالأبەرزی دەمووچاو سپی کەم دوو زۆر بەکەڵكو بێزیان بوو، رابیعە خانی هاوسەریشی تابڵێی دەست ڕەنگینو بەسەلیقەو دڵفراوانبوو، حەمەو گوڵنازیش جووتە جگەر گۆشەیان بوون. مەحموود بەئاشەوانی و رابیعەش بەگۆرەوی چنینو درومانو پینەوپەڕۆ کردن بۆ خەڵکی ژیانی خۆیانیان پیٚ دابیندەکردن، سەرەتای چلەکان بوو. حەمەی دەموچاو پانی سپیوچاوگەش بەنازو لەسەرخۆ باوکی ئاسا گوڵنازیش لاتو لاوازو سیسەڵە هەر یەك دوو ساڵێك لەحەمەی برای بچووکتر دەبوو.

خاڵە مەحمود هەر چۆن ئاشەوانی کردبوو بەکاری هەمشەیی خۆی، زۆربەی کات هەر لەئاشکە دەمایەوە بۆئەوەی بتوانێت لوێچیٚ مزە ئاش زیاتر پەیدابکات، بۆ بژێوی ماڵو منداڵی. حەمەو گوڵنازیش خۆیان وا راهێنابوو رۆژانە زۆربەی کاتیان لەئاشەکە ئەسووڕانەوە بۆ کۆکردنەوەی چیلەکەو چواڵ بۆ برژادنی خەرواو لێنانی چا. زۆرجار خاڵە مەحمود هاواری لیٚ هەڵدەستاو بەبیانووی ئەوەی بەری ئاشەکەی بۆ بکێشی بانگی حەمەی دەکردو دەیوت: کوڕم هاوکاری باوکت بکەو بەری ئاشەکە بکێشە لەجیاتی من. حەمەش گورج بەدەنگی باوکییەوە دەچوو ئاردکێشەکەی هەڵدەگرتو وردە وردە بەری ئاشەکەی دەکێشا.

ئەو رۆژانەی باراشیان زۆر بوایە حەمەو گوڵنازیش بەدەوری ئاشەکەدا دادەنیشتنو بۆئەوەی هەردووکیان هاوکاری باوکیان بکەن، دیمەنێکی هێندە سرنجراکێشبوو خۆشحاڵ دەبووی بەبەختیاریو سۆزی ئەو خێزانە کەئاوها رێكو تەبابوون. حەمە منداڵێکی زۆر وشیاربوو، زۆرجار کەدەگەیشتە باوکی بەدەستە نەرمۆڵەکانی تۆزی ئاشەکەی دەتەکاندو لەبەرخۆیەوە ئەیوت: "تۆ بڵێی ئەم دنیایە بۆ وەها دامەزرابێت، هەندێك کار ناکاو قاچ لەسەر قاچ دادەنیشیٚو خۆشترین ژیان دەژیٚ، کەچی هەندێك رۆژیش تائێوارە پشوو ناداتو کار دەکاتو رەنج

دەكێشـێت و نـانیش نییـە بیخـوات. هەنـدێك ڕۆژ كەخاڵـە مـەحمود ڕابیعـەخان و مناڵـەكانیان لـەدەوری ئاشـەكە كۆدەبوونـەوە، نانەبـەرە خامەكـەیان ڕادەخست هـەر یەكەو ئەیوویست پاروو بۆ ئەوەیتر بكات، كاتێ مرۆڤ سەرنجی ئەدا فێردەبوو چۆن تەبایی و گونجانی خێزان دروست بكات. ئا لەوێدا دەردەكەوێت ژیانێك بەڕەنجی شـانو عـارەقی ناوچـەوانی خـۆت بەدەسـتی بهێنـی، چـەند خۆشـە دوور لەچەوسانەوەی مرۆڤێكی تر. ڕۆژگار هات و ڕۆیشت، تەمەنی حەمەش هەڵدەكشا، تەمەنی زیاتر دەبوو زۆری نەخایاند، ناوی سەربازی هاتەوە، هەواڵی هاتنـەوەی نـاوی سـەربازی حەمـە ئـاگری لەجگـەری بـاوك و دایكـی بـەردا، بـەڵام سـەربازی یاسایەكی كۆمەڵایەتییەو ناكرێ و ناتوانرێ خۆتی لێلادەیت، هەرچەندە خەڵكی پارەدارەكـان زۆر بەئاسـانی منداڵـەكانیان بـەپارە دەگێڕنـەوە لەسـەربازی، بـەڵام ئێمەی هـەژار دەبێ چی بكـەین.؟ هەرچـەند ئەكـەین ژەمـاو ژەم بەزەحمـەت بۆمـان دابین دەكـرێ بـەڵام هەرچـی سـەریان دەهێنـاو دەبـرد نـەیان دەزانـی چـی بكـەن بۆئـەوەی حەمـە لەسـەربازی ڕزگـار بكـەن بۆیـە بەناچـارییەوە وتیـان: بـابڕوات سـەركەوتووبێت. تـا حەمـەش سـەربازییەكەی تـەواو دەكـات گوڵنـازیش پێـدەگاو ئەیدەین بەژنی بۆی.

هـەر لـەو ڕۆژەوە حەمـە ڕۆیشت بۆ سـەربازی و بـاوك و دایكی بەجێهێشت، ئەو خێزانە هەژارە چێژێكی خۆشیان لەخواردن نەدەكرد، بەڵام كاتێ حەمە لەسـەربازی دەهاتـەوە بەپێشـوو هـەموو بەیەكـەوە دەگەشـانەوە، خواخـوای ئـەوەیان بـوو ڕۆژ ڕابوەستێ بۆئەوەی حەمە نەڕواتەوە بۆ سـەربازی. لەكاتێكدا حەمـە دەگەڕایـەوە بۆ سـەربازییەكەی مـاوەی یـەك كیلۆمـەتر هـەموویان بەچاوی پڕ فرمێسكەوە بەڕێیان دەكرد. خۆ هەر لەو ڕۆژەوە حەمـە دەگەڕایـەوە تـا چەند ڕۆژێكیش ئاگر لەماڵیانـدا نەكرایـەوە، هێشـتا حەمـە سـەربازییەكەی تـەواو نـەكردبوو كەبڵێسـەی ئـاگری شـۆڕشـی ڕزگـاریخوازی خـەڵكی كوردسـتانی خـوارو بـەرزبۆوە. وشـەی پێشـمەرگایەتی وەكـو شـتێكی زۆر پـیرۆز جێگـای خـۆی كردبـۆوە لـەناودەروونی خەڵكدا، بەتایبەت لاوانی نـاو گونـدەكان چونكە پێشـمەرگەیان بەنموونـەی پاكی و ئازایـەتی و دڵسـۆزی دەزانـی. كـورد چـونكە میلـەتێكی زوڵـم لێكـراوەو هەمیشـەش لەناچاریدا هانای بـۆ چەكبردووە، چەك بووە بـەهۆی بـوون و مـافی هـەر بۆیـە بـووە بەهاوڕێیـەكی هەمیشـەیی و دڵسـۆزی لـەیاد نـەكردووی، پێشـمەرگەكان كـاتێ ڕۆژ

لـەئاوابوون دەبـوو شـۆڕدەبوونەوە بـۆ نـاو ئاواییـەکانی ناوچـە شـاخاویەکان.
دیمـەنێکی جـوانی قـەدو فیشـەکدانی پێشـمەرگەکان سـەرنجی تـەواوی لاوانـی
رادەکێشا، بۆ مەیـدانی خـەباتی چەکدارانەو چوونە شـاخ، ئەو وشـەیە زۆرکـاری
خۆی کردبوو کەدەوترا بەربەستی چەك تەنها بەچەك دەکرێت.

تا دەهات ئەشکەوتەکانی پڕتر دەبوون، رۆژ لەرۆژ زیاتر لاوانی کـورد ژمارەیـان
زیادی دەکرد، وای لێهات بوو پێشمەگەر بەرۆژیش دەهاتنە ناو گوندەکان، کـاتێ
حەمـە دەهاتـەوە کۆنـە برادەرەکـانی سـەردانیان دەکـرد بـۆ مالـەوەو بەبەرگوێیانـدا
هەلدەدا ببێـت بەپێشـمەرگە، زۆری ئـارەزوو دەکـرد بـەلام چـەندی بیر لێدەکردەوە
نەیـدەزانی چـۆن چـۆن لـەلای دایـكو بـاوکی باسـی بکـات، هـەر لەبـەر خۆشـیەوە
دەیـوت: "بـۆدەبێ مـن بـەرگی سـەربازیم لەبـەردابێو ئـەوانیش بـەرگی
پێشـمەرگایەتیو چـەکی دلسـۆزانە بکەنـە شـانیانو خۆیـان نیشـانی مـن بـدەن.؟
ئێستاش چاك لەیادمە کەمنـدال بووین لـەیاری منالانـەو لەکارکردنـدا لەهەموویان
بەدەسـتو بردتـرو ئـازاتر بـووم، ئـای یادگـاری چـەند خۆشمـان هـەبوو لەگـەل ئـەم
هاوڕێیانەم، نا بەخوا ئەگـەر دەبم بەپێشـمەرگە شـەرتە یادگـاری وەهـا تۆمـار بکـەم،
سـەدان جـار لـەوەی رابوردومـان خۆشـتر بـێ. بـەلێ هـەر چۆنێبێ هـەر دەبـێ ببم
بەپێشـمەرگە، بۆچـی دەبـێ ئـەوان پێشـمەرگەبنو بـوێرن بڕۆنـە سـەنگەرەوە شـەڕ
لەگەل دوژمن بکەن، من نەبم بەپێشمەرگە.؟ هـەر لەبەرئەوەی دووچاری شەڕ نـەبم،
نانا بەخوا هەرچۆنێبێ منیش ئەبم بەپێشمەرگە، جا چی دەبـێ با ببـێ.! بەڕاستی
ئەگـەر ببم بە پێشـمەرگە یادگـاری وا تۆمـار دەکـەم کەیادگاریـەکانی منالیمان هـەر
هیچ نەبێ لەچاوییەوە "

بـەلام هـەر خۆشـی سـەری بـادەداو ئـەیوت: "نانـا، نـابم بەپێشـمەرگە نـابێ
مانـدوبوونو رەنجـی بـاوكو دایکـم لەیادبچـێ، راسـتە پێشـمەرگایەتی خۆشـەو
بەبەرچاویشمەوە ولاتەکەم وێران دەکرێو دەستدرێژی دەکەنـە سـەر گەلەکەمانو
خاکەکەی، یەکە یەکە رۆلـەکانی گەلەکـەمان لەدارئەدەنو ئەیان خەنـە زیندانـەوەو
کچو ئافرەتـانی گەلەکـەمان لـەجیاتی تیـاترۆ بـەزمی سـەربازانی داگیرکـەری پـێ
خۆشـدەکەنو ئابڕومـانی پێدەبـەن، بـەلام زۆر ناخۆشـە بەشـوورەیی دەزانم چـاو
داخسـتن لەئاسـتیا، بـەلام ئـەجری دایـكو بـاوکیش گرانـە، ئەگەرچـی ئـەجری
نیشـتمانو گـەل زۆر لـەوە گـرانترە. هەرچـۆنێ بـێ ئـەمڕۆ بـەباوكو دایکـم دەلـێم

مەسەلەیەکی کوردی هەیە ئەڵێ: "سیروان لێت دەم هەردەمبەی، لێشت نەدەم هەر دەم بەی ؟" منیش ویژدانی خۆم ئاسوودە دەکەم، پێشەکی بەدایکم ئەڵێم ئەگەر ئەو رازی بکەم هاوکاریم بکات باوکیشم بڕیار بدات لەسبەی زووتر نییە ئەچمە ریزی پێشمەرگەی گەلەکەمانەوە" جارێکیتر لەبەر خۆیەوە ئەیوت: "نانا بڕوا ناکەم، قەت بڕوا ناکەم باوکمو دایکم رێگەم بدەن شەو هەتا بەیانی بەنۆرە دەست لەملم دەکەن، خۆ ئەو شەوانەی باوکم باراشی نابێ لەئاش دێتەوە لەگەڵ دایکم بەنۆرە هەتا بەیانی ئەم دیو ئەو دیوم پێدەکەن‌و بۆنم پێوە دەکەن. جا ئەی چۆن دەبێ من ببم بەپێشمەرگەو بچمە سەنگەرەوە زامدار ببم، یان بەدیل بگیرێم‌و شەهید ببم. ئەگەر بەزامێکی ترسناکەوە هاورێکانم لەجەنگا منیان پێ دەربازنەکراو دەست دوژمن کەوتم ئەوسا دەبێ باوك‌و دایکم چی بکەن.؟ نا بڕوا ناکەم " پاشان هەر لەبەر خۆشییەوە "باشە قسەی خۆم دەکەم‌و دڵی خۆم دەحەسێنمەوە، ئەگەر رێگەیان دام زۆر چاکە، ئەگەر رێگەشیان نەدام ماوەیەکیتر هەوڵێکی تر ئەدەمەوە. ئەگەر من بەڕاستم بێ‌و کۆڵ نەدەم هەر هەوڵئەدەم هەتا دڵیان نەرم ئەکەم‌و ئەگەم بەئاوات، ئەو رۆژە مامۆستا مەلا سید نوری دەیفەرموو بەو خەڵکە" سەبرتان هەبێ سەبرکردن کلیلی سەرکەوتنە" منیش سەبر دەکەم هەر دەبێ لەگەڵ هاورێکانم ببم بە پێشمەرگەو بچمە سەنگەرەوەو تۆڵەی ئەو کارەساتەیان لێبکەمەوە کەئەو ساڵە حەرەس قەومییەکان بەسەریان هێناین" حەمە زۆر خۆی بەوەوە خەریك کرد بوو ئەم هەموو راستیانەی دەیزانی ریزیان بکاو بۆ دایك‌و باوکی بگێڕێتەوەو ببێ بەهۆی ئەوەی دڵیان نەرم بکات، بڕیاری بۆ بدەن. وەکو شریتی سینەما دەیهێناو نیشانی ئەداو کەم‌و کورییەکانی ئەدۆزینەوەو لەدڵی خۆیدا چەندین جار دووبارەی دەکردنەوە، بۆ ئەوەی لەکاتی گێڕانەوەیاندا بۆ دایك‌و باوکی هەڵەی تێدا نەکات، ئەوەندەی نەمابوو شریتە سینەماییەکەی کارەساتەکەی محمد تەواو ببێ، خاڵە مەحمود خۆیکرد بەماڵداو سڵاویکرد، خێرا گوڵناز کچە بچکۆلەکەی بەرەو پیری باوکی چوو، ربە ئاردەکەی کەمزە ئاشی ئەو رۆژەی بوو لێی وەرگرت، حەمەش هێشتا گرژی بیرکردنەوە بەری نەدابوو، خۆی لەپاڵ دیوارەکەدا مات کردبوو، بەپێچەوانەی هەموو رۆژانی تر پێشوازی لەباوکی نەکرد، رابیعە خانیش هەڵسایە سەر پێ‌و ئەویش وەکو رۆژان بەرووخۆشی بەرەوپیری نەدەچوو، ئەم دیمەنە سەرنجی خاڵە مەحمودی راکێشاو وتی: ئەبێ

چی رویدابێ، لەناو خۆیاندا ناخۆشیان بووبێ.؟ " هەر خۆی لەدڵی خۆیدا "نا بڕوا ناکەم حەمە دایکی خۆشدەویۆ لاوێکی وشیارە، دەزانێ دایکی چەندی پێوە ماندووە، ئەی بڵێی لەگەڵ دەرودراوسێدا شتێ رووی نەدابێ.؟ نەخێر شتی وەهاش روونادا، ئی چی بووە.؟ " هێشتا خاڵە مەحمود پرسیاری نەکردبوو رابیعە وتی: "ئەرێ مەحمود نایەیت دەموچاوت بشۆری بۆئەوەی کەمێ پشوو بدەی.؟ "
خاڵە مەحمود ئەمەی بەفرسەتیزانیو وتی: " ئەرێ رابە ئەوە چی روویداوە حەمە دڵگران دیارەو تۆش بێ لوتفی.؟ دەخێرا کەنانێکم بدەرێ دەگەڕێمەوە بۆ ئاشی ".
رابیعە خان: "ئەزانی حەمە بۆچی بێتاقەتە.؟"
مەحمود: "نەخێر بۆ ؟"
رابیعە: "ئەیەوێت ببێت بەپێشمەرگە"
خاڵە مەحمود خێرا هەستایە سەرپێ، مەسینە ئاوەکەی توڕداو رەش هەڵگەڕا "چی چی ؟ پێشمەرگە نا پێش تەڕەماش، بەخوا جوانە دەك بە زیادی خێرم نەکرد، وەڵا بەروبۆومی کوڕمان خوارد. کچێ قسەی وەها نەکەیت تۆ گاڵتە دەکەیت یان تێکچوویت؟ من بڕواناکەم حەمە قسەی وەهای بەدەمدا بێت، چۆن دەبێت، رازی نابم بەگاڵتەش گوێم لەقسەی وەها بێت تێ گەیشتێ ".
حەمە خۆی گرژکردەوەو خۆی دەخوارەوە، سەری شۆڕ کردە سەر ئەژنۆکانیو هەڵی نەدەبڕی، گوڵنازیش لەپشتی دایکییەوە وەستابوو بەدەنگە نزمەکەی خۆیەوە رووی کردە باوکیو وتی: "بەڵێ بابە کاکەم هەموو رۆژێ هەر لەبەر خۆیەوە قسە دەکاو ئەڵێ " بەعسییەکان گوندەکەیان رووخاندوینو خەڵکەکەیان بردین، ماڵەکانیان تاڵان کردین، ئازاریان ئەداین " جاری وا هەیە لێی ئەچمە پێشیو ئەپرسم کاکە ئەوە ئەڵێی چی؟ لێم تورە دەبێ. هەندێ جاریش لێم دەپرسیۆ ئەڵێ گوڵناز ئەگەر ببم بەپێشمەرگە لەسەربازی دوژمنی داگیرکەر باشتر نییە؟ ئەمڕۆش هەر لەبەیانیەوە نێوچاوانی گرژکردووەو تۆزی لەمەوبەر بەدایکمی وت: "دایە هاوکاریم بکە باوکم رێگام پێنەگرێ، ئەبم بە پێشمەرگەی کوردستان".
بەقسەکانی خاڵە مەحمودی ئەوەندەی تر ورووژاند، وەکو شێتی لێهات، دەمووچاوی بەسەر قوڵە ئارداوییەکانی سڕییەوە، ئاردو ئارەقە دەمووچاوی گرمۆڵەی دروستکردبوو، شاڵاوی بۆ حەمەبردو وتی: "کوڕم حەمە من حەز لەوە ناکەم تۆ لێم دوور بکەویتەوە، پیاوی چاکبە هەندێ بەزەییت بەم دیمەنەمدا

بێتەوە، من تەنها تۆو گوڵنارم هەیە ئەویش نیوە بەشەرە، نامەوێ جارێکی تر قسەی وەها بکەیت، هەر ئەمڕۆش ئەچمە لای مام عەلی ئۆمەرو داوا دەکەم بەدری کچیم بداتێ هەتا زووە لێت مارە دەکەمو بۆت دەگوێزمەوەو گوڵنازیش بۆ کوڕەکانی ئەو ئەدەم بەژن " رابیعە هەڵیدایەو وتی: " دەك دەمت خۆش مەحمود دەی خێراکە".

ئەم خەبەرە حەمەی هیچ نەجوولاندو سەری هەڵنەبڕی لەسەر ئەژنۆکانی، هەر بۆیە جارێکی تر خاڵە مەحمود رووی تێکردو وتی: " حەمە کوڕم ماندوو زەحمەت کێشی کوردم و لەهەموو خەڵکی زیاتر پێویستم بەوەیە شۆڕش بکرێو بەشداری تێدا بکەم، بەڵام جارێ کاتی نییە هەردەمێ کاتی هات لەجیاتی ئەوەی تۆ ببیت بەپێشمەرگە من ئەچم چەك هەڵدەگرمو لەگەڵ رۆڵەکانی گەلەکەماندا ئەجەنگم، بەڵام توو خوا رۆڵە دڵم مەیەشێنەو تۆ باس لەشتی وا مەکە. تۆ منداڵیت، هەرناوی شۆڕشت بەرگوێ کەوتووە، بڕوا بکە شۆڕش هەرچەندە زۆر پیرۆزە، بەڵام کارێکی هەروا سووكو ئاسان نییەو چی بەکردنو بەئەنجام گەیاندنی پشووی درێژو گیانی لەخۆ بوردنو قوربانییەکی یەکجار زۆری دەوێ. کوڕم دوێنێ بوو کەشۆڕش لەکوردستانی ئێراندا بەسەرۆکایەتی پێشەوا (قازی محەمەد) بەرپاکرا، بەڵام پاش ساڵێك بەچۆکدا هاتو پاڵەوانەکانی هەرچی شەهیدبوو شەهیدبوو ئەوەی تری زیندانیکران یان ئاوارەبوون. تا ئێستا کوردەکانی ئێران هەڵنەساونەتەوەو ئێستاش چاك لەیادم ماوە کەشۆڕشگێڕانو کوردەکانی ئێران چەکەکانیان دەهێنا بۆ ئەم دیوو تفەنگەکانیان ئەدا بەنانێك هێشتا خەڵکی لێی نەدەکڕین.

حەز ئەکەم چاك ئەوە بزانیت ئەم قوڕبەسەرییە هەر ئەمڕۆ نییە، ئەوە سەد ساڵە ئەتوانم بڵێم زیاترە کورد شۆڕش دەکاو ئەنجامی نییە، چونکە یەکگرتوو تەباو برانین، دوژمن بەئاسانی ئاش بەتاڵیان پێدەکاتو ناگەن بەمەرام. خۆ زۆر چاك دەزانمو بەئەرکێکی پێویستی ئەزانمو کورد هەر ئەبێ شۆڕش بکات، بەڵام چاکتر وەهایە هەندێ سەرنج بدەین لەئامانجەکانو شێوەی شۆڕشەکە تێبگەین، ئەوسا کەی کاتی هاتو باش هەڵمان سەنگاند من ئەچم، هەرگیز نابێ تۆ باسی پێشمەرگایەتی بکەی، نا.. نا... بەهیچ شێوەیەك لێت خۆش نابم، بامن بەس چەنە لێدەم".

خاڵە مەحمود داخی دڵی خۆی هەڵڕشت، ئاگای لەنانو ئاش نەمابوو لەتاوا،

لەسەر قسەکانی ڕۆیشتو وردە وردە هێور دەبۆوە " ڕۆڵە دەمێکە من لەگەڵ مام عەلی قسەم کردووە، ئەو ڕازییەو هەر ئەمڕۆش ئەچمەوە لایو سبەینێش هەندێ دۆستو مەلا بانگ دەکەمو بەدریت لێ مارە دەکەم.

کوڕی خۆشەویستم باش لێم تێبگە، من هەر تۆم هەی هیوای دواڕۆژم هەر تۆی " ڕابیعە خان هەڵیدایەو وتی: "حەمە کوڕم قسەکانی باوکت زۆر ڕاستە، دەی بڵێ ئێستا بزانم ئەڵێی چی؟ " حەمە وتی: "دایە گیان ئێوە لەمن باشتر کارەساتی میللەتەکەمان دەزانن‌و بەشێکتان بەچاوی خۆتان دیوە، بەتایبەت ڕووداوەکانی گوندەکەی خۆمان. ئەگەر ڕێگەمن بدەن کەمێ دووبارە بۆتان دەگێڕمەوە بۆئەوەی بتوانن بڕیاری ڕاست بدەن لەسەر بوون‌و نەبوون بەپێشمەرگە، لەیادتانە ساڵی (١٩٦٣) حەرەس قەومییەکان هاتن هەر چوار دەوری گوندەکەمانیان گرت فڕۆکەکانیشیان بەسەرمانا ئەسوڕانەوە، هەموو خەڵکەکەیان لەگوندەکە بردینە دەرێ، ژنەکانیان لەپیاوەکان جیاکردەوەو دیتان چۆن چۆن دەستیان دەکرد بەباخەڵی کچو ژنەکاندا، چۆن گوارەی گوێو لوتەوانەی لوتیان‌و بازنی دەستیان‌و ملیان لێ دەکردنەوەو سوکایەتیان پێدەکردن، لیکی دەمیان دەهاتە خوارێ بەدیار ژن‌و کچەکانەوە. لەو لاشەوە سەعاتو جزدانی بەرباخەڵ، پێڵاوی پێو خەنجەرو جل‌وبەرگو پاڵتۆکانیان دەبردین‌و ناو بەناویش کێیان بویستایە دارکاریان دەکرد. چۆن لەبیرتان دەچێ عوسمان سوورەیی کەلە ترسی ئابڕوی خۆی لەسوورەدێی پاڵ کەرکوکەوە هەڵهاتبووە ئێرەو دوو خوشکەکەی هێنابوو، لەبن دەستی هەر دوو خوشکەکەی دەریان هێناو لەبن شەخسی مەحمود سەلاوالەدا سەریان لەلاشەکەی جیاکردەوەو هەر دووخوشکەکەیان سووکایەتی پێکرد. خۆباوە گیان تۆ ئەحمەدی مەلا عەبدوڵلا برادەرتبوو، چ تاوانێکی هەبوو.؟ لەوەزیاتر کەپیاوێکی هەژارو مرۆڤێکی کوردبوو لەترسی گیانیو ئابڕووی کچەکەی چوبوونە ئەشکەوتەکەی وشکە شیوە ئەژیان، حەرەس قەومیە بێ ویژدانە داگیرکەرەکان لەئەشکەوتەکەدا مام ئەحمەدیان پاش ئەوەی نەوتیان بەسەردا کردبوو ئاگریان تێبەرداو شەهیدبوو، ژن‌و کچەکەیشی پاش ڕزگاربوون لەدەست ئەو گورگانە سەرگەردانبوون.

باوە گیان لەبیرتە کەئێوەیان جیاکردەوە پەنجا پیاویان بردن بۆ بەرانبەری گوندی کلێسە بۆ هێنانەوەی کەلاکی جاشە کوژراوەکان کەچووبوون بۆ

شـرەخۆری‌و تـالآنکردن.؟ هەنـدێ پێشـمەرگەو هێـزی بـەرگری لێیـان راپـەڕین‌و ژمارەیەکی زۆریـان لـێ تۆپانـدبوون‌و کەتەرەمـە سووتاوە بۆگەنـە هەڵئاوسـاوەکانی جاشـەکانتان هێنایـەوە چـەندیان لێـدان. هـەتا ئێـوەش هاتنـەوە دایکـم دەزانـێ ئافرەتـەکان چـەندتان بـۆ گریـان‌و شـیوەنیان بـۆکردن، ئـەیان وت: ئێوەشـیان بـۆ سەربڕین بردووە. دایە تـۆ لـەیادت چووە وەختـابوو شێت بی؟ ئەی خۆکەس ئەو دیمەنەی لەیاد ناچێ پاش سووتاندن‌و شۆفڵ لێدانی هەموو خانووی گوندەکەمان ئێمـەیان خسـتە سـەیارەوە بـەرەو ئاغجەلـەر، چـۆن تـەرمی خاڵـە سـۆفی شـەریف‌و لاشەی زیندووی مام ساڵح گیانی دەرچوو، ئای چەند بێ ویـژدان بـوون، ئـەو دوو پیـاوە تەمـەنیان (٧٠) سـاڵ دەبـوو هـیچ تاوانێکیـان نـەبوو ئێسـتاش نـازانم بۆچـی ئەوەیان لەگەڵکردن.؟ دەبێ تاوانیان چی بێ لەوە زیاتر هەژارن‌و کوردن.؟ ئەی ئەو ماوەیـەتان لەیادچـووە هـەموو رۆژێ فڕۆکـەکانیان لێـرەوە رەت دەبـوون‌و بـۆ بۆردومان کردنی گوندەکانی ناوچەکەو کەدەگەڕانەوە یەك دوو قومبەلەی ناپاڵمیان بەدیاری بۆ دەهێنایـن‌و راست‌و چەپ گوندەکەیان بۆردومان دەکردین‌و هەتا ئێستا زیاتر لـە (٢٤) شـەهیدمان لـەم گونـدەداوە؟ "خاڵـە مـەحمود هەڵیدایـە " حەمـە گیـان تۆزێ ویژدانت هەبێ ئێمە بەسێ کەس تۆمان هەیەو ئەگەر تـۆ نـەبی ئێمـە ژیانمـان بۆچییە؟ چۆن بێ تۆ دەژین؟ نانـا قـەت نـا... بـەخوا مـن قـەبوڵ ناکـەم، قسـەی وەهـا بکەی لەخەویشدا، هەر ئەم شەویش ئەچمەوە لای مـام عـەلی‌و سبەینێ زەماوەندێ سـاز دەکـەم، ئـەرێ بـەخوا جـارێکی تـر رازی نـابم قسـەی وا بکـەی جـا بـۆ نایـەی هەرسێکمان بەزینـدووی سـەربڕی ، خـۆ زۆر لـەوە باشـترە بەقسـەی وەهـا جـەرگمان بڕی".

رابیعـە خـانیش قسـەی بـاوکی حەمـەی قۆسـتەوەو وتـی: "حەمـە گیـان قسـەی باوکـت راسـتە، تۆسـەری خـۆت بەگاڵتـەش جـارێکی تـر وا مـەڵێ بەڕاسـتی لەبەیانییـەوە دەسـتم تەشـی ناگرێ چونکە خۆت چاکدەزانی ژیانی ئێمـە بـەمزەی ئاش‌و تەشی رستن‌و گۆرەوی‌و لفکە چنین‌و جل درون بەڕێوەدەچێ، هـەر کـاتێ تـۆ قسەی وا بکەی سەرو دڵمان دەگری‌و ئەو رۆژە کارمان پێناکرێ".

حەمەش لەسەرخۆ رووی تێکردن‌و وتی: "ئـەوەی ئێوە دەیڵێن زۆر راسـتە، مـن بـۆ ئێـوە زۆر گـرنگم ئێـوەش زۆر بەمنـەوە مانـدوبوون‌و منـیش هیـوای دواڕۆژی ئێوەم، بەڵام ئەی دواڕۆژی ئەو هەژارانەو تێکڕای خـەڵکی کوردسـتان بـەهیوای کـێ

بیٚ؟ خۆ هەموو دایكو باوكیٚ كوڕەكانی خۆیان خۆش ئەویٚ.

جارێكی تر مام مەحمودو رابیعەخان داوایانكرد حەمە هەڵوێستی خۆی دیاری بكاو دڵنیایان بكات جارێكی تر وڕێنەی بوون بەپێشمەرگە ناكات، حەمەش وتی: "ئەوەی من بۆم گێڕانەوە راستی بوو ئەركیشە بەلاّم ئەگەر ئێوەش رێگەم نەدەن ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئێوەو ئاخر بڕیاریش بەدەستی ئێوەیە " دایكی حەمە" قسەكانت راستە لێت ناشارمەوە، بەلاّم كەدێتە سەر تۆ هەموو هەقیٚ ئەبیٚ بەناهەقو لەسەری مەڕۆ باسی پێشمەرگایەتی مەكە.

بەڵیٚ هەر ئەو شەوە خاڵە مەحمود چووە لای مام عەلی ئۆمەر وەعدی زەماندی بۆ حەمە وەرگرت، چونكە رای حەمەی بۆ باسكردبوو، سبەی رۆژ بۆوە كەرەسەی زەماوەندو مەلا براو بەدری لەحەمە مارەكرا بەپێی یاسای ژنو مێردی، خاڵە مەحمودو رابیعە خان دڵیان حەسایەوە بەو كارەیان لەئاستی حەمەو پێشمەرگایەتی.

ساڵی (١٩٧٥) بەرێككەوتنی دوو دەوڵەتی دوژمنی گەلەكەمان لەسەر لاشەی خەڵكی كوردستانو خاكەكەی شۆڕشی چەكداری كەلە ئەیلولی (١٩٦١) دەستی پیٚ كردبوو، بەسەرچوو بیٚ ئەوەش دەستو دیاری چاوەڕوانكراو بۆ حەمەو دایكیو هەزاران هەست زامداركراوی وەكو ئەوان بەدەست هاتبیٚ، تفەنگەكانی پێشمەرگەكانی هاوڕێی حەمە لەژێر پاڵەپەستۆی ئەو رێككەوتنە شومەدا گەنم گرتوو جۆبلاّوی لێكراو، چاوی رەشی حەمەش كاڵ بۆوەو ئەو هیوایەی هەی بوو ببێت بە(پ ـ م) ئەوا ئەویش نەما، خاڵە مەحمودیش كۆچی دوایی كردو دڵنیابوو كەجارێكی تر بزوتنەوەكە دروست نابێتەوەو حەمەش وڕێنەی بوونە پێشمەرگە ناكات.

رابیعە خانیش بەئاسوودەیی بەدیارماڵو منداڵی حەمەوە دانیشتو مەترسی بوونە پێشمەرگەی نەما، ناهەقیان نەبوو زۆر خەڵكی تریش پێی وابوو دوای نوچدانی بزوتنەكە جارێكی تر لەترسی فاشیستەكان كود ناتوانیٚ شۆڕش بكات. لای حەمەو هاوڕێكانی وا نەبوو هەر بۆیە هاوڕێكانی حەمە زۆر بەرێكوپێكی دوای بڕیاری گەنم گرتوو جۆبلاّوەكەی ئەوسا بەژێری چەكەكانیان لەژێر گڵو كەڵەكە بەرددا شاردەوە بۆ رۆژیٚ شۆڕش بەرپا بكرێتەوە.

ئەو سەردەمە بیٚ هیوایی زۆربەی زۆری خەڵكی گرتبۆوە لەئەنجامی زوڵمو

زۆری فاشیستی دڕندەکان، هەرکەس ڕەش نەبوایە یان نەبێ بەڕەش پیلانێکی ئەو تۆیان بۆ ساز دەدا. چەند قەوانە فیشەکێکی خۆیان لەحەوشەکەیدا دەخستە ژێر گڵەوەو بەزۆر ئەیان پشکنی‌و خاوەن ماڵەکەیان بۆ هەتا هەتایە بێ سەرو شوێن دەکرد، یان بەپێی بڕیاری قانونی خۆیان لەدادگای ڕەشەکاندا بڕیاری خنکاندنیان بۆ دەدا، ئەگەر چی پێشمەرگایەتی نەمابوو، بەڵام هەڕەشەو گوڕەشەی ڕەشەکان وایان کردبوو رابیعە خان جارێکی تر لەدوا ڕۆژی حەمە بترسی، چونکە زۆرجار ڕەشەکان لەسەر چەقۆش خەڵکیان بێ سەرو شوێن دەکرد. خۆ چاکی دەزانی ئەگەر ئەم ڕۆژە نەبوایە حەمە ئەوەی پێ قەبوڵ نەدەکراو یەکسەر ئەچووە شاخ‌و ئەبوو بەپێشمەرگەو سەری بۆ ئەو هەموو تەعدایە شۆڕ نەدەکرد.

لەو سەردەمەدا هەر کەسێ ڕەش نەبوایە ڕەشەکان شەڕیان پێ دەفرۆشت‌و دووچاری موشکلەی قورسیان دەکرد، هەر بۆیە هەندێ پیاوی ماقوڵی گوندەکەو هاوڕێکانی حەمەش پێشنیاری ئەوەیان بۆ کرد کەحەمە ببێت بەکوێخای گوندەکە یان بۆ ئەوەی خەڵکەکەو خۆشی بپارێزێ لەژێر ناوی کوێخادا، پاش هەڵسەنگاندن‌و تاوتوێکردنی پێشنیارەکە حەمەش ڕووی لەوانکردو وتی "پێشنیارەکەم پەسەند بەو مەرجەی بەهەموویان نەخشەکە بەڕێوەبەرین لەپێناوی خۆ پاراستن لەدەمی ئەم سەگە ڕەشانە" تێکڕا پاڵپشتی حەمەیان کردو ئەویش بوو بەکوێخای گوندەکەی خۆیان‌و ناوی (کوێخا حەمە)ی بەخۆیەوە گرت، لەکاتێ کارەکانی زیندووکردنەوەی شۆڕشی ئەنجام ئەدا کەڕەشەکان لەسەر دەرگای هەموو ماڵێکا کاسەسەرێکی هەڵواسراویان بەدوو ئێسکی ڕاست‌و چەپەوە داکوتابوو بۆئەوەی هەر کەس باسی سیاسەت بکات بێتەوە یادی‌و ببڕای ببڕ نەوێرێ باسی شۆڕش‌و ڕزگاری بکات، حەمەش زۆر بە ژیرانە بەپرس‌و ڕای پیاو ماقوڵان ئەرکەکەی خۆی جێبەجێ دەکرد.

ئاورنگ‌و بەیان‌و شەماڵ‌و شەوبۆ پەروانەو شەهێن‌و شاڵاو وردە وردە گەورەبوون‌و لێیان چووبووە قوتابخانە، رابیعەخان بەمنداڵەکانەوە خافڵابوو، لەوەش دڵنیابوو شۆڕش پەیدا نابێتەوە هەتا ئەگەر دەستیش بکاتەوە، حەمە لەبەر منداڵ ڕەنگە بیری لێنەکاتەوە هێشتا ساڵێکی تەواو نەکردبوو تەمەنی گەنم گرتوو جۆبلاوەکە کەتێکۆشەرانی کوردستان کەوتنەوە شاخ، سەنگەرەکان هەڵکەندرانەوە، بانگی شۆڕش هەڵداریەوە، سیاسەتی بەعەرەبکردن‌و بەبەعسی

کـــردن و راگـــوێزان ئاشـــکراکرا. داوا لــــەکرێکاران و جوتیـــاران و تێکـــڕای زەحمەتکێشانکرا چەك هـەڵگرن و بێنـە ریـزی شۆڕشـەوە، شۆڕشـی ئـەم جارەمـان رزگاری نیشتمانی دیموکراتییە بەشێوەیەکی نوێ و بیروباوەڕێکی نوێوە.

رۆڵـە دڵسـۆزەکانی زەحمەتکێشـان لەشـارو لادێـوە بـەرەو پـیری بانگەوازەکـە چوون، حەمەش جارێکی تر خەوەکەی هاتەوە دی هەروەکو کردبووی بەپیشە هـەر رازو نیازێکی هەبوایە لەلای دایکی باسی دەکرد، ئەو جارەش چپاندی بەگوێیدا" دایە پێشمەرگە پەیدا بوونەتەوە، ئەمجارەیان ئەوا کۆمەڵێك منداڵمان هەیە ئەتوانی بـۆنی مـن بنێـی بەوانـەوە هەقـە رێگـەم بـدەی بـبم بەپێشـمەرگە. دەمێکـە پێشمەرگایەتی بووە بەهیواو مەبەستم، دایە گیان پێشمەرگایەتی ئەمجارەشیان بەشداری تێدا دەکەین، دوێنێ هاوڕێیەکم باسی شەهید جەمالە رەشی بۆ کردم، زۆرم پێخۆشە منیش بتوانم ئاوها دڵسۆزو ئازابم، ئەزانی چی وتووە.؟ " رابیعە خان" نەخێر (بەتوڕەییەوە) چی وتووە.؟ حەمە" لەکاتێکا ئەیبەن بۆ بەر پەتی سێدارەی دوژمن ئەڵێ راستە، زۆر راستە ژیان زۆر خۆشە بەڵام مردن لەپێناوی زۆربـەی خـەڵکی زەحمەتکێشـدا لـەژیان زۆر خۆشترە. دایـە ئەمـە زۆر ئازایەتییـە یەکێك ئەوەنـدە دڵسۆزی خـەڵکبێ، ژیـانی خـۆی بکات بەقوربانی زۆربـەی خـەڵکی هـەژار، بەراستی لەدەست هـەموو کـەس نایـەت"دایکی وتـی: " تـۆ خـاوەن ژن و منـداڵی، خزمەتی ئەمانە بکە خۆی لەخۆیدا خزمەتە بەگەلەکەت، تکایە واز لـەم بەزمە بهێنە ئەوە بۆچی ئەوەندە چیرە درێژی".

بـەڵام چیرە درێـژی کوێخا حەمـە وازی نـەهێنا هـەتا بـوو بـەهاوڕێ محەمـەدو ئاواتەکەی هاتەدی و بوو بەیەکێك لەپێشمەرگە ئازاکانی هەرێمی دوو.

هەر لەسەرەتای بوونی بەپێشمەرگە سەبارەت بەچالاکی و دڵسۆزی و ژیری کرا بەفەرمانـدەی یـەکێك لەمـەفرەزەکانی و نـاوی فـەرهادیان بەسـەردا بـڕی واتـە بـوو بەهاوڕێ فەرهاد.

لـە (١٩)ی تـەموزی (١٩٨٠) لەسێیەم رۆژی جەژنی قوربانی ئەوساڵەدا خۆی و (١١)هاوڕێ تری پێشمەرگەی دەورە دران لەلایەن (١٨) کۆپتەری جەنگی و باربـەر، هێزێکی یـەکجار زۆر لـەجاش و سەربازی دوژمـن لـە ٦:٤٥ ی بەیانی هـەتا ٧:٣٠ی ئێوارە شەڕیانکرد، هێزەکەی دوژمن هیچی پێنەکراو گەڕایـەوەو هـاوڕێ فەرهادو هاوڕێ ستار حەمە صالح زامداربوون ئەم زامدارییەی هاوڕێ فەرهاد دایکی راهێنا

لەگەڵ مەترسی هاتنە سەر رێگای تاقانەکەی بۆیە بەکوڵی ورەوە وەڵامی خەڵکی ئەدایەوە لەکاتێکا هەواڵی زامداریەکەی حەمەیان دەپرسی. خەڵکەکە سەریان سوڕما رابیعەخان بەو هەموو پەرۆش و دڵەڕاوکێییەوە ئێستا ئاوها بەو ورەیە ئەبێ چی روویدابێ، بۆیە خۆیان پێنەگیراو لێیان پرسی چی روویداوە.؟ کەبووە بەهۆی ئەم گۆڕانە لەبیرو باوەڕتا.؟" رابیعەش لەسەرخۆ بەدیار زامداری حەمەی کوڕیەوە وتی: "خەڵکینە نەتان بیستوە جارێك وەستایەك کوڕێکی ئەبێ هەموو ئێوارەیەك پێستەیەکی پێدا دەنێرێ لەجۆگای ئاوەکەدا سەنگو بەردی دەنێ، بۆئەوەی بۆ پێڵاو دروستکردنی سبەینێ نەرم بێتەوە، پێشەکی تێر تێر لەکوڕەکەی ئەداو بۆی شیدەکردەوە چۆن سەنگو بەردی بنێ، رۆژێکیان پێستەکە ئاو دەیبات کوڕەکەی ناوێرێ بڕواتەوە، دراوسێکان پێی دەزانن و ئەیبەنەوە، وەستا لەسەر خۆ پێیان دەڵێ قسەی پێناڵێم ئەگەر ئێوش نەهاتنایە، چونکە من شینم بۆ پێستەکەبوو کەئەو ئاو بردی کوڕەکەم بۆ ئازار بدەم، منیش دەمویست حەمە نەبێت بەپێشمەرگە ئەگەرچی پێشمەرگایەتی کارێکی پیرۆزە، بەڵام کەبوو بەڵێن بێ منداڵەکانی وەکو گوڵ بۆ بەخێوبکەم، بائەویش پێشمەرگایەتییەکی خاوێن و بەدڵسۆزی و ئازایەتییەوە بکات و هاورێکانی و خەڵکی خۆش بوێ و یەککگرتووبن".

حەمە کە گوێی لەورەو بڕوای پۆلاینی دایکی بوو بەزەردەخەنەوە وتی: "دایە لەخۆشی ورەو قسەی خۆشی تۆ منیش چاکبوومەوەو ئیتر لەناو جێگادا بۆ زامەکەم ناکەوم".

ماوەیەکی زۆر تێپەڕی بەسەر سارێژکردنی زامەکانی هاورێ فەرهاددا، رێکەوتی (١٢/٢٢ی ١٩٨٠) بوو بەبۆنەی گۆڕانی وەرزی ساڵەوە، دوژمن کێوماڵی ناوچەکەی کردن بەنیازی دەرپەڕاندن و تێکشکاندنی هێزی پێشمەرگەو دۆزینەوەی ماڵ و منداڵیان لەگوندەکاندا. هەر بۆیە سوپای دوژمن یەکە یەکەی گوندەکانی ناوچەکەیان پشکنی، ئاخر گوند لەبناری چیاکە گوندەکەی هاورێ فەرهادبوو. بەیانی بۆوە کاتژمێری (دەو چارەك) پێشمەرگەی ئێشك چییەکەی لوتکە بەرزەکەی زیخەڵان شاورێکی لێدا، هاورێ فەرهاد پێشمەرگەیەکی تری نارد بۆ لای خێرا بەگەیشتنی بۆسەر گردەکە بروسکە ئاسا گەڕایەوە لای هاورێ فەرهادو چپاندی بەگوێیدا. هاورێ فەرهادیش پەیوەندی کرد بەفەرماندەی هەرێمەکەیانەوە، بڕیاردرا خێراو بێدواکەوتن هەموو لەبنداری پەناکاندا هاتنە

دەرێ‌و بەپەلە وبێدواکەوتن هەموو ئامادەبوون خێرا خێرا بەرۆیشتن سەرکەوتن بەلام پەیتا پەیتا دەوترا " کەس خۆی دەرنەخات، دوژمن ناوچەکە دەپشکنێ دوورنییە سەرێ لەم ناوەش بدات، خێرا بەپەلە هەر مەفرەزەیەك شوێنی خۆی بگرێ، کەس تەقە نەکات ئەگەر فرۆکەکانیش هاتن خۆتان نیشان مەدەن، باپۆژ درەنگ بێت ئەگەر لای ئێوارە هێزەکە گەڕایەوە بەلکە بتوانین لەپاشەکی هێزەکە بدەین‌و تۆلەی هەموو ئەو خەلکە هەژارەیان لێ بکەینەوە. هەموو چوونە شوێنەکانی خۆیان، هاوڕێ فەرهادیش لەگەل مەفرەزەکەی خۆی چوو بۆلای ئێشکچییەکان بەهۆی ئەوەی خەلکی ناوچەکەبوو ئەو رێگەی هاتوچۆی دوژمنی باشتر دەزانی.

لەسەرجەم ئەو گوندانەی دوژمن لایدابوو دوکەلیان لێبەرزبۆوە، لەگوندەکەی هاوڕێ فەرهادیش دوکەل بەرزبۆوە، هاوڕێ فەرهاد هەر سەیری کاتژمێرەکەی دەکرد تۆبلێ کەی کات ببێ بەسێ‌وچوار بۆئەوەی دەستێ لەدوژمن بوەشێنن، بەلام چونکە ئەم چاوەڕێبوو رۆژیش درێژبوو بۆوە، هەواش ساردببوو ئەگەرچی ئەمان لەبەرئەوەی هەموو هۆش‌و بیری خۆیان جووتکردبوو لەگەل ئێوارەو گەڕانەوەی هێزی دوژمن ئاگایان لەساردی نەمابوو، جارجاریش بەبیریدا دەهات شەمال‌و دایکی نەگرن خۆ بەراستی جاشە خۆمالییەکان زۆلن‌و شارەزان دایکی شەمالیش ئەناسن.

هەموو فەرماندەکان کۆبونەوە لەسەر ئەوە قسەیان دەکرد کەی‌و چۆن لەدوژمن بدەن‌و لەچەند قۆلەوە بڕۆن‌و کێ‌و کێ ئامادە بکرێ، هێشتا بەتەواوەتی لەسەر نەخشەو پلانەکە رێك نەکەوتبوون ئێشکچییەکان هاواریانکردو بەغار هاتن بۆ لای فەرماندەکان " دوژمن گەڕایەوە بۆهەموو گوندەکان، هاوڕێ فەرهاد روویکردە فەرماندەکەیان " من بڕۆم؟" وەلام " نەخێر، پەلە مەکە منیش دێم لەقۆلی تۆوە " خێرا هێزەکە کرایە سێ بەش، قۆلی یەك‌و دوو بۆ لێدانی دوژمن لەپێش‌و پاشەوەو قۆلی سێ لەدوورەوە چاوەڕێ جەنگەکە بکات‌و هێزی ئامادەی پێویست بێ.

پاش بڕیاردان‌و دەستنیشانکردن هێزەکان جوولان، لەچارەکە سەعاتێکا تەقەیان لەهێزی دوژمن کرد لەپاش‌و پێشەوە، دوژمن هەلوێستەی کرد لە گوندەکانەوە بەرەو تەقەکە هاتن، پێشمەرگە ئازاکان شەڕیان بەرە بەرە گوێزایەوە،

ئابڵوقەی هێزەکەی دژومنیاندا، دوو ناقیلەکەو هێزە زۆرەکەی دوژمن ئابڵوقەدرا تا دەهات شەڕ گەرمتر دەبوو، روو لەشەو دەڕۆی، پێشمەرگە دڵخۆشتر دەبوون، زۆری نەمابوو هێزەکەی دوژمن دەست لەخۆیان بشۆن و ئالآی خۆبەدەستەوەدان بەرزبکەنەوە لەپڕێکاو لەو پێدەشتە بێ پەناو بەردە سێ(٣)فڕۆکەی جەنگی پەیدابوون. پێشەکی کۆپتەرەکان چوونە سەر هێزە هێڵدراوەکەی دواوەو ماوەیەك بەوانەوە خەریکبوون، پاشان گەڕانەوە سەر هەردوو بەشی قۆڵەکانی دەوری هێزەکەی دوژمن، هێزە ترسنۆکەکەی دوژمن نێربوونەوەو شالآوییان هێنا، هاوڕێ فەرهاد پەلەیکردو خۆی مەفرەزەکەی خێراتر لەدوژمن نزیکبوونەوە بەو نیازەی خۆیان لە بۆردومانی کۆپتەرە حەنگیەکانی دوژمن بپارێزن، بەهۆی تێکەلآوبوونیان لەگەڵ هێزەکانی دوژمن، بەلآم لەڕێگەی دەستنیشانکردنی جاشەکانەوە فڕۆکەکان پێشمەرگەکانیان ناسییەوەو دەستدرێژیان لێکردن، کەبوو بەهۆی شەهیدبوونی وەهاب سەعیدو زامداربوونی هاوڕێ فەرهادو چەند پێشمەرگەیەکی تری مەفرەزەکەی. شەڕ تادەهات گەرمتر دەبوو هەر لەیەکتری نزیکتر دەبوونەوە، نەفەربەرەکان (ناقیلە) بلاجکتۆرەکانیان دەگێڕا بۆ بەرزاییەکان، دۆڵەکان و رێگاکان، جاشە ترسنۆکەکان یەك لەسەر یەك هێرشیان تازەدەکردەوە. شەڕەکە زیاتر تێکەلآودەبوو کەس بەکەس نەبوو، هەندێ لەکوڕە ئازاکان زامدارەکان و تەرمی شەهید وەهاب سەعیدیان بەرەو شوێنێکی دوور لەدوژمن گوێزایەوە، هاوڕێ فەرهاد هاواریکرد: "تکایە پێم بڵێن چەند کەس زامداربووە.؟ وشیار بن کەس لەمەیدانی جەنگدا بەجێ نەمێنێ !!" بەڵێ قۆڵی دووەم بەسەر قۆڵی یەکەمدا هاتنەوە، قۆڵی چاوەڕوانی حەساوەش تێکەلآوبۆوە بەجەنگەکە، ناو بەناو پێشمەرگەیەکی گورج و گۆڵ دەگەڕا بەسەردا کەس بەجێ نەمێنێ، فەرمانی کشانەوە درابوو وردە وردەو بەڕێك و پێکی زامدارو شەهیدەکان لەمەیدانی شەڕەکە دوور خرانەوە.

فەرهاد هاواریکرد: "براینە تکایە پێم بڵێن چەند کەس زامداربووە.؟ تکایە زۆر وشیاربن کەس لەمەیدانی شەڕدا بەجێ نەمێنێ" وەلآمی فەرهادیان دایەوە" بەڵێ قۆڵی دووهەم بەسەر قۆڵی یەکەمدا هاتنەوەو قۆڵی چاوەڕوانی حەساوەش تێکەلآوبۆوە بەجەنگەکە، دڵت هیچ نەکات کەس بەجێ ناهێڵین و جێ نامێنێ".

چەند پێشمەرگەیەکی گورج و گۆڵ راسپێردرابوون دەگەڕان بەسەر

سـەنگەرەکاندا، ئاگادارکرانـەوە هـەموو روو لـە(دار ئەسـحاب) بـەرێك و پێکـی بکشێنەوەو کـەس بـەجێ نـەمێنیٌ و بەوشیاری دەورەبەری خۆیان تاقی بکەنـەوەو هەرکەسە هاوڕێکەی خۆی ئاگادار بکاتەوە. دڵیان لای زامدارەکان نـەبیٌ بـەرێك و پێکی دەبرێنەوە شوێنی دیاریکراو.

هەرچـەندە دوژمـن ناوچـەی سـووررکردبیٌ بەگوولـەی گـڕداری ناقیلـەکان و ناوچەکەیان وەهادابووە بەر رۆشنایی چاراکانیان دەربازبوونی پێشمەرگەکان زۆر سـەخت ببـوو، کشـانەوەو دەربـازبوون زۆر دژوار ببـوو، شـەوگاریش تادەهـات درەنگتردەبوو هەرچۆنێك بوو ئەبوایە پێشمەرگەکان لەو ناوچەیە دوور بکەونـەوە، چونکە بەرۆژ ژیان بۆ پێشمەرگە ئاسان نەبوو.

هـەر چۆنێك بـوو تـاك تـاك و دوور لەیـەکتری و بەسـکە خشـکیٌ خۆیـان رزگرکـرد، لەبەر تیشکی بلاجکتۆرەکان.

لاوێکی منداڵکار دیار نەبوو براکەی دەگەڕا "ئـەریٌ کـیٌ عوسمـانی دووشـیوانی دیـوە.؟" یەکە یەکـە گەیانـدیان بەیـەکتری، یـەکێك وتـی: "شـەڕ تـازە گـەرم دەبـوو، یـەکێك لەنەفـەر بـەرەکان تەقـەی لـەعوسمان دەکـرد، عوسمـانیش خـۆی لەسـەردەم دابـوو بەزەویـدا نەیـدەوێرا سـەر هـەڵبڕیٌ لێـی نزیـك بوومـەوە ئامۆژگارکـاریم کـرد کەوردە وردە پاشە کشە بکات چونکە زۆر چوبووە پێشـەوە، دوورنییـە هـەر لـەویٌ بـیٌ و رێگـەی هەڵسـانی نـەبووبیٌ" چـەند کـوڕێکی ئـازا خۆیـان هەڵـداو چـوونەوە شوێنەکەی جاشـەکان و ئـەو شـوێنەیان داگیرکردبوو خۆشـیان لـەویٌ لەبۆسـەنابوو، تومـەس عوسمـان شـەهیدبووە بۆئـەوەی بڕۆنـەوە بـۆ تەرمەکـەی پێشـمەرگەی تـری لەسـەر شـەهید بکـەن. هـەر گەیشـتنە پێشـەوە دەسـتدرێژیان لێکـرا بەپەلـە کـرۆزیٌ پـاش وردە شـەڕ رزگاریـان بـوو بـەڵام تـەرمی عوسمانیـان نەهێنایـەوە چـونکە کەوتبووە دەست دوژمن، هێزەکە روو لەشـوێنی دیـاریکراو رۆشـتن، برسـێتی تینـی بـۆ هێنـا بـوون، سـەرماش هـەمووی گـرژ کردبـوون لـەپاڵ دەوارو چـیغی ماڵـە کۆچـەرەکاندا کروشـکەیان کـرد، فەرماندەکـەیان یەکـە یەکـەی هەڵسـاندن " براینـە درەنگـە کـات (٣) ی شـەوە سـبەی رۆژ ببێتـەوە دوژمـن دێتـە سـەرمان خێراکـەن. قوربـانی کـوڕی ئـازابم هەنـدیٌ پاچ و خاکەناز لـەحاجی حـارس وەربگـرن، گـۆڕێکی کـاتی بـۆ شـەهیدەکە هەڵکـەنن بیشـارنەوە بەئامانـەت و ئێـرە بـەجیٌ بهێڵن" حـاجی حارس زۆر ئەترسا، هەڵیدایە " ئا بەقوربانی نـاوی دەمـت بم بەڕاسـتی سـبەی لێـرە مەمێنن" ئێمەش هەموو دەکوژیٌ دوا براوەکە" هەر چۆنیٌ بوو یـەکێك هەڵدەسـێندرا

دووان خەوی لێدەکەوتەوە یان لەسەرما خۆی مەڵاس دەکرد، هەر چۆنێ بوو گۆڕ هەڵکەندرا بەدەوری خۆیاندا گەڵاداری زۆریان کۆکردەوەو ئاگریان تێبەرئەدا بۆئەوەی دەستیان جوان خاکەنازو پاچەکان بگرێ، گۆڕ تەواوبوو تەرمی شەهیدیان تێدا شاردەوە.

لەو لاشەوە ئەو پێشمەرگانەی خەریکی تیمارکردنی هاوڕێ فەرهادو زامدارەکانی تربوون قسەیان لەگەڵ هاوڕێدەکرد، زامەکانی پشتیان یەکەیەکە بۆ دەژماردو دڵخۆشیان ئەدایەوە، ئەویش لەسەر خۆ پێدەکەنی بەزەردەخەنەوە هەواڵی سەلامەتی یەکەیەکەی برادەرەکانی دەپرسی. پشتیان هەڵدابۆوە تیماریان دەکرد، لەپڕدا یەکێکیان وتی: "کوڕینە تەواو !!" ویستیان رایکێشن کاتێ جارێکی تر هاوار هەڵسایەوە "کورە خۆ فەرهاد!!" بێدەنگبوو، تێکرا وتیان: " فەرهادچی؟ تۆ چیت دەوێ؟" "کوڕینە خۆ فەرهاد، کورە ماڵتان ئاوابێ فەرهادیش شەهیدبوو!!" تێکڕا سەریان هەڵبڕی، پەلاماریاندا، بەڵێ هاوڕێ فەرهادبوو بەشەهید فەرهادو گیانی پیرۆزیو قسەخۆشەکانیو ورەی بەرزی بەرێکەوتن بۆ کاروانی شەهیدانی رزگاری هەژارانی کوردستان.

هاوارەکە گەیشتە فەرماندەکەیان "کوڕینە گۆڕێکی تر هەڵکەنن" ئەویش سەری رێزی دانەواند بۆ شەهید فەرهاد، خێرا خێراش داوای لەهاوڕێکانی دەکرد خۆیان ساز بدەنو تەرمی پیرۆزی شەهید فەرهاد هەڵگرنو ناوچەکە جێ بهێڵن چونکە رۆژ بۆتەوە.

پێشمەرگەکان دوورکەوتنەوە لەپەنایەکدا تەرمی پیرۆزی شەهید فەرهادیان لەکۆمەڵێك دەوەنی دار بەڕووی زۆردا بەگەڵای تەڕو وشك دایان دەپۆشی، بۆ ئەوەی ئەگەر دوژمنیش هاتە سەریان تەرمەکە نەدۆزنەوە، خۆشیان بەهەر چوار دەوریدا خۆیان مەڵاسدا لەبەر تیشکی رۆژەکە بۆئەوەی کەمێ گەرم ببنەوە. سەرما هەمووی کەسیرە کردبوون، زۆربەیان خەویان لێکەوتبوو کاتژمێر (٩)ی بەیانی بوو ئەوانەی بەخەبەر بوون چاوەڕوانی جاشو فرۆکەکانی دوژمن بوون بێن، لەپڕێکا لەباریکە رێگاکەوە پیرێژنێکی بالاً بەرزی چەماوە لەسەر خۆ بەتەنها روو لەلای ئەوان هەنگاوەکانی دەژمێرێ، یەكو دوو سێ هەموو چاویان پێکەوت کەوتنەخۆ، کوڕە ئاخر ئەوەندە ئاسان نییە ژنێك تاقە کوڕێکی هەبێ ئێستا شەهید بووبێو کوتوپڕ پێی بڵێی "فەرهاد خۆت خۆش" هەموو تەماشای یەکتریان دەکرد، کەس لەخۆی رانەدەدی، فەماندەکەیان وتی: "برادەرینە لێم مەگرن من لەگەڵ فەرهاد

وەکو کوڕی ماڵێك وابووین، کەفەرهاد لەماڵ نەبوایە دایکی منی لەجیاتی فەرهاد دادەنا ئێستا ناتوانم پێی بڵێم تکایە بڕۆنە پێشەوەو پێشوازی لێ بکەن و پاشان لێی ئاشکرا بکەن " هەموو تێکڕا وتیان: ئێمە لەخۆمان رانا پەرموین تکایە خۆت پێشمان کەوە بابیهێنین و لێی ئاشکرا بکەین چارەمان چییە.؟ تینیان دایە خۆیان و چوونە پێشەوە، هەموو لەدەمو چاویاندا دیار بوو کەشەهیدیان هەیە هەر بۆیە کەڕابیعەخان گەیشت پێیان و لێی پرسین " حەمە ماوە یان شەهیدبووە.؟" تێکڕا وتیان: دایە گیان بابڕۆین پشوویەك بدەین ئەوسا قسەیەك ئەکەین " بەدەم قسەکردنەوە بردیانە سەر دەوەن داربڕاوەکان و رابیعەخان سەری تەرمی شەهید فەرهادی هەڵدایەوە، تێر تێر ماچیکردو فرمێسکی بێدەنگ جۆگەلەی لەچاوەکانییەوە بۆسەر لاشەی فەرهاد هەڵبەست بوو، سەری هەڵبڕی و بەفەرماندەکەی حەمەی وت: هەی نامەردت نەکەم بۆچی ئاگادارت نەکردم بەزیندویەتی دوو قەسەی لەگەڵ بکەم، بۆچی ئەترسان، چی روویدەدا.؟"

فەرماندەش بۆ دڵنەوایی " دایە گیان بڕوام پێبکە لەئێوارەوە هەر خەریکی شەهیدو زامدارەکانین، ئەوەندە خەریکیان بووین وەختی ئەوەمان نەبوو بینێرین بەشوێن بەڕێزتا ئەگەرچی ئەترساین پێشمەرگە بنێرین لەناو گوندەکە ببێتە شەڕو هۆی شەهیدبوونی هەندێکی تر سەرەڕای ئەوەی پێمان وابوو فەرهاد وەزعی باشە چونکە هەتا شەهیدیش بوو هەر قسەی دەکردو داوای تیمارکردنی زامدارەکانی تری لێدەکردین" پێشمەرگەکان لەناوخۆیاندا دەیانوت: "ئێمە پێمان وابوو هەر کەبیستی فەرهاد شەهیدبووە خۆی ئەسوتێنێ و قسە بەئێمەو کورد کوردستانیش ئەڵێ" هێشتا سەریان لەسەر ئەژنۆیان بوو فرمێسکی نهێنییان بۆ دەڕشت. رابیعەخان بەدەنگێکی بەرز "ئافرەین حەمە! هەزار جار ئافەرین بەڕاستی فەرهادی من و کورد بووی، زۆرت حەز لەپێشمەرگایەتی بوو، دڵسۆزبووی خاوەنی بەڵێنی خۆت بووی، ئاخری کفنی شەهیدیت لەخۆت ئاڵاندو بەم گەڵادار بەڕووە جوانە خۆماڵیانە کفنی شەهیدیت پۆشی، هەزارجار گەردنت ئازابێ لەهەموو ماندوبوون و ئەو رەنجەی پێتەوە کێشامان، سەد ئافرەین بەڕاستی کوڕی منی شیرەکەت پاکبوو دەبنوو بنوو" ئەوجا رویکردە پێشمەرگەکان دیتی سەریان لەسەر ئەژنۆیان بوو وتی: "کوڕەکانم ئێوە خۆش لەپێناوی ئازادی خاك و گەلدا رۆیی، هەژارانی گەلەکەمان خۆش، من خاوەنی نەبووم، ئێوەو هەموو پێشمەرگەی ئەم گەلە ماف زەوت لێکراوە فەرهادی منن، ئێوەش پیاوبن سەنگەرەکانتان چۆڵ

مەکەن، بڕواتان بەخۆتان و کێشەکەتان هەبێ کەڕەوایە، هەر ڕۆژێ دێت بەوڵاتی ئازادی خۆتان (کوردستان) شاد دەبن، داواشم لەئێوە ئەوەیە من بەدایکی خۆتان دابنێن" پێشمەرگەکان شەرمگرتنی کەئەو دڵی ئەدانەوە، سەریان هەڵبڕی و فرمێسکەکانیان وشککردەوە، تێکڕا داوایان ئەوەبوو ئەوان بەکوڕی خۆی دابنێ ئەویش دەستی بەسەریەکەیەکەیاندا هێناو هەمووی لەجیاتی فەرهاد ماچکردن، بەڵێنیدا کراسی ڕەش نەپۆشێ چونکە فەرهاد دڵتەنگ دەبێ.

چەند ڕۆژێك تێپەڕی، پێشمەرگەکان بەرەو گوندی شەهید فەرهاد ڕۆیشتن بۆ پرسەکردن لەخەڵك و لەمنداڵەکانی شەهید، گەیشتنە گردی نەورۆز، موچڕکە بەسەر یەکە یەکەیاندا هات، هەموو جارێ کەبچوونایە بۆئەو گوندە، لەوێ فەرهاد ئێشکچی دەنارده سەر گردی نەورۆز، ئەو جارەیان تێپەڕین و کەس دەنگی نەکرد، بەڕیز دەڕۆیشتن، گەیشتنە کۆڵانەکان کەس ڕیزەکەی تێك نەدا، هەموو ماتەمینی شەهیدیان پێوە دیاربوو لەم بەرو ئەوبەری کۆڵانەکە هەندێ منداڵی ورد وەستابوون تەماشای ڕێك و پێکی ڕیزی پێشمەرگەکان و جوانی تفەنگ و بەرگی بۆرو قەدو فیشەکدانەکانیان دەکردن. لیك بەدەمیاندا دەهاتە خوارێ حەزیان دەکرد ئەوانیش زوو گەورەبن و ببن بەپێشمەرگەی گەل و نیشتمان، ڕیزی پێشمەرگەکان ڕوو لەمزگەوتی گوندەکە دەڕۆیشت لەسەرخۆ بێدەنگ کۆتایی ڕیزەکە لەمنداڵەکان تێپەڕین، یەکێك لەمنداڵەکان بەپێوە وەستابوو، پشتی بەدیوارەکەوە دابوو فرمێسك هۆن هۆن لەچاوی بەردەبۆوەو بەدەنگێکی کزۆڵەوە وتی: "ئەم جارەیان باوکی منیان لەگەڵ نەبوو!!" ڕابیعەخان زانیتی شەهێنی کوڕەزایەتی و چاوەڕێی هاتنەوەی باوکییەتی بۆیە بەهەڵداوان هات و شەهێنی کردە باوەشی و بردیەوە بۆ ماڵەوەو فرمێسکەکانی بۆ سڕی و وتی: "ڕۆڵە باوکت قوربانی هەزارانی گەلەکەمانە، دەخێرا تۆش گەورەبەو سەنگەرەکەی پڕکەرەوە" بەڵێ ڕابیعەخان کردی بەپیشە لەکوێ شەهید هەبوایە بەکۆمەڵێك ورەوە هەندێ لەدایك و خوشك وژ نە شەهیدی تری ئەبردو ورەی دەبەخشییەوەو پرسەکانی بەهێز دەکرد...

١٩٨٨/١٢/٢٢

ئێران

# لەم وڵاتەدا هەتا منداڵیش بەتاوانی
# ڕێگری بێ سەر و شوێن دەکرێ

پێشکەشە بە

پرشنگ و

مەشخەڵ و

پەیمانی ئەنفالکراو

هێشتا سەربازی تەواو نەکرد بوو، دایك و باوکی پێیان لێکردبووە کەوشەوە کە دەبێ ژن بهێنێ، ئەویش پێیوا بوو لەم وڵاتە رزگار نەبووانەدا زۆر ئاسان نییە بەبێ پارەو پوڵ و ماڵ و سامانێکی ئەوتۆ بتوانێ ژیان بۆ خۆشی و هاوسەرەکەیشی دابین بکات، چونکە دنیای ئازاد نەبوو، وایە ئەگەر بتەوێ پیاو بیت ئەبێ پارەت هەبێ، سەیارەو ژیانێکی خۆش پێویستی بەپارە هەیە، پارەش پەیدا نابێ ژن هێنان و ماڵ داریش هەر پەیوەندی بە پارەوە هەیە. هیچ شتێك بێ پارە پەیدا نابێ پارەش لای پارەدارەکانەو بە ئاسانی نایدەن بە ئێمە، هەتا شەش بەشی پارە نەمان چەوسێننەوەو کارمان پێنەکەن باشترین رێگای رەواش بۆ پارە بەدەست هێنان کارکردنە، کارکردنیش بووە بە واستەو دەست ئێمەو مانان ناکەوێ، ئەگەر رۆژێ کارمان هەبێ بە کەمترین پارە خوێنمان دەمژرێ لەلایەن پارەدارو خاوەن کارەکانەوە.

سەرەڕای ئەوەش ئەوەندەمان ماندوو ئەکەن رۆژانەکەمان سەروبەر بەشی کرێ دوکتۆرو دەواو دەرمان ئەکات، جا ماڵ چۆن بەڕێوەدەبرێ، بۆیە هەرچەند دایك و باوکی تینیان بۆ دەهێنا خۆی لەئاستی کێشەیەکی وەهادا نەدەبینی و خۆی لێلادەدا، بەڵام بۆی دەرکەوت بوو کە باوك و دایکی مەبەستیان ئەوەبوو زیاتر ئەو ژن بهێنێ و کۆمەك بە ئەوان بکات، بۆیە بەڵێنی دانێ لە بوارێکدا ئەگەر کەسێکی

گونجاوی دەست کەوت و ئەرکێکی زۆر نەکەوێتە سەر شانیان ئەویش پێی خۆشە.

رێکەوت رۆژێکیان باوک و دایکی و ئەورەحمان بەسەردان چوون بۆ گوندی "بۆلقامیش" بۆ دیدەنی هەندێ دۆست و ناسیاویان لەوێ دەکەوێتە داوی شۆخێکی کۆست کەوتوو، سەرنجی راکێشی بۆیە کە لە سەردانەکەیان گەرانەوە، بە شەرمەوە بە باوکی وت: ئەگەر لە تواناتدا هەبێ بێوەژنێکم دۆزیوەتەوە کە رەنگە بارێکی قورسمان نەکەوێتە سەرشان ئەگەر بکرێ بۆم داخوازی بکەن.

هەردووکیان لایان سەیر بوو، زۆر بەخۆشحاڵییەوە پێشوازیان لێ کردو وتیان: "دەی ئەورەحمان گیان بەقوربانت بین ژن بهێنەو کەمێك بمان حەسێنەوە با تا نەمردووین منداڵی تۆ ببینین، هیچ نەبێ بنەماڵەکەمان لەناوچوون بپارێزین، خۆ عەبدوڵڵای برات هەر روومان تێ ناکاو خۆشی و ئێمەش دەرامەتێکی وامان نییە تا ژنێکی بۆ بهێنین بۆ خۆی ببێت بەخاوەن ماڵ و لە رەنجبەری ماڵان رزگاری ببێت" ئەورەحمان بەدایکی وت: "دایە بەراستی ئێمە خێزانێکی زۆر هەژارین بێدەرامەتی وا ئەکات ئەبێ لەدیاری کردنی هاوسەرو دارشتنی ژیانی خێزانیش بەشوێنی ئەوەدا بگەرێین کەمترین خەرج و دەرامەتی بوێت."

خاتو ئایشێی دایکی وتی: "ئەورەحمان کورم ئەوەی تۆ داوای ئەکەری کێیە؟" هێشتا ئەورەحمان وەڵامەکەی نەدابۆوە، باوکی هەڵی دایە "ئەی رۆڵە راست ئەکات چەند داوا ئەکەن، کچی کێیە. با بزانین ئەشێ بۆ ئەوەی ئێمە خزمایەتیان لەگەڵدا بکەین؟" "بەڵێ باوەگیان لەراستیدا بۆ ئێمە زۆرە، ئەگینا بۆ کەسێکی پارەدار هەر هیچ نییە" "رۆڵە داوای چەند دەکەن؟" دە قسە بکە ئەوە بۆچی لە دوێنێوە خۆتداوە بەزەویدا؟ ئەم ماوەیە ئێمە هەوڵ ئەدەین لەگەڵتدا هەر ملی رێگەت نەدەگرت و ئێستا خۆت بە ئاگری عیشقی سوتاوی و قسەش ناکەیت. دەبڵێ کورم کچی کێیەو داوای چەند دەکەن؟".

"باوەگیان چۆن لەرووم بێ قسە بکەم، ئەزانم هەموو سەروەتی ئێمە بوونی هەردوو گوێدرێژەکەیە کە تۆ مانگانە بە خەڵوز فرۆشی بە پشتی ئەوان ئێمە بەخێو دەکەی، ئێستا هەر دووکیان بفرۆشی (٥) دینار دەکەن، جا ئەگەر رووڵە هەموو خزمان بنێین بۆ هەڵسورانی کە بەراستی زۆرم پێ ناخۆشە بەڵام بڵێم چی دڵم ئەو ئافرەتەی گرتووەو پێشم وایە هەل لەدەست نەدەین چاکە".

سۆفی محەمەد سەبیلەکەی پەستاو ئەستێ و بەردەکەی لە توورەکەکە دەرهێناو

هەندێ پۆشوی کردە سەرو دووجار بەیەکیداداو ئاوری تێ بەردا، دووسێ مژی لێداو رووی کردە ئەوڕەحمانو وتی: "هەرچۆنێك بێت زۆرم پێ خۆشەو زۆرم لا مەبەستە کە ژن بۆ یەکێکتان بهێنم یا تۆ یان کاکە عەبدوڵلات.؟ دەبڵێ کوڕم".

سەری داخست، ئارەقە لەنێو چاوانییەوە پەیدا بوو، بە نەرمییەوە وتی: "ناوی زەهۆیەو خوشکەزای مەلا ئەحمەدە، چوومەتە بنجو بناوانی مەلا ئەحمەدی خاڵی داوای بیست دینار دەکات".

کلوێچەکەی بەدەستەوەبوو چاوە مووداڕەکانی ئەڕشت، فرمێسك لەچاوە کزەکانییەوە بەر دەبوونەوە بە بەفری شەوی تاریکی زستان ئەچوو هەندێ جار فرمێسکەکانی لەڕێگای ئاسایی دەهاتنە خوارەوە، لایان ئەدا رووی کردە ئەوڕەحمانو وتی: "ئەرێ ئەوڕحمان زەهۆ لە سەعید تەلانی هیچ منداڵی نەبووە؟"بەڵێ دایەگیان کوڕێکی هەیە تەمەنی هەشت ساڵە، جا قەیدی چییە ئەو پیاوە هەژارە پاش مردنی کەسێکی وەهای نییە کە ئەرکی بەخێوکردنی کوڕەکەی بگرێتە ئەستۆ، ئەگەر کراو کارەکەمان بۆ جێبەجێ بوو خۆم زۆرم، پێ خۆشەو کارێکی مرۆڤانەیە، چیم پێ بکرێ بۆ باش پەروەردەکردنی درێخی ناکەم".

مژێکی تری لە سەبیلەکەی داو پەنجە کەڵەی خستە سەرێو بەستایەوە "رۆڵە گیان ئەگەر خوا هەڵی سوڕاند ئەوە کەی مشکیلەیە، هەر ئەمڕۆ ئەچم بۆ لای هەندێ دۆستو ناسیاو خزم بزانم کەس کۆمەکمان پێ ئەکاو هەر ئەمڕۆش مامەڵەی هەردوو گوێ درێژەکە ئەکەمو ئەگەر کەسێ رێك کەوت ئەیان فرۆشم. ئەرێ رۆڵە تۆ بڵێی مەلا ئەحمەد رووی لێ بنێن هەندێ لەسەرمان نەوەستێ؟ هەتا لەبەرەوە ساڵ بەساڵ ئەی دەینێ؟.."

هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو، کیسە توتنەکەی کرد بە بەر پشتێنەکەیداو سەبیلەکەی گرتە دەستو وردە وردەو لەسەرخۆ بەرەو لای خزمان کەوتەڕێ.

خاتو ئایشێی دایکی وتی: "دەکوڕم ئەوڕەحمان هەندی کۆتەرە موو لەچاوم هەڵدەچەقێ بزانە بە مووکێشەکە بۆم دەرناهێنی؟".

بەدەم موو دەرهێنانەوە "دایە ئەگەر کارەکەمان سەری گرت ئەتان حەسێنمەوە، بەڕاستی ئەمە ژیان نییە، تا کەوچکە شۆربایەکی ساوەرمان بۆ لێ دەنێی مردن ئەبینی، ئەو کاتەش وا ئەکەم هەموو رۆژێ پێش لە هەموو شت لێواری چاوەکانت بەمووکێش بۆ پاك بکاتەوە، بەڵکو تۆش هەندێ پشوو بدەی، بەڕاستی مردی

بەدەستمانەوە."

"رۆڵە بەخوا ئەمە ژیان نییە ئێمەی تێدا ئەژین، ئەمە چاوی منە کە خۆت ئەی بینی، ئەی باوکی هەژاریشت لە مانگێکدا باری دووان خەڵوز بەشەونخونی دەکا. زۆرجاریش کووره خەڵوزەکەی هەڵدەبێتەوەو بۆخۆی دادەمرێتەوەو رەنجی مانگێکی ئەوو رسقی ئێمە بەزایە ئەچێ، هەرچی دەکەین فریای ئەوە ناکەوێن ئەلیدرەم چاو نیو هۆقە رۆن و هەندێ شەکری پێ بکڕین، تا رۆن ئەکڕین شەکر نییەو تا شەکر دەکڕین چانییە. جگە لەپیلاوو جل و بەرگ خۆشت زۆر چاك ئەزانی لەم رۆژەدا کارێکی ئاسان نییە بیست دینار پەیدا بکەیت، بەڵام هەر چۆنێك بێت هەوڵبدەین ماڵێك بۆ تۆ دروست بکەین و خۆزیا دەکرا ژنیشمان بۆ کاکە عەبدوڵلات ئەهێنا، بەڕاستی ئەویش تەمەنێکی باشی بڕیوە، بەڵام لەگەڵ نەبوونی هیچ ناکرێ".

هەردووکیان وەها چووبونە ناو باسەکەوە هەر یەکەیان لەڕوویەکەوە بۆی چووبوو، ئەورەحمان شەیدای باڵای شۆخی کۆست کەوتووی زەهۆو خاتو ئایشیش دامەزراندنی کوڕی و حەسانەوەی لەو پەنایەدا، لەیادیان نەمابوو سۆفی محەمەد چی کردووەو کەی ئەگەڕێتەوە.

سەبیلەکەی بەدەستەوە نەمابوو، لێواری مرادخانییەکەی لەبن پێشتێنەکەیەوەو پزووی شەرواڵەکەی بەجێهێشتبوو تەنکیی ورگی و سەری مووە رەشەکانی ورگی سەریان دەرهێنابوو، وەکو نەشتەر پێدەچوو لەبرسانان وەها راپەڕیبن، خۆیکرد بەژووردا خاتوو ئایشێ و ئەورەحمان هاتنەوە هۆش و لەبەری هەستان و لەدەوری دانیشتن و چاوەڕوانی ئەنجامی سەردانەکانی بوون.

ئەورەحمان زۆر سەرنجی ئەدا لەدەموو چاویدا وای دەخوێندەوە کە شتێکی بەشتێك پێ نەکرابێ، بەڵام لەڕووشی نەدەهات پرسیار بکات.

خاتوو ئایش مووکێشەکەی لەئەورەحمان وەرگرتەوەو لە ئەنگوچکەکەیدا گرێیداو روویکردە سۆفی محەمەد "ئەری محەمەد چیت کردووە بۆ بێدەنگی؟".

"ماڵ بەماڵ گەڕام، هەرچی چۆنێك بوو بەڵێنی حەوت دیناریان پێدام، هەردوو گوێدرێژەکەشم حەوت دینار، ئەوە چواردە دینار، خۆشم پازدە ڕوپییەم هەیە، ئەوە نزیکەی پازدە دینار. ئەمێنێ پێنج دینار، ئەویش روو لە مەلا محەمەد ئەنێم جارێ لێمان بوەستێ، پێشم وایە لێمان ئەوەستێ، پیاوێکی زۆر پیاوانەو

بەبەزەییە".

روویکردە ئەوڕەحمان "کوڕم دڵگران مەبە ئیمامی عەلی فەرمویەتی "هەرکەسێ ویستی ژن بهێنێ منیش بۆی ئاسان دەکەم" کەواتە لە ئێمە هیمەت لەویش بەرەکەت" ئاگای لەدڵی ئەوڕەحمان بوو، کەچەند بەقسەکانی باوکی دڵخۆش بوو بۆیە هەڵی دایە "دەباشە حەمە هەتا زووە بڕۆین خوازبێنی بکەین، چونکە ئافرەتەکە تۆزێ بەرچاوییەو بێوەژنەو خەڵکی زۆر ئەچنە داخوازی نەك لەکیسمان بچێ".

بەیانی مەلا بانگی ئەدا، داوای دەکرد زوو هەستن بۆ نوێژکردن، سۆفی محەمەدیش هەڵساو بانگی کرد "ئایشە..... ئایشە دە هەڵسە حەوجۆشەکە بخەرە سەر سێ گوچکە ئاگرەکە بازوو گەرم ببێ، پیاڵەیەك چاو تیکەیەك نانم بدەرێ لەگەڵ دوو پیاوی ریش سپیدا بڕیارمداوە هەر ئەمڕۆم ئەڕۆم بۆ لای مەلا ئەحمەد سا بزانین چی ئەڵێت، مەسەلەیەکی کوردی هەیە ئەڵێ (سیروان لێت بەم دەمبەی، لێشت نەدەم هەر دەمبەی)" ئێمەیش ئەچین جاخۆیو غیرەتی " جولایەوەو خەوێ لێزڕا" تۆ بڵێی باوکم بەسەرکەوتوویی بگەڕێتەوەو مژدەی سەرکەوتنم بداتێ.؟ زەختی زۆر لەخۆی دەکرد نەیدەویست هەڵسێ، دایکی هاواریکرد "ئەوڕەحمان دەهەڵسە کوڕم بەخوا چاوم عەرز نابینێ، ئاگرێ بکەوەو حەوجۆشەکە بخەرە سەری بەڵکە باوکت زوو بڕوات، ئەمە خوایە بۆمان جێبەجێ بێ. بەڕاستی ئەمە ژیان نییە منی تێدام، هەڵدەستم چاوم بەر پێی خۆم نابینێ، هەنگاوێکمنا سەرم دای بەکۆڵەکەکەی ناوەڕاستدا، سەرم نەشکابێ چاکە، خۆ ئەم خانووە سەگەی ئێمە ئەڵێی ئەشکەوتە هەر چۆنی ئەجوڵێیتەوە سەرت بەر کۆڵەکەیەك دەکەوێ".

زۆری پێ خۆش بوو دایکی هەڵیساند خێرا لەگۆزە سوورەکە حەوجۆشەکەی پڕکرد، هەندێ چیلکەو داری هێنا، دوکەڵی لە ژوورەکەدا بەرزکردەوە، ژوورەکەیان لەشێوەی غەربی دروستکرا بوو، ریزێ کۆڵەکەی تێدابوو لەناوەڕاستی دوو ژووری تر دەرگاکانی دەهاتنەوە سەر ئەوەی یەکەمیان. کاو کۆتاڵو چیلکەو داری تێدابوو، ئەوی تریش شوێنی ژیانی دوو گوێ درێژەکە بوو هەتا نەفرۆشرا بوون، کاتێ مابوون هەموو جارێ کەدەپژمین پریشکی دەهاتە سەر سینی نان خواردنەکەیان، بەڵام دڵیان نەدەهات هیچیان لێبکەن، چونکە بەرەنجی شانی ئەوان ئەژیان. دوکەڵ ژوورەکەی پڕکرد خۆشی چاوەکانی پڕببوون لەئاو، دایکیشی

بەکوترە کوتر بەلای دەست نوێژەوە رۆیشت بێ ئەوەی دایکی پێی بڵێ تورەکە دۆیەکەی لەسنگی حەوشەکەکردەوەو بە کەوچکە دارە گەورەکە هەندێ تۆراغی دەرهێنا، ئامادەی کرد کاتێ باوکی و دایکی هاتنەوە هەموو شت ئامادە بوو، بەڵام هەروەکو تۆپی دوکەڵ لەژوورەکەدا تەقێندرابێتەوە وەها ژوورەکەی قانگ دابوو بەدووکەڵ، چاو چاوی نەدەبینی. بە پەلە کوتێ سۆفی محەمەد لەسەر پارچە حەسیرەکە دانیشت بەکیسەکەی دەمو چاوی سڕییەوە، خاتوو ئایش لەحەوجۆشەکە نزیك بۆوە نانە بەرەکەی هێنایە پێشەوە، ئەوڕەحمانیش تۆراغەکەی بۆ هێنا، نانەکەی خواردو دوو چای دیڤی کرد بەسەرداو وتی: "کوڕم ئەوڕەحمان دایکت بەجێ مەهێڵە هەرچۆنێ بێ منیش بۆ شەو دێمەوە" لێیدا رۆیشت.

خێرا ئەویش دەورەیەکی ناو گوندەکەی کردو هاتەوە لای دایکی و رۆژ زۆر درێژ ببوو کاتی لێ بەسەر نە ئەچوو، سەعاتێ رۆژی مابوو سەرکەوتە سەر بانەکەی خۆیان روو لە کەلی سەرچاو ئەیڕوانی، هێندەی تەماشا دەکرد چاوەکانی رێشکەو پێشکەیان دەکرد، لەپڕێکا ئەرزەکە ئەجولایەوە.

"ئەوانن بەخوا ئەوانن، دایە... دایە" "ها ها ئەوڕەحمان چییە کوڕم؟"

-"هاتەوە باوکم هاتەوە"

-"باشە رۆڵە وەرە خوارەوە با دەرو دراوسێ نەیزانن با بزانین باوکت شێرە یان.......!"

هەرچەندی ئەکرد پێی رێی نەدەگرت بێتە خوارەوە، دووسێ جار دایکی هاواری لێکرد "رۆڵە وەرە خوارێ مەیکە بەهەرا جارێ با بزانین چی بووە".

هاتە خوارێ، هەر ملە قووتێی بوو، دایکی داوای لێکرد دان بەخۆیدا بگرێ هەرچی بوو بێ بووە، پەلە بکەی یان نەیکەی چەند دەقەیەکی ترەو پاشان ئێمەش بەشداری خۆشی و ناخۆشی تۆین".

سۆفی محەمەد هاتەوە لەدوورەوە بەدەمو چاوییەوە دیاربوو شێرەو کارەکەی بەئەنجام گەیاندووە.

خێرا رایکرد لەگۆزە سوورەکە جامێك ئاوی بۆ هێنا، خاتوو ئایش بەچاوە کزەکانی هەر ئەیڕوانی بۆ حەمە ئەتوت تازە نوێ بۆتەوەو ئەیەوێ دڵداری لەگەڵ نوێ بکاتەوە، سۆفی محەمەد تێگەیشت کاتی تیلە چاوی نازاوی نەماوە، ئەم

ماستاوە بۆ دەربڕینی رازی کارەکەیەتی بۆ ئەوەی خۆیو ئەوڕەحمان دڵیان بڕەوێ.

"ئەوڕەحمان کوڕم سەرینێکم بۆ بێنە ئەوەندە ماندووم، خۆ ئەو کاولبووە ئەوەندە دوورە، رێگاکەی چڕە هەر قەنگەدڕوو قاچوقۆڵیان خواردم، ئاویش لەسەر رێ نێیە تەنها ئەو شۆرئاوانە نەبێ هەر وەختابوو بخنێکێین لە تینوا. باش بوو ئامۆزا رەشیدم بە قسەی خۆش پلیکانەی بۆ رێگاکە کرد، ئەگینا هەر نەئەگەیشتمەوە، ئای ئایشە چۆن پیر بووینو چیژێکی ئەوتۆمان لەبەرو بومی دنیا نەخوارد، لەوە زیاتر دووچاری دەردە سەری بووین".

ئەوڕەحمان لەدڵی خۆیدا "تۆ بڵێی باوکم کارەکەی بۆ جێبەجێ نەکرا بێت وا ئەیەوێت فلیمێکی تاڵمان نیشان بدات.؟ ئای دڵم دێشێ ئەم نەگبەتییە چی بوو خۆم توشکرد ئاخر ئێمە کەی هی ئەوەین ژن بهێنین.؟ بەم فەقیریو دەست کورتییە، کوڕە بەزاتی خوا ئەگەر پارەدار ئەبووم خەڵکی خۆی داوای ئەکرد کچمان بداتێ".

"ئەرێ ئەوڕەحمان بۆ وەها چویتە ژێری کوڕم دەمو چاوی باوکت رۆشنە، حەمە دەقسە بکە کوڕەکەمان خەریکە خوێنی ئەوەستێ".

"کچێ ئایشێ کورد راستی وتووە (کە لێت قەوما رێگات بکەوێتە ماڵی خانەدان) ئێمەش رومانکردە ماڵی مەلا ئەحمەد خۆت ناوبانگت بیستووە چەند پیاوە، هەر کە کاکە رەشیدم روی لێناو سەری باسەکەمان کردەوە، هەر کە دەمی هەڵهێنایەوە وتی: "ئەگەر من کچم هەبێ بیدەم بە شوو لە ئێوە باشتری نادەم، بەڵام زەهۆ خوشکەزامە بەمەرجێ ئەو رازی لەسەر بێ منیش وەکو ئێوە خۆشحاڵ دەبم، حەزیش ئەکەم خۆت سۆفی محەمەد لەگەڵم بی لەنزیکەوە لەگەڵ زەهۆ قسە بکەین" روی سپی بێت کە قسەمان لەگەڵ کرد وتی: "من لێم قەوماوە هێشتا ئەوەڵی تەمەنمە گەر دابنیشم دەبم بەبنێشتە خۆشەی خەڵکی بێ ویژدان، بۆیە ئەوڕەحمانم بینیوەو ناوبانگی بنەماڵەکەشیان ئەزانمو هاودەردین هەردوو لامان هەژارین، من بەش بەحاڵی خۆم ئەگەر خاڵم رازی لەسەر بێ منیش پێم خۆشە، بەڵام من موشکیلەیەکم هەیە حەز ئەکەم لەم سەرەوە باسی بکەم، ئەویش مەسەلەی غەریبی کوڕمە نەباوکی ماوەو نەکەسێکی تری ماوە ئەگەر رازیتان لەسەر بێ لەگەڵ خۆم دابێ." ئێمەش وتمان: کچەکەم بەخێوکردنی منداڵێکی ئاوا

هەژارو بێ دەرامەت ئەرکێکی مرۆڤانەو پیرۆزە، کێ بۆی رێك ئەکەوێ کارێکی وا پیرۆز جێبەجێ بکات.

هەر بەخۆشی ئەوەشەوە کەبووین بەخزم مەلا ئەحمەد بە کەوا شۆڕەکەیەوە دارەکەی گرت بەدەستەوەو دەنگی لە سەلامو ئەوڕەحمانی کوڕی کرد بڕۆن لە پێش ئێمەوە بۆ سەر زێیەکە، راوەماسییەکی خۆشیان بۆ کردین، نیوەڕۆ بێ ئێوە ناخۆش ژەمێك ماسی خۆشمان خواردو ئێستاش رێك کەوتین لە سەر ئەوە کە ئێمە ئامادە بووین ئەوان بڕیاریان لەسەرە بۆ ئەوەی بیگوێزینەوە هەمان رۆژی مارەکردن، بۆ کەمی پێنج دینارەکەش زۆر پیاوبوو وتی: "ئەو نرخە کەمەش بۆ زەهوو غەریب خۆیان ئەگینا فلسێکی لەمن حەرام بێت، کەبوون بەهاوسەری یەکتری ئەتوانن زەهوو گەردنی ئازاد بکات من زۆری پێ خۆشە".

خاتوو ئایش هەڵسایە سەر پێ هەندێ بەم دیوو بەو دیوی خۆیدا روانیو وتی: "دە هەڵسە ئەوڕەحمان خێرا کە چایەك لێنێ ئەمڕۆ چوومە ماڵی مام عەلی دوو خۆراك چام لێ قەرز کردون، هێشتا هەندی قەسپمان ماوە با مزگێنی ئەم خەبەرە خۆشە چایەك بۆ باوکت لێنێین، دەك بەخێر هاتییەوە حەمە بۆ خۆتو خەبەرت، نەمردم مژدەی بەڵێنی ژن دان بە یەکێك لە کوڕەکانم بەرگوێ کەوت".

"ئایشە، ئەوڕەحمان بە کاکە رەشیدو مام قادرم وتووە: جارێ باسی نەکەین، ئێمە دەست کورتین نەکو یەکێکی پارەدار کارەکەمان لێ هەڵوەشێنێتەوە، هەرچەندە دڵنیام مەلا ئەحمەد ئەوانە کاری تێ ناکات، بەڵام زیانی لێ ناکەین هەتا مارەی نەکەین کەس نەیزانێ دنیا هەزار شتی تێدایە، کێ ئەڵێ زەهوو پەشیمان نابێتەوە، ئایشە ئەبێ لەسەر کانیو ئاغەڵی ژنان باسی نەکەیت".

"ئەیەڕۆ حەمە تۆ کەی قسەی منت لەناو خەڵکدا بیستۆتەوە، من کەی چڕو چاوی ئاغەڵم هەیە بۆ نوێژەکەم بە کوترە کوتر ئەڕۆمو ئەگەڕێمەوە، دڵنیا بە هەتا مارە نەکرێ ناهێڵم پێمەوە دیار بێ".

ئەو رۆژانەی چاوەڕوانی لەئەوڕەحمانو دایکی نەئەڕۆی، سۆفی محەمەدیش دڵی لەلای ئەوەبوو کوورەیەکی تر خەڵوز بکا، بۆ ئەوەی بتوانێ ژەمێ نان بۆ رۆژی هێنانی بوکێ لەماڵی خۆیان لەگەڵ خزمەکانی بە یەکەوە بخوات. بۆیە رۆژێکیان رووی لەخاتوو ئایش نا هەندێ نانیان بۆ بکا ئەگەر ئەوڕەحمان پێی خۆشبێ لەگەڵ خۆی دەیبا بۆ چەمی قەلای جولەندی کوورە خەڵوزێ ئەسوتێنن.

ئەورەحمان زۆری پێ خۆشبوو بۆ ئەوەی خێرا لەگەڵ باوکیدا کوورەکە دابمەزرێنن چونکە ماوەی گەڕانەوەشی بۆ سەربازییەکەی نزیك بۆتەوە. لەدڵی خۆشیدا ئەیوت: " چەند خۆشدەبوو پێش گەڕانەوەی بۆ جەبەل مەنصور دڵنیابێ لەوەی کەژنی مارەکردووە بۆ ئەوەی پاش ماوەیەکی تر مۆڵەتێکی یەك مانگی وەربگرێ بۆ کاتی گوێزانەوەی".

هەر باوکی داری ئەدا بەزەویداو ئەورەحمان هەڵی دەپەرداوو خێرا خێراش باوەشی دەکردو هەندێکیشی بەهەڵدان هەڵدەدا بۆ شوێنی کوورەی خەڵوزەکە، ئەو جارەیان زۆر زوو بەشی سێ بار خەڵوزیان دار بڕیو کۆیان کردەوەو ئاگریان تێبەردا، بەڵام یەکەم جاربوو ئەورەحمان لەگەڵ باوکیدا لەو چەمو چۆڵەدا بمێنێتەوە. شەو هات کوورەش دەسوتا، جار جارە باوکی سەری لەکورەکە ئەدا، ئاگریش لەئەشکەوتەدا نیڵە نیڵ دەسوتا بۆ ئەوەی سەرمایان نەبێ کاتێ هەستیان بەبرسێتی دەکرد نانێکیان ئەخستە سەر پۆڵووەکان گەرمیان دەکردەوەو دەیان خوارد. ئەو گەرمکردنەوەیە لەجیاتی پێخۆر بوو، شەکرو چاشیان پێ نەبوو بەشی ئەوە بکات هەر کە ئارەزوویان لێ بوو چا لێ بنێن، هەندێ قەسپە رەقەو کەمێ چایان قەرزکردبوو تا ئەچێتە کەرکوكو ئەڵی درهەم دەکرێو ئەوسا ئەیداتەوە بە خاوەنەکانیان.

شەو درەنگانێ خەو بردبوونیەوە لەدەوری ئاگرەکە، دوورەهاسێکی تەنیا کە لەچەمەکەدا ئەژیا دەست ئەکا بە زیرە زیر، ئەورەحمان ئاشنابی نابێ لەگەڵیا، زۆر مەترسی لێ دەنیشێ چونکە ناوبانگی پڵنگی بیست بوو ئەترسا پڵینگ بێ و بێتە سەریان جوانە مەرگی بکاو بەزەهوی دڵ تێ چووی شاد نەبێ، هەتا ئەهات هارەی هاسەکە نزیك ئەبووە تەوراسەکەی لەخۆی نزیك کردەوە دڵیشی نەدەهات باوکی هەڵسێنێ چونکە لە ئێوارەوە دەجار زیاتر سەری لە کوورە خەڵووزەکە داوە هێندە مێشکی جوت کردبوو لەگەڵ هارەوزیرەی هاسەکە هیچی لەیاد نەمابوو. "تۆ بڵێی هەر ئەم جارە ئەم پڵینگە هاتبێ بۆ ئەو ناوە یان ئەو باوکە هەژارەم ساڵ دوانزەی مانگ لەگەڵ ئەم دڕاندانە بووە بە هاودەم، بۆ پەیداکردنی بژێوی بۆ ئێمە، ئێمەش ئاگامان لە هیچ نەبووەو زۆر جاریش نەبوونیو دەست نەرۆیشتوییەکەی خۆمانمان وەکو تاوان خستۆتە ئەستۆی، بەڕاستی راستیان وتووە هەرچی لەناو واقیعەوە قسە نەکات ناتوانێت راستییەکان بپێکێ، ئای باوکی هەژارو بێ تاوانم

چەندان جار لۆمەمان دەکردی!" زۆری دەڕوانی، شەویش تاریك بوو شەوقی ئاگرەکەش دەرەوەی ئەوەندەی تر تاریك کردبوو ئەو کاتەش گیاڕەشی بەهاربوو، دنیا ئەوەندەی تر تاریك ببوو، لەپڕێکا بەلای کوڕەکەدا ئاوڕێکی دایەوە روانیتی گرێکی بەرز پەیدابوو سەری لێ دەرنەدەکرد، ناچار باوکی هەڵساند هەلێکی باش بوو لە ترس و لەرزی هاسەکەش رزگاری بوو. سۆفی محەمەد خێرا هەڵساو پەلاماری کورەکەیداو ساجێ خۆڵی بەسەردا کرد، دوو سێ پێلەقەی پێداداو ئاگرەکەی کوژاندەوەو رووی کردە ئەوڕەحمان "چاك بوو هەڵت ساندم، زۆر جار خەبەرم نەبۆتەوە کاتێ بەیانی هەڵساوم خەڵوزەکە دامردۆتەوەو رەنجی هەفتەیەکم بە باچووە" لەپڕێکا هارەو زیرەکە پەیدا بووە ئەوڕەحمان راچەنی، باوکی ئاگای لێ بوو وتی: "ئەوڕەحمان ئەوەندەی من لەو چەمەدا خەڵوز ئەکەم ئەوە چەند ساڵێکە ئەو هاسە لەم چەمە دایەو شەوان درەنگ دەبێ هەتا نزیکی بەیانی هارەی دێ، بەڵام حەیوانێکی بێ زیانەو وەکو پڵنگ نییە، مەترسی کەم ترە هەر لە بێشەکە دایەو هەتا ئێستا بەچاو نەمبینسوە وام لێهاتووە لەگەڵ دەنگەکەی ئاشنا بووم، شەوێك دەنگی نەیەت بیری دەکەم".

ئەم قسانەی باوکی ئەوڕەحمانی دڵنیاکرد، بۆی دەرکەوت هەر دەنگەو زیانی بۆ ئەمان نییە، بەیانی زوو هەڵسان، هەندێ ئاویان بە تەنەکەیەك دەرهێناو کوورە خەڵووزەکەیان دەرهێنا، بە تەواوەتی خەم بڕیانکرد، خەرارەکانیان پڕ کرد لە خەڵوز ئەمجارەیان سێ بارو تایەکی تێدا بوو، باوکی رووی کردە ئەوڕەحمان "ئەوڕەحمان کوڕم، بڕۆوە دوو سێ گوێ درێژ بەلابار بهێنە با بیان بەینەوە خۆم لێرە دەبم نەکو لێمان هەڵبێتەوە، وابکە دایکت بچێتە ماڵی کاکە رەشیدم گوێ درێژەکەی ئەوانیش بە پیاوەتی بهێنێ بۆ ئەوەی شتێکمان بۆ بمێنێتەوە. چارە سەری پێویستیەکانی پێ بکەین، بەخێر کەی رۆیشتیتەوە من ئەچم بۆ کەرکوك و خەڵوزەکە ساغ دەکەمەوە، تۆش بگەڕێوە بۆ سەربازییەکەت، ماوەیەکی تر ئیجازە وەربگرەو هەر کەهاتییەوە مارە بڕین و گوێزانەوەی دەکەین بەیەك".

هەنگاوی نا بەشاخەکەدا سوێسکە ئاسا هەڵفڕی، داواکەی باوکی جێبەجێ کردو گەڕایەوە باوکی بۆ کەرکوك و ئەویش بۆ جەبەل مەنصور، مانگ تەواو بوو، زۆری پەلەبوو هەموو شەوێ بڕیاری ئەدا بەیانی بڕواتە لای ئامرەکەی داوای ئیجازە بکات بەیانی رۆژ دەبۆوە پەشیمان دەبۆوە، مانگەکەی تەواوکرد سۆفی

محەمەدیش خەڵوزەکەی بەلابار برد بۆ شار لەخانی ئەحمەددا بۆ فرۆشتن داینا ئەیویست پارەی باش بکات. چەند رۆژێ بەدیارییەوەبوو، دای بەچەند دینارێك و گەڕایەوە، هەر چاوەڕێی ئەوڕەحمان بوون ئیجازەکەی وەرگرێت، زۆر بەپەلە خۆی گەیاندەوە ماڵ لەڕووی نەدەهات بەباوکی بڵێ، بەڵام سەری کردە سەر دایکی "دەی دایە وا هاتمەوە تا ماوەی پشووەکەم تەواو نەبووە بەڵکە کارەکە جێبەجێ بکەین".

زۆری حەز دەکرد پێش سەردانی باوکی خۆی سەری لە خزمانی (بۆڵقامیش) بداتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی قسەی لێ کرا بوو لە ڕووی نەدەهات، وەختا بوو دڵی دەرچێ نە باوکی ورتە لەدەمی دەرئەچێ نەخۆشی لەڕووی دێ بڕوات، ئەوەی بۆیدەکرا سەرکون کردنی دایکی بوو "دایە درەنگە دایە باوکم کەی ئەچێ؟ دایە .... دایە".

خاتوو ئایش لەسەر نان خواردنی نیوەڕۆیەکیان پرسی "ئەرێ حەمە ئەوە بۆ ئەڵێی بەردە کەرەی ورتەت لەخۆت بڕیوە.؟ ئەوڕەحمان سەربازە پێش گەڕانەوەی ئەبێ پارەکەی بۆجێبەجێ کەین کەی ئامادە دەبن، بەڵکو مامۆستا بەرن و هەر بەزووی مارەی بکەین و بە پەلەش بیگوێزینەوەو منیش لەم حاڵە رزگار بکەن، ئاخر رۆژێ دەکەومەوە تەنورەکەوە هەتا نانی پێوە ئەدەم هەموو دەست و پێم دەسوتێ".

"ئایشە من لە ئەوڕەحمان بە پەلە ترم، بەڵام چەند جار چووم بۆ لای مامۆستا لەگەڵ خۆم بیبەم هەر ئەمڕۆ بە سبەی ئەکا لەوە زیاتر لەڕووم نایە مارە بڕینەکەش بە مەلا ئەحمەد بکەم، پاشان مامۆستای خۆمان گلەیی ئەکات گەر ئەو نەبەین".

ئەوە لەبەر ئەو راوەستاوم ئەمڕۆ نیازم وایە بە کاکە رەشیدم بڵێم بچێتە لای مامۆستا، ئەگەر سبەینێ نەهات گلەیی نەکات ئێمە مەلای تر دەبەین.

سبەینێ مام رەشیدو سۆفی محەمەدو مام قادرو مامۆستا رۆیشتن و ئەورەحمانیشیان لەگەڵ خۆیان برد.

-"کوڕم ئەوڕەحمان تۆ بەم ئافرەتە رازی؟"

-"بەڵێ، بەڵێ"

-"زەهو کچم تۆ بەم کوڕە رازیت"

-"بەڵێ ئەگەر خاڵم رازی بێت منیش رازیم"

بەتیلەی چاو سەیری یەکتریان دەکرد "ئێمە رازین قازیش کەیفی خۆیەتی" هەر لەو چەند رۆژەدا شاییەکی بچکۆلانەی بێ مەسرەف سازکرا هەندێ لەخزمان لەسەر سفرەی نیوەڕۆ ئاهەنگەکەیان بەڕێوەبرد.

ئەوڕەحمان بوو بە خاوەنی ماڵو سەربازی تەواو نەدەبوو تا پشوویان دەدایە بەتەواوەتی ئارەزووی ماڵیی دەکرد.

زەهۆو خاتوو ئایش رۆژانە باسیان بەئەوڕەحمان تەواو دەکرد، زەمان هاتو رۆیو دووساڵ سەربازی تەواو بوو، زێڕاندۆڵ بوو بەدۆڵی پارە پرۆژەی سەدی دوکانو گۆماوەکەی پارەی زۆری تێدا سەرف دەکرا، ئەوڕەحمان ئەرکی ماڵی کەوتبووە سەرشان. باوی خەڵوز کردنیش بەسەر چووە، روویکردە زێڕاندۆڵو بوو بەکرێکار، هەندێ پارەی بەیەکەوە ناو لەدوکان لەسەر کار لابران، بە کۆتایی کارەکەی پرۆژەکە سەردەمێکی نوێ لە عێراقدا هاتە پێش، رژێمی پادشایی گۆڕکراو رژێمی کۆماری هاتە شوێنی.

یەکێتی جووتیاران لەباوبرەودابوو جوتیارەکان هاندران دژی خاوەن زەوییە گەورەکان راپەڕنن.

لەگوندەکەی ئەمانیشدا یەکێکیان سواری گوێ درێژ ئەکردو رویان رەش ئەکرد گوایە ئەوە خاوەن زەوی گوندەکەیانە.

ئەوڕەحمان لەو گەنجانە بوو ناسرا بوو بەلاوێکی شۆڕشگێرو دژی خاوەن زەوی گوندەکەیان بوو، زۆرجار سەرکارەکانو خزمەت کارەکانی خاوەن زەوییەکان داوای بێگاریان لێدەکرد ئەویش ئەچووە بەگژیانداو بۆی نەدەکردن ئەویش ئاسان نەبوو بۆ خاوەن زەوییەکەی گوندەکەیان بۆیە بەدوای ئەوەدا دەگەڕان رۆژێ لەڕۆژان وا بکات دارکارییەکی باشی ئەوڕەحمان بکەن تا ببێت بە دەرس بۆ جوتیارێکی تر کە نەتوانێ لەسەر کارو خزمەت کارەکانی خاوەن زەوی هەڵگەڕێتەوە.

ئەوڕەحمان زوو هەستی بەوە کرد بوو بۆیە تفەنگێکی قەسەلی کڕی بوو بۆ پارێزگاری لەخۆی.

لەم بارودۆخە نوێیەشدا ئەوڕەحمان لەو جوتیارانەبوو ئەشیا بۆ کاری یەکێتی جوتیارانو هەڵبژێردرا بۆ ئەرک راپەڕاندنو رۆڵبینین.

لاونکی قسە خۆشو لەسەر خۆبوو، بەویژدانو بەپەرۆشبوو بۆ خزمەت کردن

جوتیارەکان زۆر ڕێزیان لێ دەگرت.

هاتنی ڕژێمی کۆماریی و ئازادیی و سەردەمی نوێ وای کرد پارتە سیاسییەکانی ئەو کاتە پەلە بکەن لەڕاکێشانی زۆربەی زۆری جەماوەری جوتیاران بەلای خۆیاندا.

بوارێکی شێوە دیموکراتی ڕەخسابوو بەڵام زۆری نەخایاند خاوەن زەوییەکانی کوردستان کەوتنە لای پارتی کوردایەتی ئەوساو دەربەندەکان لەدەوڵەتی کۆماری عەبدولکەریم قاسم گیران، چونکە دەوڵەتی قاسم پاش ماوەیەك لەو شێوە دیموکراتییە کەوت و کەوتە ویزەی خەڵکی کوردستان، شەڕ لەنێوان کورد و دەوڵەت هەڵگیرسابوو، زۆربەی هێزی عەشایەر دەربەندەکانی کوردستانیان لەهێزەکانی دەوڵەت گرت.

ئەوڕەحمانیش یەکەم تفەنگ بەدەستی دەربەندی بازیان بوو مێژوو هەموو کارێك ڕەد دەکاتەوە کە باش ڕێك نەخرابێ و ڕێگەی سەرکەوتنی پێ نادات ئەو دەربەند گرتنانەش سەرکەوتوو نەبوون، بە یەکەم هێرش دەوڵەت هێزی عەشایەری شکاند.

دەوڵەت کەوتە نواندنی دیکتاتۆری دژی خەڵکی کوردستان شەرێکی گەورە سەپێندرا بەسەر میللەتەکەماندا بێ ئەوەی هۆکانی سەرکەوتنیان و دەست پێ کردنی هاتبێتەدی، ئەگەر چی ئەو شەڕەش هەزاران ڕۆڵەی تێکۆشەری خەڵکی کوردستانی لەخۆی ئالاند.

ئەوڕەحمانیش یەکێك بوو لەوانەو عومەرو عوسمان دوو کوڕەی ئەوڕەحمان و زەهۆ بوون، غەریبی زڕبراشیان هەڵکشابوو بەڵام چەندێ ئەوڕەحمان هەوڵی ئەدا ڕێگای قوتابخانەی نەدەگرت، زۆر پێی خۆشبوو غەریب لەعومەرو عوسمان جیانەکاتەوەو ئەو شانازییەی بۆ بمێنێتەوە لەپەروەردەکردنی چاکی مرۆڤێکی ئاوادا بەڵام ئەو شەڕو شۆڕە ڕێگای پێنەدا غەریب بکاتە بەغەریبێکی خوێندەواری وشیاری دوا ڕۆژی کۆمەڵگەکەیان.

شەڕی نێوان کورد و ڕژێمی قاسم تادەهات گەورە دەبوو، ڕۆژانە دەیەها گوندی کوردستانی بۆردومان ئەکرا بە بۆمبی ناپاڵم، بەدەیان ڕۆڵی بێ تاوانی خەڵکی کوردستان بەناڕەوا گیانی لەدەست ئەداو شەهید دەبوو، گوند دەسوتا، خەڵك شەهید دەبوو، جەماوەری خەڵکی کوردستان زۆربەی زۆری ڕاپەڕی بوون. گوندەکەی ماڵی ئەوڕەحمانیش یەکێك بوو لەو گوندانەی نزیکی بنکەی پێشمەرگە

بـوو، خەڵکەکەشـی سـەر بەشـۆڕش بـوون بۆیـە ئاسمـانی گوندەکـەیان شـوێنی هامووشـۆی فڕۆکـەکانی دوژمـن بـوو، زۆرجـار لەگەڕانـەوەی گونـدە دوورەکانـەوە بەشـی خـەڵکی بـێ تـاوانی ئـەم گونـدەیان ناپـاڵم دەهێنایـەوە بەهـەر چـوار دەوری گونددا دەیان ڕشاند.

لـەو ناپاڵمـە نیـو تەنانـەی لـە هیندسـتانەوە هێنـدرا بـوو بـۆ سـەر پانکردنـەوەی خەڵکی کوردسـتان، نەتەقیبونـەوە، ڕۆژانـە منـداڵانی گوندەکـە بـێ ئاگـاداری باوكو دایکیـان ئەچوونـە سـەریانو بـە بـەرد پیـادان خۆیـان پێـوە دەخافڵانـد، غـەریب لـەو منداڵانەبوو لەبەر ئەوەی بێ باوكو بوو حورمەت دەگیراو زۆر بە محاسەبە نەدەکرا، لەسەر هەندێ لاساری منداڵانەدا ڕۆژێکیان فڕۆکەکان ژەمی ئاسـایی بۆردومانەکـەی خۆیان بۆ گوندەکە هێنابوو، ڕیزێکی تر ناپاڵمیـان بـە نـاو گوندەکەدا دابـوو یـەکێك لـەو ناپاڵمانـە لـە نزیکـی مـاڵی ئەمانـەوە کـەوت بـوو. لـەکاتێکا زەهـۆ بـە کـاری ناوماڵـەوە خـەریك دەبـێ و ئـەورەحمانیش نـانی بردبـوو بـۆ یـەکێك لـە بنکـەکانی پێشـمەرگە، لەپڕێکدا زرمـەیکی یـەکجار گـەورە لـەناو دێـوە لـەنزیك مـاڵی ئەمانـەوە هەڵسا، دوکەڵو تۆزو خـۆڵ باری، دەنگـی فڕۆکـەش نایـەت، وردە وردە کـە تۆزەکە کەم بۆوە زەهۆ هاتە حەوشەکەو لەسەر سەکۆکەی بەردەمی ژووری نووسـتن ڕوانی پلە گۆشتی زۆری لێ کەوتبوو بە قیمە کراوی، لای سـەیر بـوو "ئێمـە قیمـەمان نییـە گۆشـتمان نـەکڕیوە.؟ ئـەو گۆشـتە چییە؟!" لـەپڕێکا وەك تەزویـەکی کارەبا بیگـرێ هاتەوە هـۆش "ئـەی غـەریبو عومـەرو عوسمـان لـە کوێن؟" شـێت ئاسـا ڕایکـرد بـۆ لای تۆزەکـەی نـاو گونـد، عومـەرو عوسمـان لـەتۆز هەڵکێشـرابوون بـە گریانـەوە هاتنەوە، بەکوڵ ئەگریان پەلاماری دان، سـەرو چاوی سڕینـەوەو لێـی پرسـین "کوا کاکتـان لەکوێیـە؟ ئـەی ئێـوە لـەکوێ بـوون؟" "ئێمـە لـەژێرخانی مزگەوتەکـە بـووین وتیان فڕۆکە هات، کاکم نازانین ئێمـە کەسما لانـەبوو کەزرمەکـە هـات، ڕامـان کـردە ژێرخانەکەوە بەڵام تۆز پڕ ژوورەکەمان بوو، وەخت بوو بخنکێین".

زەهـۆ شـێت تـر بـوو، ڕای کـردە سـەر چـاڵە قووڵەکـە، کەسـی لێ نـەبوو حـاجی جومعـە ئـەی کێشـا بەخۆیـداو فـاتمی خێزانـی سـەری خـۆی ئەڕنییـەوەو ئـەیوت: "ڕەمەزان ڕۆ، ڕەمەزان ڕۆ" کە چاویان بە زەهۆ کەوت ژنەکـە قیژانـدی "زەهـۆ شێرە زەهۆ شێرە" واتە زەهۆ ڕۆ، کەواتە ئـەبێ کەسـێکی شـەهید بـوو بـێ؟ زەهـۆ سینگی خۆی بردە پێشەوە.

فـاتم بـۆی باسـکرد "غـەریبو ڕەمـەزان پـێش تـۆزێ لێـرە بـوون لـە نزیکـی ئـەم

ناپاڵمەوە، هاوارم لێیان کرد دەست کاری نەکەن، سەروبەردیان بە دەستەوەبوو، بە پەروانەکەیاندا ئەکێشا، دەرم کردن، ئێستا کە ناپاڵمەکە تەقی هاتووم کەس دیار نییەو پارچە گۆشتێکی زۆریش هاتە حەوشەکەمانەوە، هەبێ و نەبێ ئەوانن.

شێن گەرمبوو غەریب و رەمەزان بوون بەقوربانی سیاسەتی دیکتاتۆریەتی قاسم.

ئەورەحمان لە بنکەوە بەبێ سیم ئاگادار کرا بۆوە لەشەهید بوونی غەریبی زڕکوڕی هاتەوەو زۆری بۆڵاند بەسەر زەهۆدا "چەند جارێ پێم وتی: ئەگەر من لەماڵ نەبووم ئاگاداری منداڵەکان بە.

قاسم ملی شکاند، خەڵکی کوردستان هەر رزگار نەبوون، بەعسییەکان هاتنە سەر فەرمان رەوایی شەڕەکەیان گەورە تر کرد، مافی کوردیان بەهیچ نەئەزانی کوردیان بە بەشێك لەعەرەب دەزانی، بە عەرەبی شاخاوی، بەڵام کاتێ کوردەکان بۆ مافی رەوای خۆیان تێ دەکۆشان و خۆیان رێکدەخست ئەوان شێت گیرتر دەبوون، ئاگرو ئاسنیان بەسەر خەڵکی کوردستاندا دەباراند. لەشارو لادێدا، گرتن و سەرنگون کردنیان لا زۆر ئاسایی بوو، بەڕەوایان دەزانی هەرچی دژی دەوڵەت بێ بیسوتێنن و لەناوی بەرن، کوردیش بۆ بەرگری لەخۆی چەکی دیموکراتی بۆ عێراق و حوکمی زاتی بۆ کوردستانیان گرت بووە دەستەوە. دەجەنگان بۆ خۆ رزگارکردن لە فەوتان و بەدەست هێنانی مافی رەوای خۆیان، ئەورەحمان شەهیدکردنی غەریب زۆر کاری تێکرد بۆیە بڕیاریدا چیتر رانەوەستێ و بچێتە ریزی تێکۆشەرەکانەوەو بجەنگێ، لەلایەکی تریشەوە زۆر دڵی لای عومەرو عوسمان بوو ئەترسا رۆژێ لە قوتابخانەدا بەر بۆردومان بکەون و ئەمانیش وەك غەریب شەهیدبن.

لەو ماوانەدا گفتویەکی درۆزنانە سازکرا لەلایەن رژێمەوە، چەند مانگێ خەڵکی کورد پشوویاندا، ئەورەحمانیش بەهەڵ زانی ماڵەکەی بردە شاری کەرکوك و عومەرو عوسمانی ناردە قوتابخانە، گفتوگۆکە تێك چوو، ماڵەکانی ئیسکان و خانووە قوڕەکانی کەرکوك هەموو بە شۆفل و بلدۆزەر تەختکران. ئەورەحمانیش لەوێ هۆدە خانوویەکی بۆ منداڵەکان پێکەوە نابوو، نەك هەرخانووەکەیان تەختکرا بەڵکە خۆشیان گرت و پاش لێدانێکی زۆر ماوەی ساڵێك لەناوەڕاستی عێراقدا زیندانیان کرد، زەهۆو عومەرو عوسمان سێ قۆڵی مانەوە.

زەهۆ ئازایانە دەستی کرد بە نان کردن بۆ ماڵان بەکرێ، بۆ ئەوەی عومەرو

عوسمان لەقوتابخانە دانەبڕێن و سەر پەرشتی کردن و نەی هێشت بێ باوکیان پێوە دیار بێت.

پاش ساڵێك بەندی لەسەر ئەنجامی ڕێککەوتنێکی کاتی شۆڕشگێڕەکان و دەوڵەت ئەوڕەحمان و سەدان کوردی تر ئازاد کران، هاتەوە ناو ماڵ و منداڵ و شەووڕۆژ بیری دەهاتەوە چەند بە ناهەق لەزیندانەدا سوکایەتییان پێکردن، چۆن بەناهەق ڕەفتاری خراپیان لەگەڵ کوردەکان کردووەو ڕۆژانە لەباسکردنی سیاسەت بەعسییانەی خۆیاندا چەند بەسوك کێشەی کوردو میللەتی کوردیان بە خراپ باس کردووە، چۆن کوردەکانیان بردووە بۆ لێدان و بیانوویان پێ گرتوون لەسەر ئەوەی لەنزیکی یەکەوە دانیشتوون، دوای مواجههە چییان وتوەو کێ خەبەری بۆ هێناون.

زۆری حەزدەکرد ڕۆژێ زووتر شار بەجێ بهێڵێت و بڕوات بۆ شاخ، ببێت بەپێشمەرگە هیچ نەبێ تێر تێر هەوای ئازادی هەڵدەمژێ لەپێناوی مەسەلە گشتیەکاندا تێدەکۆشێ لەگەڵ زەهۆ کەوتە راوێژ زۆری قسە بۆ کرد بۆی باس کرد "ئەزانم ژن بەبێ هاوسەر بەدوو منداڵەوە لەشاردا ژیانی زۆر ناخۆشە، بەڵام بۆ پیاویش ئاسان نییە بە بەرچاوییەوە ئەو هەموو تاوانە بکرێ دژی خۆی و گەلەکەی، چاوی لێ بپۆشێ جا ئەگەر پێتان خۆشە بەماڵەوە ئەڕۆینەوە گوندەکەی خۆمان و ئێوە لەوێ دانیشن و منیش ئەبم بە پێشمەرگە، ئەگەر ئەشتانەوێ لەشاربن بامنداڵەکان بخوێنن و تۆش وەکو ژنە کوردێکی ڕەسەن سەرۆکاریان بکە منییش هەر شتێکیان دامێ لەپێشمەرگایەتیدا کەم یان زۆر بۆتان ئەنێرمەوە".

زۆریان لێك دایەوەو ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی عومەرو عوسمان بخوێنن زەهۆ لەباخەوانی یان لەماڵان، لەکوێ کاری دەست کەوت کار بکات بۆ بەخێوکردنی کوڕەکانی، ئەوڕەحمانیش شەرەفی پێشمەرگایەتی بەخۆی ببەخشێ.

ساڵ هات و ڕۆی، پێشمەرگایەتی شۆڕشی کورد درێژەی کێشا، ڕژێمی بەعس جێڕتر بوون ، عومەریش رایکردو بوو بەپێشمەرگە لەگەڵ باوکیدا، عوسمان و دایکی مانەوە، بەڵام سیخوڕەکان زۆریان ئازار ئەدان لەسەر باوکی، ئەویش حەزی کرد بڕوات لەگەڵیاندا مەتارە ئاویان بۆ هەڵگرێت، یان گوللەی ئارپیجی هەڵگرێ، بەڵام دایکی ڕێگەی پێ نەدەدا.

لەساڵی (١٩٧٤) باوکیان بە نەخۆشی خوێن هێنانەوە بێ فریاکەوتنی دکتۆرو دەواو دەرمان کوچی دوایی کرد.

ئەو کاتە گەمارۆی ئابووری ناوچەکە درابوو دەواو دەرمان پەیدا کردن کارێکی زۆر گران بوو، سال تێ وەر نەسوڕایەوە شۆڕشەکە هەرەسی هێناو دوژمن کوردستانی خستە ژێردەست.

هێشتا چەند مانگێك تێ نەپەڕیبوو بەسەر هەرەسەکەدا، سیخوڕێکی ناسیاوی گەڕەکەکەیان کوژرا، دوژمن دەستیکرد بەگرتنی هەندی لاوی وشیاری دەوروبەری ماڵی عومەر، عومەریش بەرکەوت ماوەی دوو سی مانگ لەهەیئەی کەرکوك ئازار دران، بەلام دەرکەوت بوو کەسیخوڕەکە پێشمەرگەیەك کوشت بووی و خۆی شاردبۆوە چونکە تازە دەستەی بچووك بچووك بەنهێنی لەلادێ کاندا پەیدا ببوونەوە، ئەوەبوو بەهۆی ئەوەی عومەرو ئەوانەی گیرابوون لەسەر کوشتنی سیخوڕەکە ئازاد بکرێن.

عوسمان تاقەتی لەخوێندن نەمابوو چونکە لەقوتابخانە بەزۆر خەڵکیان دەکرد بە بەعسی، ئەمیش لەبنەچەوە بەبنەماڵە رقیان لەسیاسەتی کۆچ پێکردن و سیاسەتی بەزۆر کردن بە بەعسی و بە عەرەب کردن دەبووە، زۆر جاریش خۆی لەمامی گرت بوو لەکاتی کۆبوونەوەکاندا کە لەماڵی ئەوان دەکرا کە باسی فاشییەتی و دڕندایەتی سیاسەتی بەعسیان دەکردو رێ و شوێنی کاری نهێنی و بەرگری کردنیان دائەنا، باسی پەیدا بوونەوەی هێزی پێشمەرگەو سەرکەوتنی شۆڕشی خەڵکی کوردستانیان دەکرد. بەنموونەش باسی خەباتی گەلانی دنیایان دەکرد کە سەر ئەنجامی کۆشش و قوربانی دانێکی زۆر رزگاریان بووە.

ئەو قسانەش وایکردبوو حەزی ئەکرد زووتر گەورە ببێ بۆ ئەوەی ببێت بەپێشمەرگەیەکی وشیارو دڵسۆزی گەلەکەی و سەنگەرەکەی باوکی پڕ بکاتەوە.

زۆر ئەگەڕا بەدوای رێکخستنی کوردانەدا کە لەسەنگەری رێچکەکەی مامی و باوکی لانەدات، نەشی ئەوێرا لەلای کەس باسی بکات، چونکە ئەو کاتە وەهابوو هەرکەس باسی رێکخستنی جیا لەبەعس بکردایە لە سێدارە ئەدراو بە وارو وێخی خۆی و بنەماڵەکەیدا ئەچوونە خوارێ، مامیشی گیراوەو لەگرتووخانەکانی ئەمنی عامەو کەس هەر سۆراغیشی نازانێ ز کەسێکی تری وانییە ئەو رازەی لابدرکێنێ تارۆژێکیان پێ بەجەرگی خۆیدا ئەنێ و ئەچێتە لای یەکێك لەو پیاوانەی لەرۆژانی کۆبوونەوەکانی ماڵی خۆیاندا لەگەڵ مامیدا دیویەتی، بۆی ئەدرکێنێت و ئەیەوێت ببێت بە لایەنگیری رێکخستنەکەیان، بەهۆی ناسیاوی ئەو پیاوە بۆ بنەماڵەکەیان رێگاو شوێنی بۆ دەست نیشان ئەکات.

عوسمان نازناوی "دکتۆر مارف" هەڵدەگرێ چالاکانە کاری نهێنیێ دەکات، دایکی زۆر هەوڵی لەگەڵ ئەدات کەبخوێنێ بەلام مارف تینوێتی خەبات وای لێ ئەکات ئەوە لەیاد خۆی دەباتەوە کەزەهۆ بەباخ بژارکردن‌و نان کردن ئەم بەخێو ئەکاو ئەیەوێ بیکات بەمرۆڤێکی خوێندەوار بۆ ئەوەی لەدواڕۆژدا پیاوێکی سوود بەخشی کۆمەڵی لێ دەربچێ، لاساری ئەی گرێ‌و لەڕێگەی ڕێکخستنەکەیەوە ئەڕوات بۆ شاخ. چالاکانە خۆی ئەگونجێنێ لەگەڵ کاری ڕێکخستنی جوتیاری‌و پێشمەرگایەتیدا پاش ماوەیەکی کەم ئەکری بە ئەندامی یەکێك لەو ناوچانەی ڕێکخستنی پێشمەرگە.

لە ئەنجامی دڵسۆزی‌و نەبوونی ئەزموونێکی زۆر بە هۆی کاری ڕێکخستنەوە، دەچنە گوندی کرژەو لەڕێگەی چەند سیخوڕێکەوە هەواڵ ئەگا بەدوژمن‌و ئابڵوقە دەدرێن، لەگەڵ شەهیدی هۆنەر (مەلا عەلی)دا دەگیرێن‌و پاش ئازاردان دەبرێ بۆ زیندان بەتاوانی ئەوەی کوڕەکەی ناردووە بۆ پێشمەرگایەتی.

عومەریش کرێکار دەبێ لە دائیرەکاندا، پاش بەربوونی لە زیندان بەکرێکاری ڕۆژانە کاری پێ ئەدەنەوە، ئەیخەنە ژێر چاودێری سیخوڕەانەوە.

بوونی مامی لە زیندان‌و گیرانی خۆی لەسەر کوشتنی سیخوڕو گیرانی دایکی‌و دکتۆر مارف لەسەر بوونی بە پێشمەرگە، وایکرد بوو ماوەی کارکردنی ئاسایی لە عومەریش تێکدابوو، خۆی مات دابوو. مانگانە سەردانی موسڵ‌و ئەبوغریبی ئەکرد، بۆ لای دکتۆر مارف‌و مامی، هەموو جارێ لەو دیدەنیانەشدا سەروڵی دەگیرا لەلایەن سیخوڕەکانەوە کۆمەڵێك پرسیاری بۆ زیاد ئەبوو.

لەسەردانێکدا بۆ لای مارفی برای، مارف هەواڵی دایکی پرسی.؟ عومەر وەلامی پێ نەبوو، عوسمان ڕووی تێکردو وتی: "برای بەڕێزم ئێمە لەپێناوی مەسەلەیەکی زۆر پیرۆزدا بە بنەماڵە دووچاری جۆرەها دەردەسەری بووین، خۆت ئەزانی باوکمان دڵسۆز بوو بۆ خەڵك لە ئەنجامیشدا لەو پێناوەدا بەڕاست‌و گۆیانەو دڵسۆزانە بۆی مرد. هەروەها مامەم لە منداڵییەوە ملی ڕێگەی خەباتی گرتووەو ئەوا ئێستا ئەویش لەبەر دەمی لەناوچوون دایە لەو پێناوەی باوکمی بۆ مرد".

خۆشت بووی بەپێشمەرگەو گیرای، منیش لە هەمووتان بچووك ترم، ئێستا سەعاتێکی تر، ڕۆژێکی تر، مانگێکی تر چاوەڕوانی لەسێدارەدانم، دایکی هەژارو کلۆڵم بەنان کردن‌و جل شۆرینی ماڵان‌و بژاری باخەوە ئێمەی بەخێوکرد، بەژنێتی خۆیەوە هاوشانی بنەماڵەکەمان دانەبڕاوە لە دڵسۆزی، ئێستایش هەرچی

روویدابێ لەو پێناوەدایەو خۆمان بەرنامەمان بۆ داناوە، بەڵام زۆرم پێخۆشە بزانم لە زینداندا ورەو بڕوا بەرزەکەی ماوە؟!!"

هێشتا عومەر وەڵامی دکتۆر مارفی نەدابۆوە پۆلیسە ئێشک چییە ئێسکگرانەکەی چاودێری زیندان دارەکەی دەستی راوەشاند"پەلەکەن ماوە نەماوە، دەی مارف برۆ ژوورەوە".

عومەر خێرا بە مارفی وت: "دایکم زۆر لەجاران باشترو بڕواشی بە سەرکەوتن هەیە، لەجاران زیاتر جارێکی تر هاتمەوە بۆت باس دەکەم، بە هیوای جارێکی دیدار، برۆ ژووری باقسەت پێ نەڵێن".

مارف بڕیاریدا ئەم جارەیان نامەیەك بۆ دایکیو یەکێك بۆ مامی بنوسێ لەزیندانەوە، هەروەها ئاگاداری کاکی بکاتەوە کە نامەی زۆری بۆ سەرکردایەتی شۆڕش نوسیوە لەسەر جۆری ئازاردانو پرسیارو وەڵامی دوژمن لە زیندان، هەر کە ئەیان هێنا بۆ حەوشە بچووکەکەی زیندان بۆ هەڵمژینی هەوا ئەو پارچە کاغەزە بریقەدارانەی ناو پاکەتی جگەرەکەی هەڵ دەگرتەوە بەو نیازەی نامەی لەسەر بنووسێ.

باری دەرونی ئەوانەی ژووری چاوەڕوان کردن بۆ خنکاندن زۆر نائاساییە، هەمیشە لەزڕەی کلیلی دەستی ئێشك چییەکان دڵیان دەترسێ، بۆیە لە هاموشۆی ئێشك چییەکان دەسڵەمینەوە "کەی سەرەمان دێ؟!، کەی ئەمان بەن بۆ لەداردان؟" زڕەی کلیلەکان لەوە نزیك بوونەوە، مارفیش سەرینابوو بەکونە بچکۆلەکەی ژوورەکەیەوەو بەتیژ تێیەرهات بە خەیاڵیدا "بڵێی ئەم جارەش کاکەم ببینمەوەو لەسێدارە نەدرێم.؟ تا بتوانم بە نامەیەك لەگەڵ مامم بدوێمو لەگەڵ دایکم قسە بکەم، سوپاسی ئەرکی دایکایەتیو ورەی بەرزی بکەم؟ بەخوا زۆر زەحمەتە!!"

## ئینجا نامەیەکی نوسی بۆ دایکی:

دایکی مەزن زەهۆ..

سلاو بە فرمێسکی تێکۆشەرێکی ماندووی بێ بەرهەم.

نوسرا بێ بۆ دایکێ هەموو تەمەنی بۆ پەروەردە کردنی رۆڵەکانی تەرخان کردبێ و خستبنییە سەر رێگای رزگاری گەل!!

ماندوویەتی و دڵسۆزیو ئازایەتی تۆ، ورە بەرزیو پەرۆشی تۆ جێگای شانازی منی، حەز ئەکەم پێش لە ماڵ ئاوایی لێت، پڕ بە دڵ سوپاسی تۆ بکەم بەڕاستی دایکی تێکۆشانم بووی. زۆر لە دایکەکەی (ماکسیم گۆرکی) بەهێزتر بووی تەنها جیاوازییەکە لەوەدایە ماکسیم گۆرکی بە پێنوسە بەتواناکەی دەوری دایکەکەی پارتی کۆمۆنیستی کرێکاری بە تواناتر دەرخستو منی لاوی بێ ماوەی بێ تواناش لەوزەمدا نییە بێ وێنەیی ئازایەتیو دڵسۆزیو شۆڕشگێڕێتی زەهۆی دایکم نیشانی دڵسۆزانی دواڕۆژی کوردستان بدەمو داوای لێبوردن بکەم کە کوڕێکی سەرکەوتوو نەبووم لەکارەکانمدا، تابەکارامەیی درێژە بە خەباتەکەم بدەم بۆ رزگارکردنی گەلو نیشتمانەکەمانو لەو سێبەرەشدا وێنەیەکی راستی دایکایەتیو دڵسۆزیو ئازایەتی تێکۆشەرێکی وەکو تۆبکێشم، بۆ دواڕۆژی کۆمەڵگاکەمان. مژدەشت ئەدەمێ مامۆستایەکی سەرکەوتوویو بەدڵنیاییەوە پێت رائەگەیەنم سەرم بەرزە ئەو هەموو ئازارو شێوە جۆر بەجۆرە ئازاردانە نا مرۆڤانەی بەعسییەکان نەیتوانی لەرێم لابداو ناوی تەنها یەك تێکۆشەرم پێ بدرکێنێ، سەرم بەرزە وەکو دایکی سەربەرزم کاتێ ئازاد بووی بۆت ئەگێڕنەوە چییان لەگەڵ کردینو چۆن وەڵامی داگیرکەرەکانمان بەخۆگری دایەوە، هەر ئەبێ وابێ یەکێك کوڕی زەهۆی سەر بەرز بێت.

هەر بژیت بۆ کورد

کوڕی بچووکت

عوسمان عەبدولڕەحمان

قەسابخانەی موسڵ

## نامەیەکی تری نوسی بۆ مامی:

### بۆ مامی بەڕێزم

سلاو

زۆرم پێخۆش بوو لەمەیدانی خەبات لە کوردستان بەیەکەوە بوینایە، بۆ ئەوەی ئەزموونەکانمان بەیەکەوە بگۆڕیایەتەوە، بەلاّم زۆر بەداخەوەم چۆن تۆو باوکم مامۆستای سەرکەوتووم نەبوون، منیش ئاوا قوتابی سەرکەوتوو نەبووم. ئەگەرچی نە ئێوە درێخیتان کردو نەمنیش بەدەست خۆم بوو، ئێوە سەرکەوتوو نەبوون لەوەی هەموو تەجروبەکانی کارکردنتان پێ ئاشنا نەکردم تا لەوە وشیار تربم. دووچاری هەڵەی کارکردنی چەپ رەوی منداڵانە نەبم و هێواش و لەسەر خۆ کار بکەم و وریای پیلان و تەڵەی دوژمن بم، سەرکەوتووش نەبوون لەوەی تۆش کەوتیتە هەڵەکەی من و کەوتیتە داوی دوژمنەوە، مانەوەمان لەمەیدانی خەبات کردن لە کوردستاندا ببوایە هۆی باشتر کارکردن بۆ چاکتر نزیک بوونەوە لەڕزگارکردنی گەل و نیشتمانەکەمان لەدەست دوژمن. سەرکەوتن بوو نەک لە ئەنجامی نەبوونی تەجروبەیەکی چاک کەوتینە داوی دوژمن و ئەمڕۆ سبەی بە ئارەزووی خۆی بێ ترس لە سێدارەمان ئەداو لەکاروانی خەبات دامان دەبڕێ.

مامی بەڕێز دوژمن زۆری هەوڵدا بە جۆرەها شێوە ئەشکەنجەو ئازاری داین، جۆرەها کرداری نا مرۆڤانەی لەگەڵ بەکارهێنناین حەزم ئەکرد بمتوانیایە هەمووم بۆ بنوسیتایە، بەلاّم خۆت ئەزانیت لەزینداندا کارێکی ئاسان نییە نوسین دەرباز بکەیت بۆ دەرەوەی زیندان. چەند جارێکیش بە نوسین رەوانەم کردووە بۆ سەرکردایەتی رێکخستنەکەی خۆمان ئەگەر شەهید نەبووی و رزگار بووی داوایان بکە بەدەست خەتی خۆم هەمووم نوسیوە دڵنیام دڵت ئەیەشێ چونکە شێوەی جۆر بەجۆری نا مرۆڤانە ئازاریان داوین، بەلاّم دڵ خۆش دەبی بە پاڵەوانییەتی و خۆگریمان.

ئەزانی مامی بەڕێزم هەر جارێك قۆڵیان ئەبەستم لە پشتەوە هەڵیان ئەواسیم بەپانکەدا قسەکانی کۆبوونەوەکانی ئێوەم بیر ئەهاتەوە کە لەماڵی ئێمەدا ئەتان کردو من و دایکم لە دەرەوە حەرەس بووین. جار جار خۆم پێ نەدەگیراو ئەهاتمە بن دەرگاکە گوێم لێئەگرتن. ئەو سەردەمە زۆر گرنگیتان ئەدا بە مەسەلەی کەوتنە

داوو خۆڕاگرتن‌و بەڵگە نەدانە دەستەوە گوێم لێبوو ئەتان وت: ئەوەی خۆی نەدات بەدەست دوژمنەوەو ناوی ڕێکخستن‌و هاوڕێ‌و خەڵکی نەبات، ئازاد دەکرێ‌و ئەگەر ئازادیش نەبوو شەهید کرا لەلای خەڵکی ڕێزی زۆر ئەبێ، بەڵام بە پێچەوانەوە گەر دان بەڕاستیدا بنێ ئەشی کوژن‌و خائین دەبێ.

قسەی کۆبوونەوەکانی ئێوەو دووربینی ئێوە زۆر سوودی بە ئێمە گەیاندو کەڵکی باشی هەبوو، لانیکەمی سەر شۆڕی هاوڕێ‌و ڕێکخستنەکەمان نەبووین‌و ئەوەی بۆشمانکرا درێخیمان نەکرد.

مامەگیان قسەم زۆرن‌و لێرەوە ناکرێ، گللەیی ئەوەم هەیە لەکاتی خۆیدا قسەت بۆ نەکردین لەترسی ئەوەی منالْ بووین نەك دەست دوژمن بکەوێتەوە، ئەگەر کاتی خۆی هەوڵی زۆرت لەگەڵدا بدامایە ئاوها بە ئاسانی نەئەکەوتمە داوی دوژمنەوەو ئێستا سودم زۆر تر دەبوو، بەڵام بەڵێن بێ تا منیش گیان ئەبەخشم لەسەر ڕێبازی رزگارکردنی خەڵکی کوردستان سوور دەبم.

هەر بژی ڕاستی.

بژی خەباتی رەوای خەڵکی کوردستان.

بمرێ دوژمنی بەعسی داگیرکەر.

برازات

**دکتۆر مارف**

قەسابخانەی موسڵ.

هەر خوا خوای بوو لە سێدارەی نەدەن، تا هەواڵی دایکی ئەزانێ‌و نامەکەی بۆ ڕەوان ئەکات.

هیواکەی هاتەدی سەری مانگ عومەری برای هاتەوە وەکو زانیبێتی عوسمان لە سێدارە ئەدرێ، ئەمجارەیان پرشنگ‌و مەشخەڵ‌و پەیمانی کچی برد بۆ لای مامیان، هەریەکەیان چەپکە گوڵێکی جوانیان بەدیاری بۆ هێنابوو، مارف چاوی بەبرازاکانی کەوت زۆر پەژارەی خوارد حەزی دەکرد لە کوردستان سەردانیان بکردایە، بۆ ئەوەی لەوێ هەندێ سرودی شۆڕشگێرانەی فێر بکردنایە. خۆی پێ نەگیرا "پەیمانی" گرت بە باوەشەوەو بەدەنگە خۆشەکەی ئەم هۆنراوەیەی خۆی بۆ وت:

هەردێمەوە...... هەردێمەوە

بەرەو شارە خنجیلانەکەم ئەگەڕێمەوە.

دەرگای ژووری دایکە هەژارەکەم ئەکەمەوە.

وێنە تۆزاوییەکەی دایکمو باوکم ئەسڕمەوە.

وێنە تۆزاوییەکەی دایکمو باوکم ئەسڕمەوە.

فرمێسکی قەتیس بووی چاوتان

بەزەردەخەنەی لێو ئەگۆڕمەوە.

هەر دێمەوە هەر دێمەوە.

پاشان مەشخەڵو پرشنگی بانگکردە لای خۆی تێر تێر روومەتەکانیانی مژی، لەپەناشەوە نامەکانی لەسوخمەکەی پەیماندا شاردەوە بەبێ ئەوە بیهێڵی پەیمان ئاگاداربێ.

هەواڵی دایکی پرسی، عومەری براسی سڵاوی دایکی پێداو وتی: "دوێنێ لای بوون لەزیندانی ناسریەیە، جاری پێشوو کەلەلای تۆ گەڕامەوە سەردانی ئەبوغرێبم کرد بۆ لای مامم سڵاویان هەبوو هەر دڵیان لای تۆ بوو، باسی ئازایەتیو بەورەیی تۆشم بۆ کردن مامەم زۆری پێ خۆش بوو برازاکەی وەها هەڵکەوتووبێ ئەو هەموو دڕندایەتییەی ئەمان نەیان روخاند بێ.

دایکیشم دڵی ئەدایتەوەو ئەیوت: "هەمووومان ئازاد دەبینو سەر لەنوێ لە دەوری کوانووە رەسەنەکەی خۆمان یەك ئەگرینەوەو شایی سەرکەوتن ئەگێڕین، چەپکە گوڵی سەر کەوتنو سەربەرزی لەسەر گۆڕی غەریبو عەبدولڕەمان دائەنێین" قسەی زۆر بوو بەڵام ئەبوو گوێ بۆ بەرامبەرەکانیش رابگرێت خەڵکێکی زۆر هات بوون بۆ لایو زۆریان پێ خۆش بوو عوسمان ئەوەندە ژیرو خۆگرو ئازا بووە، پۆلیسەکە هاتەوە بوو بەدرکەکەی مەموزین، نێوانی خزمانی کردەوە تەنها ئەوەندەی وت: بەچرپە "کاکە بەرۆکی پەیمان بگەڕێن لەماڵەوە بیدە بەمامەو دایکم".

عومەرو خزمان چاوەکانیان سور هەڵگەڕابوون، فرمێسك هۆن هۆن دەهاتە خوارێ بەچاویاندا، مەشخەڵو پرشنگو پەیمان پرسیان "مامە کەی دێتەوە بۆ ناومان ؟!!"

ئەیانزانی ئەم جارە دواجارە بەڵام بەرزیی وورەی مارف لێی تێك دابوون، هەر بە بزەو زەردەخەنە بەرێیکردنو خۆی چووە شوێنی چاوەڕوانی لەداردان، کۆتایی بوو جارێکی تر بۆ سەر گۆڕەکەی چوونەوە.

عومەر تا دەهات لاوازتر دەبوو، ڕۆژانە پرشنگو پەیمانو مەشخەڵ پرسیار یان دەکرد "مامەمان دێتەوە؟! کەی دێتەوە؟!".

پێشمەرگە خۆیان ئاشکرا کردبوو هەواڵی شەهیدانی موسڵیان بە شێوەی پۆستەر لەمزگەوتی گوندەکاندا هەڵدەواسیو کەوتبوونە باسی ئەوەی پێویستە هەموو خەڵکی ببن بە پێشمەرگە دژی سیاسەتی بە عەرەبو بەبەعسی کردنو ڕاگوێزان.

پەژارەی مارف هەر لە زیندان بوو، کە تەرمەکەی زەهۆی دایکیشی یان دایەوە هیوایەکی لەشاردا نەمابوو، پەلی منداڵەکانی گرتو چووە گوندەکەی باوکی، بە پەلە چووە بنکەی پێشمەرگایەتیو خۆی ناونووس کردو ئەنجام بووبە فەرماندەی یەکێك لەو کەرتانەی سەرەتای شۆڕش، هەواڵی ئازادبوونی مامی زانی بەپێی بڕیارێکی لێبووردنی گشتی. یادی دکتۆر مارفی کردەوە ئەگەر بمایە ئێستا ئەبوون بە سێ پێشمەرگە لە شۆڕشدا، چەند خۆش دەبوو زۆری بیر لێدەکردەوە.

ئەو سەردەمە شوێنێکی دیاری کراو نەبوو بۆ پێشمەرگە، هەرچەند سەعاتەو لەشوێنێك ئەبوون.

عومەریش دووچاری نەخۆشییەکی کوشندەبوو، ئەویش باوکی ئاسا بەبەرگی پێشمەرگایەتییەوە گیانی بەخشی، بێ دکتۆرو دەوا.

سەرەی پرشنگو مەشخەڵو پەیمان هات، کەڕووبەڕووی دەردەسەری ژیان بنەوەو ئەوانیش لەگەڵ سەدان بنەماڵەی تری کوردستاندا بەر شاڵاوی کورد قڕانەکەی ساڵی (١٩٨٨) (ئەنفال) کەوتنو تا ئێستاش بێ سەرو شوێنن.

خوێنەری بەڕێز:

داستانی بنەماڵەی عەبدولڕەحمانو بەسەرهاتی خۆیو ژنو منداڵەکانی بریتی بوو لە زنجیرەیەکی لەیەك نەپساوە لە خۆڕاگریو گیان بەخشینی وشیارانەو

دڵسۆزانه.

داخەکەم من ئەو توانایەم نەبوو وەکو هەبوو وەها بە چیرۆك زیندووی بکەمەوە، کەببێ بە سەرەتایەکی چاك بۆ لێوە فێربوون بۆ رۆژگاری خەبات گێڕانی داهاتوو، هەر ئەوەیە هەوڵم داوە لەناوچوون بیپارێزم و هەروەکو ئێستا ئەیبینی پێشکەشتانی ئەکەم، چونکە کورد ئەڵێ "کردە پەشیمان بی نەك نەکردە پەشیمان".

ئێران

١٩٨٨/٣/٥

# چەپکێ قژو چوار پەنجە

پێشکەشە بە:

تێکڕای ئەنفال کراوەکانی گوندەکەیان.

گوندەکەیان بوو بەشوێنی رایەڵەی فڕۆکەکانی دەوڵەت، دانیشتوانی گوندەکە واڕاهاتبوون لە گەڵ تاریكو روونی بەیانیدا خۆیان ئامادە ئەکرد بۆ چوونە دەرەوەی گوندەکە، بۆ پەناگا، هەتا ئاژەڵەکانیش کە گوێیان لەدەنگی فڕۆکە دەبوو بۆ دەرەوەی گوندەکە رایان دەکرد.

مام گچکەڵ ئاژەڵداری کردبوو بە پیشەی شەو ڕۆژ بەدوای بەخێوکردنی ئاژەڵەکانیانەوەبوو لە گوندەکەی خۆیانو سنووری لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانی بەولاوە هیچ شوێنێکی تری ئەم دنیا فراوانەی مرۆڤایەتی شارەزا نەبوو، تەنها لە ئاژەڵ داریدا پسپۆڕی هێنابوو.

سەرناسێکی چاك بوو لەئاژەڵ ناسیدا وابوو دووسێ پشتی ئاژەڵەکانی بەشێوە لێك جیا دەکردەوە، دنیا لای ئەو گوندەکەی خۆیانو دەوروبەری بوو، لەو گۆمەڵگا گەورەیەی مرۆڤایەتی تەنها خەڵکی گوندەکەی خۆیانی دەناسیو پەیوەندی تەنها بە خدری کوڕیو فاتمی هاوسەرییو چەند شوانی مەڕو ماڵاتی سنوری پاوانەکەی خۆیەوە بوو.

تا ئەمڕۆش نەیدەزانی میلی رادیۆ بابدات لەکاتێکدا رادیۆ قسەی ئەکرد زۆر بە سەیرەوە ئەتڕوانی بۆ ئەو مرۆڤەی قسەی تێدا ئەکاتو، وای ئەزانی بچوك بۆتەوەو لەناو لاشەی رادیۆکەدا قسە دەکات.

پیاوێکی رووخۆشو قسە خۆشو ئازا، لەدواندندا نیازی بەماڵو سامانی کەس نەبوو، بالآیەکی بچکۆلەی گردەی هەبوو، زۆربەی زۆری کات ریشە ماشو برنجەکەی هات بوو، لەناو ماڵی خۆیاندا ژیانێکی زۆر خۆشی هەبوو لەگەڵ فاتمی خێزانی زۆر دڵیان بە یەك خۆش بوو، کوڕێکی تاقانەیان هەبوو، پێیان وابوو ئاسمان کون بووەو تەنها ئەوی لێبەر بۆتەوە.

بەیانی ئاژەڵەکانی ئەبردە دەرەوە هەتا ئێوارە دەهاتەوە فاتمو خدر

لەچاوەڕوانیدا بوون، ژیانێکی بێ غەمو هەژارانەیان بۆ خۆیان دابین کردبوو، بە نیازی ئەوە نەبوو لەوە زیاتر بخەنە سەر گوریسی کۆکردنەوەی سەروەتو سامان.

فاتم بە سەلیقە رووخۆش‌و بەپەرۆش بوو بۆ پەیوەندی دراوسێیەتی، بەیانیان گورج هەڵئەسا مەشکەکەی ئەژاند، هەندێ لەدۆیەکەی دەبەخشییەوە بەسەر دەرو دراوسێکانیدا، خلە گیانیشی لەنزیك خۆیەوە دا ئەنا هەرکە مەشکەکە دەژانرا گورج ژەمە کەرەیەکی بۆ ساز ئەکرد لەسەر ژێر پیاڵەیەك‌و هەندێ شەکری بۆ پێوە ئەکرد، دەیوت: "کوڕم ماڵی دنیا هەر بۆتۆیە".

راستیان وتووە: کەس ژیانی هەتا سەر بێ کێشە بۆ ناڕواتە سەر؟! ئەم خێزانە بچکۆلانە بێ زیانە لەپڕێکا دووچاری کارەساتێکی زۆر ناخۆش بوون‌و خدری تاقانەیان دووچاری نەخۆشیەکی کت‌و پڕبوو، لە ئەنجامدا بوو بەهۆی شەلینی قاچێکی‌و وردە وردە کورت بۆوە.

ماوەیەکی زۆر لە جێگادا بۆی کەوت، زۆر پێ ئەچوو سەرەتای نەگبەتی‌و نەهامەتی بنەماڵەکەیان بێ، ئەگینا کێ بینیویەتی بە نەخۆشی قاچ کورت بێتەوە.؟ گچکەڵ‌و فاتم زۆر پەرۆش بوون بۆی، هەر بۆیە هەرچی بۆیانکرا بۆ چارەسەری هەر لەمەحمود ساڵەواتەوە تا دەرمان‌و شێخ عەبدولکەریم عەوالان‌و چەندان شێخ‌و مەلای تریان برد ئەنجام گەڕانەوە لای پزیشك‌و دەواو دەرمان، بەڵام چارەی هەر نەبوو، بەناچاری گۆچانێکیان دایە دەستی بۆ ئەوەی دەرو ماڵی پێ بکات بەڵکە جولانەکەیشی بۆ ببێ بەشیفاو پێی چاکبێتەوە.

زۆر بەسەر کارەساتی شەلینی خدردا تێ نەپەڕی بوو، دایکشی بەسەر مناڵەوە کۆچی دوایی کردوو منداڵەکەیشی خدر خۆش، مام گچکەڵ دووچاری بەڵایەکی گەورەتربوو نەی ئەزانی لەمەولا چی لەخدر بکا، ئەی ئاژەڵەکان؟ ئەی مەشکەو ماڵەکەی کێ بۆی جێبەجێ بکات؟ ئەمانە هەموو پرسیاری بێ وەڵام بوون لای ئەو، نەی ئەزانی چی بکات.

باشە چی بکات خۆ لەناو کوردەواریشدا بە شورەیی ئەژمێردرێ، پاش ژن مردن ئاوا بە زوویی‌و بێ تێپەڕبوونی چەند ساڵێك بەسەر مردنەکەیدا ژن بهێنێ، هەرچی ئەکرد سەری لێدەرنەئەکرد.

چەند مانگێ تێپەڕبوو خەڵکێکی زۆر ئاگاداری باری ژیانیان بوون، خدر هەر لاواز تر دەبوو، مەڕەکانیان لەبەربێ سەرپەرشتی کردن، هەندێکی گورگ خواردی‌و

هەندێکی تریشی ئاوێتەی رانەمەڕی تر ببوون.

گچکەڵە یەخەی کراسەکەی لەپێ چڵکی لەسەر کەوت بوو، هەمیشە بەسەر خۆش ئەچوو، بەلادا ئەهات بەهەر لایەکدا ئەڕۆی بەنوکی پێڵاوەکانی شەقی لەبەرد هەڵئەدا. زۆر بەزەییان بە حاڵیدا ئەهاتەوە، سەردەمێ فاتم کە لەژیاندابوو یەخەی کراسی گچکەڵە ئەتوت کافوری سپییە، ژیانیان زۆر رێك بوو، گچکەڵە هەمیشە گورج و گۆڵ و دەم بەخەندەو قسەخۆش، ئەوەتا ئێستا وای لێهاتووە، تۆ بڵێی لۆمەی بکەن ئەگەر بیرێك لەژن هێنان بکاتەوە بەڕاستی وەزعەکەیان زۆر تایبەتە، هەق نییە کەس گلەیی لێ بکات.

هەندێ پیاوی هاوتەمەنی خۆی چوونە لایی و دایان بەگوێدا "بۆچی بیرێك لەوەناکاتەوە پیرەژنێك بهێنێ بەڵکە خدریش ئەبووژێتەوەو خۆشت ئاهێکت بەبەردا دێتەوە، ئاژەڵەکانیش ئاوا نافەوتێن، کوڕە خۆ هیچ نەبێ کەوچکە شۆربایەکت بۆ دەکاو جلو بەرگەکانتان بۆ ئەشۆرێ".

خۆشی زۆر بەخەیاڵیدا ئەهات کە ژیانیان بەو شێوەیەو بەو بێ کابانیە ئاسان نییە، بەلام کەیادی خۆی دەهێنایەوە وەکو ئەمەکداری بوو ئەو هەموو دڵسۆزی و رێك و پێکی و خۆشەویستییەی فاتمی خێزانی ئەوسا تەزوو لەتەپڵی سەرییەوە ئەهات و لەبنی پێیەوە دەرئەچوو، ئەیوت: "نا، نا قەت ژن ناهێنم بڕواش ناکەم کەسێکی تر هەبی وەکو دایکی خدر ئاگای لەدڵی من هەبێ و سەرپەرشتی ماڵ و منداڵم بۆ بکات، لەکاتێکدا خدر ئاوها شەل و پەك کەوتە بووە، ئانا بڕوا ناکەم زڕدایك هەفتەیەك بەرێك و پێکی بۆم بەخێو بکات. پاشان ئابڕوشم ئەچێ تەنها ئەو کوڕە شەلەم هەیە ئەویشم پێ دەردەپەڕێنێ یان ئەبێ خۆم دەریکەم".

خەڵکی زۆریان بۆ هێنان، رۆژێکیان لەهەیوانی مزگەوتەکەی بەرامبەری ماڵی خۆیان دانیشت بوو، سێ چوار هاوتەمەنی خۆی هاتن لەگەڵ خۆیان بردیان بۆ لای ماموستای مزگەوتەکەیان، مام گچکەڵ زۆر شەرمی دەکرد، زۆرکەم لەڕووی ئەهات لە مەجلیسی ئاوهادا دابنیشێ، کە ماموستا یان پیاوی ناو داری تێدا بێت، بەدەوری ماموستادا دانیشتن و پرسیارەکەیان دووبارە کردەوە "ئەرێ ماموستا خۆت لەو نزیکانەوە ئاگات لە وەزعی ماڵی گچکەڵە، هیچی تێدایە گەر ژنێکی بۆ پەیدا بکەین؟".

مەلاش لەخوای ئەویست پرسیاری لێ بکرێ لە پێشەوە هەندێ حەدیسی بۆ

خوێندنەوەو ئەوسا دەستیکرد بە قسە کردن لە سەر وەزعی تایبەتی و بڕیاری بۆ دا کەژن بهێنێ "هیچ تاوانی نییە هەر کەسێ ئاگای لەژیانی ئێوە هەبێ هەقت پێ ئەدا ژن بهێنی" ماموستا رووی کردە هاورێکانی گچکەڵ "ئێوەش کۆششی بۆ بکەن منیش لای خۆمەوە هەوڵ ئەدەمو بڕواش ناکەم گچکەڵ لە قسەمان دەربچێ، ئەمەش لەبەر خاتری خلە شەل ئەکەین".

ماموستا رووی کردە مام گچکەڵو وتی: "بەڕاستی هەقە مەڕەکان بکەیت بە پارەو لەمەولا پیرەژنێك بهێنی و خۆتو خدر ژیانتان بگۆڕن، ماڵ کاول تۆ هەر لەگەڵ مەڕدا بەکێوەوە گەورە بویتو تا ئێستا شارو شارۆچکەیەکت نەدیوە، هەوڵبدە لەمەولا خدریش بهێنە بۆ حوجرە بەڵکە یەك دوو سورەت قورئانی پیرۆز بخوینێ، سبەینێ لەمردنی کەسێکدا بتوانێ سورەتی یاسین بخوێنێ".

ماموستا مەسەلەکەی زۆر قوڵ کردەوەو رێگاکانی لەگچکەڵ بەست، ئەویش دەمی هەڵهێنایەوە "بەڵێ فەرمودەتە، ماموستا چۆن ئێوە ئەفەرموون من وائەکەم لەم ماوەیەدا مەڕەکان لەناو ئەبەم، کەی خوا رێکیخست ئەوە جێ بەجێ ئەکەین".

هەوڵی ماموستاو هیمەتی برادەرەکانی بەدڵسۆزی بێوەژنێکی لێ قەوماویان بۆ دۆزییەوە کەهەرچۆنێ باسیان ئەکرد پڕ بەپێستی گچکەل بوو، بۆ پڕکردنەوەی شوێنەواری دایکی خلە شەل مام گچکەڵیش رەزامەندی خۆی نیشانداو "بەهێ" ی هێنا، بەهێش ماڵی بۆ گچکەڵ ئاوەدان کردەوە، دەستێکی باشی بە ژیانی خدردا هێنا و ملیوانەکانی گچکەڵ سپی بوونەوە، بزە وردە وردە گەڕایەوە بۆ سەر لێوەکانی خدرو وردە وردە کەوتە سەر قاچو رۆیشتن تا ئەهات باشتر دەبوو. ژیانێکی ئاسایی رووی کردە ماڵیان، بەهێی لێقەوماو لەگەڵ گچکەڵی هاودەردی واڕێزیان لە خۆیانو ژیانیان ئەگرت خدریشی پێوە دڵ خۆش ببوو، ساڵ هاتوو تێپەڕی خدر گەورەتر ئەبوو چێژی لە ژیانی ئەکرد، بەهێی زڕدایکی بۆی بوو بەخێرو خۆشی، کچێکی جوانیان بوو زۆری پێخۆش بوو هاوڕێی بۆ پەیدابوو لەماڵەکەداو هیوایەکیشی بۆ پاشە رۆژ بوو، بەهۆی ئەو خوشکەیەوە ژنی پێ بدەن ئەگەر وانەبێ کێ ژن ئەدا بەخلە شەل.

خدر بەهێ خانو گوڵەی خوشکی خۆش ئەویست، ژیانی خێزانەکە تا دەهات روو لەخۆشی دەڕۆیی و شوێنەواری ماوەی پێشوو دائەپۆشرا.

جارێکی تر گچکەڵ مەڕدارییەکەی لاشیرین بۆوە، چەند سەر مەڕێکی پەیدا

کرد، ڕۆژانە ئەیبرد بۆ لەوەڕگا.

گوڵە کەوت بووە سەر پێ لەگەڵ خدردا تاو تاو ئەچووە سەر حەوزەی مزگەوتەکە، گوڵە ببوو بەگوڵی ئینجانەی ماڵەکە، شەو سەرەی باوکی بوو تا دەخەوتن لە نزیکی خۆیەوە دای ئەناو چیرۆکی خۆش خۆشی بۆ ئەگێڕایەوە، ڕۆژیش بە دایك و کاکی نازی ئەگیرا، بەڕاستی ببوو بەکچی چیرۆك و زۆر زوو هەڵکشا جار جار گۆرەوی کاکی و باوکی ئەشۆری و حەزی ئەکرد لەشوێنی دایکی قاپەکانیش بشوا.

بەڵێ ژیانێکی زۆر ئاسایی گەڕابۆوە بۆ ناو ماڵەکەیان، بەتەواوەتی تاڵ و ترشی دوای مردنی فاتمی لەیاد چووبوو.

ئێوارە درەنگ بوو وەکو ڕۆژانی پێشتر گوڵەو خلە لەسەر ڕێگای هاتنەوەی باوکیان وەستا بوون، بەهێ هەر بۆڵەی ئەهات "دڵم دێشێ، نەهاتەوە بۆچی نەهاتەوە" نەشی ئەویست خدر گوێی لێ بێت، گوڵەش هەرناو بەناوێ ئەیوت: "کاکە باوکم کەی دێتەوە؟!" بەهێ خۆی پێ نەگیرا "خدر خدر" خدریش بە شەلە شەل هاتەوە بەرەو حەوشە، "بەڵێ، دایە بەڵێ" کوڕم سەرێ لەماڵی مامەت بدە بەڵکە یەکێکیان سۆراغی باوکت بکەن، وا شەوە درەنگە نەهاتەوە".

خدر دڵی ڕاچەنی لەپەرۆشی دایکی بەپەلەو شەلە شەل هەنگاوەکانی هەڵ ئەهێنایەوە، سەری بەماڵی مامیدا کرد هەواڵی دواکەوتنی باوکی دانێ، ئەوانیش کەوتنە سۆراغکردن و لەشوانەکانی گوندەکەیان پرسی، حەمۆل یەکێك بوو لەشوانەکان وتی: "ئەوەندەم ئاگا لێبوو مەڕەکانی لەپاوانەکەدا ئەلەوەڕاند، وەکو ڕۆژان نەدەلەوەڕان ملیان پێوەنابوو بێ سنوور ئەجوڵان هەتا منیش هاتمەوە ئەوان هەر لەناوەڕاستی پاوانەکەی "توتە مڕ"ی خۆیاندا بوونز دنیا تاریك بوو مام گچکەڵ دیار نەبوو" خزمان پەلەیان پێ کەوت، سەرو چرایان هەڵگرت و ڕوو لە "توتە مڕ" کەوتنە ڕێ، زۆر گەڕان، مەڕەکانیان دۆزییەوە، سەگە بۆرە زلەکەشیان ئێشك چی مەڕەکان بوو گەمارۆی دابوون، زۆر بەزەحمەت توانیان مەڕەکان بهێننەوە. مەڕەکانیان کرد بە حەوشەدا، بەهێ خان دڵی خۆش بوو وای ئەزانی گچکەڵ هاتەوە بەڵام ئەوڕەحمانی برازای ئاگاداری کرد کەمامی دیارنییە بەڵام جارێ دان بەخۆیاندا بگرن بزانین چی ڕووی داوە.

لەبەهێی ئامۆژنی پرسی "ئەرێ ئامۆژن مامەم کێشەو ناخۆشی لەگەڵ کەسەدا

هەبووە ئەوەندەی تۆ ئاگادار بیت؟" بەهێ وتی: "کاکە ئەوڕەحمان گچکەڵ پیاوێکی ئەوەندە چاکە تا وەکو ئێستا گوێم لێ نەبووە زەمی کەس و لۆمەی کەس بکات، تەنها ڕۆژێك باسی ئەوەی کرد کوردە کۆچەرییەکان پایزان دێنە خوارەوە لەنزیك گوندەکەمان پوش و پاوان ئەکرن زۆر جار پرکێشی ئەکەن، شەوان بەدزییەوە مێگەلەکانیان ئەکەن پاوانەکەیانەوە، ئەگەر لەگەڵ ئەوان دووچاری دەنگە دەنگ نەبووبێ چاکە، لەوەش زیاتر هیچی تر شك نابەم"

ئەم قسەیەی بەهێ سەرنجی عەبدولڕەحمانی ڕاکێشاو لەدڵی خۆیدا وتی: "خۆ بەڕاستی لەم کۆمەڵگایەی ئێمەدا هێشتا خەڵکی وەها دواکەوتوومان هەیە لەسەر پوش مرۆڤ بکوژێ لای شتێك نییە،ساڵی ڕابردوو ئاغای گوندەکەمان خزمەت کارەکانی هانداو لەسەر تفەنگێکی چیکی کەمستەفای وەستا خدر بە ڕەنجی شانی خۆی کڕی بووی کوشتیان و هەتا ئێستاش چەندان کاری وەها نابەجێ لەبەر نەبوونی وشیاری تەواوی خەڵکەکەیان ڕووی داوەو بووە بەهۆی پەیدابوونی دوژمنایەتی گەورەو چەندان بنەماڵە بوونەتە سووتەمەنی ئەو نا وشیارییەی ئێمە. هەتا ئێستا ڕووداوی وەهامان زۆر دیوەو هەتا ئێستاش خۆمان تێ نەئالاندووە جازۆر مەترسی ئەوە ئەکەم تێ بکەوین و ماڵ و منداڵمان دووچاری دەردەسەری و شەونوخونی بکەوێ، خۆکەریش بوو بەتوشەوە ئەبێ شانەی بۆ هەڵگری.

زۆر جار بەناڕەوا لەغەرەزێکی تایبەتییەوە کلکی گوێ درێژی بێ زمان و بێ تاوان ئەبڕدرێ بۆ لۆمەی بەرانبەرەکەی، بەڕاستی شتی وەها نا ماقوڵیش لەویژدان و مێشکی مندا جێی نابێتەوە!!

ئای خلە شەل بەخوا نان و دۆبڕی ئەمجارەش لێت نەقەومێتەوە چاکە، ئەی بەهێی بەدبەخت دوێنێ بوو هاوسەرەکەی تری لەسەر دەمە قاڵێك کوژرا، ئەم ڕۆش خوا ڕەحم بەو بکات".

ئەوڕەحمانی برازای بەنج ببوو لێی کۆبوونەوە "برا چاوەڕێی چی بکەین؟ بەرنامەمان چی بێ و کوێ بگەڕێین.؟ تۆ بڵێی ڕووی کردبێتە کوێ.؟ خوا بکات مار پێوەی نەدابێت چاکە، مام ڕەشیدی برای ڕووی کردە خزمان " نەگبەتی خۆشە بەڵام قۆرتەکانی ناخۆشن، خوا بەخێری بگێڕی دان بەخۆتاندا بگرن. سبەی زوو کێومالێکی بۆ بکەن، هەر لەتەنگی سەرو چاوەوە تا حەوشەی سملکاوی پاوانە ڕووتەو کانی کەتان هەتا سەری توتەمڕ، شیوو دۆڵ بگەڕێن، من گومانم لەوە هەیە

لەسەر سنوری پاوان دووچاری شەڕبووبێ لەگەڵ شوانەکان و لەناویان دابێ. ئەگەر بمایا هەتا ئەوسای ئێوە چوون مەڕەکانتان هێنایەوە دەرئەکەوت، هەڵسن باپڕۆین سەری بەهێ و خلە بدەین".

کاتێ ڕەشیدو خزمان چوونە لای خلەو بەهێ، دۆش دامابوون، گوڵەی جوان کیلە فێرنەبوو شەوێك لەدەوری باوکی دانەنیشێ زۆر پەرێشان بوو، دایکی و کاکی هەڵپێچابوو "کوا باوکم بۆ کوێ چووە.؟ کەی دێتەوە؟!"

قەرەباڵغیان کرد، چەند سەعاتێ ئارام بوونەوە، هەر چۆنێ بیریان لێ ئەکردەوە هەر ئەچوونەوە سەر ئەوەی کەلەسەر پوش و پاوان سەرنگون کرابێت، ئەوشەوە بەهێ و خلە خەویان لێ نەکەوت، گوڵەش ئەوەندەی تر پەرێشانی کردبوون بەهەواڵ پرسین، بەیانی خدر زۆر زوو چووە بۆ ماڵی مامی و داوای لەئامۆزا عەبدولڕەحمانی کرد پەلە بکەن لەسۆراغکردنی باوکی.

پاش نان خواردنی بەیانی ئاگاداری گوندیان کردەوە کێومالێکی پاوانەکانیانکرد کون و پەنا بەردو شیو زۆر گەڕان، سەگە بۆرەکەشیان برد بوو، لەسنوری پاوانەکەی توتەمڕی خۆیاندا دەستی کرد بە بۆن کردن و بەرەو شاخێك ڕۆیی، ئەورەحمان بەدوایدا ڕۆیشت، چووە ناو تلیشە بەردێکەوە ڕوانی کەپەنکەکەی مامی لەوێیە، تاوێ لێیروانی مامی لەوێدا بەپەل پەل کراوی دانراوەو بە کەپەنکەکەی خۆیدا پۆشراوە، هاواری لێ هەڵسا... خزمان وەرن والێرەیە".

هەموو لێی کۆبونەوە، سەرنجێکی تەرمەکەیاندا زۆر بێ ویژدانانە کوژرا بوو، تەرمی پارچە پارچە کراویان هێنایەوە بۆ خلە شەل، ئێستاو ئەوساش کەسێك پەی بەوە نەبرد کە کێ کوشتویەتی بۆ؟! تەنها هەموو ئەوەیان ئەزانی لەسەر سنوری پوش و پاوان لەتلەت کراوە.

بەڵێ نەگبەتییەکەی بنەماڵەکەیان مام گچکەڵشی گرتەوە، خلەو گوڵە بێ باوك مانەوە، بەهێ کەوتە ژێر باری پەروەردەکردن و بەخێوکردنی منداڵەکانەوە، ژیانیان بەتەواوەتی تێك چوو، مەڕەکانیش جارێکی تر کەوتنەوە بەردەمی فرۆشتن.

بەهێی دایکی پێشنیار بۆ خدر کرد هەتا پارەی مەڕەکان تەواو نەبووە بەڵکە کارێکی پێوە بکەن بۆ ئەوەی بژێوی خۆیانی پێ جێبەجێ بکەن، خلە پێشنیارەکەی دایکی پێ چاك بوو، پارەکەی لەدایکی وەرگرت و سەردانی شاری کەرکوکی کرد بۆ کڕینی پێویستی بۆ دوکانێکی بچکۆلە لەوردە واڵە کەزیاتر بۆ

بەردەستی ڕۆژانەی ماڵەکان بشێ.

خدر هەر کەگەیشتە بازاڕی حەسیرەکەی کەرکوک بەدوکانەکاندا ئەگەڕا بۆ بابەتەکانو هەرزانترین نرخ، لەپڕێکدا دوو سیخوڕ بن هەنگڵی دەگرنو دەیخەنە سەیارەوەو هەر لەڕێگا چاوی ئەبەستن، شەڕێکی زۆری دەرونی لەگەڵ دەکەن هەتا ئەیبەنە شوێنێکی نادیارو بەچاو بەستراوی فڕێی ئەدەنە ناو ژێر خانێکەوە لەهۆش خۆی ئەچێ، کاتێ دێتەوە هۆش خۆی دوو سیخوڕ خۆیانی لێ ئەگۆڕنو ئەڵێن ئێمەش گیراوینو هەندێ قسەش بە دەوڵەت دەڵێن. خدر باش بۆی دێو بەدوای قسەکاندا ناڕوا، خۆی لێ بێ دەنگ دەکات، نیو سەعاتێکی تر دێن بەدوایداو ئەیبەنە شوێنی لێدان.

سەرەتا لەکورسییەکی نزیکی یەکێك لەسیخورەکان دای ئەنێن، دەست ئەبەن، جگەرەیەکی ئەدەنێ، خلە ئەڵێ جگەرە ناکێشم، خێرا بانگ ئەکەن چای بۆ بهێنن، ناوێرێ بڵێ چا ناخۆم، چایەکە ئەخواتەوە لەسەر خۆ بەر پرسیاری سیخوڕەکان ئەڵێت "کاك خدر تۆ کوڕێکی چاکی، ئێمەش کارێکی زۆر گرنکمان پێتە ئارەزوو ئەکەین چیت پێ ئەڵێین جێبەجێی بکەیت، تۆش چی ئارەزوو بکەی ئێمە بۆت دەکەین".

خدر لای سەیر ئەبێ گەنجێکی شەلو شێتی وەکو ئەو ئەبێ چی پێ بکرێ وا دەوڵەت داوای لێ ئەکات کاریان بۆ جێبەجێ بکات، هەندێ مات ئەبێ، هەر بیری لێ ئەکاتەوە ناتوانێ تێ بگات.

سیخوڕەکان بەئاگای ئەهێننەوە "ها کاك خدر چی ئەڵێی؟" خدر ئەڵێ "فەرموون من چیم پێ ئەکرێو ئێوە چی ئەڵێن بابزانم پاشان بڕیاری لەسەر ئەدەم" سیخوڕەکان "تۆ زۆر شتت بۆ ئەکرێ، ئەمانەوێ لەگوندەکەی خۆتاندا هەر هەڵسو کەوتێکی تێك دەرەکان هەیە بینوسی یا تەسجیلی بکەیتو بۆمان بهێنیو تۆش چیت ئەوێ ئەوەت بۆ ئەکەین، هەموو مانگێك موچەیەکی باشیشت ئەدەینێ کەپێی بژیتو بۆ خۆشت کارو کاسبییەکی لەبەرەوە بکەیت"

خدر تێگەیی ئەیانەوێت ببێت بە سیخوڕ، یەکسەر بیری هاتەوە کە لەناو خەڵکیدا سیخوڕ ئێسك گرانەو جێگای لۆمەی خەڵکە، جگە لەوەی لەبنەماڵەکەی ئەماندا کاری سیخوڕی جێگای نەفرەتە سەرەڕای ئەوەی بەبەرچاوی خۆیەوە چەند کاری ناڕەوای دیوە دەکرێ بەرانبەر خەڵکی پاشان ئەزانێ پێشمەرگەکان چەند

بێتـاوانن، هـەموویان وازیـان لەخۆشـی ژیـانی خۆیـان هێنـاوە لـەپێناوی لابردنـی زوڵمو زۆری ئەوانـەداو چۆن ئـەم بۆ موچـەیەکی پـیس بڕوات سـیخوڕیەتی بەسـەر ئەوانـەوە بکـات. زۆر بـیری لێ ئەکاتـەوە هەڵوێسـتـەیەك ئـەکات پاشـان روو ئەکاتـە بەرپرسیاری سـیخوڕەکانو ئـەڵێ "مـن لاوێکـی هـەژارو بێ بـاوكو دایکـم، ئەمـەوێ بـەڕەنجی شـانی خـۆم خـۆمو خوشـکەکەم بـەخێو بکـەم، ئـەو کـارەی ئێـوە ئـەیڵێن لەتوانای مندا نییە" هەر ئەوەندەی خۆش ئـەبێ ئـەڵێ "لەتوانامـدا نییە ئەم ئەرکە بـەمن مەسـپێرن، بـەمن جێبـەجێ نـاکرێ" دەسـت ئەکـەن بـە لێـدانی ئەوەنـدەی لێ ئـەدەن تـا لـەهۆش خـۆی ئەچـێ، ئـەی نێرنـەوە شـوێنەکەی خـۆی جـا شـەویش جارێکی تر ئەنێرنەوە بەدوایدا، لەبەر چاوی کچێکی بەندکراو ئەهێننو پانتۆڵێکی پیاوانی لەپێی ئەکەنو ئەیخەنە بەر فەلاقە، بەسۆندە هێندەی لێ ئەدەن هەتا هـەموو لەشی ئەکـەن بـەخوێن، ئەوسا پێـی ئـەڵێن "بڕۆرەوە شـەوێکی تـر ئـەت هێنینـەوەو ئەگەر دەستەبەری ئەوە نەبی کـەپێت ئـەڵێین کـاری خراپـت لەگـەڵ ئەکـەینو ئەوسا هەر رۆژەی پارچەیەکت لێ ئەکەینەوە".

پاش رۆشتنی کچەکە بەتوڕەیی بەخلە ئـەڵێن "هـا ئـەڵێی چـی هـەر ئێسـتا ئـەبێ راسـتی بـدەیت بەدەسـتەوە، لـەکام پارتیـدا کارئەکـەی؟ کـێ بەرپرسـیارتە؟ چـەند ئابونە ئەدەی؟ بەرپرسیاری چەند کەسـی؟ ئەگـەر پێمـان نـەڵێیو سـەر راسـت نـەبی خـەڵك هەیـە قسـەی لەسـەر کـردووی ئێسـتا ئـەی هێنینـە بـەردەمت پاشان پارچـە پارچـەت ئەکـەین، هـیچ شـتێك لەحوکمـەت بـزر نییـە، ئێمـە وتمـان بـۆ خـۆت پیـاو ئەبیو کارمان بۆ ئەکەیو شتەکانیش خۆت ئاشکرای ئەکەی، بەڵام پیاوانـە ددانـی پێدانەنێی ئێمە ئەزانین چۆنت پێ ئاشکرا ئەکەین، دە بڵێ بزانم".

خلە زۆر ئەترسا لەدڵی خۆیدا ئەیوت: "لـەو نەگبەتییـەی ئێمـەی گرتـووە، باشـە بۆ ئـەبێت هـەمووی بەسـەریەکەوە رووبدات؟ ئەوە چـەند سـاڵێکە کارەسات بەسـەر کارەسـاتدا روو ئـەدات، توخـوا مـنو ئـەم بەزمـەیان وتـووە؟ هێشـتا دەرگـای ژیـانم لەسەر نەکراوەتەوە هەتا لێم داخرێ، من چی بکەم؟ چی بڵێم؟ تاوانم چییە.؟

سـیخوڕەکان لێـی تـووڕە بـوون "بـەرپێی خـۆت تەماشـاکە هـەر لـەم شـوێنەدا فەلاقەت دەکەین، پاشان سەرێ هەڵبڕەو بڕوانە بن میچەکە هەڵت ئەواسینو دەستت لەپشـتەوە ئەبەسـتین، هـەر وەکـو فڕفڕۆکـە ئـەت سـوڕێنینەوە، پاشـان ئـەو شوشـە لوسە جوانانەت بینیوە ئەبێ بەڕوتی لەسەری دانیشی دوای ئەوانە ئـەو پلاییسـەت

بینیـوە یەکـە یەکـە نینۆکـەکانت هەڵئەکێشـین. ئـەزانی ئەگـەر بتـەوێ خـۆت بەشۆڕشگێڕ نیشان بدەی ئەچین گوڵەی خوشکت ئەهێنین لێرە لە بەرچاوت چیمان بـوێ لێـی ئەکـەین. جـا چـاکتر وایـە ئـەو دەردە دووچـاری خـۆت و خوشـکەکەت نەکەیت".

زۆریان بۆ وت، مێشکی وەرینەدەگرت. لەبەر ئەوەی زۆر ئازار ئەدراو قاچیشی ناتـەواوبوو وای لێهـاتبوو خـۆی لەسـەر پـێ پـێ رانـەگیراو ئەکەوتـە سـەر زەوی و هەڵئەستایەوە. مردنی زۆر پێ خۆشتر بوو "گوڵە ئەهێنن وای لێئەکەن، جا بۆچی گوڵەی هەژار تێر شیر بووە هەتا لە بوش بیبڕنەوە" لە دڵی خۆیدا ئەیوت: "چیم لێئەکەن بیکەن، قەت لەوە زیاتر نازانم کە من ئەو کارەم بۆ جێبەجێ ناکرێ" لەدڵی خۆیدا بەپەلە ئەمانەی بەمێشکیدا ئەهات. لەپڕێکا بوو بەکردارو هاواری کرد "من ئەو ئەرکەم پێ جێبەجێ ناکرێ، جاچی ئەکەن دەسەڵات بەدەست ئێوەیە".

هەر ئەوەندەی خۆش بوو قسەکەی کرد گورگ ئاسا هەڵمەتیان بۆ برد، تێر تێر فەلاقەیان کرد هەتا قاچەکانی ئاوسا، خوێنی تێزا، هەڵیان سانده سەرپێ لەوێش بەکرەیەکیان بەگۆرانییەوە لەسەر کرد، بەدووکەس لە سیخورەکان سۆندەکاریان کـرد، کـەوت، ئەچـوونە سـەر پێـی خـوێن فیچـقەی ئـەکرد، لێیـان ئـەداو جنێـوی ناشیرینیان پێئـەدا، هـەڵیان ئەسـاندەوە، خـۆی پـێ نەئـەگیراو بـێ هـۆش ئەکـەوت، ئاویـان بەسـەردا ئـەکردو جارێکی تـر تـا خۆیـان وەکو ئەسپی عەرەبانـە فیشـکەی لوتیـان ئـەهات پاشـان دوانـی تـر ئـەهاتن، هـەر دوو باڵیـان بەسـت لەپشـتەوەو بەپانکەکـەدا هـەڵیان واسـی، فرەیـەك دوان سوڕایەوە، گرانـی لاشـەی وەختـابوو بن هەنگەڵەکانی دەربهێنێ، هاواری لێ هەڵسا "توخوا، تو پێغەمبەر، تـو ئینسـانییەت وازم لێ بهێنن" بـە تەوسـەوە پێیـان ئـەوت "گەوجـە ئەوانە ئیجـازەن" جـارێکی تـر هـاواری کـردەوە "ئەمانـە کـافرن" ویسـتی هـاوار بـۆ خـوا بکـات، بەڵام زانـی ئەوانـە گوێی پێ نادەن بۆیە هاوار هاوارەکەی گۆڕی "من توانام نییە هەژارم، هیچ کارێکم پێ ناکرێ لەهەژارییەکەی خۆم بەولاوە" زۆریان لێدا، چەند دەقیقەیـەکیش هـەڵیان واسی، شل بوو فڕێیان دایە پەنایـەکی ژوورەکەوە تاهاتـەوە سـەرخۆ. هێنایانـەوەو هەندێکی تر قسەی خۆشیان بۆ کرد، ماوەیاندا بڕوا شەوو ڕۆژێك بیری لێبکاتـەوە، ئەوسـا بێتـوە راسـتیەکان بـدرکێنێ، بـەڵێنی کـار کردنیـان پـێ بـدات خـۆ ئەگـەر پێچەوانە بوو خۆی بۆ کوشتن ئامادە بکات. زۆری پێ خۆش بوو کەوتیان: "خـۆت

بۆ کوشتن ئامادە بکە" ئەمجارەیان باسی هێنانی گوڵەیان نەکردەوە خۆشی یادی هاتەوە کە گوندەکەی ئەمان لەژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدایە ئەمان ناتوانن گوڵە بهێنن بۆیە دڵی خۆشتر بوو، خۆی بۆ مردن ئامادە کرد.

ئەو شەوو رۆژە چەند کەسێکیان هێنایە ژوورە تەنها کەی ئەو، هەموو دەمیان تاقی ئەکردەوە هانیان ئەدا چی ئەزانی بیڵێ، ئەیان ترساند "ئەو دەوڵەتە هەرکەسێ راستی پێ نەڵێ ریشەی ئەکێشن" یەکێکیان بۆی باسکرد کەزۆر بەرگری کردووە، بەڵام رۆژێك ژنەکەیان هێناوەو کردویانە بەگژیداو داوایان لێکردووە ئەگەر خۆی نەدا بەدەستەوە ئەو حاشای لێئەکات. جگە لەوەی دوور نییە کاری خراپی لەگەڵ بکەن، بەڵام ئەو خۆی نەداوە بەدەستەوە. رۆژێکی تر کورێکی هەبوو ئەویشیان هێناوەو لەبەر چاوی ویستویانە سەری بڕن، ناچار خۆیداوە بەدەستەوەو هەموو شانەکانی رێکخستنی خۆیانی بەدەستەوەداوە. زۆریان بۆ ئەوت، خلەش خۆی لێ گێل ئەکردو هەر ئەوەندەی ئەوت: "برا بەخوا من تەنها شوانی ئەزانم، کارم بەسەر سیاسەتو میاسەتەوە نییە، هەرکەس بەتاوانی خۆی سزا ئەدرێ".

شەو رۆژەکە بێ خەیاڵ خەوت "گوڵەیان بۆ نایەت، خۆشم مردنم خۆشترە لەم ژیانە، سەرەڕای ئەوەی چۆن پێم قبوڵ ئەکرێ بۆ رزگارکردنی خۆم کۆمەڵێك خەڵکی بێ تاوان ناو بهێنمو بیان هێنمە ئەم قەسابخانەیەوەو ژیانی ئەوانیش لەخۆمان خراپتر بکەم." وتی: "تازە من لێم قەوماوە هەرچی ئەکەن با لەگەڵ مندا بیکەن".

بەیانی زوو بوو، دوو سیخوڕ هاتن لە ژوورەکە دەریان هێناو کەلەپچەکەیان لەدەستی کرد، پێش ئەوەی بیبەنە ژووری لێدان چاویشیان بە پەرۆی توند بەست پەلیان راکێشا لەنزیك مێزی نوسینەوە داوایان ناو وتیان: "دەی کاك خدر ئومێد دەکەین خۆت گەیشتبیتە ئەو ئەنجامەی راستیەکان بدرکێنیو بەزەییت بە خۆتو گوڵەی خوشکتدا بێتەوە، خدر گیان ئێمە لە تۆ شارەزا ترین، دەوڵەت کەروێشك بەعەرەبانە ئەگرێ، تۆش ناتوانی کڵاو بخەیتە سەر ئێمە، ئێمە چاکتر ئەزانین پەیوەندیت بە تێکدەرەکانەوە هەیە، جا خۆت بۆمان باس بکە کە چۆنو چەندە؟".

خدر وتی: "بەڕاستی من لەیەکەم رۆژەوە قسەم کردووە پیاوی کڵاوومڵاو نیم، من لادێیم، ئاگام لەو شتانە نییە، تەنها خەریکی ئاژەڵ داریم، ئەم کوژن یان ئازادم

دەکەن ئەمە قسەی منەو راستییە".

سیخوڕەکان زۆر رقیان هەڵسا، دوو سیخوڕ کەوتنە ویزەی ناو بەناو فڕێك ویسکیان ئەخواردەوە، کەلە سەر مێزی بەردەم بەرپرسیارەکەیان دانرا بوو، هارتر ئەبوون، ئاگای لەخۆی نەما، هەموو لەشی سڕ ببوو، خوێن لە هەموو لەشی ئەچۆڕایەوە. خۆی لەسەرە مەرگا ئەبینی و خۆشی بەسەر بەرز دائەنان چونکە ناوی کەسی پێ نەدرکێندرابووز لەوەش دڵنیابوو کەگوڵەیان بۆ نایەت، بۆیە لە دڵی خۆیدا ئەیوت: "مردنی وەها ناگۆڕمەوە بەسەد خۆشگوزەرانی سەر شۆڕانە".

جارێکی تر دەستیان کردەوە بە لێدانی، کاتێ هاتەوە سەرخۆ لەگەرەکێکی ناوچەی کوردەکاندا هەر لەشاری کەرکوك فڕێیاندابوو، منداڵ دەوریان لێدابوو، هەواڵی ناویان لێ ئەپرسی.؟ ئەوەندە هاتە وەڵام ناوی خلە شەلەو ناونیشانی خزمێکی پێدان.

ئاگای لە خۆی نەبوو، چەندی پێ چوو، خزمێکی هات و زۆری بۆ روانی، نەیدەزانی ئەمە کێیە.! پرسیاری لێکردو بۆی ئاشکرا کرد، کەئەو خلە شەلەو کوڕی مام گچکەڵە، هاواری لێکرد فریای بکەوێ، زوو بیگەیەنێتەوە گوندەکەی خۆیان.؟

پاش ماوەیەك لەدوای تیما کردنی، لەماڵی خزمەکەی بەپەلە خۆی گەیاندەوە لای بەهێی دایکی و گوڵەی خوشکی، بەدوورو درێژی بۆی گێڕانەوە کەچی یان لێکردووە. هەروەها هەرچی پارەی مەڕەکانیش هەبووە هەموویان لە گیرفانەکانی دەرهێناوە، لەبەردەمی گوڵەو دایکیدا بڕیاریدا هەتا ماوە روونەکاتە شار، چونکە فاشییەکان دەسەڵاتیان لەوێدا بەهێزە. وتی: "سەد رەحمەت لەگچکەڵی باوکم کەهەتا ئێستا چاوی بەشار نەکەوتووە".

خدر ناو بەناو وەکو مار (کاژ)ی فڕێ ئەدا، برینەکانیشی هەڵیان دەدایەوە، زۆریان هەوڵ لەگەڵ ئەدا بڕوات بۆ شارو چارەسەرێکی خۆی بکات نە ئەڕۆی، بەڵام کاتێك کە پێشمەرگەکان رێگایان ئەکەوتە گوندەکەیان داوای یارمەتی لێئەکردن بۆ تیمارکردنی زامەکانی.

رۆژانە فڕۆکەکانی دوژمن گوندەکەیان بۆردومان ئەکرد، گوندەکەی ئەمان لەو گوندانەبوو کەبوو بەخەتی کاکێشانی فڕۆکەکان، رۆژی لانی کەمێ جارێك بۆردومانی ئەکرد، خەڵکێکی زۆریان شەهید ببوو، کەچی بەپێچەوانەی ئەوەشەوە

ژمارەی پێشمەرگەکانی ئەوان زۆرتر بوون کە بە بنکەیەکی ئەو سەردەمەی پێشمەرگەکان ئەژمێردرا لەلایەن دوژمنەوە.

بەهێ ناسۆری دووجار کۆس کەوتوویی تادەهات کاری خۆی زیاتر دەکرد لە دەرونیدا هەر لاواز ئەبوو، دووچاری نەخۆشییەکی توندبوو، بوو بەهۆی ئەوەی ئەویش کۆچی دوایی بکات. خلەو گوڵە بێ دایكو باوك مانەوە، گوڵە هێشتا وای لێ نەهات بوو بتوانێ کابانی تەواو بکات، خدریش هەموو دەروازەیەکی لێگیرابوو. هیچ کاری پێ نەدەکرا، تەنها ئەیویست شەوو ڕۆژ چاوی لەگوڵە بێت بۆ ئەوەی پارێزگاری لێبکاو زوو گەورە بێ، بەڵکو بەهۆی گوڵەوە ژنێك بهێنێو ببێت بەخاوەن ژنو ماڵ.

مانگی ڕەمەزان بوو، گوندەکەیان هەموو بە ڕۆژو بوون، مزگەوتی گوندەکەش لەبەر ماڵی ئەواندا بوو، هەیوانێکی دوورو درێژو فێنکی هەبوو، هەروەها ژێرخانێکی زۆر قایمی هەبوو، حەوزێکی ئاوی تێدا بوو بۆ خۆ شۆرینی بەیانیانی پیاوان. حەوزێکی گەورەی ئاویش لەحەوشەکەیدابوو، بەرێزە توویەکی گەورە سێبەرێکی خۆشیدابوو بەسەر تاتە تویژە چیمەنتۆ ڕێژەکەیدا. پیاوانی گوند لەو مانگەدا لەوێ کۆ ئەبونەوە، لەکاتێکدا فڕۆکەکان ئەهاتن تێکڕا ئەچوونە ژێرخانی مزگەوتەکەوەو زۆر بڕوایان وابوو کە بۆمباکان ئەوێ نابڕێ، خلەش ڕۆژ تائێوارە لەبەر هەیوانەکە بوو کەرێك ڕوبەڕووی دەرگای حەوشەکەی خۆیان بوو، زۆر جار گوڵەی خوشکی ئەگەر کارێکی بەکاکی هەبوایە لەوێوە ئیشارەتێکی ئەدایە، خدریش گۆچانەکەی هەڵ ئەگرتو بەدەنگیەوە دەڕۆی.

ئەو ڕەمەزانەیان کەس نەبوو هەوڵی خواردنی پارشێوو ئێوارانیان بۆ بدات، بەناچاری گوڵەخان ئەبوو کابانێتی بکات، ئەگەر چی چاکیشی لێ نەئەزانی، بەڵام چی بکەن لەناچاریو بێ کەسی باشتر بوو.

نزیکی ئێوارە بوو، گوڵە تەنەکە ئاوەکەی هەڵگرتو چوو بۆ سەرچاوەی ئاوەکە، هەندێ ئاوی خاوێنی هێناو بە پەلە گەڕایەوە بۆ ئەوەی بەربانگ ئامادە بکات بۆ خۆیو کاکی، هەندێ داری تەڕی خستە بن سێکۆچکەکەوە، چەپکێ چیلکەی بۆ شکاندەوە، شخارتەکەی پێوەنا، چیلکەکان دامردنەوە، دارە تەڕەکان دانەگیرسان. چەند جارێ کارەکەی نوێ ئەکردەوە، تا چاوەکانی پڕبوون لەفرمێسكو سور هەڵگەڕا بوو، مەنجەڵە بچووکەکەی خستە سەری، سەلکێ پیازی

سوری تێدا جنی، لوێچی ساوەری لەتەنیشت خۆیەوە داناو ئەیویست رۆنەکە بقرچێ و ئاوەکەی تێ بکات، ئەوسا ساوەرەکە هەڵکفێنێ.

هاژەیەکی زۆر هات، سەری هەڵبڕی ناپاڵمەکە لەسەر سەر دەهاتنە خوارێ، بە پەلە ویستی خۆی بکات بە هەیوانەکەی خۆیاندا، تەپ و تۆز بەری ئاسمانی گرت، گوندەکە بزربوو لەتۆزو باروت و دوکەڵدا دنیا ئاخر بوو، کەس ئاگای لەکەس نەما، مچە شەل لاوێکی زیتەڵە بوو لەمنداڵیشدا هەر ئەو زیتەڵەییەی وای لێ کردبوو بەگژ دارو دیواردا ئەهات، جارێکیان بۆی رێئەکەوێ گەلە سەگێك پەلاماری ئەدەن و بە کەڵبە هەنجن هەنجنی ئەکەن باش ئەبێ خەڵکی فریای ئەکەون و لە دەم سەگەکانی ئەستێننەوە هەر ئەو زامارییە بوو بەهۆی پسانی دەمارێکی قاچی و قاچێکی زۆر کورت بۆوە، بەڵام ئەوەش هێشتا لە زیتەڵەیی نەخست بوو، جارێك لە شەڕی نێوان جوتیارەکان و ئاغای گوندەکەیان ئەم تفەنگێکی دەست ئەکەوێ و شوێن دەستی دیار ئەبێ ئەوەبوو بە هۆی ناوی خۆی ببیستێتەوەو لە هەموو روداوێکی گوندەکەدا ئەهاتە دەرێ و بەرەو شوێنی روداوەکە ئەرۆیشت. ئەم جارەشیان پاش رۆشتنی فڕۆکەکان و نیشتنەوەی تۆزو دوکەڵەکە مچە شەل دێتە دەرێ بەنیازی بەسەر کردنەوەی خەڵکەکە، گوێی لە ناڵەو هاواری ماڵی عەبدولڕەحمانی ماڵی مام رەشید ئەبێ، بە شەلە شەل لێیان نزیك ئەبێتەوەو هاوار ئەکات "ئایشە چی روویداوە بۆ هاوار ئەکەی؟" ئایشە هاوارەکەی زیاتر بەرز ئەکاتەوەو سەرو پرچی خۆی ئەڕنێتەوە سەبری بەدبەختی ژنی حەسەنی خوشکەزای ئەوڕەحمان ئینجا روو ئەکاتە مچە "کوڕە مچە سەیر قۆڵێك و مەمکی چەپی لەبندا لێ بۆتەوە، ئەمرێ ئەمرێ من چی بکەم؟! دوێنێ ئاهەنگی گوێزانەوەکەیمان بۆ گێڕا، هێشتا خەنەی دەست و پێی کاڵ نەبۆتەوە، ئەمرێ بەخوا ئەمرێ خێراکەن، کوڕە خێراکەن نامەردتان نەکەم".

مچە شەل بۆی رون ئەبێتەوە سەبری بەر ناپاڵمەکان کەوتووە، هەوڵی هەندێ خەڵك بدات، ئەوڕەحمانی ئامۆزای خلە شەلە لە بن شانی سەبریدابوو، هاواری ئەکرد"مچە شێرانە فریابکەوە هەندێ کوڕی گورج و گۆڵ پەیدا بکە با سەبری بگەیەنینە بنکەی چەمی رەزان بەڵکە نەمرێ".

مچە شەل پشتاو پشت گەڕایەوە بەنیازی کۆکردنەوەی هەندێ گەنج بۆ ئەوەی زامدارەکە بگەیەنێتە بنکەی پێشمەرگە، لەولاوە پیرۆزی مام سەعید هاواری ئەکرد

"کوڕینه فریا کەون" ئەیوت: "هاوار بە ماڵم، ئەو ماڵە قسەکەی تەواو نەکرد بوو لەو لاترەوە شێخەوڵا هات بەدەنگییەوە" ئەوە چیە پورە پیرۆز.؟" "کوڕە مامە شێخ فریا کەون ماڵی رەسوڵی پورە عاسە خانووەکەیان بەسەردا تەپیوە، بەڵکە دەریان بهێنن هەتا نەسوتاون".

لەم هاوار هاوارە چەند کەسێ کۆئەبنەوە، پەلی مناڵەکانیان ئەگرن و لە کونی دیوارە روخاوەکانەوە دەیان هێننە دەرەوە، بەڵام دایکیان لەبن داراێکدا لێ ببۆوە جگە لە تێکشکانی هەر دوو دەستی و سەروچاوی هاوار هەڵسا "کوڕە مەردی چاك بن خێرا هەندێ فەردە کا هەڵبەستن با زامدارەکان زوو بگەیەنین، خۆ لە سایەی ئەم دەوڵەتە دڕندەیەوە رێگاو بانەکان دەواو دەرمانیش دەست ناکەوێ، تاکەچارە هەر بنکەی چەمی رەزان و پێشمەرگەیە، پەلەکەن تا نەمردوون." کەوتنە خۆ ئەو زامدارانەی لە چوار کۆڵانەوە نزیك بوون بەڕێکران، هێشتا بە تەواوەتی لە گوندەکە دوور نەکەوتبوونەوە ئامینی ژنی مام رەسوڵ شەهید ببوو، تەرمەکەیان گێڕایەوە. ویستیان بیبەن بۆ مزگەوتەکە، عەلی سەید کەریم لە مزگەوتەکە بە هەڵە داوان هات، رەنگی رەش داگیرابوو، سەروچاوی لە تۆزو رەشۆی باروتدا بزر ببوو، هاواری کرد "فریاکەون خزمان فریاکەون، گەرەکی مزگەوت هەمووی بەسەر یەکدا تەپێندراوە، ماڵی خلە شەلی پورزاشم بەر کەوتووە، گوڵەی خوشکی خلە دیار نییە، تکایە هیمەت بکەن و پیاوی چاك بن".

نەیان ئەزانی تەرمی شەهید ئامین چی لێ بکەن، گەرەکی مزگەوت تەخت بووە، رێگای هاموشۆ نەماوە، هێشتا دوکەڵ بە تەواوی نەڕەویوەتەوە، بە باشی دنیا تاریکە هەرایە کەس نا پەرژێتە سەر کەس، هەرکەسە خەریکە مناڵەکانی خۆی دەربکات بەرەو دەرەوەی گوند.

هەندێ پیاوی گەنجی لەخۆبردو بەسەرەوە ئەگەڕان، پەلەیان بوو ماڵەکان هەمووی بەسەر بکەنەوە، لەکاتێکدا عەلی سەید کەریم هەواڵی وێران کردنی گەڕەی مزگەوتی گەیاند، خێرا بەپرتاو شالاویان بۆ ئەوێ بردو روانیان گەڕەکەکە هەمووی تەپیوە. شوێنەواری تەنها دارو پەردووەکەیەتی، سەرێکیان لە ژێرخانی مزگەوت هەڵهێنا، خلە شەل بەسەر گۆچانەکەیدا خۆی شۆڕ کردبۆوە، ورتە لە دەمییەوە نەئەهات، لێی نزیك بوونەوەو لێیان پرسی "کاك خدر لەم گەڕەکە کێ شەهید بووە؟ کێ ماوە؟".

خله زۆر به بێزارییەوە سەری هەڵ نەبڕیو وتی "نایزانم، جا بۆ کەس ماوە؟!" بەدەمو چاوییەوە دیار بوو شتێکی لێ ئەزانێ، بەڵام نایڵێ، جارێکی تر پرسیاریان لێکردەوە "ئەرێ خدر راست بڵێ با فریا کەوین ئەوەی زامدارە بەڵکو زووو بەرێی بکەین بۆ بنکە".

"برا ئێوە زۆر سەیرن من ئاگام لەچییە تەنها ئەوەندە ئەزانم گوڵەی من بێ سەرو شوێنە، ئەگەر ئەو پیاوەتییەم لەگەڵ بکەن بۆم بدۆزنەوە، نازانم لەترسا رووی کردۆتە کوێ".

هەموویان بەملاو بەولای خانووە روخاوەکاندا دەستیان کرد بە گەڕان، دنیا بە تەواوەتی تاریك ببوو، خانوەکان وەها تەپێنرا بوو پێ نەدەچوو پێشوو تر خانوو بووبن، چاڵی گەورە گەورە هەڵکەندرابوو بەسەدانو هەزاران لیتر ئاوی ئەگرت، چێ ئەچوو بەو شەوە هیچیان بۆ نەدۆزرێتەوە، چونکە شەو بەرەو درەنگی ئەڕۆیی هاتو هاوار زۆر کەم بوو بۆوە لەناو گوندەکە. خدریش لەبەرامبەر شوێن خانوەکەیان هەر چاوەڕوانی هاتنەوەی گوڵە بوو، هەندێ لەو پیاوانەی گوندەکەیان ئەگەڕانو خەڵکەکەیان بەسەر ئەکردەوە هاتن بۆ لای خدرو وتیان: "ئێمە پێمان چاکە هەموو ماڵو منداڵو ئاژەڵ لە گوندەکە دووربخرێنەوە دوور نییە سبەی کەرۆژ بووە لای بەیانییەکەی فرۆکەکان بێنەوە سەرمان بۆ ئەوەی زیانی زۆر نەکەین، زەرەر لە نیوەش بگەڕێتەوە باشە، بەڵام ئێمە ئەمێنینەوە، بەیانی سۆراغی چاکمان بۆ ئەکرێو ئاگاداری ناو گوندەکەشمان ئەبین، زۆر بە باشی ئەزانین کە تۆ لەگەڵ ماڵی مامت بڕۆیتە دەرەوە، هەرشتێکمان زانی لەبارەی گوڵە خانەوە ئاگادارت ئەکەینەوە".

خدر ئەم قسەیەی زۆر پێ ناخۆش بوو، داوای لێبوردنی کردو وتی: "من هەر لێرە ئەبم، ئەگەر گوڵە مابێ ئەزانێ من لێرەم دێتەوە بۆ لام".

زانیان خدر زۆر دڵگرانە دڵیان نەشکاند، بەڵام نەخشەی خۆیان جێبەجێکردو گوندەکەیان چۆڵکرد.

بەیانی تازە رۆژ تیشکە زێڕینەکانی خەڵات ئەکرد بە ناوچەکە، جارێکی تر چەند فرۆکەیەك هاتن خۆیان لارکردەوە بەسەر گوندەکەدا بەبێ ترس، بۆشیان دەرکەوت بوو کە وێرانیان کردووەو خەڵکەکەی چۆڵی کردووە، بەڵام هەر بێ بەشیان نەکردو چەند سەرێکی تر بۆردومانیان کردەوە.

ئەوانەی لەگوندەکەدا مابوونەوە زۆر بە پەرۆشەوە بە دوای سۆراغی گوڵەدا ئەگەڕان، هەر یەکە لەبەر خۆیەوە قسەیەکی ئەکرد، یەکێکیان وتی: "گوڵە بنپشکی خلە شەل بوو، کورە کورد راستی وتووە: کە (بەڕە لای تەنکییەوە ئەدڕێ) بەڵێ کە نەهات نایە ئەو هەژارانە چەند ساڵێکە بۆیان نەهات.

ئەوە چەند کارەساتێکیان بەسەردا بێت، فاتم بەسەر منداڵەوە رۆی، خلە نەخۆش کەوت و قاچی شەل بوو، گچکەڵ کوژرا، بەهێ کۆچی دوایی کردو ئێستایش گوڵە بێ سەرو شوێنە!!".

هەرکەس لەبەر خۆیەوە قسەی ئەکرد، کەس گوێی لەوەی تر نەئەگرت، بۆ گوڵەو خلە زۆر بە پەرۆش بوون، یەکێك لەبەر خۆیەوە وتی: "ئاخر دوو منداڵ پاش ئەو هەموو رووداوە یەك لەسەر یەکەی بنەماڵەکەیان دوو قوڵی سەریان بەیەکەوە نابوو، نیازیان بوو دواڕۆژێکی نوێو خۆش دابمەزرێنن ئەوا گوڵەش بەسەردا بێ سەرو شوێنە" خێرا خێرا پەلاماری پەناگاکانیان ئەداو ناو بەناویش سەریان هەڵ ئەبڕیو گوێیان ئەگرت لەترسی فڕۆکە نەیان ئەوێرا لە کەلاوەکان دووربکەونەوە، هەچ شوێنێ دەگەڕان سەریان لەخلە ئەدایەوە.

یەکێکیان هاواری لێ هەڵسا "خزمینە پریشکە گۆشتێکی زۆر ئەبینم لەو ناوە پەرش و بڵاوبۆتەوە تۆ بڵێی گوڵە شەهید نەبوو بێ؟" هەموو لێی کۆبونەوە چەند سەرنجیان ئەدا پێ ئەچوو کەسێك شەهید بووبێ، بەرەو لای خدر کەوتنەڕێ، خدر خۆیدا بوو بەسەر گۆچانەکەیداو بە تەواوەتی چوو بووە ناخی بیرکردنەوەی هەست کردن بە ستەمێکی گەورەو هیچ هۆشی لەلای ئەوە نەمابوو بەدوای چیدا ئەگەڕێ. پێدەچوو سەهۆڵ بەندان بەسەر گۆچانەکەیەوە وشکی کردبێتەوە، گرمە گرمی خەڵکەکە خدریان بە ئاگا هێنایەوە، هەر یەکە لای خۆیەوە ژمارەی کارەساتێکی بۆ دەگێڕایەوە لەو هەزاران تاوانانەی کرا بوو دژی گەلەکەیان، نمونەی گوندەکەی خۆیان بۆ دەهێنایەوە کەچۆن بێ بەزەییانە رۆژانە ئەو ناپاڵمە گەورە گەورانە ئەدات بەسەریانداو چۆن بۆتە هۆی ئەوەی خەڵکەکەی لەگوندەکەیان بتارێنێ.

یەکێکی تر ورەی بەرز دەکردەوەو ئەیوت: شۆڕشی رزگای خەڵکی خوێنی کەسانی نیشتمان پەروەرو خەڵکانی دڵسۆزو خەڵکانی بێ تاوانی دەوێ، ئەیانوت: یەکە شەهید نابێ و دووایین شەهیدیش نییە، ئەمە شۆڕشەو تا

سەکەوتن ئەبێ خۆمان ئامادەی دەیان کارەساتی تر بکەین. تێکڕا وتیان: چاك وایە لە بەردەمی ئەم کۆستەشدا، چۆك دانەدەین و بەڵێن نوێ بکەینەوە، شان بەشانی هێزی جۆشخواردووی جەماوەری گەلەکەمان و هێزی پێشمەرگە لەتێکۆشاندا بەردەوام بین بەرەو بەدی هێنانی کوردستان یان نەماندا.

خدر وەکو ماری سر خۆی راست کردەوەو چەپکە قژەکەو چوار پەنجەی میراتی گوڵەی جوانە مەرگی بۆ دەرهێنان و وەکو چەپکە رێحانە رای وەشاندو هاواری کرد "ئەو کەسە ناپاکە لەگەڵ گەلەکەی دا نەبێ و بۆی نەژێ و نەمرێ، دەبرا دەرینە با ئەم دیارییە بەخاکی پاکی کوردستان بسپێرین لەپاڵ شەهیدانی ئازادی کوردستاندا!!"

٢١ی تەمموزی ١٩٨٩

ئێران

# فەرەیدون هێشتا نەگەڕاوەتەوە...

پێشکەشە بە:

شەهیدان پشتیوان و شاخەوان و مەلا ئەحمەدو هاوڕێکانیان کە لە شەڕی ١٩٨٠/١٠/٦ لە گوندی مام ڕەش شەهید بوون

هەر لەو ڕۆژەوە چاوی کردبۆوە خولیای ئەوە بوو بتوانێ خوێندنەکەی تەواو بکاو لە ئەنجامدا ببێت بە پیاوێکی پسپۆڕو لێهاتوو، بۆ ئەوەی خزمەتی خەڵکی زەحمەت کێش بکا، پێی وابوو میللەتی کورد بەهۆی ئەو دابەشکردن و بەش بەش بونەوە ڕێگەی ژیانی لێگیراوە، زۆر بێ بەشبووە لەسادەترین مافی مرۆڤ. بەڕاستی بەئاشکرا ئەتوانرێ جیاوازییەکانی ژیانی خەڵکی کوردستان و خەڵکی جیا لەکوردستان جیابکرێتەوە، بە تایبەت لەو جارانەیدا کە سەردانی شاری کەرکوکی دەکرد لە باوکی و لە هەندێ خەڵکی تری گوندەکەیانی بیست بوو کە کاتی شۆڕشەکەی (شێخ مەحمود)ی نەمریش کە کەرکوك بە شارێکی کوردی باسکراوەو کێشەی گەورەی لەسەربووە، کەچی ئێستا بۆ سەردان دەچێتە کەرکوك دەبێ بە عەرەبی قسە بکەی و هەرچەند هەنگاوێ دەڕۆی داوای پێناسنامەت لێ دەکەن و ئەگەر باش زمانەکە نەزانی ئای چیت لێ دەکەن مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانێ.

تازە هەڵدەچوو کادرەکان ناوبەناو دەچوونە گوندەکەیان کۆبوونەوەیان پێ دەکرد، باسی بەروبومی کوردستان و بە پیت و بەرەکەتی خاکەکەیان دەکردو، دەهاتنەوە سەر ژمارەی کوردو دابەشکردنی کوردستان، ئازارو چەوسانەوەی نەتەوایەتی، هەر چارەسەرێکیان نیشانی جووتیارانی گوندەکەیان دەدا زۆری پێ خۆش بوو گوێ بۆ باسەکان بگرێ، هەموو جارێ چاوەڕوانی دەکرد تاکۆبوونەوەی داهاتوو، ئەوەی گوێی لێ دەبوو هەوڵی ئەدا ئەویش لێی تێبگاو بۆ هاوڕێکانی خۆی باسبکات.

پێشمەرگەکان دەهاتنە گوندەکەیان دەست بەجێ یەکیان دەچووە گردی قەڵاو دەبوو بەئێشك چی، ئەویش ئەچوو بۆلایان، دووربینەکەی لێ وەردەگرتن، ئەینا بەچاویەوە سەیری ئاسمانو زەوی پێئدەکرد ئای چەند لای شیرین بوو ئەویش ببووایە بە کادرێکی چالاكو لەگەڵ ئەم پێشمەرگانە گوند بە گوند بۆ هۆشیار کردنەوەو راپەڕاندنو سازان بچوایە لەگەڵیان، تا شەو دەهات لە پێشمەرگەکان دوور نەکەوتەوە، هەندێ وشەی دەزانی فێریان ببوو وە لەو برایانەی دەپرسیو هەوڵی ئەدا شتی نوێی تریان لێ فێر بێ.

شۆڕش تا دەهات پەرەی دەسەند، بڵێسەی شارو گوندی داگرت بوو، رۆژانە لەرێگەی گوندەکەی ئەوانەوە پۆل پۆل قوتابی، مامۆستا، کرێکار، کاسبکار دوکاندار لەشارەوە دەهاتن بۆ ناو شۆڕش، هەر یەکێ لەوانەی دەهاتن بە ئاگری گەرمی پەروەردەی پارتایەتییانەوە تێنو تاوێکی تریان دەبەخشییە جەماوەری جوتیاران لەگوندەکان. فەرەیدونیش خەریك بوو لەمەسەلەکان تێبگاو بڕوای هێنابوو کەدەبێ ئەویش چی تر چاوەڕێ نەکاو خێرا پەیوەندی بکا بەبنکەیەکەوە، بۆ ئەوەی فەرمانێکی شۆڕش بگرێتە ئەستۆ. هەرچەندە بیری لە فاتمی دایکیو ئایشی خوشکی ئەکردەوە سەری دنیای لێ دەهاتەوە یەك، نەیدەزانی چییان لێ بکات، پاش مردنی مەلا شەریفی باوکی مەلاژنو ئایشە دووقۆڵی فەرەیدونیان گرتبووە باوەشو ژێر چاودێری گەورە بوونو پارێزگاری کردن ئەچوو بۆ گوندێکی تر تا دەهاتەوە دنیایان لێ ئاخرو دڵیان لەمشتیاندا دەبوو تادەگەڕایەوە.

خۆشی ئەوەندە خولیای خزمەتکردنی خەڵکی کەوتبووە سەر، نەیدەتوانی چیتر خۆی لەبەردا رابگرێ.

شۆڕش لەگەشە کردندابوو هاتوو چۆ لەگوندی ئەوەوە بۆ گوندێکی تر بە پسوڵەی (پ-م) نەبوایە نەدەکرا، هەرکەسێکی نەناس پسوڵەی پێشمەرگەی پێ نەبوایە دەگیراو رەوانەی بنکەی پێشمەرگ دەکراو ئەبرا لە ئەشکەوتێکدا بەند دەکراو تەنەکە ئاوی پێ رادەکێشرا. سەنگەرەکانی پێشمەرگە بەرگری کردنی لەو هەموو هێرشانەی بۆ سەر ناوچەکانی گوندەکان بە شێرانە بەرگری لێدەکرا. زۆربەی جاریش پێشمەرگەکان سەرکەوتوون دەبوون، بڵاوکراوەی سەربەشۆڕش مانگانەو هەفتانە لە دیواری مزگەوتەکانو لە گوندەکان هەڵدەواسراو دەخوێندرایەوە. هەموو ئەمانە فەریدون یان تیژتر دەکرد بڕیاریدا ببێ بە

پێشمەرگە. ماڵ ئاوایی لەمەلاژن و خوشکی کرد شین و شیوەن جێگای خواردن و پێکەوونینی لەماڵیان گرت، فەرەیدون پاش ماوەیەك لە بنکە (ئەوساوابوو هەرکەس تازە بوایە ئەبوایە ماوەیەکی چاك لە بنکە بمێنێتەوە تا کارێکی پێ بدرێ).

فەرەیدون پاش تاقیکردنەوەی کرایە کادرێکی جوتیاری لەناوچەکەی خۆیان، بەهۆی ئەوەی خەڵکی ئەو ناوچەیەیەو جوتیاران ئەیناسن و بڕوای پێدەکەن لەدایك و خوشکی نزیك دەبێ، جاروبار سەرپەرشتییەکی وەزعیان دەکات.

ڕۆژ لەڕۆژ زیاتر فێری شێوەی چوونە ناو جوتیاران دەبوو لەکارکردندا. کتێبی زۆری دەخوێندەوە، بڵاوکراوەکانی دەخوێندەوە، شۆڕشەکانی دنیای بەرگوێ کەوت بوو، هەوڵی ئەدا لێیان تێ بگات بۆ بەراورد کردن و کەڵك وەرگرتن لە بابەتە بە کەڵکەکانیان و دوور کەوتنەوە لە هەڵەکانیان. زۆر جار ئەوەی فێر دەبوو لە مزگەوتەکاندا بۆ جوتیارانی باسدەکرد، هەندێ جار لە خۆی دەپرسی "ئێمە کێین؟ لەکوێ ئەژین؟ لەسەر زەوی دەورمان چییە؟ پەیوەندی ئێمە چییە؟ ئەبێ چۆن بێ؟ شۆڕشی ئێمە داواکانی چییە؟ دوای ئەم داوایە داوای ترمان، بەرنامەی ترمان چییە؟ ئالای وڵاتمان، ڕەنگی چۆنە؟ کێ بۆمان دەست نیشان دەکات؟ هێزی پێشڕەومان کێ بێ؟ دۆست و پشتیوان کێ دەبێ؟ ناکۆکی چییە؟، ئێمە لەگەڵ کێ بەگژیەکدا دێین؟ ئەو کەسە توانای هێزی، دەسەڵاتی، تاکتیکی چییە؟، ئێمە بۆ بەربەرەکانی چی دەکەین؟ ئەمانە ئەوەندەی تر فەرەیدونیان وڕوکاس کردبوو. باسی شتێکی دەکرد ئەوەی تر بەشوێنیا دەهات، خەڵکی کوردستانیش بەسەرومال بەگیان ئامادەبوون، کیژە کۆرد و خوێندەوارەکانی شاریش خۆیان ساز دابوو کورد رزگار بێ، شوو بەپێشمەرگە بکەن. ئەم قسانەش دەم پێشمەرگە کەوت بوو زیاتر دڵیان بە پێشمەرگایەتی خۆش دەبوو، تەبایی و دڵسۆزی یەکێتی ریزەکانی جوتیاران و پێشمەرگە لەلادێداو دڵسۆزی و هاوکاری شارییەکان لەگەڵ بنکەکان و پیشمەرگەدا ئەوەندەی تر ژمارەی پێشمەرگەی زیاد دەکرد و هانی دەدان. فەرەیدون بابەتی زۆر دەست کەوت و وتارەکانی بۆ رێکخستن و گوندییەکان زیاتر دەکرد، پەلەی زۆر دەکرد زیاتر بخوێنێتەوەو بیداتەوە بە خەڵکی، زۆر جار دەیوت: "ئێمە قوتابی خەڵکین لەوانەوە شت فێر دەبین و ئەی دەینەوە بەئەوان بەگەلاڵە کراوی فەرەیدون هیواکەی نەهات بووەدی لەڕووی فکرییەوە لە گەشەکردندابوو، بەڵام وەڵامی هیچ پرسیارێکی لێ ڕۆشن نەبوو دوژمنی گەلەکەی

دەستی خستە نێو رۆڵەکانی گەلەکەی و ئاگری دووبەرەکییەکی زۆر ناخۆشی خۆش کردبوو، فەرەیدونیش ئەوەندەی تر بابەتی ئاڵۆز ئاڵۆزو پرسیاری بۆ وەڵامی دەهاتەوە پێش "ئایا کورد خۆی دوژمنی خۆیەتی؟ ئۆتۆنۆمی لەلای کورد خۆیەتی؟ ئایا لەدووبەرەکی و یەکتر کوشتن رزگارمان دەبێ؟ تۆ بڵێی بەم پرش و بڵاوییەو ئەم ناکۆکیانەی ناو رێزەکانی خۆمان و لەیەکتر کوشتن رزگارمان بێ؟ ئەویش وەڵامەکانی هەرچەندە نەبوو بەڵام سەبارەت بە بەردەوامی لەسەر رۆیشتنی شۆڕشگێرەکان لەسەر یەکتری کوشتن و قسە بە یەکتری وتن نەکەی لێی ئەبوو بە "نازانم".

دووبەرەکی و دەست تێوەردانی دڕندایەتی دوژمنان ئابلوقەدان بێ دۆست و پشتیوان نەبوونی چاوساغی بتوانێ راست بەرێدا چاوساغی گەل بکات، بوو بەهۆی ئەوەی نەك هەر دووبەرەکی بگرە هەرەسیشی پێ هات و فەرەیدون و هەزار، پێشمەرگەو کرێکارو جوتیارو مامۆستاو قوتابی و ژن و منداڵ و جوان و پیر بێ هیوا بن. پاش ئەو هەموو ماندوو بوون و قوربانی دانە کوردستانیان چۆڵکردو دوژمنانی کوردستان بەئارەزووی خۆی دەستی گرت بەسەر وزەو توانای هەموو گەلەکەمان بۆ ماوەیەکی دیاری نەکراو. فەرەیدونیش وەکو هەموو شۆڕشگێرەکانی تری خەڵکی کوردستان کە لەورەو باوەڕدا نەڕوخا بوون، بەڵام شەقی زەمانە هەرەسی پێ هێنا بوون جارێکی تر گەڕایەوە گوندی مام رەش و لەگەڵ مەلاژن خەریکی بەدەست هێنانی بژێووی بەرەواڵەت بوون، بەڵام لە دەروندا دەگەڕا بۆ دۆزینەوەی کۆمەڵێك هاوڕێی وەکو خۆی کە سەر بەیەکەوە بنێنەوەو ئەمجارەیان وەڵامی پرسیارەکانی وەربگرێتەوە، بۆ ئەوەی بتوانن جارێکی تر شۆڕشێکی تر لەسەر کوانوی روخاوی ئەم شۆڕشە هەرەس پێ هێنراوە دابمەزرێننەوەو بەشدارییەکی کاریگەری تێدا بکەن.

ئەگەرچی مەلاژن و ئایشە داواو ئامۆژگاریان بۆ فەرەیدون ئەوە بوو زەوییەکانی شەریفی باوکی بکێڵێ و ژیانی خۆیانی پێ دابین بکاو کاتی ئەوەش هاتووە ئایشە بدات بە شوو، ژنیش بۆ خۆی بهێنێ، بەڵام فەرەیدون ئەوەی بەلایەوە گرنگ نەبوو ژن هێنان بوو ئایشەی ئازاد کردبوو لە دیاریکردنی هاوسەری و دڵنیاشی کردبوو کە ژن بەژنی پێ ناکا چونکە زۆر جاری بەرگوێ کەوتووە ئەنجامی ژن بەژن زۆر کارەساتی دڵتەزێنی تێدا رووداوە، جگە لەوەی لەو چوار کەسە یەکیان و دوانیان

هەر بە ئارەزووی نابێ و تێدا دووچاری دەردە سەری وماڵوێرانی ژیان دەبێ.

ئایشە ئەم رازەی ئەزانی، بەڵام بڕوای وابوو محەمەد ئەبێ ژن بهێنێ ئەوسا شووبکات، بۆیە هیچ گوێی بەدیاریکردنی هاوبەشی ژیانی دواڕۆژی نەدەداو رۆژانە دەچووە دەوروبەری گوند لەگەڵ کیژۆڵەکانی دەرودراوسێ کۆڵە پەڵۆشی خۆی دەهێنایەوە بۆ ئاگرکردنەوە.

مەلا ژنیش زۆر دەترسا فەرەیدون ژن نەهێنێ و ئایشەش بەدیار ئەوەوە دابنێ و دووچاری بەڵایەك بێت، بۆیە هەر زوو زوو "فەرەیدون کوڕم ئەگەر غەمی خۆت نییە مشورێکی ئایشە بخۆ، خوا لێت هەڵناگرێ، ئەویش لە وەڵامدا ئەیوت:" دایە خۆت گەورەمانی چی بۆ ئەکەی من پێم خۆشە بە مەرجێ ئایشە رازی بێ، چونکە دایە ئەمە زەمانی ئێوە نییە، ئەم زەمانە ئەبێ وابیربکەینەوە کچ شوو دەکا باوك و دایکی نا، کوڕ ژن دێنێ خۆی هەقی هەیە دواڕۆژی خۆی دەست نیشان بکا لەگەڵ کێ زەماوەن دەکاو کەی دەیکا، خۆ شوکر لە سایەی شۆڕشەوە ئەوەندە تێگەیشتین کە مرۆڤ هەقی فرۆشتنی نییە بەڵکە هەقە ئازاد بێ لە ژیاندا. بەڕاستی خەڵکی بۆیە دڵی بە شۆڕش خۆشە گۆڕان دروست بکا لە هەموو روویەکەوە، ئەگەرچی شۆڕشی ئێمە لەباربراو ئەنجامێکی نەدا بەدەستەوە، بەڵام زۆر شتی لێوە فێربووین کە بەبێ شۆڕش و پێش شۆڕش فێریان نەببووین.

دایکی: "حەمەی گیان هێشتا وازت لە قسەی زل نەهێناوە، بەم قسە لوس و زلانە چیتان کرد لەوە زیاتر خوێنی رۆڵەی خەڵکتان رژاند، ماڵی خەڵکتان بەسوتاندا، کوردستانتان لە فرمێسك و خوێندا نقوم کرد، تووخوا جارێکی تر قسەی وام بۆ مەکە، خێراکە خۆت ژن بهێنە با ئایشە نەهێڵینەوە زەعیفەیە خراپە، خراپ کوڕم".

محەمەد: "دایە گیان تۆ گەورەی ئێمەی، دەبوو خۆت لەگەڵ ئایشە قسە بکەی ئەگەر کەسێکی دەستنیشان کردووە با بیدەین بەشوو، خۆ ئەگەر شتی وەهاش نییە یا تۆکێ بەچاك دەزانی لەم ناوە با قسەی لێ بکەین".

فەرەیدون هێشتا مشوری ئایشەی نەخوارد بوو کەوتە بیری ئەوەی بڕواتە شار، لەوێ بخوێنێ و کاربکا بۆ تەواوکردنی ژیان و خەبات، پێشەکی چووە کەرکوك بۆ مەیدانی کرێکاری بەیانیان رادەوەستا، رۆژێ دەیان برد بۆ کار دوو نەیان دەبرد، تا ناسیاوی پەیداکرد لەگەڵ وەستاکانیدا ئەوسا بەزۆر کاری دەست دەکەوت، وای

لێ هات ئەگەر دایکی و خوشکی بهێنێتە شار ئەتوانێ خانوویەکیان بۆ بگرێ و بەکرێکای گوزەرانیان بۆ دابین بکات، بۆیە سەردانێکی گوندی مام رەشی کردەوە، مەسەلەکەی بۆ دایکی و خوشکی باسکردو بڕیاریاندا لەشاردا جێگیربن و دەست لەزەوی لادێ هەڵگرن.

فەرەیدون شارەزایی لەکارکردن چاکتر پەیدا کردبوو، بە خەلفە لەگەڵ هاوڕێی کارکردەکانیدا رۆژانە قسەو باسیان دەکرد. ئێواران لەکار دەگەڕایەوەو سەری کتێب خانەکانی ئەدا، بابەتی تازەی لە کتێب و رۆژنامەی دەکڕی و شەوانە ئەی پشکنی، پرسیاری تری بۆ ئەهاتە پێش، پاش تێدا چوونی شۆڕش ئێمە چی بکەین؟ دەستەو ئەژنۆ دابنیشین یان کاربکەین؟ چ کارێ بکەین؟ بەرنامەمان چی بێ؟ کەی و لەکوێ دەست پێ بکەین؟ ئەم جارەیان چ بەرنامەیەك پەسەند بکەین کە دەستە بەری رزگارکردنی زەحمەتکێشانی کوردستان بێ.؟"

خووی دابووە خوێندنەوەی هەندێ پەرتووکی پیاوە مەزنەکانی مێژوو ڕێبەرە سەرکەوتووەکانی کرێکارانی دنیا. هەندێ شتی لای خۆی دەستنیشان کردبوو، دەگەڕا بۆ شێوەی رێکخستن، لەپڕێکدا لەگەڵ کۆمەڵێ هاوبیری وەکو خۆی لەرێکخستندا خۆیان دیتەوە.

جارێکی تر مەسەلەی دەست پێکردنەوەی شۆڕش هاتەوە پێشەوە، زۆری پێ خۆشبوو کە ئەوەی بە دوویدا دەگەڕا دۆزییەوە، ئەگەر ئەویش لەبار نەبرێ و رێگە هەڵە نەکات و ئەنجام بەچۆکدا نەیات.

زۆر دڵی بەشار خۆشبوو، رۆژی بەکارو خوێندنەوەو خەڵك رێکخستن و هۆشیارکردنەوەو دەبردە سەر.

هیواکەی جارێکی تر بوژایەوە، پێشمەرگە لە شاخ پەیدا بووە، جۆرەها کۆمەڵی سیاسی بەبیروباوەڕی جیاوازەوە سەنگەریان گرتەوەو بۆنی بەرەیەکی نیشتمانی لێدەهات زۆر جار لە دڵی خۆیدا ئەیوت: "بڵێی لە منداڵدانی کۆمەڵگاکەماندا پارتی رابەری چینە شۆڕشگێڕەکەی خەڵکی کوردستان پەیدا نەبێ.؟ ئەی لەشکری جەماوەری گۆشکراوی باوەڕێکی شۆڕشگێڕانە دروست نەبێ تا دەستەبەری ئەوە بێ بەرەنگاری هێزی داگیرکەر کات و، وڵات ئاوەدان بکاتەوە، رێگە بگرێ لەشەڕی ناوخۆی؟ دەستەبەری سەرکەوتنی گەل بێ؟".

بەڵێ فەرەیدون گەرمتر دەبوو، ئاواتی دایکی هەر نەهاتەدی، نە فەرەیدون ژنی

هێناو نە ئایشەش شووی کرد بۆخۆی کۆچی دوایی کرد، ئایشەو فەرەیدون دوو قۆڵی کەوتنە کاری ڕێکخستنەوە ڕۆژانە بەیان و بڵاوکراوە نهێنییەکانی فەرەیدونی دەخستە باخەڵییەوەو بۆی دەگوێزایەوە، خۆشی لەلای خۆیەوە لەناو ئافرەتانی بڕوا پێکراوی خۆیەوە کاری بۆ ڕێکخستنەکەی فەرەیدونی برای دەکرد، وەها ئاڵابووە کارەکەوە ئەویش شووکردنی هەر لەبیر نەمابوو.

جارێکیان بەسەردان چوونەوە گوندی مام ڕەش، بەڵام خۆزگە نەچوونایەتەوە، کاتێ دەگەنە ئەوێ بەسەر شەڕێکی زۆر گەورەدا کەوتن لە گوندی مام ڕەش بەرپا ببوو. ئێوارەی ڕۆژی پێشوو کەرتی پێشمەرگە بەجەولە گوند بەگوند بەکۆبوونەوە بە گوندەکاندا هاتبوون، شەو سەعات ٣ گەیشتبوونە مام ڕەش، هەندێ جاشی خۆفرۆش شوێن پێیان هەڵدەگرن و تاریک و ڕوونی بەیانی گەمارۆی گوندەکە دەدەن و لەگەڵ جموجوڵی پێشمەرگەکان دەست ڕێژیان لێدەکەن. هەر دەستڕێژی یەکەم دوو پێشمەرگەی قارەمان شەهید دەبێ کەیەکێکیان ناوی مەلا ئەحمەد دەبێت خەڵکی مام ڕەش خۆی دەبێت، ئەوی تریش تایەر بابە دەبێ کە یەکێکە لەو قوتابیانەی فەرەیدون پەروەردەی کردووەو ڕەوانەی بنکەی پێشمەرگایەتی کردووە.

پاش شەڕێکی سەروەری بەیانی تا ئێوارە ماڵ بەماڵ چوار پێشمەرگەی تر شەهید دەبن، کەیەکێك لەوانە پشتیوانی فەرمانەدەی کەرت و خەڵکی شاری کەرکوك، هاوڕێی فەرەیدون دەبێ و زۆر کاری تێدەکا و سەفەرەکەی لێتێك دەچێت و زۆر بە پەلە ڕۆژی دوایی دەگەڕێتەوە بۆ شاری کەرکوك، زۆر پەرێشانی ئەم شکستەی یەکەم کەرتی پێشمەرگەکان دەبێ، چونکە ئەو ناوچەیە هێشتا وای لێنەهات بوو پێشمەرگە جووڵەی تێدا بکات ئەوە یەکەم جار پۆلێکی کوڕی چاك تێدا شەهید بوون، ئەبێ بە هۆی چاوشکانی خەڵکی. بۆیە نەیدەزانی چی بکات، چۆن دەمی بگاتە سەرکردایەتی بنکەی ئەو ناوە، داوای لەڕێکخستن کرد ڕێگەی بدەن بەنهێنی سەر لە ڕێکخستن بدات ئەگەر کاری ڕێکخستن هەیە ئەیگەیەنێت ڕێگە دراو بەکاری ڕێکخستن و ویستی خۆی چووە بنکە، واڕێککەوت ئەمجارەش هێزێکی بێ ژمارەی دوژمن لەگەڵ (١٨) کۆپتەر دایان بەسەر بنکەکەیاندا. شەڕ دەستی پێکرد ئەو ڕۆژە فەرەیدون تفەنگێکی وەرگرت و شەڕێکی جوامێرانەی کرد، شەو هات پێشمەرگەکان نەشکان، دوژمن هەڵهات و ڕۆژی دووەم فەرەیدون

گەڕایەوەو هەتا ئێستا فەرەیدون سۆراغی نییەو ئایشەش قوربانی ڕێبازی خەباتی شۆڕش‌و خەڵکەو شێت‌و سەرگەردان بە دوای فەرەیدوندا دەگەڕێ‌و هەر ئەڵێ "فەرەیدون نەهاتەوە!!!".

پاییزی ١٩٩٠
کوێتە – پاکستان

# مەردین

پێشکەشە بە:

کاک مەریوان عەبدوڵڵا عەسکەری جوانەمەرگ

شۆڕش و راپەڕینی شەستەکانی خەڵکی کوردستان هێشتا بە چۆکدا نەهاتبوو، بەڵام شیرازەی رێکخستن پچڕپچڕو لاوازببوو، بیروباوەڕ وەکو جاران بە جۆش و خرۆش نەمابوو، گەورەکان ئۆباڵی وەزعەکەیان دەخستە ئەستۆی بچووکەکان و بچووکەکانیش ئۆباڵەکەیان دەهاویشتە ملی گەورەکانی خۆماڵی و بێگانە بە ناو دۆستەکان. ئەویش لەوباروودۆخەو لەدووەمی هەفتاکاندا چاوی بەدنیای رۆشن هەڵهێنا، کوانووەکەیان تەشتی پڕیان بەخۆیانەوە نە ئەبینی، کار نەبوو، سەروەت و سامان شتێکی وەها نەبوو، ئەوەی هەبوو، کۆتای نەدەهات فەقیری کرێچێتی بوو.

خەڵك سەرنگونکردن دەستی پێکردبوو لەجادە چۆڵەکان و لەکۆلانە سەرپەڕەکان تاکە تاکە دەرفێندران و بێ سەرو شوێن دەبوون، تاوانیشیان هەر ئەوەندەبوو کەکوردن و دڵسۆزن بە خەڵکی کوردستان و بە پاکی کوردایەتی دەکەن.

لە خانووەکەی (جووت قاوە) دەریان کردن لەبەر ئەوەی هەندێ جار کۆبوونەوەی مانگانەیان هەفتانە لەوێ دەکرا بەهۆی ئەوەی بنەماڵەکەیان قیروبنێشتی نوسابوون بەکوردایەتییەوە.

جارێکی تریش بەزمەکە دروست بۆوە، هەم دیسان دەبێ بگوێزنەوە چونکە خەڵکی هامووشویان دەکات، باوکی زۆر بێزار بووەوە زۆری رق لەو گوێزە گوێزی بوو، دایکیشی توندە تەبیعەتبوو قسەی خەڵکی پێ قەبوڵ نەدەکرا، چونکە هەندی جار خراپ لێك ئەدرایەوەو ئەوترا: "ئەوە بۆچی ئەوەندە خەڵکی هاموشۆیان ئەکەن؟" ئەویش تا دەهات گەورەتر دەبوو، ئەمجارەیان چونکە گەڕەکێکی چەپەك بۆ ئەوەی لەوێ بتوانن ئەرکی رێکخستنی کوردایەتی باشترو بێ کێشەتر بەڕێوەبەرن بەڵام ئەم خانووە تاکە هۆدەیە ئەوەندە کۆن و داڕزاو بوو، تەنها هۆدەیەك بە دووگڵۆپی سەد واتی رۆشن نەدەکرایەوە چونکە ئەوەندە کۆن و

چڵکن و دوکەڵاوی بوو. هەرچی مەرجی ژیان هەیە تێیدا نەبوو بەڵام ئەوان بەدەست نەبوونی و بەدەست قسەی خەڵکەوە نەیان دەزانی چی بکەن باشە خۆ ناشکرێ حاشا لە کوردو کوردایەتیش بکەن و بڕای بڕای بە لایدا نەڕۆن، نەیان دەزانی چۆن چۆن گوزەران بکەن، لە هەموو شتێ خراپتر ئەوەبوو زۆر لەوە ئەترسان پۆلیسی نهێنی بزانێ و هەموویان راپێچی گرتوخانە بکات.

ئەو بەسەردا نەخۆش کەوت، هەناسەی توند دەبوو، فیشکەی دەهات وەکو هێستری ژێر ناعور، دەرامەتی باوکیشی هەر بەشی ژیانی ئەمانیشی نەدەکرد مەمرو مەژی، نە ئەتواندرا ببرێتە لای دکتۆر، هەر چۆنێك بوو لەڕێی ئەو برادەرانەی هاوبیرو باوەڕ بوون پارە قەرز کراو برایە دکتۆرو دەرکەوت کە دووچاری نەخۆشییەکی زۆر کوشندە بووە، ئەگەر کەمێ دوا بخرایە لەوە زیاتر کۆچی دەکردو لەو رۆژەشدا کۆچی ئەو یانی کۆچی هەموو بنەماڵەکەیان. ئەوەندە چوو بووە دڵی باوك و دایك و براکانییەوە، لەجیاتی تەلەفزیۆن و شتی خافڵاندن ئەو ببوو بە مایەی گەشانەوەو حەسانەوەی هەموویان. باوکی ئێواران عەرەبانەکەی دادەناو شتێکی خۆشی بۆ ئەو دەخستە گیرفانی و هەر دەگەیشتە ماڵەوە خێرا (خلیو) خۆی فڕێ دەدایە باوەشییەوەو دیارییەکەی لەباوکی وەردەگرت چونکە دڵنیا بوو هەر شتێکی بۆ دەهێنێ و ببوو بەکاری رۆژانەی باوکی، ئەویش هەرمێ یا سێو یا پرتەقاڵ یا هەر شتێکی بۆ بهاتایە دەی گێڕا بەسەر یەکە یەکەی ئەندامانی ماڵەکەیان و داوای دەکرد لەگەڵی بخۆن.

(خلی خاشان) وەها شیرین بووبوو، کاتێ ئەندامێکی بنەماڵەکەیان بۆ چەند رۆژێ دابڕایە هەم ئەو بێ تاقەت دەبوو هەم ئەوەی دوور دەکەوتەوە تاقەتی دەچوو.

خۆشەویستی و شیرینی، ژیری لەو پەڕیدابوو هەر بۆیە زۆر زوو گەورە دەبوو، دەڵێن کچ رۆژی بە قەد دەنکە جۆیەك زیاد دەکا و کوڕیش بە قەد دەنکە گەنمێ، واتە کچ زووتر گەورە دەبێ، بەڵام (خلیوی) ئەوان لە کچ زووتر گەورە دەبوو، کاتێکی زانی لە سەنگەری بەرگریدا خۆی بینییەوەو لەوێش زۆر زوو گەورە بوو، ئەیویست بە ساڵێك هەنگاوی چەند ساڵە بهاوێ و ئارەزووی ئەوەی دەکرد رۆژێك بێتە پێشەوە ببێ بە سەرکردەیەکی دڵسۆزو ژیرو وشیاری گەلی کوردستان، بەڵکە ئەویش بتوانێ کەلێنێك بۆ کوردایەتی پڕ بکاتەوە.

ئەولە شۆڕشی ئەیلولدا ساوابوو، ئێستاش شۆڕشی پاش هەرەس، هەر چۆنێك بوو ئەیەوێ دەوری خۆی تێدا ببینێ ئەگەر چی درەنگەو ئارەزووی دەکرد لەسەرەتاوە دەست پێشکەری بکات، بەلام ئێستاش باشەو بایی ویژدان ئیسراحەتکردن لێرەش هەر نەبێ لە سەنگەرێکدا شان بەشانی کوردێ رووبەڕووی دوژمن دەوەستێ و شێر ئاسا بەسەریاندا دەنەڕێنێ و بە دوژمنی دەسەلمێنێ، مافی مرۆڤی کوردی لێداگیر کراوەو ئەیەوێتەوە، زوو بێ یان درەنگ.

زۆر زوو بوو ئەنفال شەپۆلی بەحر ئاسایداو لوتکەو ئەشکەوت و دۆڵ و دەشتی گرتەوە، بەڕێز جاش سەرشاخ و لاقەت پاڵ و ناو دۆڵ دەگەڕان و کێوماڵیان دەکرد، ئاگریان لە باخەکان، قامیشەکان، پوش و پەلاش بەردەدا، ئەوەی ئاگریش نەیگرتایە بە فڕۆکە تێزابیان بەسەردا دەکرد، کانیاوەکانیا پڕ دەکردەوە بۆ ئەوەی پێشمەرگە ئاوی لێ نەخۆنەوە، ئەشیای پاش ماوەی خەڵکی لەدۆڵ و ئەشکەوت و شوێنە چڕەکاندا شارا بوونەوە، ئەیان سووتاندو تێکەلاویان دەکردن و نەوتیان بەسەردا دەکرد، مەسینەو قاپ و مەنجەڵ و چەقۆو کەوچك و هەرچی پێویستی مرۆڤی بوو دەیان سوتاندو بەنوکی حەربە کون کونیان دەکرد، کەتری و قۆڕیش مەگەر هەر خۆیان بزانن چۆن کون کونیا دەکرد. بۆ ئەوەی پێشمەرگەو خەڵکی کورد کەڵکی لێ وەرنەگرێ، پێلاوە کۆنەو هەر شتێ بەکاری لەپێکردن بهاتایە لەت لەتیان دەکرد، ئەشکەوتەکانیا بەلوولەی باروت ئەتەقاندەوە.

ئەویش جوتێ پێلاوی زیادەی لەگەڵ نانەبەرەکەیدا کردبوو بە پشتیداو لە هەر شوێنێك شتێکی بدیتایە بۆ لێقەومان بەکاردێ دەی شاردەوە بۆ ئەوەی جاشە رووڕەشە خۆماڵییەکان لەناوی نەبەن، وەهای لێ هاتبوو هەر لەخۆیەوە چاوی دەگێرا بۆ ئەوەی شتێ ببینێ و هەڵیگرێ بۆ رۆژانی لێقەومان، ئەنفال درێژەی کێشاو هێزی دوژمن هەر زیادی دەکردو وردە وردەش کورد لەهەموو گوندەکان نەمابوون، یان بەرەو ئێران و تورکیا یان ئەنفال کرابوون، یا خۆیان لە ژێر باڵی جاشێتیدا حەشار دابوو.

فێر بوو بوو هەمیشە نانی زیاد، دەزو دەرزی، جل و بەرگی زیاد لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ، سەرەڕای ئەوەش فیشەك و مەغزەن کە خۆراکی سەرەکی پێشمەرگە بوو هەر چۆنێکە دوو سێ رومانەی پێ بێ و لانیکەمی کەمی (٥) مەغزەنی هەبێ، ئەگەر دەستیش بکەوێ مەغزەنێکی (٧٥)ی ئەوەش تێشوویەکی چاکە بۆ

لێقەومانی دەستەویەخەو کەوتنە بۆسەوە.

حەزی دەکرد "بێ سیم" فێر بێ، بە ئارەزووی خۆی گەیشت و ماوەیەك لەو ناو دەوەن و بەردانەدا وایەرەکانی لە بن دەوەنەکانەوە رادەکێشاو لەسەر سەعاتاندا بە نەرمی و لەسەر خۆ لەگەڵ "بێ سیمەکان" ی سەر سنوورەکاندا قسەو باسیان دەگۆڕییەوە.

ژیانی ئەنفال زۆر سەخت بوو، ئەوشتی وەهای نەبینی بوو، شەوو ڕۆژ کوڵ بە کوڵ و بە ڕێگا ڕۆیشتنەوە، شەوان زۆر دژوار بوو، ڕۆیشتن نەدەکرا چونکە تەڵقە تەنوورەی ڕەبایەی سەربازو جاش ڕێگاکانی ڕۆشندەکردەوە، ئەبوو لە کاتێکدا تەڵقە تەنووره هەڵدەدرا خۆی بدات بە زەویدا جا ئەو ئاستە ناو قوڕ، ئاو، دڕك و هەر شتێ بێ هەر ئەبێ خۆی لەگەڵ زەویدا جوت بکات، بۆ ئەوەی بەدی نەکرێن، چونکە بەدی کردن و تەواو بوون یەکێك دەبوو.

لەپاش دوو مانگ و نیو لەسنووری ئەنفال ڕزگاری بوو، بە قەندیلی سەر سپیدا هەڵگەڕا، زۆری لاخۆش بوو، زۆر باسی هەڵۆی قەندیل و قەندیل دەکرا، باسی بەفری زۆرو ئاوی ساردو چڕی لوتکەو دۆڵ و شیوی قەندیل سەرنجی ڕاکێشا بوو، ئەو چەند ڕۆژەی ئەویش هەڵۆی سەر لوتکەی قەندیل بوو لە خۆشترین ڕۆژانی ژیانی دەژمێردرا.

هەڵۆی چێ، هەڵۆ کوا ئەوەندە ئازایە دژی بەدەسەڵات ترین هێزێ دوژمنێکی ئەوەندە خاوەن تەجروبەو پارەو هێزو چەکی کیمیاوی بوەستێ و لەگەڵ مەرگا لە پێناوی ئازادی گەل و نیشتماندا بجەنگێ.

زۆری نەخایاند هێلانەکەی لە قەندیل گوێزایەوەو ڕوو لە ئاوارەیی هەڵفڕی و لە پاکستانی دواکەوتووی دوور لەویژدان و زانیاری سەردەم سەقامگیربوو، چیدەکرد لەوێ هێلانەی بۆ دانەدەمەزرا، هەندێ چیلکەو پوشی کۆکردەوە، بەڵام ئاگری تێبەربوو، لەگەڵ یەکەم هەنگاوی ڕاپەڕینی جوامێرانەی گەلەکەی لە (١٩٩١/٣/٥) ئەویش کەوتەوە کەڵکەڵەی ئەوەی هێلانەکەی بەرێتەوە دەشتی کاکی بە کاکی شارەکەی باوو باپیرانی شاری کەرکوکی کوردان، لەشەقەی باڵیدا بەسەر کۆمەڵێ زیندان و دڕکەزیدا گەیشتەوە دەشتی خوێناوی کەرکوك، لانەواز ببوو، وەفا نەمابوو، کەس لەو هاوڕێ و برایانە لەسەردەمی خەباتی نهێنیدا بەگەرم و گوڕی هاموشۆیان دەکردن و لە شانەو بەشەکانی ڕێکخستندا مشت و مڕیان لەسەر

بیروباوەڕو جۆری داڕشتنی بەرنامەی شۆڕشی نوێی کوردایەتی دەکرد نەیان گرتە خۆ. ئەویش نەیدەزانی چی بکات، نامۆ بوو لە هێلانەکەی خۆشیا، بێ هێزو بێ پشتیوان، بێ پەنا نەیدەزانی ئەم لێقەومانەی ئەم چی بوو خۆ ئەو لە ئەنفالدا ئەوەندە دڵتەنگ نەبوو، ئەچووە سەر لێواری شۆستەکان بیری دەڕۆی بەلای ئەوەدا بۆ دەبێ یەکێك هەموو ژیانی خۆی بۆ کوردایەتی و بۆ خەڵکی تەرخان کردبێ ئا ئەوها بەزوویی و ئاوها لە لێقەوماندا کەس نەیگرێتە خۆی و ئاوڕێکی لێ نەدەنەوە لەگرمە گرمی ئەوانە بە ئاگا هاتەوە کە پەلە پەلی ئەوەیان بوو بڕۆن هەندێ تەلی کارەبا، هەندێ شۆفڵ، هەندێ سەیارەی گەورەو هەندێ دامەزراو پرۆژە گەورەکان لەکوردستان جێگربوون بیڕوتێننەوەو بیان گەیەننە ئێران و خێرا بیفرۆشن و خۆیان لەسەر لاشەی شەهیدان دەوڵەمەند بکەن بە ئاگا دەهاتەوە.

هەرچۆنێك بوو خۆی لە لای رەوتێکی بچکۆلەی کۆنی کوردایەتی جێگیر کردو دەستی کرد بەکارکردن و پەلی خەبات گێڕی کارکردنی چاکی وەرگرت.

تۆزێ هاتبووە سەرخۆ، چاوی دەگێڕا بۆ هاوسەرێك، زۆری کۆشەش کرد، کچێکی شۆخی چاکی کرد بە هاوڕێی رازو نیازی، زۆر خۆشحاڵدەبوو بەوەی ئەو کچە شۆخە ژیرەی دۆزیەوەتەوە بۆ ئەوەی بیکات بە هاوسەرری خۆی، بەلام چۆن رۆژگار هەمیشە لەبەرژەوەندی خەڵکی دڵسۆزو پاك و راستگۆنییە ئاواش ئەستێرەی کەوتە کزی و دەستی فیتنە کەوتە نێوانیان و نەگەیشتن بەئاکام و دووچاری بیرکردنەوەبوو، زۆر خوی دابووە ئەوەی خۆی لەبیربکات، ئارەزووی دەکرد یەکجاری خەوی لێبکەوێ.

خزمان و براو دۆستانی بیریان لێ کردەوەو هاوسەرێکی رێکوپێکیان بۆ دۆزییەوەو بوو بە خاوەن ژن و ماڵ.

وەکو ئەوەی بیزانێ کە تەمەنی روو لەتەواو بوونە، جار جارە لەبەر خۆیەوە ئەیوت: "تۆ بڵێی بەم زووانە منداڵێکمان ببێ و بیگرمە باوەش و هەر خۆشم پەروەردەی بکەم و دەست بەسەرو گوێیدا بهێنم و بەنازی باوکایەتی پەروەردەی بکەم " لەسەر قسەکانی بەخەیاڵەوە ئەڕۆیشت و ئەیوت: "شەرتە هەرچەندە من ئەشکەنجەی زۆرم بینی بەم تەمەنە کەمەم بۆ رزگاربوونی کوردستان، ئەبێ وەهای پەروەردە بکەم نەوەکەم زۆر لە خۆم شێتگیرتر بکەم و وای پەروەردە بکەم هەرگیز نەبەزێ لەبەردەم قۆرتەکانی رێگای ژیان و خەباتدا".

وازی لەوە هێنا چۆن پەروەردە دەبێ و کەوتە سەر ئەوەی ناوی چی لێ بنێ، لەپاش بیرکردنەوەی زۆر وتی: "مەرد هەمیشە ئەو کەسەیە راستگۆو ئازاو دڵسۆزو بە کەڵکی مرۆڤایەتییەو لە کوردەواریشدا دڵسۆزی، پاك داوێنی و دەست پاکی و راست گۆیی و نەبەزی و ژیری. بۆیە هەر یەکێك لە کوڕ یان کچ مان بوو ئەبێ ناوی بنێم (مەردین)!!".

هێشتا خەوە خۆشەکەی مەریوان نەهاتبووە دی کۆرپەی لەدایك نەبووبوو، لەمیوان دارییەکدا بۆ ماڵە دۆستێکی بەنارنجۆکێکی دەستی دڵە بەهێزە کوردانەکەی لە لێدان کەوت و ئەو هیواو ئاواتە پیرۆزەشی لەگەڵ خۆی بردە گۆڕەوەو (مەردین)یش نازی باوکی نەدی و ئێستا کچێکی کوردیی بێ باوکە!!.

١٩٩٦/٨/٣

راوەڵ پەندی ـ پاکستان

# پێشمەرگە بوویت

پێشکەشە بە
کامیار کەمال

منداڵ بووی، بە تەواوەتی نەتدەتوانی بەری ئاشەکە بکێشی و چاودێری بکەی کەباوکت کۆچی دوایی کرد، دایکی هەژارت چوار کوڕو سێ کچی بەسەردا بەجێما، تۆش زۆر زیتو زیرەك بووی و ئەتویست سەردانی ئاشەکەش بکەی و ئاوی رەزەکەشتان بدەی، جار جارەش لەگەڵ دایکت و براو خوشکەکانت ئەچوون بەرچنە هەنجیرو باری هەنارتان دەڕنی و بەبرا گەورەکەتاندا ئەتان نارد بۆ سلێمانی بۆتان بفرۆشێ و پارەکەی بهێنێ تەوەو بیخاتە دەستی دایکە کلۆڵەکەتانەوە رۆژانەش مزەی ئاشەکە هەبوو ئیدارەتان پێ دەکرد، بەڵام تۆ زۆر بزۆز بووی، ئارەزووت دەکرد ئەوێ بەجێ بهێڵی چونکە گوند نەبوو شاریش نەبوو، تاقە ماڵە لەسەر لێواری تەقتەقە شاخێ بەدیار هەندێ رەزو ئەشی روانیە سەر رووبارە پێچاو پێچەکەی سورقاوشان. شەو دادەهات واقەواقی چەقەڵ و قرمەقرمی قامیشی ژێر پێی بەراز دڵیان ئەترساندن، تاکە ماڵە بوون، زۆر چۆڵ و دووربوون لەئاوەدانی ژیان، بەتەنها ماڵە زۆر بەگران دەگوزەرا بەتایبەت بۆ منداڵێکی وەك تۆ بزۆز لە ماڵەکەشدا سفری پشتی فاریزە بووی چونکە برایەکتان لەخۆت گەورەتربوو هەر هەمووشتان لەڕووی دایکتاندا نەتان دەوێرا ورتە بکەن چونکە باوکی رەحمەتیت زۆر بەنیزام و توندو تیژبوو وای پەروەردە کردبوون.

قوتابخانەتان لێوە نزیك نەبوو، نەخۆشخانەش هەر نا، هەتا پۆلیسخانەش نزیك نەبوو بۆ کاتی لێقەومان، هەر چەندی بیرت لێ دەکردەوە ئەو شوێنەی ئێوە لێی ئەژین بۆ ئەم سەردەمە ناشێ و بەکەڵکی ژیانی هەرچوار فەسڵەکە نایات.

وردە وردە گەورە دەبووی، ئەتتوانی سەرپەرشتی ئاشەکە بکەیت وات لێهات بوو ئەگەر بارە هەنارت بۆ لە گوێ درێژەکە بار بکەن لەگەڵ حاجی واحیدا بیبەیتە سەر جادەی دوکان– قەشقۆڵی و لەوێ بیفرۆشی، زۆر ئارەزووت دەکرد هەموو جارێك تۆ بڕۆی چونکە سەیارەی جۆراو جۆرت دەبینی کە دەهاتن و دەرۆیشتن،

خەڵکی شارت دەبینی، نیگای بەرگی خۆت و سەرو چاوی چڵکنی خۆت دەکردو ئەتروانی بۆ ئەوانی شار، زۆر جیاوازیان هەبوو، کە دەهاتییەوە بۆ تاکە ماڵەکەی خۆتان دڵت توند دەبوو بەڵام نەتدەوێرا لە ڕووی دایکتدا هیچ بدرکێنی.

لە زستاندا ماشەی ماسیتان دەنایەوە بۆ ماسی گرتن، بەڕاستی گۆشت ماسی چاکتان دەخوارد، زۆر جارێش بە قولاپێکەوە لەسەر بەردێك هەڵ دەچیچکای و ناوبەناوە ماسیەکی پێوە دەبوو، زۆرت پێ خۆش بوو هەستت دەکرد گەورە بووی ئەتەویست گۆڕانێك لەژیانی خۆتدا بکەی، راپەڕی و لەم گوندە رزگارت بێ، ناوبەناویش چەم و تاکە ماڵەکتان دەکەوتە بەر بۆردومانی فڕۆکەکانی رژێم، کونە تەیارەیەکی چاکتان هەبوو، ئەشکەوتە رەشی ناو باخەکەتان بۆ ئەوە چاك بوو چونکە درك و داڵ و قەمیشە بەرزەکانی لێواری رەزەکە بەردەمی کونەکەیان بزرکردبوو لە ئاسمانیشەوە فڕۆکەکان بەدییان نەدەکردو هەر کەگرمە دەهات خێرا خۆت دەگەیاندە ئەوێ.

یەکەم جارت بوو، تازە مێرد منداڵ بووی، خێرا خێرا قۆڵت بادەدا، زۆر لە خۆت رازی بووی و خۆت بە بەهێز دەهاتە بەرچاو، لەدڵی خۆتدا دەتوت: "تۆ بڵێی کەسێ هەبێ لە تەمەنی خۆمدا بتوانێ پشتم بدات لەزەوی" لەپڕێکاو لە شیوەکەی گەرمکەوە هەندێ تفەنگ بە دەستت بینی، لەوەو پێش نەت بینی بوون، بەرگیان بۆر نەبوو هەموو رەش و بەڵەك بوون، دیمەنیان بە چەکداری شاخی نەدەکرد، چڵکن نەبوون، جامانەیان تاکە تاکە بەستبوو، بەوە دەچوو هێزی تریان لەگەڵدابێ، هیچ نەئەترسان دیار بوو شارەزاشیان لەگەڵ بوو، کەچاویان بەتۆکەوت بەتوڕەییەوە بانگیان کردی "کورە وەرە بۆ ئێرە" ئەوان لە پشتی ماڵی ئێوەوە روو لە سورقاوشان ئەڕۆیشتن و راوەستان بۆ ئەوەی تۆ برۆیتە لایان، تۆش سەرت رووت بوو، جلێکی خۆڵەمێشی کۆنەت لەبەردابوو، چویتە پێشەوە نەت دەزانی ئەمان چین".

پرسیاریان لێت کرد:

-ناوت چییە؟

-کەمال.

-کوڕی کێیت؟

-شێخ محەمەد.

-باوکت له کوێیه؟

ئەوە رای چڵەکاندی، زانیت نەشارەزانو نازانن باوکت نەماوە، هەڵوێستەت کرد، بەتوڕەییەوە یەکیان هاتە پێشەوە "باوکت لەکوێیە؟" بەوە دەچوو ئەمجارەیان جواب نەدەیتەوەو بدەن بەناوی دەمتدا، وتت: "مردووە مردوو" وتیان: "درۆ دەکەی، پێمان بڵێ لە کوێیە ئەگینا تۆ لەگەڵ خۆمان دەبەین" تۆش ترس لێت میوان بوو، خێرا وتت: "بڕوا بکەن مردووەو لەکێ دەپرسن پرسنو ئەگەر وەها نەبوو بم کوژن" ژیرانە جوابت دانەوە، دڵنیا بوون کەڕاست دەکەی، وتیان: "قسەیەکت لێ دەپرسین عاقڵ راست جوابمان بدەوە، تۆش چیت لەئێمە بویێ ئەت دەینێ".

وتت: "بڵێن چییە؟ " وتیان: "پێشمەرگە، جاش کێ لەم ناوەیە بە ڕۆژو بەشەو پێمان بڵێ، ئێمە ئەمانەوێ چاومان پێیان بکەوێ، زۆر زرنگ بووی کە ئەمەت بەر گوێ کەوت بۆت دەرکەوت کە ئەمانە جاشنو لە پێشمەرگە دەگەڕێنو ئەیانەوێ تۆ بکەن بە جاسوسو شوێن رێی ئەوانیان پێ بڵێیت، بۆیە خێرا وتت: "کێ لەم چەمە چۆڵەدا دەژی لە ئێمە زیاتر، بڕوا بکەن لەخۆمان زیاتر کەسێکم نەدیوەو ئەوەش یەکەم جارە چەکدار ببینم کە ئێوە هاتوون لام سەیرە، ئێوە بۆ رێگاتان کەوتۆتە ئەم چیاو چۆڵە، خۆ هەر ئێمەو چەقەڵو بەراز لێرە ئەژین".

زۆریان هەوڵدا بەڵام شتێکیان لێ هەڵنەکڕاندی، ئەوان ڕۆیشتنو تۆش خێرا چوویتە ناو رەزەکەوەو قسەکەت بۆ دایکت گێڕایەوە، دایکت وتی: "ئافەرین کوڕم ئەوانە جاشن، قەت قسەی راستیان پێ نەڵێی".

پرسیارتکرد "دایە جاش یانی چی؟" دایکت وتی: "کوڕم ئەمانە کوردنو خۆیان فرۆشتوە بەڕژێمو بەدوای پێشمەرگەدا دەگەڕێن بیان کوژن، هەر کوردنو بە پارە کورد دەکوژن، ئەویش جۆرێکە لە نەگبەتی کورد!".

ئای چەندت لاخۆش بوو کە دایکت وتی: ئەوانە جاشنو بە پارە خۆیان فرۆشتووەو تۆش هاوکاریت نەکردونو فێڵت لێکردوون.

لەوەو پاش چاوت دەگێڕا بەدوای پێشمەرگەکاندا، ئەچوویتە لایان، دادەنیشتیو قسەو باست لێدەپرسین، خۆشت دەویستن، ناوی پێشمەرگەو ئەرکەکانیت لەوان دەپرسی، زۆر بە پێچەوانەی ئەوەوەبوو کە دایکت وتی: جاش یانی خۆ فرۆش، بەڵام پێشمەرگە یانی کەسانی هەرە ئازاو دڵسۆزو لەخۆ

بوردووی رۆژانی پێویستی گەل و مەرگی خۆ پێش مەرگی خەڵك خستن. لات ئازایی بوو، قارەمانێتی بوو کەسێ بۆ کەسێ بۆ خەڵکی خۆی بە کوشتن بدات، کەسێ بتوانێ ئەوەندە دوور بێ لە خۆویستیو ئەوەندە بتوانێ خۆی بۆ خەڵکی ماندوو بکات، ئای کەهەستێکی بەرزو پیرۆز بوو بۆیە هەر لەو رۆژەوە خۆت بە پێشمەرگەیەکی بێ پاداشتی بچکۆلەی خەڵك زانیو بەڵێنتدا لەو پێناوەدا تێبکۆشیو خۆتی لە پێناودا بەخت بکەی، ناوت لە خۆتنا "پێشمەرگەی نهێنی".

هەر کەچوشیتە سلێمانی هەوڵتدا خۆت بگەیەنیتە بەشەکانی رێکخستنی کۆمەڵەو لەوێدا چالاکی خۆت بنوێنی، نەمردی بە ئەنجامت گەیاندو بوویتە جێگای بڕوای هاورێکانی کۆمەڵەو لەولایشەوە بووی بە شاگردی نانەواو بۆ رۆژانەی ژیان کارت دەکرد.

شارت زۆر بەدڵ بوو، ئارەزووت دەکرد هەر لەشاربن، تەمەنت هی ئەوە نەبوو برۆیتە قوتابخانە، بەکەمو کورتیت دەزانی خوێندەواریت نییە، بەلاَم بڵێی چی بێ باوکیو نەبوونی نەیان هێشتووە تۆش خوێندەواربی وەکو باقی هاوتەمەنەکانی خۆت، ئەگینا ئەکرا تۆش خوێندەوارێکی چاکت لێدەربچێ.

لەشار دا دەستت کرد بە کارکردنی سیاسی، هەوڵت ئەدا بە پلەکاندا خێرا سەر بکەوی بۆ ئەوەی بتوانی باشتر خزمەت بکەی، زۆر گوێڕایەڵ بووی، دڵسۆزو جێگای بڕوا بووی، هەر بۆیە رێکخستنی سلێمانی کۆمەڵە هەر جارێ برایەکی سەر بەرێکخراو ئەمری گرتنی دەرچووایە یان بیویستایە بڕوات بۆ پێشمەرگایەتی بانگی تۆیان دەکردو ئەت بردن بۆ بنکە ئازادکراوەکان. چاك لەیادت مابوو کە شەهید پشتیوانو شەهید وریا سووری سەر تیپو خەڵکانی تری لەو بابەتەت دەگەیاندو ژێرانە دەگەڕایتەوە.

وات لێهاتبوو دەورەی پێشمەرگایەتیو دەورەی کاری نهێنیت بە تەواوەتی بەکردەوە بینی بوو، کاتێ لەسەر ئەنجامی چالاکییەکانت لای دوژمن بوویتە جێگای گومانو ناوت دەرچوو بۆ گرتن، رێکخستن ئاگاداری کردیو تۆش ئاگاداری دایکت کردو خێرا خۆت خستەوە باوەشی تاکەماڵەکەی خۆت لە زێڵێن، خۆت گونجاندو دەستت کردەوە بەکارو کاسبی جاران.

لەساڵی (١٩٨٠) شەڕێکی گەرم لەسورقاوشان روویدا، دە دوازدە پێشمەرگە لەو ناوە بوون، نا پاکێك خەبەری دابوو بە جاش، هێزێکی سەربازی یەکجار زۆر بە

پاڵپشتی (١٨) فڕۆکەی کۆپتەر کەسیانیان جەنگیو باقی نەفەر بەر، سەربازو جاشیان داباراندە ئەو بەرو بەری سوورقاوشان. شەڕ دەستی پێکرد لە بەیانی سەعات حەوتەوە، بەردودار، دەوەن، بستێ زەوی نەما بوو گولەی پێ نەکەوتبێ، فڕۆکە بە بەردەوامی نەفەری دادەگرت. فڕۆکە بە بەردەوامی بۆردومانی دەکرد، زیاتر لەدۆشکەو شەست تیرو هەندێ جار بە (هێشوویی) دەی ڕشاند. ڕەزو پوشو داری ئەو چەمە چڕە ئەم بەرو بەر سووتا، تۆش لەگەڵ دایکتو خوشکەکانتو هەندێ ژنو مناڵی ڕەزەکانی تر لەیەك هۆدە خانوودا کۆبوونەوە، شەست تیرەکان ئێوەشیان دەگرتەوە، هێمنە بچکۆل بێ سیمێکی دەستیی پێ بوو لەناو خانووەکەی ئێوەی تێدا بوون، قسەی لەگەڵ یەکێك لە پێشمەرگەکان دەکرد، داوای ئاویان کرد، زامداریان هەبوو، کەس نەی دەوێرا سەر دەربکات، هەمیشە (١٨) کۆپتەر ئەسوڕایەوەو ئەو هەموو جاشو سەربازەش تەقەی دەکرد، هەڵسای تونـد تونـد بەلەکت پێچاو یەك مەتارەی گەورەکانت پڕ کرد لە ئاو بە شەیتان باژێڕدا سەرکەوتی، زۆریان تەقە لێکردی، نە پێکرای هەر ڕۆیشتی تا گەیشتیتە پێشمەرگەکانو ئاوەکەت دانێ، هەر دەست بەجێ گەڕایتەوە لای دایکت بۆ ئەوەی دڵی لات نەبێ، بەڕاستی ئازابووی، هەموو شاهیدیان بۆ دەدایو هەر ئەیان وتەوە: "ئافەرین کەمال پێشمەرگە نەبیو ئەوەندە چاو نەترس بی".

ئێوارە دوژمن کشانەوە، پێشمەرگە سێ (٣) زامداریان هەبوو، دوژمنیش (٣٥) کوژراو، وورەی پێشمەرگەکان بەرز بوو، وورەی خەڵکەکە زۆر تر، چونکە لەو کاتانەدا مەفرەزەی پێشمەرگە بەڕۆژ نەدەگەڕا لەبەر پەلاماری جاشو کۆپتەر ئەبوو بە شەو بگەڕێن، بەڵام ئەو شەڕە چاوی جاشی شکاندو بوو بەسەرەتایەك بۆ گەشەی پێشمەرگە لەو ناوچەیەدا، تۆش دەوری خۆت تێدا تۆمارکرد.

ناوی خۆت بەرگوێ کەوتبوو، حەزت دەکرد هەڵێ برەخسێو ببی بە پێشمەرگەو بزانی ئەتوانی دەوری فەرماندەیی ببینی؟

ساڵ تێ وەرسوڕایەوە، چوویتە تیپی (٢١)ی کەرکوك، لەوێ خۆت ناونووسکردو بووی بە پێشمەرگە، لەچەند شەڕێکی گەورە لە دەشتی ساڵەیی و شواندا بەشداریتکرد، بە تەواوەتی ترست شکا بوو، ناویشت بە پێشمەرگەیەکی گوێڕایەڵو ئازا دەرکردبوو.

هەر بە پێشمەرگەیی مایتەوە، تا ساڵی ١٩٧٨، بە تەواوەتی گەورە ببووی

وەختی ئەوەت هاتبوو ژن بهێنی، لە شارەوە کچێکی شۆخیان بۆ سەردانت هێنا، بەو نیازەی یەکتری ببینن ئەگەر هەردووکتان یەکتان بەدڵ بوو لە یەکتریتان مارە بکەن و بۆت بگوێزنەوە.

ڕێگایاندا لەگەڵ کچە شۆخەکە بڕۆنە سەر ئاوەکەو لەوێ ڕازو نیاز بگۆڕنەوە، ئای ئەو ڕۆژەت چەند لا شیرین بوو، پێت وابوو ئاسمان کوون بووەو ئەو کچەی لێوە هاتۆتە خوارێ بۆتۆو حەزت دەکرد نەیەنەوە لای میوانەکان، بەڵام بۆت نەدەلووا. میوانەکان و کچەکە گەڕانەوە شار، تۆش خۆت نەقڵکردەوە بنکەیەکی پێشمەرگە لەو چەمەدا، زۆرت پەلە دەکرد دایکت زوو کارەکەت بۆ جێبەجێ بکات، بەپەلە بووی، خانوویەکی نوێی خۆشت بۆ خۆت لەپاڵ خانووەکەی دایکتەوە دروست کردن سەرت گرت و ناوەکەت سواخداو دەورو بەریت بە گوڵ و ڕێحانە ڕازاندەوە. ژنیان بۆ هێنای،ماڵێکی بچۆلەتان دامەزراند، ماوەیەکی چاك بەیەکەوە بە خۆشی ژیا، ئەوسا چەمت زۆر لاخۆشتر بوو لەمنداڵی، واتدەزانی بە هەشتەو حۆری لەناویدا دەسوڕێنەوە.

ئەنفالی بەدناو شووم سەری دەرهێناو بەزنجیرە لە کوردستاندا کەوتە نواندنی تاڵان و سوتاندن و کوشتن و دەرپەڕاندن.

هێشتا ئەنفالی سێ (٣) لای ئێوەی نەگرتبۆوە، بەڵام خەڵکانی ناوچەکانی قەرەداخ و زەنگەنەو جەباریو کەلارو ساڵەیی و بازیانی ئەو بەر بەلێشاو دەهاتنە سنوری ئێوەو بەرەو بەری کۆیەو مەڵبەندی یەك بەڕێ دەکەوتن. دیمەنێکی دڵتەزێنی هەبوو، زۆرت بەزەیی پێدا دەهاتنەوە، بەڵام لەگەڵ هێزێکی وەها دەوڵەمەندی خاوەنی چەکی کیمیاوی دوژمندا شتێك نەدەکرا لەوە زیاتر تا مردن بجەنگێ.

ئێوارەی ٣-١٩٨٨/٥/٤ بوو کە هەشت فڕۆکەی کیمیا هەڵگرهاتن و ناوچەکەیان ڕشاند، بەڕیز ڕەمییان دەکرد، بەڵام دەنگی نەدەهات لەبەر ئەوەی کیمیاوی بوو بۆنی کیمیاوی لەچەمدا بڵاوبۆوە، ئێوارەش خۆرئاوابوو، لە گوندەکانی عەسکەرو مایلەو سۆتکەو گۆپتەپەوە خەڵکانی کیمیاوی لێدراو بەرەو چەم ڕێچکەیان بەست بوو. خەڵکی دەرشانەوە، بۆگەنی گاز لە دەمیان دەهات و چاویان کوێر بوو بوو، ڕەش هەڵگەڕا بوون و سەروچاویان ئاوسابوو، هەر کەس ئازا بوایە ماڵ و منداڵی دەرباز بکردایە، تۆش دایکت و هاوسەرت برد بەرەو جادەی دوکان و هەر بەو شەوە

لەگەڵ جەمالی برات گەڕانەوە دەووری خانووەکەتان، ئەتانویست لەگەڵ باڵێکی پێشمەرگەدا یەك بگرنەوەو بجەنگن تاگیانتان تێداماوە.

سەعات چواری بەیانی بوو، سەرکەوتیتە لوتە تیژەکەی پشتیماڵەکەتان دووربینە کۆنە روسییەکەت گرت بەدەستەوەو پاشان سەرنجێکی بناری سردتدا، چیت بینی؟! مێرولە ئاسا جاش‌و سەرباز سەوز دەچۆوە، دەبابەش لەسەر تەختاییەکان خۆی لە ئاسۆگەدابوو، واتدەزانی چاوت ڕێشکەو پێشکە دەکا، روانیت بۆ بەری توتەمڕ، لەوێش هەروەهابوو، ئەمجارە وەرگەڕایتەوە پشتی زیخەڵان‌و پەلی بەردە عەلی لەو ناوە زۆر چڕ تر سەربازو جاش مۆڵدرا بوو.

رووتکردە سەری کەڵکەسمقاو بەری کلێسە بینیت سەیارەیەکی زۆر روو لەدەشتی کۆیە دەجوولان، ئەتویست بە هەموو لایەکا بروانی، هەر چەندت دەکرد بڕوات نەدەکرد کاتێ جەمالی برا بچکۆلەت وتی: "کاکە وەرە خواریێ گیراین!" هەڵمەتێکی پڵنگ ئاسات بردو بەجووتە چوونە ناو بێشەکەوە، خۆتان مەڵاسدا، هێشتا هەتاو گەرم نەبووبوو کەهێزێکی زۆر خۆیانکرد بە چەمداو دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی تاڵان‌و سوتاندنی ماڵان لەسورقاوشان‌و شێخان.

هەرچاوتان کسکەی دەهات، چوو بوونە ناوجۆگا ئاوەکەی هەڵبەسترا بوو بۆ ئاودانی ئاوی رەزەکانی سورقاوشان، زۆر قوڵ‌و چڕبوو، لە هیچ شوێنێ دەرنەدەکەوتن، ئێوە جاشەکانتان دەبینی، لێشاوەکە لەوەدا نەبوو بە (ئارپیجی)یەکەت دوو دانەیان پێوەنێی‌و دەپانزەیەك بکوژی، چونکە سەروبنی دیار نەبوو، ورتەی هێزی پێشمەرگەو خەڵکیش نەدەهات، رۆژە رەش بوو، رۆژی وەها لە مێژووی کورددا تۆمار نەکرابوو یان تۆ بەچاوی خۆت نەت دیبوو، جەمال زۆر بەسەبر بوو، هیچ خۆی تێك نەدەدا، زۆرت پێ خۆش بوو ئەویش تفەنگێکی وەسەت برنەوی لابوو بە قەدێك فیشەکەوە، هیچ خۆی رانەپسکاند تەقە بکات، هەناسەتان نەدەهات، تا رۆژ لەهەموو ناوچەکە ئاوابوو، جاشەکان نزیك نزیك سەنگەریان دادەمەزراندو (١٥) جاشی تێدا دەمانەوەو چاودێری وەزعەکەیان دەکرد. ئێوەش بەهێواشی‌و بێ خشە لە جۆگا ئاوەکە هاتنە دەرێ‌و چوونەوە ئەشکەوتە رەش، هەندێ نانتان تەڕ کردو سەلکێ دووان پیازو هەندی خەروا هەنجیرتان کردە ناوی‌و کەوتنەڕێ. نەتان دەزانی بەرەو کوێ بڕۆن، زۆر جار پێشمەرگە لەچەمی رەزاندا خۆیان پەنا دەدا، بەرەو ئەوێ رۆیشتن، شوێنەواری

خەڵكی لەچەمی ساچوخ و لە چەمی قەڵای جوڵندیدا هەبوون، جل و بەرگ قاپ و قاچاخ و زەخیرەی زۆر، بەڵام هەموو درابوو بە سەر یەكدا، دیار بوو خاوەنەكانی لە ترساندا بە پەلە پەل ئەوەی ویستویانە بردوویانەو رۆیشتون، چەمەكە ئەوەندە چۆڵ بوو ئەو دیمەنانەش بۆنی خوێنی لێدەهات، مریشك و قەل و مانگاو گۆلك لەوناوە بێ خاوەن دەسوڕانەوە. ناوە ناوە سەگێك لێتان دەبوو بەبەڵا و پێتان دەوڕی و ئاشكرای دەكردن، بۆیە نەتان دەویست سەگەكان بتان بینن، تاوە تاوە پشووتان دەدا، ئارەقە لەبنی پێتانەوە دەچۆڕایەوە، ڕێگاكان چڕو دژوار بوون. زۆربەیان سەرەو ژوور بوون كەسێكتان بەدی نەكرد هەتا چوونە كەڵەشێرەو لەوێشت هەستان دەكرد دوژمن ژمارەی زۆر ترە، سەرو بڕ داری بەڕووتان لە خۆتان بەست و وەكو دەوەن دەجوڵانەوە تا گەڕانەوە هەواری باوو باپیرتان.

بەحرەكە بنی نەبوو، مەلەوان خۆی پێ دەرباز نەدەكرا، تۆش شڵەژا بووی هەرچی سەرت هێناو سەرت برد نەت توانی لەم هێزە زۆرە بێ شمارە دەرباز ببی و هەر بەدەوری خۆتاندا دەسووڕانەوە.

بە هاوسەرەكەت وتبوو: "ئەگەر كوڕمان بوو پێم خۆشە ناوی بنێم (كامیار)" هێشتا كامیار نەهاتبووە دنیاوە، كە لەپڕێكا خۆت و جەمال بوون بەخۆراكی خوێن خۆرانی گەلی كوردو گیان و ورەی بەرزیشتان لەگەڵ كاروانی شەهیدانی كوردستاندا كەوتەڕێ، كامیاری كوڕیشت چاوی بەدنیای بێ باوكی هەڵهێنا.

١٩٩٦/٨/٨

راوەڵ پەندی ـ پاكستان

# فرمێسک

**پێشکەشە**

**بەهەموو ئەو شەهیدانەی لە پێناوی ئازادکردنی کەرکوکدا شەهید بوون لە ساڵی ١٩٩١**

لەساڵی ١٩٢٧ چاوی بەدنیا هەڵهێناو لە باوەشی خێزانێکی جووتیاردا لە گوندێکی گەورەی ناوچەکەیاندا گەورە ببوو.

خۆی ناسی بۆوەو بە تەواوەتی لە خۆی رازی بوو، لەساڵی (١٩٤٥) ناوی سەربازی هاتەوەو بوو بە سەرباز، دوو ساڵی سەربازییەکەی تەواو کردو هەر لە سەر ئارەزووی خۆی سەربازی نوێ کردەوەو درێژەی بە سەربازیداو خەتێکیاندا بوویە، وەك نیشانەی گوێڕایەڵی و وشیاری.

لەکاتی راپەڕینەکەی مەلا (مستەفای بارزان)ی خوا لێخۆشبوودا فەوجەکەیان برا بۆ ناوچەکانی بلەو بارزان‌و ناو باڵەکایەتی، کاتێ چاوی کەوت بە لوتکەی سەر سپی حەساڕۆست‌و دەوروبەری دۆڵی سەوزو داری بەری‌و ئاوی فێنك‌و هەوای ساف‌و خەڵکی سادە ئەوەندەی تر بەدڵیدا چوو بوو. ئارەزووی دەکرد هەر لەوێ بمێنێتەوە، بەڵام کاتێ شەودا دەهات لەلوتکەی شاخەکانەوە بەردیان بەسەر فەوجەکەیاندا بەردەدایەوەو لە نزیکەوە تەنەکەیان بۆ لێدەدان، حەزیکرد چی زووتر بگەڕێتەوە ناوچەکانی ناوەڕاستی عێراق، هەر ئەویش وەها نەبوو بەڵکە ئەفسەرەکان‌و سەربازەکانی تریش هەموو زێڕەیان کرد بوو، ئارەزوویان دەکرد پاشەکشە بکەن کەچی کە رۆژ دەبۆوە ئەفسەرەکان کۆششیان دەکرد چەکدارە کوردەکان بگرن‌و لە ناویان بەرن بۆ ئەوەی نەجمەی پێ وەربگرن‌و خۆیان بگەڕێنەوە.

هەرچۆنێ بوو نەکوژراو فەوجەکەشیان بە لووت شکاوی گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆیان‌و پاش ماوەیەك ئیجازەیانداو هاتەوە گوندەکەی خۆیان. کە خەڵکی دەهاتن بۆ بەخێرهاتنەوەی ئەو باسی ئازایەتی شۆڕشگێڕە کوردەکانی بۆ داگێڕنەوە، کە چییان بەسەر هێناون لەو ناوچەیەدا، جار جارە پیاوێکی دنیا

دیدەی گوندەکەیان بە دەمیدا دەهاتەوەو ئەیوت: "کاوێز ئاغا بەلاوك دەڵێ چی بکەم کورد خائینە بەڕاستی ئەگەر کورد لەناوخۆیدا خۆ خۆرو یەك نەگرتوو نەبێ کەس پێی ناوێرێ، چونکە کەڵە پیاوی چاکی تێدا هەڵکەوتووەو گەلێکی ئازاو چاونەترسن، داخەکەم کە یەککگرتوونین!!".

ئەویش شتێکی ئەوتۆ سەری لە سیاسەت دەرنەدەچوو چونکە دنیای هێندە بە گرنگ نەگرتبوو، هەر خەریکی گاڵتەوگەپ بوو، پێی وا بوو مرۆڤ تەنها دڵپاك بێ لەگەڵ خۆیو خەڵك هەموو شتێکە.

گەڕایەوە سەر سەربازییەکەی، ساڵێ دووانی تریش بە ئارەزوومەندانە سەربازی کرد، پاشان هاتەوە ناو کەسو کاری، هەوڵی زۆریان لەگەڵ ئەدا کە هاوسەرێ بۆ خۆی پەیدا بکات ئەویش هەر خۆی لێئەدزییەوە، هەروەکو جاران بوو دنیای بە هەند نەدەگرت.

ساڵی (١٩٥٨) چوو بۆ پرۆژەی سەدی دوکان (زیراندۆڵ) و بوو بەکرێکا، پارەیەکی چاکی بەیەکەوە نا، کاتێ شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ بەسەرکردایەتی (عبدالکریم قاسم) بەسەر داهاتو رژێمی مەلیك (فەیصەڵو نوری سەعد) روخاو جوتیارو کرێکار هاتنە ناوناوانەوە، لەو کاتەدابوو ئەمیش ژنێکی هێناو بوو بە خاوەنی ماڵ، هەستی بە لێپرسینەوە دەکرد، زۆری پێ نەچوو کرێکارەکان کەم کرانەوەو ئەویش بەرکەوت و لەپرۆژەکە دەرکرا، چونکە کاری پرۆژەکە تەواو ببوو.

لە (١٩٦١/٩/١١)دا نێوانی کوردو رژێمی عبدالکریم قاسم تێکچوو، لەسەرجەم دەربەندەکانی کوردستان رێگا لەرژێم گیراو بۆ ماوەی رۆژێك شەڕێکی سەیرو سەمەرە بوو، دوا بەدوای ئەوە وردەوردە چەکداری (پارتی دیموکراتی کوردستان) بەشەوان دەهاتنە ماڵە جوتیارەکان لە گوندەکان بۆ نان چنینەوەو قسەکردن دەربارەی دڕندایەتی رژێمی قاسم.

ئەویش بە هاوسەرەکەی وتبو: کە هەر دەمێ هاتن بۆ نان بێ بەشیان نەکا، چونکە ئەوانە لە ماڵو کەسی حۆیان دابڕاون.

وای لێهات رژێم فڕۆکەی بەناوچەکاندا دەگێڕاو خەڵکی دەترساند، شان بەشانی ئەوەش بنکەی پێشمەرگەی کورد لە چەمی رەزانو بێتواتەو زۆر شوێنی تر دامەزرابوو، پێشمەرگەکان زۆرتر دەردەکەوتنو کۆبوونەوەشیان بە خەڵکی

دەکرد بە شەوان، هەر بەمەوە نەوەستان جارجارە لە تەنگە بەراییەکانی لادێکان ڕێگایان بە سەیارەی چەکداری پۆلیس دەگرت و تەقەیان لێدەکردن، هەندی جار لێشیان دەکوشتن، فڕۆکەکانی دوژمنیش گوندەکانی هەراسان کردبوو، خەڵکی گوندەکان کەوتبوونە دروستکردنی کونە تەیارەو هەڵکەندنی چاڵ بۆ حەشاردانی گەنم و جۆو دانەوێڵەکانیان.

یەکەم بۆردومانی ئاسمانی فڕۆکەی "مێکی ٢١" زۆربەی گوندەکەیانی گرتەوەو کوڕێکی (١٥) ساڵ و کچێکی یەك ساڵانەی شەهید کردو خەڵکێکی زۆریش زامدار بوون و چەند خانوو ماڵێکیش ئاگری تێبەربببوو، خەڵکی گوندەکەیان زۆر رقیان لەڕژێم هەڵسابوو یەکەم جاریش بوو خەڵکی بۆردومانی فڕۆکە ببینێ لەکاتی خۆی و لە ساڵی (١٩٢٤) فڕۆکەکانی ئینگلیز سلێمانیان بۆردومان کردبوو، دەم بەدەم دەگێڕدرایەوە کەچەند ناخۆش بووە ئەوا ئێستا خەڵکی گوندەکەیان بەچاوی خۆیان بینییان.

راستە ئەڵێن: زانیاری لە شارەوە دەبا بۆ لادێ، پێشووتر ئەو هیچ ئاگای لەسیاسەت نەبوو، کەچی سەر ئەنجامی شۆڕش و ئەو زوڵمەی رژێم دەیکات ئەویش ئەیەویست لایەنگری لە پێشمەرگەکان بکات و دژی دوژمن قسە بکات.

ئەو سەردەمە تازە چەکدارەکان دەهاتنە ناو خەڵك و دژی رژێم قسەیان دەوت، ناوی خۆیان نەنابوو پێشمەرگە، بەڵکە ئەوترا "کۆمەڵە" خەڵکی ئەیان وت "کۆمەڵەی چەمی رەزان" زۆرجار لە سادەیی خەڵکەوە دەوترا "مام جەلال مەکینەیەکی لە چەم داناوەو کۆمەڵە دروست دەکا، بۆیە ئەوەندە زوو زوو زیاد دەکات، ئەویش هەر لای وەها بوو، نەمام جەلالی دیبوو، نە کەسێکی تر، تەنها تا ئەو کاتە باسی قازی محەمەدو شێخ مەحمودە نەمرو مەلا مستەفای بارزانی بەر گوێ کەوتبوو".

شەڕی نێوان رژێم و کۆمەڵەکان تا دەهات لەگەشە کردندا بوو، چەکدارەکانی چەم پۆل پۆل ببوون، دەستەو پەل و لق دروستکرا بوون و بەسەر ناوچەکاندا بڵاوببوونەوە، لەزۆر ناوچە مەرکەزی پۆلیس پەیوەندییان دەکردو دەهاتنە پاڵ شۆڕش. لە شاخ و لادێ چەکی سەربازی هەڵاتوو، پۆلیسی هەڵاتوو زۆر ببوو، ناوە ناوەش دانە دانە سەرباز یان پۆلیس دەکوژراو چەکەکەی دەهاتە لیستی چەکی شۆرشەوە.

کادر راسپێردرابوو ماڵە دەوڵەمەندو چەکدارەکان دەگەڕان، داوا دەکرا لێیان کە یان ماڵی چەکێك بدەن بە کۆمەڵەکان، یان خۆیان‌و چەکیان، یان ماڵی یەکیان بێتە ناو کۆمەڵەکانەوە.

ناوی پێشمەرگە داهات، خەڵکی زۆریان پێ خۆشبوو کە دەوترا "مەرگی خۆی پێش مەرگی خەڵك دەخات!".

فڕۆکە حەشری دەکرد، گوندەکەی ئەوانی زۆر دەگرتەوە چونکە گوندەکەیان لە چەمی ڕەزانەوە نزیك بوو، گوندێکی گەورەو ناودار بوو ژمارەی پێشمەرگەشیان بە ئاشکرا هەبوو، زۆربەی شەوانیش پێشمەرگە بۆ کرینی پێویستی لە چەمەوە دەچوونە ئەوێ، سیخوڕەکان ناویان بە خراپ دابوو، هەموو ڕۆژی فڕۆکەی "مێکی ٢١"و پاشانیش "سیخۆ"و "باجەر"یش کردبوویان بە ئەرك‌و بەشی گوندەکەی ئەوانی هەر هەڵدەگرت‌و سەرێ دوان بۆردوومانی دەکرد. خۆ بەتایبەت کە بەتالیۆن دروست بوون چونکە بارەگای بەتالیۆنەکان لەوێ دەبوون، هەمیشە جێگای سەرە مەیدانی گەڕانەوەی فڕۆکەکانی دوژمن بوو.

ئەو سەردەمەی ڕژێمی قاسم مابوو کە ناپاڵمە نیو تەنییەکانی کە لە هیندستانەوە هێنابوویان دابەسەر کوردستانداو لە ڕۆژێکا (٢١) دانە بەر گوندەکەی ئەمان کەوتبوو، هەندێکی تەقی بوونەوەو خانووەکانی ناپاڵمەکانی بەر کەوتبوو ئەوەندە قوڵ ببوون شوێنەواری خانووی هەر پێوە دیارنەبوو، هەندێ شوێنی سێ چوار ماڵی بەیەکەوە تەخت دەکرد، بەڵام هەندێکی نەتەقیبوونەوەو زیاتر ئەوانە بوو لە دەورو بەری گوندەکەیدا بوو، هەر ئەو ڕۆژە خەڵکێکی زۆری زامدار کرد بوو بەڵام دوو منداڵی گوندەکەیان کە یەکیان کوڕی زەهۆی براژنی بوو ناوی غەریب بوو لەگەڵ ڕەمەزانی حاجی جومعە سواری ناپاڵمێك بوو بوون‌و یارییان بە پەروانەکەی کردبوو، تەقیبۆوەو هەپرون بە هەپرونی کردبوون، بەڵام سەیر لەوەدابوو خەڵکەکە وازیان نەهێناو فێربوون چۆن کەپسولەکەی دەربهێنن‌و باروتەکەی دەربکەن‌و قەوارەکەشی بکەن بە تەورو تەوراس‌و لە هەندی ماڵدا کرابوو بەگوڵدان.

بۆردومان خەڵکی ماندوو کردبوو، خەڵکی وایان دەزانی ئەم شۆڕشە چەند ساڵێکی کەم دەخایەنێ‌و ڕژێم دەڕوخێ‌و ئەوانیش ئازادی وەردەگرن‌و لەم چەرمەسەرییە ڕزگار دەبن.

به بەردەوامی شۆڕش لە گەشە کردندا بوو، خەڵکی ڕۆژ لە ڕۆژ زیاتر دەهاتنە پاڵ پێشمەرگەکان، نیزام زۆر چاك بوو، براو تەبا بوون، پێشمەرگە ئارەزووی ئەوەی دەکرد شەهید بێ و بنکەیەکی بەناوەوە بنرێ، جوتیار، کرێکار، مامۆستا، قوتابی، فەرمانبەر، کارمەند، پێشمەرگە، حەماڵ، بەقاڵ، کەناس هەرچی چین و توێژی کۆمەڵ هەیە بەشی هەرە زۆری بەدڵ لەپاڵ شۆڕشدا بوون. جاشیش بەو رادەیە زۆر نەبوو، ناو ناوە سیخوڕێ نهێنی لە کوردەکان دەنێردران بۆ پشکنینی بنکەو شوێنی هێزی پێشمەرگە، بەڵام لەبەر ورەی خەڵکی خۆیان نەدەگرت و زۆریان دەگیران و لە ئەشکەوتەکاندا تەنەکە ئاویان پێ دەکێشرا، بەناهەق و بێ بەڵگەش شۆڕش خەڵکی نەدەکوشت.

هەرجموجوڵێکی سەربازیی هەبوایە خێرا ڕێکخراوی پارتی لە شارەکان ئاگاداری بنکەکانی دەکردەوە، لەکات و ساتی جوڵەی دوژمن ئاگاداریان دەکردن.

لەترسی ئابڵوقەی ئابووری پاشکەوتێکی چاك لە دانەوێڵەو گەنم و جۆو ساوەرو نیسك و نۆك و شەکرو چا دەکرا. پاسایەکیان دانابوو لەبنکەکان بەگرام ئازوقە دابەش دەکرا، کارەباو تەلەفۆنیش برابوونە بنکەی چەم.

خەڵکی لە گوندێکەوە بۆ گوندێکی تر پێویستی بە پسوڵە هەبوو، هەر کەسێ پسوڵەی پێ نەبوایە خەڵکی گوند لە ژێر چاودێری لێپرسراوی گوند کەشۆڕش دایدەنا، نەی دەتوانی تێپەربکاو دەگیراو دەبرا بۆ بنکە، پاش لێکۆڵینەوە ئازاد دەکرا، ڕێکخستن و پارتایەتی جێی خۆی کردبۆوە، لاوێکی زۆر لە شارو لادێدا ئالاّبوونە بیروباوەڕی پارتییەوەو مەبدەئی شۆڕشیان پەسەند کردبوو.

خەڵك شۆڕش و پارتییان ئەوەندە خۆش دەویست، خۆیان لەسەر بەکوشت دەدا، بە دەیان خەڵك لەزیندانەدا لەسەر ئەوەی جوێنیان نەدابوو بەپارتی و سەرکردایەتی شەهید کران.

١٤ی تەمموزی ساڵی (١٩٦٣) بەعسییەکان کودەتایان کردو (عەبدولکەریم قاسم) کوژراو ڕژێمەکەیشی گۆڕبەگۆڕبوو.

سەرەتا بەعسییەکان داوایان دەکرد لەگەڵ کوردەکان ڕێك بکەون و ئامادەبوون لامەرکەزی بە کورد بدەن، ئەویش زۆری پێ خۆش بوو هەر چەند نە ئەوو نە زۆربەی خەڵك و پێشمەرگەش پاسایی لامەرکەزییان نەدەزانی، بەڵام بەلایانەوە زۆر چاك بوو مادام ڕژێم رووخاوو حکومەتی نوێ بڕوای بە مەسەلەی کورد هێناوە.

هـەنگاوی یەکەمـەو زۆر چـاکە، لەبـەر خۆیـەوە هـەر ئـەی وتـەوە "ئەگـەر حـوکمی زاتییەکـە سـەری گـرت یەکسـەر منالـەکانم هەلدەگرم‌و ئەڕۆمـە شـار، با هەنـدێ لـە مندالەکانم پەروەردە بکەم‌و بخوێنن، کوڕەکەی ئەوە ژیانـە، سـەر چەورێکی شـاری دێ ئەلێی بـەڕووی لەدەمـدا تـەقیوە ئـەو هـەموو قسـەیەی پێیـەو هەمووشـی قسـەی چاکەو لەسەر یەك دوو سێ سەعات لەمزگەوتدا دەچەقێ قسە دەکاو خـەلکی وەکـو ئێمەش هەر سەر دەلـەقێنین، شـەرتە رانەوەسـتم هـەتا شـار، خـوا بکـەم راسـت بـێ‌و درۆمان لەگەلْ نەکەن".

زۆری بەسەردا نەڕۆی نەك لامەرکەزی نەدا، بەلکو خۆی جێ گیرکردو تـاقمێکی عەشـایەری زۆر دڕنـدەی دواکـەوتووی پێکـەوە نـا بـەناوی "حـەرەس قـەومی" کـە بەڕاسـتی حـەرەس لاقـەومی بوون‌و سـەگ بـوون، گـورگ بـوون، دڕنـدەو مـرۆڤ خـۆر بوون، دژی زانیاری‌و کۆمەلْ بوون، ئەمانە وەها پەروەردە کرا بوون سەری کورد بـۆ رژێم‌و مالیشیان بۆ "حەرەس قەومی"یەکان. هێزێکی کولە زەرد ئاسا، نا نا، سن‌و کوولە ئاسا، بەرەلای گیانی خەلکی کوردستان کران، جارێ ماوەیـەك لـە سـالەیی لای پـردێ بەربوونـە گیـانی گـەلۆزی‌و سـەربیرو بیرەسـپانەکان‌و دێهـاتی بـەرجادە، خەلکێکی یەکجار زۆریان شـەهید کـردو لـە ژن‌و منـدالْ‌و پیرو گـەنج، مالْ‌و حالیـان تـالان کـردن‌و خۆشـیان هـەلهاتن بـۆ دەوروبـەری چـەمی رەزان. پاشـانیش لـە شـاری سلێمانی بەربوونـە گیـانی خـەلکی‌و زیـاتر لـە (١٧٥) کەسـیان زینـدە بەچالکرد، لـە سەردەمی (زەعیم صدیق)ی کورد کوژدا.

مامـە عەبـە ئەمانەیشـی هـەموو بـەرگوێ کـەوتبوو، هـەتا خـەلکانی گونـدەکانی سالەیی ئەبینی بـە بەرچاوییەوە بەسـەلت‌و قـولتی رایـان کـردووەو هەرچـی مالْ‌و سـەروەتیان هەیـە بردویانـە، ئەوەنـدە رقـی هەلدەسـتا ئـارەزووی دەکـردو دوعایـەك بکات هەموو عارەبی پێوەبسووتێ، بەلام هیچ بەدوعا بۆی نایاتەدێ، بۆیە هەر ئەی پەستایە دەروونییەوە.

سـالْ هــەر سـێهەمی شەسـتەکان بـوو، هێزێکـی حـەرەس قـەومی زۆربـەی ناوچـەکانی گرتـەوە، ناوچـەکەی ئەوانیشـی بـەفراوانی گرتبـۆوە، جـاران وادەزانـرا بـڕای بـڕای دوژمـن ناتوانـێ نزیکـی چـەمی رەزان‌و ناوچـە شـاخاوییەکان بکـەوێ، کەچـی دوژمـن تـا دەهـات هەلدەکشـا، تاهاتـە گوندەکـەی ئـەوانیش، بۆیـە تێکـڕای خـەلکی گوندەکـەیان رایـان کـرد بـەرەو ئەشـکەوتەکانی چـەمی قـەلای جولنـدی‌و

شوێنە چڕەکانی ناوچەکە. دوژمن گوندەکەی بە بلدۆزەر تەختکرد،ماڵو حاڵی هەموو بەتاڵان برد، هەتا جاشە قەومییەکان دەرگاو پەنجەرەیان بەکۆڵ دەگوێزایەوە.

شەڕ گەرم ببوو، وردە وردە پێشمەرگە پاشەکشەی دەکرد، خەڵکی ئەوەیان چاوەڕوان نەدەکرد، وایان دەزانی شۆڕش لە توانایدا هەیە رژێم سەرنگون بکات لەکوردستان، ئێوارە درەنگانێ بوو، براکەی سەری لێدان بۆ ئەشکەوتەکەی چەمی قەڵا، هەندێ ورەی بەرزکردنەوەو وتی: "سبەینێ هەر وەکو ئەمڕۆ شەڕ دەکەینو تا دوژمن بەسەر لاشەکەماندا نەڕوات ئێوە لێرە مەبزون، ئەمڕۆش شەڕی چاکمانکرد هەتا مەڕوماڵاتێکی چاکمان لە دوژمن گێڕایەوە لە پشتی ئەشکەوتی گامێشان، بەڵام بەداخەوە کوڕێکی لاوی زۆر جوانو خوێندەوار خەڵکی شاری کۆیە بوو ناوی دڵشاد بوو، شەهید بوو، شارەزای شەڕ نەبوو هەرملە قوتەی دەکرد، زۆر پێشم وت: "سەر هەڵمەبڕە" بەگوێی نەکردمو ئاخری گوللەیەك بەردەمی کەوتو گیانی پاکی چووە کاروانی شەهیدان، بۆ ئاگاداریتان تەرمەکەیمان راکێشایە خوارێ لەبن ئەو دارو شەخسانەی بەرامبەری قەڵای جوڵندی ناشتومانە بە ئەمانەت تاکەسو کاری بۆی دێن" مامە عەبە دڵۆپی ئاوی لەچاو هاتە خوارێو وتی: "خوا هەقمان بکەی!"

دوای ئەوەی براکەی لە قسەکان بۆوە ئەویش بە هاوسەرەکەی وت: "دەهەڵسە ئەو یەك دوو فڕوجەی هێناومانە سەر بڕەو سووری کەوە با براکەم لەگەڵ خۆیدا بیان بات لەگەڵ هاوڕێکانی دەورووبەریدا بیخۆن.

هەڵسایە سەر پێ بە دەستی خۆی دوو فڕوجی گرتو سەری بڕی، بەو شەوە قیڕە قیڕی تێ بەردان، تا فڕوج کوڵاو ئامادەکرا دیاردەی ئەوە دەرکەوت کە سەرکردایەتی هێزی چەمی رەزان بڕیاریداوە لە هەموو ناوچەی چەم بکشێنەوەو بڕۆن بەرەو دەوری سەرگەڵوو شەدەڵەو سورداشو قەمچوغە. ئەم هەواڵە خەڵکی راکردووی گوندی شلەژاندو، هەندێ لە ئافرەتەکان کەوتنە جوێن دانو وتیان "باشە سبەی حەرەس قەومی دێن، کلاو ئەنێنە سەر ئێوەو ئێمەش رسوا دەبین" بەڵام بڕیاری سەرووبوو درابوو کەسێ نەی دەتوانی فەرامۆشی بکات، براکەی رۆیشتەوە سەر شاخ، پێی وانەبوو ئەو هەواڵە راستە بەڵام کاتێ چۆوە ناو پێشمەرگەکان تێ گەی چەمیش چۆڵکراوەو ئەمان ئاخر هێزن، ئەم شەودەبێ

بگەنە ئۆمەرقەومو حاجی تانی سەروو.

پێشمەرگە ناسیاوەکانی ئەوان سەریان دادەخستو ئەڕۆیشتن بە تەنیشتیاند داو سبەی کەڕۆژ بۆوە حەرەس قەومی هاتوو هەمووی گرتنو رووتی کردنەوە، سەعات، پارە، پێڵاو، سەروبەرگ، جامانەو قاتی رێکوپێك لێیان ئەسەندرا، بەڕووتیو بەپێی خاوسی خەڵکیان گەیاندە تەلبەندێك لەئاغجەلەر، تێکڕای ناوچەی قەلاسێوکەو شوان شێخ بزێنی سووتاو خەڵکەکەی سەرگەردانی هەڵەتەکان ببوونو ئەوەیشی دەستیان لێگیر ببوو، هێنابویانن بۆ ئاغجەلەرو خستبوویاننە تەلبەندەکەوە، رۆژێکی تاڵ بوو، لای ئەو لەزۆربەی رۆژەکانی رابووردوو تاڵ تربوو، منالْ واقەی دەهات لە برسا، هەمووی خۆیان پیس دەکردو دایك شوێنێکی دەست نەدەکەوت پاکیان بکاتەوە، چەتە قەومییەکان ئیهانەیان دەکردن.

رۆژی ۱۹٦۳/۱۱/۱۸ (عبدالسلام عارف)کودەتای کردو کۆتایی بەنیزامی حەرەس قەومی هێناو خەڵکی تەلبەندەکەیان ئازاد کرد.

هەر لەساڵی (۱۹٦۳) سێ جار گۆڕان کاری لە رژێمدا بوو، ئاخرییەکەی بەعسییەکان لەسەرکارمانەوەو (ئەحمەد حەسەن بەکر) بوو بەسەرۆکیان، بەلام هیچ کام لەم رژێمانە لەگەڵ کورددا باش نەبوون.

مامە عەبەش پاش ئازادکردنی لە تەلبەندەکە بێ ماڵوحاڵ مابۆوە، رۆیشتە گوندێك هەر بیست دەقەیەك لە ئاغجەلەرەوە دوورەو بەو هۆیەوە نەسووتابوو.

لەوێ لەپاڵ هەندی ناسیاویدا ماوەی چەند مانگێك ژیانی بردە سەرو، پاشان نەخشەکەی خۆی بەجێهێناو چوو بۆ کەرکووكو دەستی کرد بەکرێکاری. بەکرێ زۆژانە عەرەبانەی دەهێناو تەماتەو شووتیو میوەی رۆژانەی لەسەر دادەناو لە ئیمام قاسمەوە هەتا تسعینی کۆن پاڵی دەناو کۆلان بەکۆلان دەگەڕا. کەوتبووە گاڵتەو گەپ، قسەی خۆشی بۆ دەکردن، مشتەریی زۆرو چاکی بۆ خۆی پەیدا کردبوو، ئێواران پێش خۆرئاوا دەگەڕایەوە بۆ ناو منداڵەکانی.

منداڵەکانی خستە بەر خوێندن، لەژێر پاڵەپەستۆو چاودێری رژێمە یەك لەدوایەکەکانی عێراقدا درێژەی بە ژیاندا، چرکەی لەخۆی بڕبوو، تەنها پاڵی دەناو منداڵی بەخێو دەکرد، براکەشی ناسراو نەبوو، نەش دەزانرا برای لە شاخە، بۆیە وەزعی کەمێ ئارام تربوو لەوانەی کەسیان بەشاخەوە بوو.

ساڵی (١٩٨٣) هەستکرا بەوەی برای بەشاخەوەیەو بەرپرسیاریتیشی هەیە، لەو کاتەشدا رژێم کردبووی بەپیشەی هەمیشەیی و ئەی نارد بەدوای هەموو کەس‌وکاری پێشمەرگەکانداو پاڵی پێوەدەنان بە زۆر برۆن براو کوڕیان بهێننەوەو ئەگەر نەیان هێننەوە لەشار دەریان دەکەن. ئەمە وایکردبوو خەڵکێکی زۆر شار جێ بهێڵن‌و رووبکەن شاخ‌و لادێکان، بەوەش بەعسییەکان سوودیان لەوە دەبینی زەوی‌و خانوو ماڵیانی داگیر دەکردو دەیدا بە یەکێك لەو عەرەبانەی بۆ بە عەرەب کردنی کوردستان هێنابوونی‌و هەر یەکە (٥٠٠٠) هەزار دینار، سەیارەو خانووی دابوونێ.

رۆژگاری کەرکوك تا دەهات سەخت تر دەبوو، ئەویش پێی لێ کرابووە کەوشەوەو دەبوو براکەی بهێنێتەوە، کوڕە گەورەکەیشی لە سلێمانی دەیخوێند، ترسی ئەوەشی هەبوو ئەویش لەوێوە رابکات‌و ئەوجار هەر ئەی کوژن، نەیدەزانی چی بکات، بانگ کرا بۆ بەغدادو هەڕەشەو گوڕەشەی زۆری لێکرا، ناوە ناوەش خێزانەکەیان بانگ دەکردە ئەمنی ئیمام قاسم‌و زمانیان دەکێشایەوە، وەهای لێهاتبوو چوار چاو ببوو، ناچار رێگای شاخی گرتە بەروو چووە لای براکەی‌و مەسەلەکەی بۆ باسکرد، ئەویش زۆر بەرێزەوە تێی گەیاند کەئەو کارە هی کردن نییەو ئەگەر ئەیەوێ رووڕەشی گەل نەبن بڕوا ماڵەکەی بهێنێتەوە شاخ‌و لەگەڵ خەڵکی لادێکان وەك جاران بە سەربەرزی ژیان بەرێتە سەر، ئەگەر وەهاش نەکات دەکوژرێ‌و ئۆباڵی منداڵەکانی لە ئەستۆی خۆی.

مامە عەبە رێگاو رێگا گەڕایەوەو چۆوە بۆ بەغدادو بۆی گێڕانەوە، کە براکەی بڕیاریداوە لەبۆچوونی خۆی پاش ماوەیەکی تر ئاگاداری بکات. هەتا ئەو کاتەیش هەر شتێکی پێ گەیی لەبراکەیەوە لەبابەت هاتنەوە، ئاگاداریان دەکات. گەڕایەوە ناو منداڵەکانی، هەواڵی زانی کە کوڕە گەورەکەیشی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەجێ هێشتووەو بەرەو بنکەی پێشمەرگە رۆیشتووە.

ترس زیاتر لای میوان بوو، بەڵام ئەو پیلانەی دۆزی بۆوە، خۆی پێ پەنادا تاماوەیەك "ئەوا ئەویش رۆیشت" ئەیوت "چی بکەم.؟" هەرلێکی ئەدایەوە، هەر چۆنێك بوو لەبەر ئەوەی منداڵەکانی دەیان خوێند دانی بەخۆیدا گرت.

ساڵی ١٩٨٤ دەنگی گفتوگۆیەکی تر بەرز بۆوە، پاش هەرەس ئەمە یەکەم گفتوگۆ بوو، زۆری پێخۆش بوو، بۆ ئەوەی شوێن گۆڕکێ نەکات تا منداڵەکانی

کەمێ گەورەتر دەبن.
گفتوگۆ وەکو جارەکانی تر زۆری نەخایاندو شەڕ دەستی پێکردەوە، ئەویش لە پێنجەمی هەشتاکاندا وردە وردە ماڵەکەی ڕەوانەی دەرەوە کردو خۆشی لەگەڵ منداڵەکاندا بە تەواوەتی بۆوە بە خەڵکی گوندێ.
هەر ئەو ساڵە بوو هێرشیان بۆ هاتو گوندەکەیان تەخت کراو ئەوانیش چوونە گوندی (دەرەنار) لەوێ بە کوللەمەرگی و لە هۆدەیەکی پڕ لە کێچدا چەند مانگێکی تر ژیانیان بردە سەر.
بۆ هاوینی ساڵی ١٩٨٦ چوونە گوندی (زێڵێن)و پارچەیەك ڕەزی هەنارو ترێیان ئیجار کردو درێژەیان بەو ژیانە کوللە مەرگییەدا، پایزو زستانی ئەو ساڵەشیان لەوێ بەسەر بردو لە حەوتەمی هەشتاکاندا کاتێ وردە وردە خەڵکی چاوقایمی گوندەکەیان چوونەوە سەر کەلاوە رووخاوەکانیان و سەرو هۆدەیەکیان سەرگرتەوە، ئەویش ڕۆیشتەوە گوندەکەی خۆیان و هۆدەیەکیان لەگەڵ کوڕەکانیدا سەرگرتەوە.
ساڵێ هەشتەمی هەشتاکان دووچاری نەخۆشی (ڕەبۆ)بوو، بەڕێگای قاچاغا خۆی گەیاندە هەولێرو کوڕەکانیشی هەموو بوون بە "پ.م" تەنها خۆیو هاوسەری بۆ چارەسەری نەخۆشی ڕۆیشتن بەڵام نە پەرژان بگەنەوە سەر ماڵو حاڵیان و ئەنفالی سێ هەموو ناوچەکەی گرتنەوە. ماڵو حاڵیان جارێکی تر سووتایەوەو تالان کرا، ئەوانیش کاتێ ئەمەیان زانی و ڕێگای گوند نەمابوو ناچار چوونە شاری سلێمانی و لەوێ لەپاڵ ماڵە ناسیاوێکیاندا تەنها هۆدەیەکیان پەیدا کرد بەکرێو ژیانی دووقۆڵیان دەبردە سەر، لە دۆزەخی دووری جگەر گۆشەکانیاندا.
ئەنفالەکان ناوچەکانی وەها گرتبۆوە تەوای گوندەکانی سووتاندو هەموو دانیشتوانی پەراگەندە بوون، بەشێکی زۆریشی ئەنفال کران.
هێزی پێشمەرگەو خەڵکی لەسەرجەم ناوچەکاندا دەرپەڕێندران، جگە لە چەند دەستەیەکی بچووك نەبێ کە ئابڵوقە درا بوون.
کوڕەکانی و براکەی بەر ئابڵوقەیەکی دوومانگو نیوی کەوتن لە ژیانێکی زۆر دژواردا ئەژیان، هەر چۆنێ بوو خۆیان دەربازکردو چوونەوە سەر لوتکەی قەندیل.
باری سیاسیو ئابووریو سەربازی پارتە سیاسیەکان زۆر خراپ ببوو

خـەڵکێکی زۆریـان بـە ملـەوە بـوو، دەرامـەت نـەبوو، شـوێنی هەڵسـوکەوت و جموجوڵیش هەر ئێران بوو، ئێرانیش بە ئاسانی ڕێگای نەئەدا بۆیە سەرکردایەتی پارتەکان بە پێشمەرگەو خەڵکیان دەوت هەر کەسێ ئەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ عێراق، ئێستا لێبوردنی گشتی هەیە پاش ئەنفالەکان، با کەڵکی لێوەربگرێ و بگەڕێتەوە، هـەر کاتـێ شـۆڕش پێویستی پێیـان هـەبوو ئـەنێرێت بـە دوایانـداو ئەوانە ملکی شۆڕشن. سیروان و شوانیش دووان لەوانەبوون گەڕانەوە لای باوك و دایکیان و هـەر بەگەیشـتنەوەیان لـە لایـەن دۆسـتێکی باوکییـەوە شـوان بـووە بـە خـاوەن مـاڵ و هاوسەر.

شـوان و سـیروان گـیران بـە سـەربازو بـران بـۆ خـوارووی عێـراق، مامـە عەبـە ئەوەندەی تر کەوتە پەژارەوە، دڵی لای براو کوڕە ئاوارەکانی لەلایەکی ترەوە دوو کوڕی تری گیراون بە سەربازو خوا خۆی ئەزانێ لەکوێدا بە کوشت دەدرێن. "کوڕە خۆ جاران گەر بکوژرانایە ئەمان وت: لە پێناوی کورددا شەهیدە، ئەی ئێستا چی بڵێین.؟ بەڕاستی ژیـانێکی سـەیرە، هـیچ بـە دەسـت مـرۆڤ خـۆی نییـە، هـەمووی ڕووداوەکـان بڕیـار دەدەن لـە سـەر دواڕۆژمـان" نەیـدەزانی چـی بکـاو چـۆن خـۆی قەناعەت پێ بهێنێ و کەم پەژارە بیخوات.

ئێـوارە بـوو، سێبەر بەسـەر شـاردا کشـاو زەردەی خـۆر بـە لوتکـەی ئەزمـەڕەوە مابوو، بە کووڕە کووڕ ڕوو لـە ژوورەکـەی خـۆی ڕۆیشـتن و هاوشـانی هاوسـەرەکەی دانیشت، خـۆی چـەند غـەم دای گرتبـوو ئـەویش ئەوەنـدەی تـر بـاری شـانی قـورس دەکـرد، هـەر هەناسـەی هەڵدەکێشـاو باسـی کـوڕە ئاوارەکـانی دەکـردو خێـرا خێـرا زامـەکانی دەکولانـدەوە، شـەو نەئەڕۆیشـت، چـەند جـار رادەکشـاو چـاوی دەچـووە خەوو لە پڕێکا خـەوی بەکوڕە بچکۆلەکەیەوە دەبینـی، زۆری دڵ پـێ وەبوو، هـەر نەبێ ئـەویش بگەڕێتـەوە لای چاکە، هەڵدەسـتاو جگەرەشـی تەرکدابوو نەیـدەزانی بەچییەوە خۆی بخافڵێنێ.

کاتێ ڕۆژی لێدەبۆوە لەحەوشەکەیاندا ئەم بەروبەری دەکرد، بـەڵام هەمیشـە لـەم بەروبەرەکەیـدا چـاوی ئەدایـەوە لوتکـەی گوێـژەو کۆتاییەکـەی دەهاتـەوە نـاو دەرگاکەی خۆیان، ئەیوت: "ئەمڕۆ یـا سـبەی؟ کـەی دێـت بەرلـەوەی بمـرم چاوم بـە کوڕەکـانم و براکـەم بکـەوێ، تێرتێـر ماچـیان بکـەم، ئەوسـا کۆچـی دوایـش بکـەم قەیناکات".

راپەڕینی خەڵکی دەستی پێکردو شارو شارۆچکەکان بروسکە ئاسا پاك دەکرانەوە، جاش و سەربازو ئەمنی داگیرکەر ڕاو دەکران، ئا لەو کاتانەشدابوو سیروان و شوانی کوڕیشت بەجووتە گەڕانەوە کوردستان و چوونەوە سەنگەری پێشمەرگایەتی لەگەڵ پێشمەرگەکاندا دژی دوژمنی داگیرکەر دەجەنگان. ئازادی باڵی بەسەر کوردستاندا کێشا، شۆڕشگێڕان و خەڵکانی خەباتکاری ڕۆژانی نهێنی سەرپەرشتی قوڵ بەقۆڵیان دەکردو لەڕادیۆو تەلەفیزیۆن و کۆڕو کۆمەڵدا ناودەبران و دەردەکەوتن. ئەمیش زۆرخۆش حاڵبوو ئەو ڕەنجەی دابوویان ئەوا بەرهەمی هاتەدی بەلام هێشتا ئەم خێری لێنەبینیوە تەنها ئەوە نەبێ لە کوردستانی ئازاددا هەناسە هەڵدەکێشێ، چاوی وێڵە بەدوای ڕۆڵەکانی و براکەیدا "نەهاتنەوە، هەر نەهاتنەوە! کورە خۆ ئەوانە پێشمەرگەو سەرەتای ئەم شۆڕش بوون، لە شۆڕشی پێشووشدا براکەم هەر بەشاخەوەبوو، ئەی بۆچی نایەنەوە.؟ ئەوان واعاسی بوون، ئەی بۆچی هاوڕێکانیان بانگیان ناکەن و نایان هێننەوە، بڕۆم بۆ لای کامیان، دەست بکەم بە بەر پشتێنەکەیدا.؟!"

سیروان هاتەوەو تفەنگەکەی هەڵسپارد بەلادیوارەکەدا، داوای لە دایکی کرد خێرا نانی بۆ ئامادە بکات، وتی: تۆزێکی تریش شوانی برای دێتەوەو بەیەکەوە ئەڕۆن بۆ چەمچەماڵ.

باوکی گوێی لەم چریەیە بوو، هاتە ژوورەوەو پاڵ دیوارەکەی بەجێ هێشت و وتی: "سیروان ڕۆڵە بۆ کوێ ئەڕۆن؟" سیروان "باوە گیان ئەم شەو لەسێ لاوە هێزی پێشمەرگە بەسەر کەرکوك یاندا داوەو بەشی زۆری شارەکە ئازاد بووە. بەلام هێشتا شەڕ لەدەوری شەریکەی نەوت و سەربازگەکە هەیە، شەڕ گەرمە، هیوا زۆرە ئەمجارەیان کەرکوك بە تەواوەتی بێتەوە دەستی خاوەنەکەی. لەمەولا کەرکوك لە ژێر دەسەلاتی هێزی پێشمەرگەو کورددا دەبێ، ئەگەر شڕە خۆری و لوت بەرزی و لەخۆبایی بوون بهێڵێ. ئێمەش داوا کراوین ئەڕۆین، ڕەنگە لەوێوە بەرەو بان مقان و پاشان بۆ کەرکوك، بەڕاستی باوە زۆرم پێ خۆشە بگەمەوە کەرکوك و بە چەکەوە بەناوی پیرۆزی پێشمەرگانەوە بڕۆم سەری لە ئازادی و ئیسکان و ئیمام قاسم و بەرتەکێ و، بازاڕێ حەسیرەکەو ئەخی حوسێن و سید سەروەرو جودقاوەو قەلادێرینەکەی کەرکوك و بەرەو سەر بڕۆمەوە شۆریجەو جینگلاوەو قەسابخانەو بپەڕمەوە سەر ڕێگای بەغداو تسعینی کۆن و نوێ و هەڵگەڕێمەوە بۆ حەمامی عەلی

بەگ و ئەحمەد ئاغای کۆن و بازاڕی قوریّ بەگشتی و بە شەقامی تەکساسدا بەرەو تەپەی مەلا عەبدوڵڵا هەڵگەڕێم و تاویّ لە سەرچەم پشوو بدەم و ئەوسا سەریّ لەڕەحیم ئاوا بدەم و دێمەوە زێویّ و عاشوورو ئەڕۆمەوە بۆ پیریادی و تێر تێر هەناسەی خۆشی لە هەوای ئازادی شارەکەمدا هەڵمژم".

هەر لە بەر خۆیەوە بەراووردی دەکرد، زۆری پێخۆش بوو، ئەیوت "چا نییە سیروان و شوانیش لەلام ماون و لەم گوڵمەزەدا بەشداری دەکەن، هیچ نەبیّ بەشی هەوێنیش بیّ لەسەنگەردا هەمانە".

سیروان لەسەر نان خواردن بوو، شوانیش هاتەوەو وتی "سیروان پەلە بکە، ئەڕۆین، من نانم خواردووە، لەماڵی خاڵە بەکری دارتاش و سیروانی ئەویش دێت بۆ ئەم جەولەیەمان" سەرو چایان خواردو بە پەلە بەریّ کەوتن.

دایکی شوان پرسیتی "ئەریّ شوانە کوڕم باس و خواسی خاڵە بەکر چییە؟ هەر بیّ سەرو شوێنە.؟ یان ئەزانریّ لەکویّ زیندانە؟" شوان وتی "دایە گیان خاڵە بەکر شەهید کراوە- پاش ئازارو ئەشکەنجەدانێکی یەکجار زۆر لە ژێر لێدانەدا گیانی پاکی سپاردووە" جارێکی تر پوورە خەمە کەوتەوە گریان و شین و ڕۆ ڕۆ، مامە عەبەش وتی "ئەریّ دەواز لە کوڕەکان بهێنە با فریای هاوڕیّ کانیان بکەون، ئەوە بۆچی مەجلیسی شیوەنی تۆ هەموو ساتیّ هەر گەرمە.؟ بڵێین چی کوردی داماو هەر بەشی گریان و شەهید بوون و ئاوارەیی و نەهامەتییە! دەبا کوڕەکان بڕۆن و گلەییان نەیاتە سەر".

سیروان و شوان بیّ گوێدانە قوڵپی گریانی دایکیان ڕۆیشتن. جارێکی تر خەم یەخەی پیّ گرتەوەو چووە بەر دەرگاو پاڵ دیوارەکەی خۆیان. هیوای ئەوەی دەخواست کەرکوک ئازاد بیّ، هات بەبیریدا کە ئازادی کەرکوک ئازادی سەرجەم کوردستانە. شریتی درێژی فیلم ئاسا هاتە بەر چاوی، باسی ئەو ڕۆژانەی هاتەوە خەیاڵ، فەیصەڵ ڕەشید دەهات بۆ ماڵیان و دادەنیشتن لەگەڵ براکەی کۆبوونەوەیان دەکرد لەسەر بەرپا کردنەوەی شۆڕش. ئازاد عبدالمجید هەورامی بیر دەهاتەوە، منداڵێکی ڕەش ئەسمەری چاوگەشی بالاّ ناوەڕاست، بەلاّم دەنگ خۆش و دەنگ نەرم و بەشەرم و وتو وریاو هۆشیارو نەترس. دەهاتنە ماڵیان و لە یادی بوو کەئازاد ئەیوت "من ناکۆکی سەرەکی بەرژێمی عێراق دەزانم، چونکە کاتیّ سەر هەڵدەبڕم مقەڕی ئەمنەکەی پشت ماڵمان لە ئیسکان دەبینم بە

سەرمەوەو شەوو رۆژ چاوەدێری هەڵسوکەوتم دەکەن" دەنگە خۆشەکەی‌و سروده شۆڕشگێرییەکانی دەی خوێند، بەدەنگە نزمەکەی کەهەموویان تام‌و چێژیان لێوەردەگرت. عەلی مجیده جافی دەهاتەوە بیر، ئەوەندەی تۆزێك بوو، بەو منداڵییە بلیمەت‌و دەم تەڕ، قسە خۆش، بەبیرو باوەڕو نەترس. ماڵە کرێکار نەمابوو سەری پێدا نەکاو رای نەکێشێ بۆ هەڵقەی رۆشنبیری کۆمەڵە.

ئەتوت: ئاگرەو لەپوش بەردەبێ، هەر رۆژە لەلایەکەوە خەڵکی بۆ کۆمەڵە پەیدا دەکرد.

ئەنوەر حەسەنی دەهاتەوە یاد، بالاّ بەرزی چاو گەشی وشیارو ئازاو چاو نەترس. کەخۆی دەکرد بەماڵیاندا ئەوەندە درێژبوو سەری دەدا لەبن دەرگاکە، بەلاّم پێدەکەنی‌و بە باوەش ورەی بلاّودەکردەوە لەناویاندا.

یاسین ئەنوەری قوتابی دەهاتەوە یاد، چۆن زۆربەی عەسران دەهات بەدوای براکەیداو دەی برد بۆ ناو شار، بۆ مشت‌و مڕ لەسەر بارودۆخی ئەوسا.

دەهاتەوە یادی کۆنیش، هێشتا شۆڕش هەرەسی نەهێنا بوو، شەهید فەیزوڵا حاجی محەمەدو جەلال کەریم‌و شکور قادرو هادی ئەحمەد، بەناوی پارتییەوە هاموشۆیان دەکردن‌و لەگەڵ براکەیدا شەوو رۆژ کۆڵان بە کۆڵانی کەرکوك دەگەڕان بۆ بلاّوکردنەوەو رێکخستنی خەڵکی بۆ ناو شۆڕش.

فلیمەکەی مامە عەبە درێژ بوو، تەواو نەدەبوو، خەباتی خەڵکانی کەرکوك‌و کەرکوکییەکانی بۆ نەدەبڕێردرا. بەڕاستی ئازایەتی‌و نەبەردی‌و دڵسۆزی‌و خاکێتی کەرکوکییەکان هەر لەگێڕانەوە نایەن‌و فلیمەکەی مامە عەبە هەمووی تۆمار کردووە، بەلاّم لێدانەوەی ئاسان نییە لەبەر پەژارەی نوێی ئەم سەردەمە.

پوورە خەمە هاتەوە نزیك‌و وتی: "ئەزانی دەنگ هەیە لەکەرکوك شەڕەکە زۆر سەخت بوو بێ‌و دەگێڕنەوە کە پێشمەرگەو خەڵکەکە کە چوونەتە ناوشار ئالاّونەتە هەندێ شتی لابەلاوەو، ئاگایان لەوە نەماوە دوژمن لە رێی بەغداوە بەپشتی جینگلاّوەو شۆریجەدا هاتونەتەوە جەبەل بۆ روو، لەوێوە چوونەتەوە بەرەو خاسەو رێگایان لەپێشمەرگەی ناوشار گرتووەو پێشمەرگە زۆر بە هیلاکەت دەرباز بوون. باس لەوە دەکەن شەهیدی زۆریان داوە، دایکتان بمرێ سیروان‌و شوانیش رۆیشتوون، خوای بکردایە سەلامەت بن.!!"

کاتیان بەچراکانەوە دەژمارد، پوورە خەمە زوو زوو دەهاتە بن دەستی مامە

عەبەو ئەیوت: "کوڕە عەبە بۆچی سەرێکی بازاڕ نادەی بزانی ئەو منالانە چییان لێ هات، بڕۆرە دەوری بارەگای پێشمەرگەکان بزانە کەرکوك چۆلکراوەو پێشمەرگە بەدیل گیراون.؟ پاشەکشەیان کردووە یان هەر لەناو شاردا ماون.؟"مامە عەبەش لەسەرخۆ "کچێ بۆ وازم لێناهێنی، من خۆم کەمم پەژارە هەیە تا بڕۆم هەندێکی تر بخەمە هەگبەکەمەوە.! دەسا بەخوا دوو پێم ناچێ، لێم گەڕێ بابەدەردی خۆمەوە لەپاڵ ئەم دیوارەدا بتلێمەوە."

هەر چاوەڕوانی هەواڵی کەرکوك و پێشمەرگەکان بوون، (بێ سیمەکان) رادیۆکانی پارت و رێکخراوەکان هەر یەکە بە شێوەیەك بانگەوازی شەڕەکەیان دەکردو بە جفرەو ژمارە دەخوێندرایەوە. کەس نەیدەزانی سەرکەوتنە یا کشانەوە.؟ بانگی کەرت، هێز، نەفەر دەکرا هەر بە ژمارە بۆ ژمارە.

پاش چەند رۆژێ دەرکەوت کەدوژمن بەتەواوەتی کەرکوکی بەپێشمەرگە چۆڵ کردووەو، خەڵك و پێشمەرگەیەکی زۆریشی لە چیمەنەکانەوە هەتا قەرەهەنجیر بە کۆپتەرو بە دەبابەو بەهێزی سەربازیی شەهید کردووە. زۆربەیشیان تەرمی پیرۆزیان لەگۆڕەپانی شەڕەکەدا بەجێماوە.

"هات، هات!" دەستی پێکردەوە، مامە عەبەش بەرگوێی کەوتەوەو وتی: "ئەمجارەش وتیان هات و هەمدیسان ئەبێ لێ پێچین، خوا خۆی دەزانێ بۆ کوێ؟ جاران ئەچووینە پاڵ لوتکە شاخی دۆڵێ، ئەشکەوتێ، ئێستا بۆ کوێ.؟ خوایە بمان پارێزی، لەم بەڵا گەورەیە، کەی رزگارمان دەکەی؟! بوو بەهات هاتەکەی رۆمو هەر لەگەڵ تەمەنی کورددا سەردەکەوێ و نەبڕایەوەو نەبڕایەوە. دەبا بێت و بە یەکجاری کۆتایی بە ژیانمان بهێنێ، مردین هێندە خانووی سووتاو منداڵی کوژراوو ماڵی تاڵان کراوو بار بە بارو کۆچو کۆچبار بەرێوە، دەبەسە ئەمەبوو بەچی؟!" بە تەواوەتی رقی هەڵسابوو، هیچ وزەی تێدا نەمابوو، دەنا دەچوو بۆ ناو پێشمەرگەکان و چەکێکی دەکردە شانی و لەوێ خۆی لەسەر بستێ خاکی خۆی بەکوشت دەدا.

لەبەر خۆشییەوە دەیوت "ئەمجارەیان روو لە کوێ بکەین؟" بانگی پوورە خەمەی ژنی کردو وتی "کچێ دەڵێی چی ئەگەر راکەڕاك گەیشتە ئێرە ئێمە روو لەکوی بکەین؟! کوێ ماوە بۆی بڕۆین.؟ خۆ لادێکان نەماون و هەموو لەئەنفالدا سووتان و وێران کران و چۆڵن. تەنها رێگا ئێرانە لێرەوە خەڵکی بۆی بڕوا، بەلام

ئێمه بێ پوڵو پارەوماڵو سامان چۆن بڕۆین، نه سەیارەمان هەیه، نه هێستر، نه گوێ درێژ، نه تراکتۆرو نه عەرەبانەش، ئەی چۆن بگەینه ئێرانو ئەی لەوێ چی بکەین؟! ئەم فیلمەیان نەدی بوو، پێموایه هەر ئەبێ ببینین، دەك ماڵت وێران بێ کورد قەت نەبوو بەرنامەکانتان تاسەر رێكو پێكو دروستبێ، هەر ماوەیەکه، که هێزتان زۆر بوو مەغرور دەبن، بەردی زل هەڵدەگرنو دەکەوێ بەسەر قاچی خۆتاندا، دەباش تەماشاتان بکردایەو حسابتان بۆ هێزی دوژمن بکردایه، هەر تۆزێ وریا بوونایەو نەخافڵانایه بەشڕه خۆرییەوه، ئێستایش ئێمه جارێکی تر کۆڵ بەکۆڵ نەدبووینەوه، ده ئێستا من روو له کوێ بکەم بەخۆمو ئەم پیرێژنەوه؟!"

تۆڵەی خاڵه بەکر دارتاش بەهەڵەداوان خۆی کرد به حەوشەداو وتی "مامه عەبه سیروانی برام هاتەوەو وتی سیروانو شوان سەلامەتنو وتوویانه با باوەو دایه بەرەو پێنجوێن بجوڵێن، نەوەکو دوژمن پەلاماری سلێمانیش بدات".

جارێکی تر کەوتنەوه پرپاسکه لێك نانو دارێکی گرت بەدەستییەوەو به کوتره کوتر بەرەو پێنجوێن به قۆناغ قۆناغ کەوتنه دووی کۆڕەوەکەی خەڵکی کوردستان، روو له ئاوارەیی، تێرو برسی ئەڕۆی، چاكو خراپ نەمابوو، هەمووی ئەجولان، ئەمانیش تێکەڵاوی ئەو جەنجاڵه بوون. هەر یەکه کەوتنه شوێنێك هەندێکی لەدەورو بەری سەقز خۆی گرتەوەو هەندێکی له سنەو هەندێکی لەمەریوان. ئاوارە ببوون، ئەگەرچی ئەو ناوچانه کوردستانو خەڵکەکەیشی کوردنو هاوکاریی چاکیان دەکردن، بەڵام هەر خۆیان بەئاوارە دەزانی چونکه یەکەم جار بوو بەشی خوارووی کوردستان بەجێ بهێڵن. لەکاتێکا هێزی پێشمەرگەو خەڵکی کوردستان روو بەڕووی دوژمن بوونەوه، سنورێکیان کەوته نێوانەوەو خەڵکی ئاوارە کەوتنەوه گەڕانەوه بۆ شوێنو رێی خۆیان، مامه عەبەو شوانی کوڕی بەیەکەوه گەڕانەوه بۆ سلێمانیو چاویان دەگێڕا بەدوای سیروانو هاوسەری شوانو دایکی سیرواندا، بەڵام نەیان دۆزینەوەو هەرچییان دەکرد شوێنو رێیان هەڵنەدەگرتن.

لەم کاتانەدا بوو کوڕه بچکۆلەکەی ئاوارەی مامه عەبه ئەسپی خۆی تاوداو له ئاوارەییەوه بەرەو کوردستان هاتەوه، کاتێ گەیشتەوه سلێمانی تەنها باوكو شوانی برای دۆزییەوه، خۆی پێ نەگیراو پاشەو پاش گەڕایەوه ئێرانو ئۆردوگا به ئۆردوگا گەڕاو براژنیو دایکیو سیروانی براشی هێنایەوەو هەندێ پاره که

(UNHCR) دابویانێ، کەی گەڕانەوە بۆی دان بە خانوویەکی بچکۆلانەو لەکرێ چێتی رزگاری کردنو خۆی کەوتە دوای جێگیرکردنەوەی خۆی لەناو هێزی پێشمەرگە، بەلام هیچ کام لەهاوڕێ کۆنەکانی خۆشیو مامی نەیان گرتە خۆی، بۆیە چووە لای رێکخراوێکی بچکۆلەی کۆنی کوردایەتیو دەستی کرد بەکارکردنی دلسۆزانە.

هەلبژاردن بەپاکی بەڕێوەنەچوو، فێلی تێداکرا، یان بێ فرتوفێلْ بەڕێوە چوو خۆیان دەزانن.؟ ئەوەندە هەبوو گرژی دەردەکەوتو لۆمەو پرتەوبۆلەش بەرز دەبۆوە. پەنجا بە پەنجا، پێنج بێ لایەن، خەلکانی تر تێکەلاوو دەبوون بەهێزە سەرەکییەکان. هێزو کەسانی دەرەوە ژمارەیان زۆر دەبوو، رۆژانە کوردستان ئاوێتە تر دەبوو بە کۆمەلگای جیهانی، کێشەی کورد تادەهات ئاسۆیەکی نوێ تری بەخۆوە دەدی.

لەم سەرو ئەوسەری دنیاوە، لەدەولەتی بچووكو گەورەوە، بۆ بەرژەوەندی دواڕۆژی خۆیان روویان لەم بستە کوردستانە ئازادە دەکرد. هەر کەسە چمکێکی دەگرتە دەستو پێشنیارێکی دەکرد کە جووت بێ لەگەلْ بەرژەوەندی خۆیاندا.

سەر لێواری شەقامەکان، بەردەمی دووکانەکان رازا بوونەوە بە جۆرەها شتی نوێ، مانگرتن دەستی پێ کردو خەلکی داوای دەکرد بەپێ لەسلێمانییەوە وەك مانگرتن روو لەکەرکوك بکاتو لەوێ خۆی بمرێنێ لەپێناوی ئازادی کەرکوکدا.

رێکخراوەکانی سەر بەتەوە یەککگرتووەکان ژمارەیەکی زۆریان دابەزینە دەشتەکانی کوردستانو نێوانی رژێمو خەلکی کوردستان. کامێرا لە ئاسمانەوە جێ گیرکرا بوو، بۆ وێنەگرتنی ئەو ژانە گەورەیەی گەلی کوردستان. لەو لایشەوە دەستی ناحەزان پلانیان بۆ شکانی هەنگاوی بەرەو سەرکەوتن کەوتەگەڕو باشترین نەخشەیان پێکاو شەڕی کورد کوژییان زیندوکردەوە.

کار دەکرا، گوند ئاوەدان دەکرایەوە، کشتوکالْ گەشەی پێ ئەدرا، دوو مەڕو چوار مریشكو کەلەشێرێكو چەند تەن چیمەنتۆو دەرگاو پەنجەرە ئەدرا بەخەلکی گوندەکان بۆ ئاوەدانکردنەوەی گوندەکانیان، نەخۆشخانەو قوتابخانەش بۆ ئەوگوندانە ئەکرایەوە کەزۆرترین جووتیار بڕواتەوە.

ژمارەی پێشمەرگە تۆمارکردن زۆرتر دەبوو، خول دەکرایەوەو فەوجو لیواو شتی نیزامی سەربازی بۆ هێزی پێشمەرگە دادەهات.

وەزارەت دادەمەزرا، دەوڵەت کەوتە کارو سەرۆك وەزیرانی کورد کەوتەکار، سەرۆکی پەرلەمان و جێگریشی هەبوون.

دانیشگاو قوتابخانەو پۆلیسخانەو شارەوانییەکان دامەزرانەوە، کۆلیژی سەربازی گەنجێکی زۆری کۆکردەوەو لیواو فەوجی تایبەتی دامەزرا. ئاڵای زەردو سەوزیش هەتا دەهات لە بۆربۆریندا بوون. شۆفڵ و ئوتومبیل و تەل کارەباو تەلەفۆنات و چاپخانەو فۆتۆو ستێنسڵ و کەرەسەی چاپەمەنی و جیهازە گرنگەکانی نەخۆشخانەکانیش زۆریان خۆیان کرد بە ئێرانداو لەوێ ئاوارە بوون و کوردستانیان بۆ یەکجاری جێ هێشت.

پەیکەر بۆ شەهیدو هۆنەرو ناودارانی کورد لە زۆربەی شەقام و کۆڵانەکان بەدوو شێوە دروست دەکرا، یەکیان زەردو ئەوی تریش سەوز، زیندانەکانی رژێم روخابوون، زیندانی نوێ دامەزرا بوونەوە.

کۆڕی شیعری و سیاسی و هونەری دەبەستراو پارت و رێکخراوی سیاسی لەسەر تەلەفیزیۆنەکان روو بەڕوو دەبوونەوە.

شەڕی حسك و پارتی دەستی پێکرد، شەڕێ یەکێتی و ئیسلامی دەستی پێکرد، شەڕی یەکێتی و پارتی دەستی پێکرد، گۆمەکە زۆر قوڵ بووبوو.

پوورە خەمە زۆر دڵخۆش ببوو، کوڕە بچکۆلە زۆر خۆشەویستەکەی چوو بۆوە بەرچاوی و هەموو جارێ کەدەی بینی گەورە بووەو کادرێکی چاکی کوردایەتییە، دڵی خۆشتر دەبوو، ئەیوت "کوانووەکەمان گەشایەوە."

بەڵام رۆژگار لەگەڵ کەس تاسەر بەباشی ناڕواو پاش ناخۆشی خۆشی و پاش خۆشی ناخۆشی، لەپڕێکا مەریوان شەهیدبوو، مامە عەبەو پوورە خەمەش کەوتنەوە بەر هەڵڕشتنی لێشاوی فرمێسك!!!

راوەڵ پەندی - پاکستان

ئابی ١٩٩٦

کۆتایی

# ناوەرۆك

## هەڵۆ بویت

زۆر دڵت بە پێشمەرگایەتییەکەت خۆش بوو، تۆ تۆپ ئاسا هەڵدەبەزیتەوەو سەرنجی هاوڕێکانت ڕادەکێشا، زۆر لات شتێکی نوێ بوو لە هەوای ئازادداو لەسەر خاکی خۆت نانە بەرەیەك نان و چەند کلۆیەك شەکرو چا بەشی یەك دوو ژەم لە پریاسکەیەکدا توندتوند ببەستایە بەکوڵتەوە، قاچە خرپنەکانت، بەژن وباڵا ناوەنجیەکەت، گوپە ئەسمەرەکانت، بازۆڵەی هەڵکراوی توکاویت، چریکەی خۆشیان لێدەباری. پێدەچوو لە کارخانەدا تۆ بۆ پێشمەرگایەتی دامەزرابی، ڕۆژانە ئەتویست شتی نوێ فێربی، زۆریشت حەز دەکرد ببی بەکادرێك و لە دێهاتەکاندا وتار بۆ جوتیاران بخوێنیتەوەو هەندێ جاریش حەزت دەکرد خێرا ببی بەبەرپرسێکی پێشمەرگەو دەستەیەك پێشمەرگەی گورج و گۆڵ لەگەڵ خۆت هەڵگریو لەشوێنێکدا لێدەو بڕۆو بدەی بەسەر هێزێکی چەکداری داگیرکەرانی کوردستاندا.

من نازانم تۆ لەیادت چوو بۆ بەیانیان کە لە گوندەکەی خۆتانەوە بەرەو شارۆچکەی ( ئاغجەلەر ) لەگەڵ هەندێ منالی تری خەڵکی گوندەکەتان ئەچوون بۆ خوێندن، ئەوەندە خەپەتۆڵە قەڵەو شل و شاوبووی هەموو هاورێکانت گاڵتەیان پێدەکردی. زۆر جار پێیان دەوتی: (خلیو) پەلەکە فریای قوتابخانە ناکەوین، کەچی تۆ هەر لە دواوە دەڕۆیشی و چاوت بە هەڵەتەکانی دەوروبەری ڕێگادا دەگێرا، بەوە دەچوو شتێکت لێون بووبێت.

من چاك دێتەوە یادم کە زۆرجار ئێمە دەستەیەك ( پ .م ) یان لەوەش زیاتر بووین لەلاڕێدا خۆمان لە بۆسەدەنا بۆ ئەوەی لەپاشەڵ و پێشەکی هێزە داگیرکەرەکان بدەین، لەکاتی تێپەڕبوونمان لەم سەربازگە بۆ ئەو سەربازگە یان ئێوەمان ئەبینی، ئەها چەند جارێکیش لاتداو دەستە خەپەکانت کردە ملم و داوات دەکرد لەگەڵ خۆمان بتکەین بە ( پ . م ). ئێمەیش بە چەند دینارێك بۆ گیرفانت و هەندێ قسەی خۆش و جاری ماوتەو کەی گەورە بوی و خوێندنت تەواوکرد سەرەی تۆش دێ، کەچی تۆ دەگریای و پارەکەت فڕێ ئەداو ئەتوت: من گەورەم

حەز دەكەم لە گەڵ ئێوەدا بەشاخەوە ژیان بەرمەسەر، چونكە ئێمە لەژێر دەستی دوژمن دەخوێنین و هەموو ڕۆژێك جنێوی سوك و سوڵمان پێ ئەدەن بەڕاستی دەمانگرن و دەمانخەنە زیندان، یا ئەوەتا ئەبێ تا زووە ڕابكەین.

ئێمەیش گوێمان بەقسەكانت نەئەدا، هەرچۆنێك بوو بەخۆم و دووسێ ( پ. م ) ی هاوڕێمەوە بڕوامان پێ دەهێنای و بەپەلە دەمان ناردییەوە بەدوای هاوڕێكانتدا بۆ قوتابخانە.

زۆرچاكم لەیادە لەگوندی ( بالیسان )ی ناوچەی خۆشناوەتی بووین، هەواڵیان دامێ وتیان برا گەورەكەت و كوڕێكی جوانكیلە هاتوون بۆلات. لام وابێ تەنها تۆ پەیت بە خۆشەویستی نێوانی خۆم و خۆت ئابەو خۆشەیستییەوە بە باخچەكانی بەر مزگەوتی ( بالیسان ) هەڵگەڕام ئەوسا وەكو ئێستا پشتم نەشكابوو، قاچەكانم لەكار نەكەوتوبوون، ئەوەندەی سێ و دوو گەیشتمە لاتان و ئەملاو ئەولای تۆم ماچ كرد، ئەوسا دەستی كاكەم مژی وەكو وەفای گەورەو بچوكی برایەتی.

پێموایە خۆشت چاك سەرنجت دابێ كە چەند بە دیدارتان گەشامەوەو خێرا كوڵمەكانم سوور هەڵگەران، ئای چەند لام دیمەنێكی خۆشبوو ئەوسا ئەو ناوچەیەش تەنها لەژێر دەسەلأتی هێزی ( پ.م ) بوو. ئەوەبوو سەردانێكی بنكەكان و هاوڕێكانی خۆم پێكردی و دەمانچەكەت لێ وەرگرتم و توند لە پشتتكردو سێ قۆلیش وێنەیەكمان گرت. بەلأم ئێوە نەتانوێرا لەگەڵ خۆتان بیبەنەوە بۆ ناو شار، چونكە تەنها لەسەر ئەوەندە دەكوژران.

باش دێتەوە یادم كاتی سبەی زوو ویستمان بەڕێتان بكەین دوو فڕۆكەی جەنگی هاتن و ناوچەكەیان بۆردوومانكرد، بەرگوێت كەوتبوو كە گوندی ( شێخ وەسانان )یش كیمیاوی باران كرابوو، كەچی لەخۆشی ئەوەی هاتویتە ناوچەی ( پ . م ) و لای منی نەئەترسای و لێم دوور نەكەوتیتەوە. چەندجار باوكت وتی: ( خلیو ) گیان بڕۆینەوە باشە بامامەشت بەهۆی ئێمەوە لەكارەكانی دوانەكەوێ، تۆ وەلأمت نەبوو بەڕاستی پێتەوە دیاربوو كە ناتەوێ بگەڕێتەوە، بەلأم چی بكەی هیچ بەدەست تۆ نەبوو، ئێمە زۆرمان لێكردی و هەرچۆنێ بوو بردمانیتەوە سەرجادەی سەرەكی و بەرەو شارو زیندان بەرەو ژێردەستی بەعسیەكان بەڕیمان كردییەوە. چاوم لێت بوو هەتا لەچاو ونبوی من سەیرم دەكردی و تۆش دەستە خرپنەكانت هەڵدەوەشاندو زەردەخەنە سەرو چاوی بەر نەئەدای ئەگەر چی

لەدڵەوە زۆر غەمبار بووی. لەبیرتە ئەوساڵەی ئاوەکەی ( چەمی سوورقاوشان ) وشك ببوو، لەبیری خەڵکی ناوچەکەدا شتی وەها ڕووی نەدابوو، ئێمە بەماڵەوە لەسەرکردایەتی مەڵبەندی دوو وازمان هێنابوو، هاتبووین لەو پەنایە پشوو بدەین، ئێوەش بەماڵەوە شارتان بەجێ هێشتوو هاتن بۆ ئەوێ.

خۆ من چاکم ئەزانی تۆ وەهات کردبوو ژیانت لە باوك و دایکت تێك دابوو، هەر بۆ ئەوەی بێیتەوە لادێ وبەڵکو بەزۆریش بێ خۆت بکەی بە ( پ . م ) ئاگاداربووی چۆن نەمان هێشت ئەو نەخشەیەشت سەربگرێ و ئەوجارەش بەدزییەوە بەرێمان کردی بۆ ماڵە خزمان لە سلێمانی، جارێکی تر نادرمانییەوە بەر خوێندن هەر بۆ ئەوەبوو خوێندن تەواو بکەیت. توانای چاك پەیدا بکەی، ئەوکاتە لە کوێوەو چۆن خزمەت بەکوردو کوردستان دەکەیت بیکەیت. ئەوەی بۆتکرا لەخوێندندا خوێندت، چرپ و هوری سیخورەکان و چاودێری و باس و خواسی لەسەر ئێمەو ( پ . م )ی هاوڕێمان.

ڕۆژ لەدوای ڕۆژ جێگای قوتابخانەیان پێ لێژ دەکردی، ئەوە بوو پێش ئەوەی بتگرن و بتخەنە زیندان جارێکی تر هاتیتەوە لامان و ئەم جارەیان خۆتدا بە زەویداو وتت: لێرە گوللەی ( ئار . بی . جی ) و فیشەك و کوڵەنان، مەتارەی ئاو، دەواو دەرمان، چاو چێشتان بۆ دەکەم، بەڵام بەڕای بەڕای ڕوو ناکەمەوە شار، چونکە لێم ناگەڕێن بخوێنم و سوور دەزانم دەمگرن و وەکو ئەو هەزاران هەزار منداڵە کوردەی تر سەرەو نگومم دەکەن... هەرچی ئێمە گوتمان تۆ نەتبیست، ئیسکی خۆت هەندە سوك بوو سەرنجی ( پ.م ) ە کانت بەلای خۆتدا ڕاکێشا، ئەوەبوو ئاخری خۆت لای شەهید ( ڕەسول حەمەزێڕ ) ناو نووسکرد، ئەوسا ئەو فەرماندەی کەرتی ئێمەبوو هەر وەکو پێشتر لە دڵم دابێ تۆ بۆ ئێمە نابیت و گورج و گۆڵی و قسە شیرینەکانت لێمان دادەبڕێ، بەڵام هیچمان پێنەکراو بووی بە ( پ . م ) و هیوات هاتەدی.

کە ئەیانوت: کێ خەفەرە ئەمڕۆ؟ تۆ خێرا خۆت دەکرد بە شەریك و بەردەستی خەفەرت دەکرد، وات کردبوو هەموویان ڕێزیان لێدەگرتی و زۆریان خۆشدەویستی، هەر کەئەمانوت: دەستەیەك بڕۆن بۆ سەردانی فلان شوێن، خۆت ئامادە دەکردو ئەتویست فەرمانت پێبدەین، بەڵام هاوڕێکانت پێش خۆت دەهاتن و مۆڵەتیان بۆ داوا دەکردی. هەتا دەهاتیتەوە، دڵم لەمشتمدابوو، نازانم بۆچی

ئەوەندەم خۆشدەویستی و بۆچی دڵم لەدووریت تاوێك ئارامی نەدەگرت.

ساڵی ١٩٨٦ شەڕ دەستی پێکردەوە، دوای ساڵێك و شتێ وەستان شەڕو هامشۆی شار بەرەو حیوارو شەڕو حیوار، ئەنجام زنجیرە چیای چەرماوەند گیراو لە دوژمن پاك کرایەوە، ئێمەش خۆمان پێ نەگیراو بەبروسکەیەك سەرکردایەتی ( ی . ن . ك ) مان لە هەڵوێستی خۆمان ئاگادارکردەوەو ئامادەی خۆمانی نیشاندا بۆ بەشداری شەڕەکان. ئاگام لێت بوو ئەم هەڵوێستەت زۆر پێ خۆشبوو ئەوە بوو هاتیتە لام وتت: دەستت خۆش مامەگیان بەڕاستی شتێکی چاکتکرد، بەلأم تکا دەکەم ئەگەر چویتە سەرەوە منیش بەرە ئەوێ ئەمەوێ هەندێ شارەزایی لەشەڕی ( پ . م ) پەیدا بکەم...

لە یادمە نێوچەوانم لێگرژ کردی وام نیشاندا کە نابێت تۆ بێیت لە گەڵمدا، ئەبێ لەلای مقەڕو لەنزیك باوك و دایکت بی، چونکە سێ براکەی تریشت لەگەڵ مندا بوون و دەهاتن بۆ جەولەکان، زۆرت پێ ناخۆشبوو ڕۆیشتی، پاش تۆزێ کاك ڕەسوڵت ناردە لام و تکات بۆ بکا لەگەڵ خۆمان بتبەین لەژێر داوای کاك ڕەسوڵدا بڕیارماندا لەگەڵ خۆمان بتبەین، بەلأم پێم ڕاگەیاندی لەڕێگا دانیشتن و بەجێمان نییەو خێرا وەلأمت داینەوە: بەڵێ چاکە.

لەسەر قولە سەوزو قولە پوشینەی زنجیرە چیای (پیرەمەگرون) سەنگەرمان گرتبوو، هێرشەکان زۆر توندبوون، سەرەتای ئەنفال بۆ هێزەکانی ڕژێمی صەدام لە ژێر فەرماندەی صدامدا زۆر دەبوو، بلأو ببۆوە هێرشێکی گشتی دەکرێتە سەر ناوچەکانی هێزی ( پ.م ).

شەوان هەر کە دونیا لێڵ دەبوو هێرشی جاش و سەرباز لە حاجی تانی سەرەوەو بناری سوسێی سەرو بۆ سەنگەرەکانمان دەستی پێکرد. هەر لە ئێوارە تا بەیانی چوار هێرشمان تێکشکاند، دوژمن تۆپبارانی خەستی دەکردو ئەوسا هێزەکەی هێرشی دەکرد، کە دەش شکا بەهەمان شێوە لەژێر تۆپبارانێکی چڕا هێزەکانی دەکشانەوە.

بەبەرچاوماندا دەهاتیو دەچووی، نەت ئەویست تێمبگەیەنی کە گورج و گۆڵی و لەدوژمن ناترسێ و لەکاتێکدا ( پ. م ) کان، بەرو پیری هێرشەکەی دوژمن شالأویان دەبرد تۆش خۆت تێکەلأو دەکردن و بە تفەنگە کلأشینکۆفە قۆناخ دارەکەت لەگەڵیان ئەڕۆیشتی.

لەوێ بوو ڕۆژێکیان بە تۆپباران لە سابوراوەوە کیمیاییان تێ گرتین و دەوروبەرمانی دوکەڵاوی کرد، لەیادمە کە لە بنکەکانی دواوە لەشەدەڵەوە بەجیهاز پێیان وتم: ئەو دوکەڵانە کیمیاوییە یان دوکەڵە بۆ هێرش کردن.

بەپێکەنینەوە وتم: هیچ نییە ئێمە لە شوێنی خۆمان سەرکەوتووین، هاتیتە لام وتت: مامە بۆنێکی زۆر ناخۆشە چاویشم ئەچوزێتەوە، پێم وتی: ئاخر کە پێم ئەوتی: مەبە بە( پ. م) ئەمە کارێکی وەها ئاسان نییە، تۆ لێت وەرنەدەگرتم، کەچی هەڵدایەو وتت: مامە خۆ من نەترساوم، هەروەکو شتێ بۆم گێڕایتەوە بۆچی نابێ مرۆڤ ڕای خۆی دەردەبڕێ ئەی بۆچی دڵم خۆشە بووم بەپێشمەرگە، هەربۆ ئەوەی بە ئازادی ڕاو بۆچوونی خۆم دەربڕم. خۆ نەموتووە: ئەڕۆم تا تۆ وەهام پێ بڵێی....!!!

لام سەیربوو ئەو هەڵگەڕانەوەیەت بەڵام لەبەر خاتری ئەوەی ئەتووت ناترسێم و لەترسان نەموتووە دڵ خۆشبوم و بەتۆشم وت: شتێکی وەها نییە باسی مەکە خراپە باکەسێکی بێ ورە نەی بیسێ.

ئەو سەفەرەی داوایان لێکردین بڕۆین سەرپەرشتی (قوڵی مەرگە) بکەین لەگەڵمدا بووی کە وتم: لەهەر شوێنێکا شۆڕش پێویستی بەمن بێ دەچم ئەگەر سوور بزانم تێدا دەچم.

گۆرەویەکانت لێ هەڵکێشاو بە بەرگەڵوو دۆڵی سێدەردا کەوتینەڕێ لەسێدەر هەندێ لاماندا پرسیارتکرد ئەم گوندە چۆن ژیان دەبەنەسەر بێ ئاو.؟ گوندێکی وشك و برینگە، بۆم باسکردی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کوردستان ئازاد نییە تا چارەسەرێك بۆ سەدان گوندی تری ئاوا دابڕاوو وشك و برینگ بکات. هەرکاتێ ئازاد بووین جادەشیان بۆ دەهێنین و ئاویشیان بۆ پەیدا دەکەین و قوتابخانەش دادەمەزرێنین بۆ منداڵانیان و لەو پیس و پۆخڵییەش ڕزگاریان دەبێ. هەر لەدڵت دەر نەچوو، چەند ساڵێك لەدۆڵێکی درێژو وشك و برینگ، منداڵی چڵمن و پیس و پەڵۆخ پرسیارتکرد بۆ قوتابخانە وتم: نیانە، وتت: ئەی ئەو منداڵانە لەکوێ دەخوێنن...؟ وتم: ناخوێنن، چەندت لا سەیر بوو سەرت با ئەداو ئەوسا بۆت دەرکەوت چ تاوانێ بەرامبەر ئەم خەڵکی کوردستانە دەکرێ.

هەر بەدەم ڕێوە دەڕۆیشتین تاکە تاکە پێشمەرگەی ترت ئەبینی گورج و گۆڵ دەهاتن و ئەڕۆیشتن لەنێوان سێدەر و شارەستێندا هەستت دەکرد ماندوی،

شوێنی وەها بێ ئاوو گەرمەسێرت نەدیبوو. لەڕوشت نەدەهات بڵێی زۆرمان ماوە، لەپڕێکا لەئاسۆگەکەی بەرمالآن سەرکەوتین و شارەستێن دەرکەوت، حەزت دەکرد لە یەکەم ماڵ ئێمە دامەزرێین بۆ ئەوەی قومێ ئاو بخۆینەوەو پشوویەك بدەی، باش دێتەوە یادم خۆت لێم نزیك کردبۆوەو هەناسە بڕکێت پێکەوتبوو ئارەقە چۆڕ چۆڕەی دەهات بەسەرو چاوتدا، لە پشتەوەو لەبن شەیالەی هەردوو ڕاست و چەپەوە خەتێکی ماستاوی دروست کردبوو، بەتەواوەتی خاو ببوویتەوە لەپڕێکا لەبەردەم مزگەوتەکە کۆمەڵ بووین، هێشتا بەتەواوەتی شارەزای تەوزیع نەببووی، لێپرسراوی گوندو ئەنجومەنەکان هاتن دەستە دەستە دابەشیان کردین، ئێمەیش بەیەکەوەبووین چووینە ماڵە دۆستێکی خۆشەویستی خۆم، خێرا بەفرو دۆیەکی ساردیان هێنا، لەپێشدا لەبەردەمی مندا دایاننا، زۆرت حەز دەکرد خێرا کەوچکێکی لێبدەم ڕەوانەی بکەم بۆ تۆ من دەمزانی نوێی لە پێشمەرگایەتی، بۆیە کاسە دۆیەکەم خستە لاوەو وتم: کەم بخۆ جارێ،ماندوی باژان نەکەی، سەیرێکت کردم لات سەیربوو وات دەزانی گاڵتەت پێدەکەم، کەوچکێکت فڕکرد کردت بەدوان دەستم گرتی جارێکی تر سەرنجت دام. وتم: دوایی بخۆرەوە ژان دەکەی هەر بڕوات نەدەکرد، بەلآم لەشەرما وازت هێنا، پاش تۆزێکی تر بە کاسەکەوە نات بەسەرەوە منیش دەستم نەگرتی لات سەیربوو من هیچ دەنگ ناکەم. کاتێ لێبوویتەوە بەزەردەخەنەوە وتم: شیافتبێ، پێکەنین گرتتی و ڕووت کرد بەولاوە، نەتدەزانی چۆن شەرمەزاریت لەیاد بکەیت.

گەیشتینە شاری مەرگەی وێران کراو، لەناو بازاڕەکەدا هەواڵی شەهیدبوونی ( عەلی ئەحمەد ) وانێکمان زانی بەهەلمان زانی چوینە پرسەکەو هەر لەوێش پشوویەکمانداو بە ئوتۆمۆمبێلی یەکێك لەبارەگاکانی پێشمەرگە بەرەو گوندی (ئاوەژە) کەوتینە ڕێ، شوێنەکەت زۆر بەدڵ بوو.

بناری چیای سەربەرزی ( ئاسۆس ) شوێنێکی ڕاوشکاری ( مەرگەو پشدەریان ) و لەوێش دیوەخانەکەی مام باپیری ئاوەژێیی.

زۆرت لاسەیربوو هەر سەیری برۆ درێژەکانی مام باپیرت دەکرد، ئەت ڕوانیە پەستەکە خورماییەکەی و قسە نەستەقەکانی، شتی وەهات بەرچاو نەکەوتبوو لەبن ئەوچیا سەرکەشەدا خانوویەکی بچکۆلە لەبن گاشە بەردێك بکرێ و ببێ دیوەخانەی نان دان بە ڕێبوارانی ماندوو.

مام باپیر قسەی زۆر خۆشی بۆ کردین، باسی بۆ دەکردین کە بەخۆی و برنەوە درێژەکەی و هەر سێ چوار کوڕەکەی خزم و کەس وکاریەوە لە پاڵ شۆڕشدابن و ئامادەن ئاخر تنۆکی خوێنیان ببەخشن.

زۆر لات خۆشبوو پیاوێکی بەسالاچووی وەکو مام باپیر ئەوەندە ورەی بەرزە، ئەوەبوو هاتیتە لامەوە بەچرپە لێت پرسیم ئەم پیاوە کێیە... ؟! منیش ئاشکرا تێم گەیاندی ناوی مام باپیرەو خەڵکی ئاوەژێیەو پیاوێکی چاو تێرو نان بدەیەو خۆیو کوڕەکانی لەگەڵ شۆڕشدان.

چووینە ماڵی فەرماندەی تیپی (ئاسۆس) ئەوسا هێشتا شەهید نەببوو لەوێش هەستت دەکرد ڕێز لەناو شۆڕشگێراندا زۆرە، هەستت دەکرد (عبدالرحیم) خۆی و براو ماڵ و منداڵی میوانداریيەکی زۆریان لێکردین و زۆر باسی خۆشمان کرد تۆش چێژت لێوەردەگرت، لەقسەکانماندا زانیت سەرتیپی ئاسۆسەو زۆر جاریش ناوبانگی ئازایەتیت بەرگوێ کەوتبوو لە چالاکی ( پ. م ) ە کانەوەو لە بەلاغی عەسکەری و دەنگی شۆڕشی گەلی کوردستانەوە.

لەیادمە لەقوڵەکانی بەردە قڵیش و گەورە قەلاو توکلی گەورەو بچوکەوە کەشەر دەستی پێکردو هێرشی ئەنفالی یەك دەستی پێکرا سەنگەرەکانمان تەقەمەنییان دەویست، فڕۆکە جەنگییەکان ناوچەکەیان دەکێلاو ڕۆژ نەبوو چەند ژن و منالی بێ تاوانی ئەم گوندانە شەهید نەکا. کەچی ئەوەندەت حەز دەکرد بەشداری ڕاستەوخۆی هێزەکە بکەی لەشەڕدا هەراسانت کردبووم، بەناوی ئەوەی تۆ بنێرم فیشەك و تەقەمەنی بە تراکتۆر بگوزیتەوە خێرا ، زۆرجار ناچارت دەکردم ئەو کارە بکەم، کەچی جارێکیان تازە هێرشی توکلی گەورە کرابوو لە لایەن دوژمنەوەو لەشارستێنەوە هاواری هێزو تەقەمەنی کرا، کە بانگم کردی و وتم: خۆت ئامادە بکە ئەم شەو ئەڕۆین بۆ گرتنەوەی توکل و گەورە قەلای دامێنی مەرگە، ئەتوت خەلات دەکرێی هێندت پێ خۆشبوو، خێرا تراکتۆرت هێناو چوویتە سەری و چاوەڕوانی ئامادە بوونی ئێمەت دەکرد.، کاتێ گەیشتینە بارەگای تیپی ئاسۆس لە ناو خانووە ڕوخاوەکانی شارستێنەدا گورج تراکتۆرەکەت خستە کوڵانێکەوەو هاتیتەوە لامان. ئەوشەوە چووینە پاش توکلی گەورە بەدیوی سێدەردا هێرشێکی کەم وێنەی دلێرانەی پێشمەرگە کرایە سەر توکلی و لەدوژمن سەندرایەوەو زۆر ئازایانە لەچەند کاتژمێرێکدا پاك کرایەوە وزیانی زۆر لە دوژمن درا.

ئای چەندت لاخۆشبوو بەسەر لاشەی جاشە ڕوو ڕەشەکاندا بازت ئەدا، بۆ ڕاوەدوونانی سەربازە داگیرکەرەکان نەت ئەزانی من چەند دڵم لاتبوو، چەند ئەترسام.؟ لە هەمان کاتدا چەند دڵخۆشبووم بە ئازایی و ورەبەرزی و دلێریت. ئەزانم تەنها ئەوەت بزانیایە زوو خۆت بە شەهید کردن دەگەیاند، چونکە زۆر حەزت دەکرد شتێ بکەی کەدڵی منی پێ خۆش دەبێ.

ئەنفالی یەکەم تا دەهات ژمارەی هێزە داگیرکەرەکان زیادی دەکرد، هێرشەکە هەر لەناوچەی چوارتاوە بۆ قەیوان و ماوەت بەگشتی تا دەگاتە خەجەلەرزۆك و دێتەوە دۆلە ڕووت و بۆ مێرگەپان و قزلەرو لەو لایشەوە دۆڵی سورداش بەگشتی و دەوروبەری قەمچوغەو تا دەهاتەوە قەرەسردو هەنجیرەو بۆ پشتی بۆسکێن و لەولایشەوە بەدەوری ئاسۆسدا لەدیوی پشدەرەوە هێرش بۆ جاشە ڕوو ڕەشە زۆرو زەبەندە خۆماڵییەکان لەپێشیانەوەبوون، ئابڵوقەی تەواو درابووین، هێزە دۆستەکانی ئەو سەردەمەی شۆڕشیش بەسەدان سەربازی ترسنۆکی بە دوو مەغزەن فیشەکییانەوە لەپشتەوە ڕاگرتبوو قورساییان لەسەرمان دروستکردبوو. ئەبوایە نان لەدەمی خۆمان بگرینەوە بیدەین بەوان، کەچی تەنها یەك فیشەکیان لەسەر نەتەقاندین، ئەمزانی زۆرت ڕق لێیان بوو زۆرجار ئەتوت: بادوو دوو، سێ سێ، لەناویان بەرین بەڕاستی ئەمانە دۆستمان نین و دوژمنی ترسناکی گەلەکەمانن بەرژەوەندی خۆیان وەهای کردووە هاتوون لە دوورەوە سەیرمان دەکەن، بەناوی ئەوەی بۆ هاوکاری هاتوون، ئاگام لێبوو زۆرت پێ خۆشدەبوو کەجار جار قسەم بە ئەفسەرێکیان دەوت و لەبەر چاوی پێشمەرگەکان دەمم شکاندن، هەستم دەکرد گەش دەبویتەوە.

هێرشەکە جۆری تەرتیبی هەڵبژاردنی هێزەکانی ئێمە بۆ بەرگری بۆلبژێرکردنی پێشمەرگەو بەرپرسە ئازاکان و بردنی بۆ شەڕی دۆڵی شەدەڵەو پشتی ژیلوان، وای کرد هێزەکانی ئێمە لەبەردەمی هێزی ئاسمانی و زەمینی دوژمندا خۆ نەگرێ. ئەو ڕۆژەی شکان دەستی پێکرد لەسەری دەرو گەورە قەڵاو لە بەردە قڵیش و لە توکلی گەورەو بچوك، دەموچاوت زۆر گرژبوو. لە نێوچەوانتا دڵ گرانییەکی زۆرم دەخوێندەوە، جارجار چاوە بچوکەکەت بەدەست دائەپۆشی، لەگەڵ پۆلای شەهید لەسەری دەرو ئەدوای، داوات دەکرد بەرگری مان و مەرگ بکەین. بە قسەکانی شەهید پۆلا دڵت خۆشدەبوو کە دەیوت: ئەبێ دوژمن بەسەر لاشەمدا هەنگاو بنێ

دەنا سەری دەرو چۆڵ ناکەم.

ئەوکاتە خەبەری شەهید بوونی پۆلآت هێنا چاوەکانت فرمێسکیان لێئەتکا، هاتیتە لام بە بێزارییەوە لەولامەوە دانیشتی بە ساردێکەوە پرسیت باشە ئەم هەموو هێزە زۆرەی دۆستەکانمان لەم دەورەن کەی لەسەرمان هەڵ ئەدەنێ..؟ نەهێزی خۆمان و نە هی دراوسێ کانمان فریامان نەکەوت، هێرشمان یەك لەسەر یەك کرایە سەر.

ئەو ڕۆژە لە سەرکردایەتییەوە پێیان ڕاگەیاندین سەرێ لەکانی توو بدەین و لەوێ مشوری زیندانیان بخۆین، بەلایەکدا ڕەوانەیان بکەین، یەکەمجاربوو گوندی کانی تووت دیبوو، لەبناری چیای ئاسۆسدا، شەو بەری بەیان بوو گەیشتینە ئەوێ نیازمان وابوو تەکبیرو ڕا بکەین و خێرا بگەڕێینەوە ئاوەژە، لە ماڵێکدا هەندێ کاکڵە گوێزو مێوژو چایان داینێ، خێرا شتێکت کردە گیرفانت چونکە زۆر چڵێس بووی، دەمزانی زۆر حەز لەو جۆرە خواردنانە دەکەی، من سەیرم نەکردی و نەمهێشت بزانی کە ئاگادارم بۆ ئەوەی بەخۆتا نەشکێیتەوە.

هێشتا مەلای بەیانی بانگی نەدابوو هاتینەوە بۆ بارەگاکانی سێروانە، لەوێ لەلای سەربەست پشوویەکمانداو بە مجفرەکە هەندێ قسەمان لەگەڵ سەرگەڵو کرد لەبابەت شڕی وەزعی خۆمانەوە.

هەڵساین بەرەو ئاوەژە بگەڕێینەوە بارانێکی توند بەباوە هەڵی کرد، چاو چاوی نەدەدی و کاتژمێر گەیشتە حەوتی بەیانی سەرەتاو پاشەڵی هێزی پەرێشانی و شکاوی خۆمان لەداوێنی بارەگای سێروانە بینییەوە کەس گوێی لێمان نەدەگرت. زۆریان تفەنگەکانیان ڕوو لە ئاسمان کردبوو بەڕیز فیشەکیان ئەتەقاند زەندەقی مرۆڤی دەبرد، قەت چاوەڕوانی شکانی وەها نەبووین هەرچیم دەکرد تاکە پێشمەرگەیەکیش گوێی نەدەگرت، بەرپرسەکانیش لەوان خراپترو کۆمەڵێ بڕو بیانویان دەهێنایەوە، نەتدەزانی چی دەبێ، سەیری ڕێگاو بانی ئاسۆست دەکرد هەمووی گیراوە بەبەفر و لای خوارەوەش دوژمن بەتەواوەتی دەستی بەسەردا گرتووە، بەتایبەتی جاشە شارەزاکانی مەرگەو پشدەر.

ئێمەش بەناچاری بەدوای هێزی شکاودا خشاین چوینە کوخی هەوارەکانی پشت ماڵانی کانی توو، خەڵکی بەشێوەی قازو قوڵنگ بەڕێگای بەفر گرتووی کوڕکوڕدا قەتارەیان بەستبوو ئەوەندەی چاو بڕیکا خەڵك بەرەو دیوی گەلاڵەو

سەفرەو زەروون سەردەکەوتن زۆر شەپرزە ببووی بایەکی زۆر ساردی هەڵکرد وردە کرێوەی لەگەڵ بوو تا دەهات توندی دەکرد. دەستەکانت تەڕببوون سارد سارد ببوون، ئەتخستە باخەڵتەوە سوودی نەبوو ئەتخستە گیرفانی شەڕواڵە خاکییەکەتەوە هەر سوودی نەبوو، ئەڕۆیشتین تا ئەژنۆ ئەچەقیە بەفرەوە، لە دواشەوە هاژەی تۆپ و گوللەی دوور هاوێژی جاش و سەرباز بواری گەڕانەوەو سەردەرکردنی نەدەدا. تاکە رێگا هەر ئەوەبوو بەدوای ئەم رەوە گشتییەدا هەنگاوی هیوا بهاوێژین، ئێمە ئاخر پۆلی پێشمەرگەی دواوەی لەشکری شکاوین، دەمانڕوانی بۆ پێشەنگی قەتارەکە لەپڕێکا وەکو بۆڵەترێی تەرزە لێدراو لە سەرەوە هەموو هەڵوەریو بەو لاو ئەولادا کەوتنە ناو رەنووە بەفری سەر لوتکەی کورکوڕی ئاسۆس.

تادەهات زریانەکە بەهێزتر دەبوو، ئێمە لەسەر رێگاکە بووین هەندێ خانووچکەی باغی گوندەکە لەم بەرو بەری رێوە لەژێر بەفردا داپۆشرابوو، ئەو خەڵکانەی دەربازبوون لەسەرەوە هاتنە لامان رێنوێنیمان دەکردن بۆ ئەوێ و ئاگریان دەکردەوەو خۆیان گەرم دەکردەوە. تۆش لەتەنیشتی منەوە چەقی بویتە ناو بەفرەوە لەپڕێکا یەك دوو ژن کە بەفرەکە زۆری شەپرزە کردبوون بەرەو بن ئەو پارچە نایلۆنە هاتن کەمن بە سەر سەری خۆمدادابوو بۆ ئەوەی زریانەکە پەکم نەخات خێرا نایلۆنەکەم دانێ و تۆ پێشیان کەوتی بۆ کوخەکەو لەو لایشەوە شوانەی برازام بێری کچی حەمەی حمە باقی لەکۆڵا بوو روو لەتۆ هات چوونە کوخەکەوە دوکەڵ چاوەکانی پڕ کردبووی لە ئاو، خێرا هاتنەوە لام بە مەلەوانێك دەچوی خەڵکی لە گۆلی خنکاندندا دەربازیان بکەین، هەرلا منداڵ یان ژنێکی لەگۆ کەوتوت دەبینی پرت دەدایێ و ئەت هێنا بۆ لامان. بۆ ئەوەی ببیتە نەوایەك، ئێستا لام سەیرە بۆچی بەو منالییەوە تۆ ئەوەندە بەهەڵمەت بووی بۆ وەها هەڵو ئاسا لە تەنگانەدا بە مشوور بووی.

دوای ئەوەی کەسێکی سەرەوەی بەفرە زریانەکە نەما ئەو جا روو لە کوخێ کەوتینەڕێ، دونیاش تاریك ببوو بەڵام هەموو دنیا سپی بوو بۆیە رێگاش رۆشن بوو.

لەبەردەمما گەنجێك خۆی درێژکردبوو تفەنگەکەی لە باوەشدا بوو، تۆ خێرا ویستت هەڵی سێنیتەوە، بەڵام لەمنەوە نزیك بوو من دەستمگرت، گەنجەکە خۆی

خسته کۆڵم و بە ئامان و زەمان لێم نەبووەوە. تومەز قاچەکانی لەگۆ کەوتبوو بەڵام هۆشی مابوو، ویستی خۆی دەرباز بکات لەمەرگ.

زۆرم هاوار لەپێشمەرگەکانی دەستەکەم کرد کەئەم لاوەم لە کۆڵ بکەنەوەو بەنۆرە هەڵی بگرن تابن کوخێك، هەمووی ئەوەندە ماندوو شەتەك ببوون کەس فریام نەکەوت ئەوەبوو تۆ هەڵمەتت هێناو کردتە کۆڵی خۆت، لەوەودواوە دەستە بە دەستە لەگەڵ هاورێکانماندا بردمانە ناو کوخەکەوەو زیندومان کردەوە بە کاکڵە گوێز و مێوژی گیرفانی تۆ.

هێشا نەگەیشتبووینە کۆخەکەی رێگای پشت ماڵانەوە، پیاوێکی پیری حەفتا ساڵانە لەسەر سکی بەفرەکە لەسەر گازەرەی پشت لێراکشابوو، پەلاماری ئەویشتدا، بەڵام بۆت هەڵنەسا داوات لە ئێمە کرد. بەهەر حاڵێك بوو هاتینە هاوکاریتەوە، بەڵام کاتێکمان زانی گیانی لەدەستدابوو، ئەویش بوو بەسەربازی ونی میللەتەکەمان. زۆرت خەم لێخوارد، هەر ئەتوتو ئەتوتەوە، ئەو پیاوە دەموچاو نورانییە تاوانی چییە ئەوها لەسەر ئەو سەهۆڵ بەندان و لەم زریانەدا گیان ببەخشێ.؟ نەت دەویست بەجێی بهێڵین بەڵام لە تواناماندا نەبوو مردوو بگوێزینەوە.

ئەوەبوو هەر کە گەیشتینە ناو کوخەکە ئازایانە ئاگرێکت بۆ کردینەوە، هەموو لە دەوری کۆبووینەوە، خێرا خێرا دارو دری ناو خانووەکەت دەچنییەوە، لەپڕێکا گوێزو مێوژی زۆرت بەدی کرد بە هاورێکانت وت: خواردن مسۆگەرە مەترسن لەسەرما.

هێشتا ئێمە وشك نەبوبوبوینەوە کۆمەڵێك ژن و پیاوی ئەو گوندانەی دوژمن دەستی بەسەردا گرتبوو، هاتنە لامان، یەك دوو منداڵیان لەبەفرا هەڵگرتبۆوەو دایان بە ئێمە وشکی بکەینەوە، خێرا یەکێکیانت گرتە ئەستۆو ڕوتتکردەوەو لە بەتانیت ئاڵاند، جلە کانت بۆ گووشیو وشکتکردەوە، بەڵام کاتێ ویستت جلەکانی لەبەر بکەیتەوە ڕوانیت گیانی بەخشی و ئای کەزۆرت پەژارە لێخوارد. چاوت بڕیبووە چاوە شینەکانی فرمێسك هۆن هۆن بەرچاوی گرتبووی و بەرەو سمێڵە تازە هاتووەکانت کۆچیان دەکرد. لەپڕێکا منداڵەکەی تر کەبەدەست هاورێکەتەوە بۆ زیندوو بووەو داوای نانو ماستی دەکرد نەی دەزانی چی قەوماوەو لەوەش بێخەبەربوو کەکەس نازانێ باوكو دایکی چیان بەسەر هاتووە.

زۆر دڵخۆش بووی بە زیندوو بوونەوەی ئەوەیان ئەتوت: زەرەر لە نیوەش بگەڕێتەوە هەر باشە.

پۆل پۆل ژن و پیاو دەهاتنە کوخەکەوە ئاگرەکەت بۆ خۆش دەکردن و خۆت دوور دەخستەوە، بەڵام حەشرت بە کاکڵە گوێزو مێوژە سوورەی خۆیان کرد.

بەیانی ڕۆژی دوای هێرشەکەو زریانەکەبوو جاش گەیشتە سەرمان تۆ (ئارپیجی)یە کەت هەڵگرت بە نیازی ئەوە نەبووین لەو ئابلۆقەیە دەربازبین، چونکە ئێمە نیازی شەڕمان هەبوو، بەڵام کاتی بەیانی هەڵساین هەر خۆمان مابووین، هەرچۆنیٚ بوو خۆمانکرد بەناو چیلکەی باخەکان و پەڕینەوە بەری هەوارە بەرزە، جاش هەستیان پیٚ کردین و دایانینە بەر دەستڕێژی گوللە، هەرچۆنیٚ بوو جەنەڕاڵ بەفر ڕێگای نەدا بە ئاسانی جاش بمانگاتیٚ.

هێشتا بەرامبەری گوندی کانی توو بووین کەجاشەکان هاتنە ناو گوندەکە بەبەرچاومانەوەو لەماڵەکاندا هەندیٚ خاوو خێزان مابوونەوە، پیاوەکانیان شەو چووبوونە ئاوەژەو پەیوەندیان کرد بوو خۆیان دابەدەستەوە.

زامدارێکیش وێڵ ببوو لەویٚ بەدیل گیرا، کە کەس ئاگاداری نەبوو.

لەبن لوتکەکەی ڕووبەڕووی ماڵان خۆمان مەڵاسدا بۆ تۆش (ئارپیجی)یە کەت ئامادەکردبوو لەپشتی سەرمەوە هەڵتوتکابووی لەپڕێکا وتت: مامە هات هات، سەرم هەڵبڕی دوو پیاو بەشەلە شەل منالێکیان لە کۆڵایەو بەرەو لای ئێمە دێن، خۆمان ئاشکرا نەکرد تا هاتنە ناومان، یەکێك لە پیاوەکان ئەفسەرێکی گیراوی بەرەکانی شەڕی دۆڵی شێخ محمد بوو ئەوی تریش جوتیارێکی مەرگەیی بوو کەتێکڕای خێزانەکەی لە زریانەکەدا لێدابڕابوو تەنها ئەو کچە چوار پێنج ساڵانەیەی لا مابوو کە بەپێیپەتی بەدوای خۆیدا بەکێش کردبوو نەیدەویست خۆی بدات بەدەست دوژمنەوە، چوویتە لایان دەستان کرد بە پرسیار کردن، ئەفسەرەکە هێرشێکی زۆری کردە سەر ڕژێمی عێراق و وتی: من ئازاد کراوم لەلایەن شۆڕشەوە، بەڵام ناوێرم بگەڕێمەوە بۆ خوارووی عێراق، چونکە لەسەرم دەدەن، بۆیە هەرچۆنێك بێت لەگەڵ خۆتان بمبەن دەربازم بکەن. جوتیارەکەش ئەیوت: بە هیچ شێوەیەك سەر بۆ دوژمن شۆڕناکەم دوێنیٚ دوو کچی ترم لەگەڵ خێزانەکەم لەزریانەکەدا لێم دابڕان، تۆش لەبەر منداڵەکە ئەتویست قەناعەتی پیٚ بکەی بڕوات خۆی بدات بەدەست جاشەکانەوەو ئەتوت: خۆ هیچ نەبیٚ کەمیٚ

بەزەییان پێیدا دێتەوە. نیازت وابوو ئەو منداڵەی لەکۆڵیایەتی و جارجار بە پێپەتی بەناو بەفرەکەدا بکێش دەکات نەمرێ، چونکە پێکانی سڕ ببوون سوور هەڵگەرابوون، بەفرەکە بردبووی. دەستەکانی گۆی نەدەکرد هەر دوو سەرکولمەکانی وەکو دەنوکی کەو سوور هەڵگەڕابوون، تۆ زۆرت سەیردەکرد بە تاوانت دەزانی ئەو منداڵە بێتاوانە بمرێت. بەلام باوکی کچەکە هیچ گوێی لێنەگرتی و وتی: من یەك داوام هەیە، من لەجیاتی تۆ وەلامم دایەوەو وتم: بەلێ وتی: ئەگەر ئەو منداڵەم بۆ بگەیەننە گوندی خوڕخوڕە گەورەترین مرۆڤ دۆستییەو وا منیش لەجیاتی ئێوە ئەم ئەفسەرە ڕاکردووە دەگەیەنم، ئەوە بوو من پێشنیارەکەم پەسەندکرد تۆ یەکەم پێشمەرگەی دەستەکەم بووی کەخستە کیسە خەوەکەی لەپشتتدابوو تەنها ملی بەدەرەوەبوو ئەویش سەرکلاوی کیسە خەوەکەت بەسەردا دابوو کردمان بەسەرە، پاش نیو سەعات ڕۆیشتن بەناو ئەو بەفرە زۆرە لەژێر ڕەحمەتی گوللەی بێ ژماری ڕەشەکوژی جاش و سەربازو هوڕەی تۆپە کوێرانەکانی ڕژێم.

هێشتا سەرەکەت تەواو نەبووبوو هاوارت لێهەستا، لێت هاتینە پێش لێمان پرسی چی ڕوویداوە.؟ وتت: ئاوێکی گەرم بە پشتمدا دێتە خوارەوە، تێتگەیاندین کەکچەکە گەرم بوتەوەو ئاگای لەخۆی نییە میزی پێدا کردووی، ویستمان لێت وەرگرین نەت داینێ و وتت: من سەرەکەی مامیشم هەلی دەگرم، هەرچی کردم و وتم، نەتدامێ هەلی گرم.

لە گوندی خوڕخوڕە کەبنکەی پێشمەرگە لەوێبوو گەیشتینە ناوچەی ئازادو لە ئابلۆقەی دوژمن دەربازمان بوو، هەر دوو دەستەکانت خستە پشتەوە، سەرت هەلبڕی و وتت: سەد جار ئۆخەی ڕزگارمان بوو، ئەم جارەش زۆر لەوە ئەترسام دەستگیر بکرێین، هەر ئەو شەوەبوو شەڕ لە (داری زەکەریا) دەستی پێکردو هێرشەکان یەك لەسەر یەك بوون، نەیان دەهێشت پشوو بدەین، ناچار ئێمەیش چوینە سەنگەرەوە، تۆ چەند بارانەکە چڕو خەستبوو خۆڵ و بەرد دەباری بەسەرماندا هاوارت دەکرد وریابن خێرا سەرکەونە سەر گردەکە، چونکە تۆپەکان زیاتر ناو گوندەکە دەگرێتەوە.

ماوەی یەك دوو هەفتەیەك لەشەڕی بەردەوامدا بووین، ماڵەکانی خوڕخوڕەو یاخیان هەمووی بەرەو دیوی ئێران ڕەویانکرد، ئاژەڵەکانیان لەناو ماڵان و دەورو

بەری مابوونەوە، هەر ئەتوتو ئەتوتەوە ئەم تاوانە تاکەی ناوەستێ.؟ بەسەدان سەر مەڕو بزنو گاو مانگا بێ خاوەن مابوونەوە.

ئێمەش بێ نانماینەوە، تێکڕای پێشمەرگە لە ناچاری حەیوانیان سەر دەبڕی و دەیان خوارد. تۆ دەستت تێنەدەچوو، بەڵام برسیی بوی زۆریشت حەز لەگۆشت بوو، چونکە چەند ڕۆژێك لەسەر یەك لەڕاکە ڕاکەو سەرماو برسێتیدا بووی، بۆیە تۆش وەك ئێمە ڕاهاتی لەسەر ئەوەی گۆشت بخۆی... دوای سەرکەوتنی ئەنفالی یەکەم بەسەر ناوچەکەدا، بەتێکڕایی ڕەوکردنی خەڵك و پێشمەرگە بەرەو دۆڵی شێخ محمەدو سەفرەو زەرون و شاناخسێ دەستی پێکرد، ئێمەش کەوتینە ڕەوەکەوە لەدۆڵی شێخ محمەدەوە تێپەڕین، لاشەی سەربازو کوژراوی عێراقی لەشەڕی ئێراندا، کەلاکی بزن و مەڕ و هێسترو گوێ درێژو گاو مانگا ڕچەیەکی ڕەشی لەسەر بەفرەکە دروست کردبوو. ئێمەیش دەبوایە لەوێوە بڕۆین، لەزۆر شوێنیشدا لێفەی سەر کوڵی ژن و منداڵ بەمبەرو بەری ڕێگاکە سووریان دەکردەوە. شتی وەها دڵ تەزێنت نەدیبوو هەر سەرنجی شتەکانت ئەدا، ڕێگات بۆ نەدەکرا زۆر جار دادەبڕای ناچار لێت توڕەدەبووم، بەزەییت دەهاتەوە، هەندێکجار دانەچڕەت پێ دەکەوت دیمەنی وەها دڵ تەزێن ڕەنگە لەمێژوودا کەم ڕووی دابێ. تۆش بەو تەمەنە ئەو شریتە دڵ تەزێنە سینەماییەت بەبەر چاودا دەهات، لەکاتێکدا خۆشت ڕوو لەهەندەران ڕەوتدەکرد. لە هەمووی ناخۆشتر بوو، زوو زوو ئەتوت: مامە بۆچی نەگەڕێینەوە دەشتی کەرکوك و لەوێ تا دەکوژرێین دەکوژێین، توخوا با نەڕۆین بۆ پەنا بەری چونکە دراوسێکانمان لە گەڵمان سەر ڕاست نین و ئەو کاتەنەی بۆمان پێدەکەنن کاریان پێمانە، دەنا هەموو بەمەرگمان شاگەشکە دەبن. چووینە گەلاڵە لەوێ لەلایەن بنکەی پێشمەرگەوە پێشوازی کراین، هەندێ پاتەی ئێرانی کردرابوو لەوێ بۆ ئەوانە دانرابوو پێڵاویان لەپێدا نەماوە، تۆش پاتەکانت سوابوون بەفر تەنکی کردبوون و ئاو هێندە چووبووە پێتەوە، پەنجەکانی پیرەڵۆك کردبووی، لەڕوشت نەدەهات داوای بکەی، کاتێ بۆمان گۆڕیتەوە، ئەتوت: وا ئەزانم کادیلاکیان داومەتێ، هەر بە پێوەو بەپاتەکانەوە دەخولایتەوە.

لە گەلاڵەش بەرێ کەوتین بەرەو شاناخسێ، ئەو گوندە سەر سنوورییەی ڕۆژی پاش ئێمە کیمیابارانکراو چەندان پێشمەرگەی دلێری تێدا شەهیدو زامدار بوون،

شەوەکەی چووینە شاری بانەی کوردستانی سەروو شەو لەماڵە دۆستێکی کوردستانی خواروودا ئاراممان گرتوو ڕۆژی دوایی ڕووەو سەردەشت تێوەر سوڕاینەوە. لەوێش لەشاردا جێگایان نەکردینەوەو دۆستان دەریان کردین بۆ گوندەکانی دەرەوەی سەردەشت.

بەچەند ڕۆژێك بەجەولەیەکی دوورو درێژ بەبنەو خەڵەف و کانی زەرددا چووینەوە گوندی زەڵێ و لەوێ لەبارەگای گومرگ ماینەوە. پاشان بەبەری گۆڕە شێردا ڕوومان کردە بناری قەندیل، جارێکی تر کۆڵێ نانمان بەستەوە، تۆ بەشەکەی منیشت هەڵگرت، جگە لەوەی لەڕێگا هەورازو دوورەکانیشدا تفەنگەکەی منیشت دەکردە شان، تۆ نەتدەزانی من چەند دڵخۆشبووم بەو هەڵسوکەوتانەی تۆ وام دەزانی لەشەڕی گەورەی دوژمندا سەرکەوتنم بە دەست هێناوە.

ڕۆیشتین هەر ڕۆیشتین تاگەیشتینە ئێندزی و لیوژێ لەوێوە شەو بەناو ڕەبایەکانی دوژمندا بێ چرپە پەڕینەوە زار گەلی و پاشان بەهیلاکیەکی زۆرەوە چووینە گوندی وەرتێ. لەبەر ماندویەتی نەمانزانی چۆن دابەشی مالآن بوین و بەرکام ماڵ کەوتین، بەیانی زووبوو هاتینە بەردەرگای ماڵی خانەخوێ من پاش تۆزێ کەوتینەڕێ بەرەو پشتی گولآن بۆ دەرەشێرەکان و لەوێشەوە بە ئۆتۆمبێل بۆ مەڵبەندی سێ، کەشەهید حسن کوێستانی و شەهید عبدالڕەزاق محمد هاتن بەرەو پیرمان.

دوای چەند ڕۆژێ مانەوە لە گوندی توتمێ لەڕێگای سەیارەی بنکەکانەوە بەرەو نازەنێن و لەوێشەوە بۆ سماقوڵییەکانەوەو پاشان بەرە و پیرەل و باوەقووب، ئەودیوی گوندی گۆمەشێن و گۆپتەپە هەر لەێوە چووینە گوندی دارە تووی ماڵی فاروق علی مەولود کەبەڕاستی دڵسۆزانە لەوێ خزمەتیان کردین و پاشان بەڕێیان کردین لەجادەی ئیلنجاخ پەراندمانیانەوەو شەوەکەی چووینە گوندی مەلا زیاد. تۆزێ نزیك ببووینەوە لە گوندەکانی قەڵا سێوکە، زۆرت پێخۆشبوو هەوای کەس و کارت بەسەردا دەهات. دەمێك بوو دابڕانی وەهات بەسەردا نەهاتبوو، زۆریش بیری دایك و باوکت دەکرد، چونکە تۆ پاشە بەرەیان بووی و زۆر خۆشەویستی ئەوان بووی. کەگەیشیە گوندی خەرابەو لێژ بوویتەوە بەرەو گوندی کانی بی زۆرتر دڵخۆش دەبووی سەیری ئەو پاڵە پەستۆیەی ئەنفالی یەك و ناوچەی دۆڵی مەرگەو

پشدەرت دەکرد، لەگەڵ ئاسایی هامشۆی خەڵك و پێشمەرگە لەگەرمیانەکە دڵت زیاتر خۆش دەبوو، کاتێ چووینەماڵی سەلامی فەقێ ئەحمەد لەکانی بی و لەبن ساباتەکەی دەم زێ هەندێ هەنجیرو خەیاری نوێ پێگەیشتوو هەندێ زەردە لویان بۆ هێناین، زۆرت بەدڵ بوو، دەمزانی دەمت یەکی نەدەگرت لەخۆشیان.

دوای شەوو ڕۆژێ پشوو، زۆرت پەلەبوو لەگەڵ براکانت قەدبڕتان کردو خێرا پەڕینەوە بەری قەلاً سێوکەو چوونە لای دایك و باوکت.

لەعەسکەر کەگەڕامەوە لاتان ڕەنگ و ڕووت بەتەواوەتی گۆڕابوو گەش گەش ببوویتەوە، ماوەیەکی کەم لە پشوودا بووین پاشان هێرشی ئەنفالی دوو دەستی پێکرد لە سنوری مەڵبەندی یەك و ناوچەی دەربەندیخان و جەباری و ساڵەیی و بازیان چەند ڕۆژێکی نەبرد ئەوەی گیراو ئەوەی خۆی خستە شارەکان و ئەوەی هات بۆ ناوچەکانی شوان و شێخ بزێنی و قەلاً سێوکەو لەوێشەوە بەرەو مەڵبەندی سێ ڕەویان کرد. ئێمەیش بۆ دڵنەوایی و دڵدانەوەو وره بەبەر هێنانەوە چوینە ناوچەکانی شوان و قەلاً سێوکەو بەجەولە دەجولاًین بەلاًم تین و تاوی ئەنفالی دوو لەو ناوچەیە هێندە بەهێزبوو خەڵك و پێشمەرگە خۆی پێنەگیراو ڕۆژانە لەورەی خەڵکی دادەبەزاند. زۆر بە ئاشکرا پێتەوە دیاربوو هەم دیسان ببووی بەمامە خەمەو غەمی خەڵکت گرتبووە کۆڵ، پەژارەی ئەوە دایگرتبووی ئەو هەموو جوتیارە بەماڵو منداڵەوە لەکوێ بژین و ئارام بگرن و لەمەرگ ڕزگاریان بێ، بەلاًم لەخەم خواردن بەولاوە شتێکت بەدەستەوەنەبوو. هێرشی ئەنفالی دوو بە تەواوەتی سنوری مەڵبەندی یەکی چۆڵکردو ڕۆژانە دوکەڵی سوتانی ماڵ و حاڵی خەڵك و قوتابخانەو مزگەوتەکان بە شێوەی گەردەلول باریك و بڵند هەڵدەستا، هەر بەوە دەچوو شەکوا بەرێ بۆلای خوداو هاوار بکات کوردو خاکەکەی لە دەست زوڵمی بەعسیان ڕزگاربکە.

هێزەکانی مەڵبەندی یەك و خەڵکی بەتەواوەتی دەریەڕێندران لە لای ئێمەیشەوە ڕەتبوو، سەرە هاتە شوانەکان و شێخ بزێنییەکان، ساڵەیی، قەلاً سێوکە، سورداش، بازیان.

ئیوارەی ١٩٨٨/٥/٣ بوو لەسەر تاشە بەردەکانی پردەکەی شێخ ڕووبەڕوی ماشە ماسییەکان قاچمان شۆڕکردبۆوەو هەوای شێداری ڕووبارەکەمان هەڵدەمژی، کەلەچەمی ڕەزانەوە سەرچاوەی هەڵگیرابوو، بیرمان لەوە دەکردەوە لەڕۆژانی

هێرشی ئەنفالی سێدا سەنگەرەکان لە کوێ و کوێوە لێدەین و ماڵ و منداڵی خەڵکەکەش ڕەوانەی تەنکی ساچوخ بکەین، پێمان وابوو بەرگری چاك دەکەین و هەرگیز نەهێڵین دوژمن دەرمان پەڕێنێ. هەر بۆیەش بۆ دوو سێ ڕۆژ بوو ئازوقەکانتان بردبووە ئەشکەوتەکانی تەنکی ساچوغ و هەرچی نوێن و چەك و تەقەمەنی زیادیش هەبوو خۆت سەرپەرشتیت دەکردو دەت شاردەوە بۆ ڕۆژانی پێویست.

ماوەیەکیش بوو چویتە سەر جیهازە ڕاکاڵەکەو دەورەت بە تەواوەتی بینبوو ئەویش فێر بووی، ماتۆڕە بچوکە ( ٥٠٠ ) واتەکەشت شاردبۆوە بۆ شەحن کردنی پاتری جیهازەکەت، بەڕاستی مشوری چاکت خواردبوو زەخیرەی چاکت بۆ شاردبوینەوە، بەڵام ئەوەی ئێمە بیرمان لێئەکردەوە ئەم ئێوارەیە هەمووی لێ هەڵوەشاندینەوە، ئەوەش لەکاتژمێری شەشی ئێوارەی ئەو ڕۆژەدا گەلە فڕۆکەیەکی یەکجار زۆر لە خاڵ خاڵانەوە بەسەر شێخ بزێنی سەروو قەلا سێوکەدا بە ڕژانی گازی کیمیاوی هاتن و سەریان لای ئێمەداو چوونەوە سەر چەمی ڕەزان و گوندی کانی هەنجیر و قوچەبلاخ و شیربابەو شیرەدەرەو لەو سەرەوە بە بەتاڵی گەڕانەوەکەرکوك. لە ڕۆژی ١٩٨٨/٥/٤ تۆ کوڵە پشتەکەت لەپشتابوو، هێشتا نەچووبوویتەوە بارەگاکەی خۆمان، هێشتا بۆنی هەناسەی کیمیاوی لێدراوەکانی عەسکەرو گۆپتەپە سەرو سنگی بەرنەدابووین کەئێوارەی ڕابردوو بەرەو پیریان چووبووین‌و دەستی ئەوانەمان دەگرت و ئەمان خستە سەر ڕێ کەچاویان کوێرببوو. گەردەلولی دوکەڵی کیمیاوی لەدەمیانەوە دەهاتە دەرێ‌و ڕوی لەسنگی ئێمە دەکرد، تۆ چاکتر بووی خێرا خێرا خەڵکت ڕاستەڕێ دەکرد. هەواڵیشت زانی بوو کەنوری ئامۆزات ئێوارە کیمیاوی شەهیدی کردووە، بەسەر خۆت نەدەهێنا، کاکی گەورەشت ڕەش هەڵگرابوون سەرو چاوی ئاوسابوو ڕەش ڕەش ببوو نەت دەناسیەوە، بەڵام مادام ئەیتوانی بڕوات خۆت لە ئەویش نەئەدا، زۆر ماندو ببووی ئەبوو جیهازەکەت هەڵدەی و بروسکە بۆ هەموو بنکەکانی سەرکردایەتی بکەیت‌و لەوەزعی خۆمان ئاگاداریان بکەی. من نەمدەزانی بەو منالییە بۆچی وەها نهێنی پارێزبووی، جفرەکان لاتبوو ئێستایش کەس نەیزانی لە سەرەوە چ فەرمانێك دێ، تاکاتی جێبەجێکردنی دەهات.

وایەرە درێژەکانت لە دوو دەوەن گیر دەکردو خێرا خێرا پەیوەندییەکانت

دەکردو دەست بەجێ دەت پێچایەوە و لە کۆڵت دەکرد چونکە لە ئان و ساتدا دەجولاین و هێرشمان دەکرایە سەر.

١٩٨٨/٥/٥ بوو بەتەواوەتی کەوتینە ئابڵۆقەی دەیان هەزار جاش و سەربازەوە لەحەوزی چەمی ڕەزان، دەبابەکان لە شوێننە ستراتیژیو زاڵەکانی سەر حەوزی چەمدا کۆنترۆڵی تەواویان هەبوو، ژمارەی چەکدارانی ڕژێم مەگەر بە کۆمپیوتەر بژمێردرایە.

تا دەهات تەقە نزیکتر دەبۆوەو هێزەکان لێمان دەهاتنە پێشەوە، ئەشکەوتەکان پڕ ببوون لەژن و منالْ، تەنها یەك فیشەك تەقاندن بەس بوو بۆ دوابڕینی هەمووی، نەدەکرا سەری خۆمان بخورێنین، هەرچۆنێ بوو بڕیارماندا شەڕنەکەین و خەڵکی بپارێزین، چونکە بەحری بێ بن و هێزەکانی دوژمن ڕۆژێك و داون و سێ حەوانەوەمان لە چەمدا لەتواناادا نەبوو، چونکە جاشەکان کێومالیان بۆ دەکردین، ئەشکەوت، بنبەرد، ناو دەوەن ناو قامیشەلان شیوو دۆڵ و پەنا. هەمووی دەپشکنرا، بۆیە بڕیارماندا بپەڕینەوە بەری پیرەمەگرونی سەرکەش، بەلام ئەوەش یەکێك بوو لەکارە هەرە سەختەکان چونکە بە دەیان ڕەبایەو مۆڵگای سەربازی دانرابوو لەسەر چەم و ڕێگاو بانەکان ئێمەیش شارەزای تەواومان لەگەڵ نەبوو.

ئێوارەبوو ڕۆژ بەتەواوەتی چەمی بەجێ هێشتبوو سێبەر باڵی کێشابوو بەسەرداو ئێمەیش لەبێشەکان هاتینە دەرێ و ڕووەو قۆچەبلاخ و کانی هەنجیرو کەڵەباش و لەوێشەوە بۆ بناری سوسێ سەرو ڕچەمان بەست، هەر لەچەند سانییەکدا تەڵقە تەنورەکی گەورە هەڵدەدراو بەتەواوەتی دەشتەکە ڕوون دەبۆوە، هەموو جارێك ئەبوو خۆمان بەزەویدا بدەین.

جا ئەو شوێنە ئاو بێ، قوڕ بێ، دڕك بێ، نەئەبوو بەپێوەبین، تۆش تفەنگەکەو جیهازەکەت بەپشتەوەبوو نەکاراو نەدیدەبووی بەلام پێتەوە دیارنەبوو. ئەو شەوە پێنج سەعاتێ ئێمە بەڕێوەبووین، لەڕێ لەگەڵ برا ناوەنجییەکەت لێتبوو بەهەرا ڕقت هەڵساو ئەتویست بەتەنها بگەڕێتەوە بۆ ناو باغەکانی چەم لەوێ بژیت، دیار بوو تۆ زۆرت پێ ناخۆش بوو براکەت لەڕێ لایدابوو لەڕیزەکە دابڕابوو. قسەت کردبوو ئەویش خۆی لە تۆ بەگەورەتر ئەزانی لێی قبوڵ نەکردبووی عەتا هێزی تیادابوو دابووی بەبنا گوێتا زۆرت لا ناخۆش بوو لەبەر ئەوەی خۆت لە سەر حەق ئەزانی.

بەیانی ڕۆشن بووەوە لە ناو پاقلەو پیازەکانی ناو هەنجیرە نەمامەکانی سوسێی سەروودا بووین، هەر ئەوەندەمان زانی لەم لا ولاوە چەکدارمان لێپەیدابوون خۆتدا بەزەویداو تفەنگەکەت هێنایەوە، زۆرم پێ خۆشبوو چاپك و خێرا بێ شڵەژان هاتیتە دەست، هێشتا نەگەیشتبووە ئەوەی تەقە بکەین یەکیانمان ناسی کەپێشمەرگەی تیپی (٢٣)ی سورداشە، بەوە لەشەڕەکە ڕزگارمان بوو چووینە بناری پیرەمەگرون لەوێش هەندێ پێشمەرگەی پەرەوازەی ترمان ناسییەوە بەیەك شادو شوکور بووینەوە. لای بەیانییەکەی ڕاکشاین و عەسرەکەی کۆبوونەوەی بەرگریمان پێکردن و پاشان بەرەو دۆڵەبی پیرەمەگرون کەوتینەڕێ، ئەو ڕۆژە هەندێ سەربازی ڕاکردوومان لەگەڵ بوو، بەڕێمانکردن لەڕێی خەڵکی سوسێوە بیان بەنەوە ناو شار، بۆ ئەوەی لەکوژران ڕزگاربن، ڕووم لەتۆکرد وتم: جارێ منداڵی وەرە بەقسەمکە بڕۆرەوە شارو سەرلەنوێ دەست بکەرەوە بەخوێندن، ئەم جارە بێ شەرم و شکۆ وتت: من تازە پێشمەرگەم و ئێستایش لێقەومانە ئاخر کەسم لەگەڵتان دەبێ بمرم.

هەرچی وتم: تۆ نەتبیست بۆ ئەوەی بگەڕێیتەوە بۆ شارو هەر لەو ڕۆژەوە بەشە ناوساجی و شەکرو چاو ئاوو جار جارەش چەکەکەشت ئەگرتە ئەستۆی خۆت و شەوانیش سەرەڕای ئەوە حەرەسمان هەبوو خۆشت بەسەر سەرمەوە دادەنیشتی و چاوەکانت نەدەنوقاند، لەترسی ئەوەی نەك لەو ڕۆژە ڕەشەدا یەکێك من بکوژێ و خەڵات وەربگرێ لای دوژمن.

زۆرت پێخۆشبوو کەچەپکە ڕێواسی ناسکت ئەشکاندەوەو بەخوێوە دەت مژی، کەوتم: بابڕۆین سەیرێکی دیوی مێرگەپان بکەین لەسەر لوتکەی پیرەمەگرونەوە، دەتوت: ڕۆنی قازت لە لەشت دراوە خێرا تفەنگەکەی منت هەڵگرت و جیهازەکەشت لای هاوڕێیەکی دڵسۆزت داناو چوینە دیار بەدیاری هەوارەکانی مێرگەپان. لە قوتولکەیەکی کونی ئاوی تەماتەدا چایەکمان بە بەفری تواوە لێنا هەر ئەتوتو ئەتوتەوە بۆچی چای دەشت و دەر هێندە خۆشە؟ جار جاریش شوڵی ڕێواسی گوڵ سپی و سوورت ڕادەکێشاو هەندێ خوێت لەپریاسکەیەکدا دەردەهێناو ئەت مژین ناچار دەبووم منیش بەشداریت بکەم.

من عەوداڵی ئەوەبووم ڕێگای دەرباز بوون بدۆزمەوە، بۆ بەری ژێلوان و لەوێوە بۆ دۆڵی شێخ محەمدو گەورەدێ بەڵام هێزەکانی دوژمن وەها بەچڕی ناوچەکەیان

تەنیبوو هیچ دەروازەیەکمان نەبینییەوە.

ئێوارە گەڕاینەوە بەرەو ئەشکەوتەکەی دۆڵەبی، ڕوانیمان هێزێکی زۆری مغاویر لەقەرەچەتان دابەزین بەکۆڵە پشتی زۆرەوە، ئێمە گومانمان وابوو بۆ سەر ئێمە ئامادەکراوە، بۆیە بڕیارماندا شوێن بگۆڕین و بگەڕێینەوە چەم، دەست بەجێ لەگەڵ خۆرئاوا سەرەوخوار بووینەوەو قۆناغمان بردە گوندی زەرزی. لەماوەی ئەو دووسێ ڕۆژەی ئێمە چووینە پیری، هێزی چەم هەندێ کەم کرابووەو هەستیان کردبوو لەپیرەمەگرونین. بۆیە ترسی ئەوەمان نەبوو لەگابەردەکانی بەر ئەشکەوتی قز قاپان لامانداو لەو پاڵ بەردانەی چاومان لێك نا سەرمای ئەو دەم و ڕووبارە زۆر کاریگەربوو، خەومان لێنەدەکەوت، من بەتانیەکی دووبەری خۆمانم پێ بوو هەردووکمان پشتماندا بە پشتی یەکەوەو ویستمان بخەوین بەڵام سەرما نەی هێشت.

بارودۆخی چەم کەمێ گۆڕابوو مەجالی هاتوچۆی ناو چەم کرابۆوە، خێرا بڕیارماندا ئازوقە کۆبکەینەوە، خێرا لەگەڵ هاوڕێکانت خۆت ئامادە کردو چوونە چەمی ساچوغ و گردە گروی و لەو ئەشکەوتانەی خەڵکی شتیان بۆ ڕۆژی ڕەش شاردبۆوە لە گەڵ هەندێ ئەشیای خۆمان گوێزاتانەوە چەند شوێنی ترو زەخیرەی سێ مانگتان بۆ دابین کردبووین. بەهەموو لایەکتان لەگەڵ خۆشتان هەندێ هێلکە مریشکی ئەشکەوتەکانتان هێنابوو...

ئێوارەبوو بووە هەرا وتیان: جاش گەیشتە سەرمان تۆ خێرا ڕاتکرد بێ ئەوەی گوێ بەوە بدەی کێ دێت لەگەڵت، بەهەر چوار دەوردا کەوتیتە پشکنین، پاش ماوەیەك هاتیتەوەو تێت گەیاندین ئارامبن دوژمن دوورە. بۆ شەوەکەی تۆ نوستبووی من بە دیارتانەوە دانیشتبووم و هاژەی ئاوی چەمی داوێنی بافلەکە کاسی کردبووم، کاتێ گوێم لە هاوارو ناڵەناڵی تۆبوو بەڕاستی جەرگت بڕیم، بۆم دەرکەوت جارێ منداڵی دیارە بە ڕۆژ زۆر ترسابووی کرپوزەم لێدەهات. دڵیشم نەدەهات لە خەوت بکەم هەرچۆنێ بوو هەڵم ساندی، زۆر سەرمکردە سەرت چی ڕوویداوە.؟ ئێستاش پێت نەوتم هەرچەند من کردم سوودی نەبوو بەسەر خۆت نەهێنا.

ئێوارە هەندێك لەبرا پێشمەرگەکان چوونە دۆڵی عەوالان، بۆ پەیدا کردنی ئازوقەو نیازیشیان وابوو ئەگەر هەندێ ولاخە بەرزەیان دەست بکەوێ بیکڕنەوە،

بـۆ بارهێنـان و بـردن، بـەڵام ڕەوە جاشـێکی زۆریـان بـەدیکردبوو بـەرەو لای ئێمـە بـەڕێوە بـوون. گەڕانـەوە لامـان و وتیـان سـەدا سـەد ئـەم شـەو پـەلامار ئـەدرێین، کۆبوینەوە نەخشەمان کێشا کەئێمە زووتر بڕۆینـە بن دەسـتی ڕەبایـەکانی دوژمن، بـۆ ئـەوەی لـەم پـەلامارە خۆمـان بپـارێزین، تـۆش جیهازەکـەت سـازدابوو تـازەش پاترییەکـەت چارچـکردبۆوە. شـەو ڕۆیشـتین بـۆ بـەر مـالأنی دووسـێ ماڵـەی کەڵەشێرەو بووین بە دوو بەشەوە، بەشێ بۆ ( مەکۆ ) بەشەکەی تر بۆ ( کەرخۆر ) دوو شوێنی زۆر چڕو پەنای دامێنی مالأنی کەڵەشێرەن. بەیانی بوو تەقە هەڵسا، خـۆت پێنـەگیرا خێـرا دووربینەکـەت کـردە ملـت و بـەرەو ئاسـۆگەکەی دیـاری ئەشکەوت دووکونی چەمی ڕەزان وردە وردەو پـەنا دەوەن بـەدەوەن ڕۆیشتی هـەر کـە گەیشـتیە جـێ و سـەرنجێکی چـەمەکەتدا خێـرا بـەدەنگێکی نـزم جیهـازە دەستییەکەت کردەوەو بانگت کردم وتم: چییە.؟ وتت: مامە بەسێ ڕەتڵ لـە سـێ شـوێنەوە سـەرراز و سـەرراز، بەرراز و بـەرراز بـۆ ئەشـکەوتە دوو کـون و ئەشـکەوت سحرا چەماو چەمیش لـە سـێ قوڵـەوە دەسـت ڕێژەو ( ئاڕ. پـی. جـی) تەقەکردنـە. ئێستا لەبەر چاومن هێزێکـی زۆر بـەرەو لای ئێمـە دێـن، بـەنیو سـەعاتێ تـر دێنـە سەرمان، بەراوردی هێزەکانمان، ئێمە ( ٢٥ ) پێشمەرگە دەبین بەهـەر دوو بەشـەوە، ئـەوانیش واتـە دوژمـن دەهـەزار دەبـێ لەهـەر چـوار قوڵـەوە، لـەلای ئاغجەلـەرو لـە گـەورەدێ، لـەکانی بـی لەچـەم و لـەلای سـۆتکەو عەسـکەرەوە هێـرش هـات. بـانگم کردی خێرا هاتیتەوە لامان جیهازمـان کـرد بـۆ بەشـی مـەکو، وشـیاربن دان بـەخۆدا بگـرن، تاسـەعاتێ چـوار کـەس تەقـە نـەکات، ئەگـەر کـرا کـەس خـۆی دەرنـەخات، بادوژمن ڕەتبێ زۆر شلەژابووی پێت وانەبوو دوژمن نەمان دۆزنەوەو بە نەزەری تۆ (٢٥) نەفەر لەگەڵ دەهەزار چەکداری دوژمن شتێکی بۆ ناکرێ، تۆ ناحـەق نـەبووی شتی وات نەدیبوو، ئێمە هەر دوو لامان ئاگادار کردبۆوە کەس خۆی دەرنـەخات. تۆشـم نـاردە نـاو تـوتڕکو بەردەکـەی کـەرخۆر خۆیشـم چـوومە سـەر دار بـەڕووە گەورەکـەی سـەرتان، بـەدووربین چـاودێری گشـتی هێـزی دوژمـنم دەکـرد، چـرکە بەچـرکە پـێم دەوتـن: وشـیاربن دوژمـن لێمـان ڕەت بـوو، بـەلأم نەگەیشـتۆتە برادەرەکانی وتم: ئەوە گەیشتە کانی شێخ ئەولا، ئەوە چوونە سەر کانییەکە، ئـەوە حەرەسـیان دانـا خۆیـان دەم و چـاو دەشـۆرن، ئەترسـن نـاوێرن خۆیـان ڕووت بکەنەوە. مەترسن خەریکن بڕۆن بۆلای بێدەنگ بەسەرو کانی بی لێمان لایدا ئەوە

سەعات ( ٣/٥ ) نیوە، وەخت درەنگە مەترسی کەمبۆوە خۆتان دەر مەخەن.

جاش جوولاَن ئەریَ وەلاَ شتیَکیان بەدی کردووە، دوورنییە هاوڕیَکانمان بن، ئیَ گویَتان لیَبوو ئەوە دەستڕیَژکرا نەخیَر شەڕ دەستی پیَکرد خۆتان دەرمەخەن. هەلَۆ هەلَۆ، قەندیل قەندیل، بەلَیَ بەلَیَ، ئەوە لەگەلَ ئیَوەیە بەلَیَ ئیَمە لەمەکۆدا دانیشتوین لەپڕیَکا جاش هاتنە ناومان و ناچار هەرسیَکیانمان کوشت ئەوا ئیَمە پەلاماریان ئەدەین و ( ٩ ) کەسمان ئابلَۆقە داون، وریابن برا وریابن ئیَوە هیَرش مەکەن جاریَ زووە برا ئاگاتان لەخۆتان بیَ.

نەخیَر تەقە زیاد بوو شەڕ بەرەو لای ئیَمەش دەستی پیَکرد برادەرانمان دابەشکرد یەك یەك و دوو دوو، تۆ لای من بووی جیهازەکەت لەبن دڕکەکان شاردبۆوە.

هیَزیَکی سەربازی لە(گەورەدیَ) وە بۆ سەر ئیَمە دەهات، جاریَ پەلامار مەدەن بانزیك ببیَتەوەو لەپڕیَکا دەستڕیَژ بکەن بۆ چاو ترساندن. بە کۆمەلَ بیانکوژن داگیرکەرن، جاشیان زۆر لەگەلَە شارەزان، زۆریان لەم چەند ڕۆژەی ئەنفالدا بۆ ئەوەی خۆیان لەمەرگ و گرتن بپاریَزن چوونەتە لای مستەشارەکان، دیارە نەشارەزاشیان لەگەلَە.

شەڕ گەرمتربوو هەلَۆ هەلَۆ، قەندیل قەندیل، بەلَیَ بەلَیَ ئیَمە داویَکمان بۆ مستەشاریَك ناوەتەوە، نیازی ئەوەی هەیە سەرمان لیَبدات خۆمان لیَکردووە بەجاش هاکا بۆمان کوشتی، وریابە منیش ناردومە دووسیَ تیپی تر بنیَرن لەکانی بی و گەورە دیَ و چەم و لای عەوالاَن و عەسکەرەوە. هەر ئەم شەو هیَزیَکی زۆری دوژمن دەکوژین، تۆ لات سەیربوو مامەت درۆ دەکات نەتدەزانی فەنی شەڕەو جاش گویَ دەگرن و بۆ ئەفسەرەکان دەگیَڕنەوەو دەشلەژیَن و پاشەکشە بەهیَزدەکەن، بەوە گرەو دەبەینەوە.

قەندیل قەندیل، بەلَیَ بەلَیَ، هیَزیَکمان بۆ بنیَرن ( ١٤ ) جاشمان دەست بەسەردا گرتووە، کەلاکی زۆرمان لیَیان خستووە، بەلَیَ هەر ئیَستا ئیَوە مەجولَیَن خۆم دەزانم چۆن فریاتان دەخەم. ئەگەر هیَزیَکی خۆمان لە (گەورەدیَ) وە هاتە خواریَ گویَ مەدەنیَ پیَم سپاردوون پشت لەو هیَزەی دەرو بەری ئیَوە بگرن، لات سەیربوو ئەمانە چەندی بە چەند، ئیَمە ( ٢٥ ) پیَشمەرگە، کەرتیَ نین و لە هەموو ناوچەکاندا پیَشمەرگە نەماوە ئەمەی مامەت چەندی بە چەند. هاتیە وەلاَم و وتت:

تفەنگەکەم بدەری ئەڕۆمە پێشەوە، پێم وتی: من کەسم لا نامێنێ تەنها دەمانچەیەکم لایە، ئێستا تۆ لامبە خۆت پێنەگیراو بەرەو هێرشەکە ڕۆیشتی، دەستڕێژت لەسرییەی سەرباز دەکرد، دوان سسیانێکت پێکاو هاتیتە وەڵام وتت: ئێمەیش زامدارمان هەیە لەپشتی داوە، لەسنگییەوە دەرچووە، وا برادەران دەی هێنن بەڵام دوژمن شکا.

قەندیل قەندیل، بەڵێ بەڵێ، دنیا تاریکە، ئێوە دێنە لای ئێمە، یان ئێمە بێین.؟ جاش و سەرباز هەڵاتن مەیەن، مەیەن ئێمە دێین، چۆنن چاکن کێ زامدارە.؟ خۆ شەهیدمان نییە.؟ نەخێر تەنها ئەو زامدارەی قوڵی ئێوەمان هەیە، دەباشە کاکە ئەوەمان تیمارکردووە لەماینە بۆرمان بارکردووەو دوو برادەر دەستیان پێوەگرتووە.

دەی چیتان کردووە ئێمە ( ١٤ ) کلاشینکۆکۆفی بێ قۆناغمان گرتووە لەگەڵ ( ١٤ ) جاش و کۆمەڵێ زۆر تەرم لە ژێر دەستمانە، جاشەکانمان کۆکردەوە هەندێ قسەمان بۆ کردن. لەبەر ئەوەی زۆربەیان جاشی ڕۆژانی ئەنفال بوون ئازادمان کردن و چەکەکانمان بۆ پێشمەرگە گۆڕی، باقیمان لەدەوەن و درزە بەرد هاویشت.

نەخشەمان کێشا زیاتر بڕۆینە ناو هێزەکانی دوژمن و هەوڵ بدەین زامارەکەشمان بگەیەنینە شاری هەڵەمەت و قوربانی، لەڕێگای ئۆردوگای بازیانەوە.

بەبن دەستی سەربازەکاندا چوینە گوندی قوجەلەر لەناو جەرگەی دوژمن و لەناو دارو باغەکاندا ڕۆژمان بردە سەر، شەویش زامدارەکانمان بەرەو سەرچاوەی بازیان بەڕێکردو دڵنیابوین چوونە ماڵە دڵسۆزەکان لەئۆردوگای بازیان...

ڕۆژی دووەم فڕۆکە هاتو بەتێزاب هەموو چەمی ڕەزانی سوتاندو هێزێکی یەکجار زۆری بۆ کێوماڵ خستە چەمەوە، ئێمەیش سەیرمان دەکرد ئەو ڕۆژە بوو تازە لەسەر نان خواردن بووین. کەجاشەکان دایان بەسەر جێگاو بانەکەماندا و نان و چاو شتەکانیان گرتین، تۆ لێم دابڕابووی، ئارامم نەمابوو هەر دەرنەکەوتی، پەرۆشی ئەوە بووم چی وەڵامی دایك و باوکت بدەمەوە .

بەڵام زیرەك بوون بۆ ئەوەی جاشەکان نەتان بینن ئاگرتان لە پوشەکە بەردا، دوکەڵ بەری ئاسمانی گرت، لەو کاتەشدا وەها بوو لەکوێ ئاگرو دوکەڵ هەبوایە یانی جاشن. بەوە سەرنجی جاشەکانتان لەسەر خۆتان لاداو وردە وردە لە ژێر باڵی دوکەڵەکەدا هاتنەوە لای ئێمە، ئاگر هاتە لای ئێمەش بۆ ئێمەش کەڵکی

هەبوو، تۆ تەڵێ دار بەڕوی تەڕت گرت بە دەستەوە بۆ ئەوە نەسوتێ و لە جێی خۆشت هەڵنەستی ئاگرەکەت کوژاندەوە هەموو وامان کرد.

کات ژمێر ( ١٢ ) جاش چونەوە ئاغجەلەر، ئێمەش بەبەر چاوی جاشەکانی لوتکی دەربەندی بازیانەوە چوینەوە بۆ گوندی سوتاوی قوجەلەر، چوینە سەر کانی و ئاوەکەی گوند، هەندێ بڕە شوتی لەسەر زبڵ دانەکەبوو گەڕای چەند دانەیەکی بچوکت دۆزیەوەو هێنات پێکەوە خواردمان. ئێوارە زەرد بوو پێشمەرگەکان کەوتنە گەڕان بەدوای خۆراکا مێشێکی گەورەتان لەماڵێکی سوتاودا دۆزی بۆوەو جەمەدانەیەکتان لە سەرو چاوتان پێچا بوو. مێشەکەتان بڕی بوو هەر یەکە چەند شوشەیەکی دۆشاوی تەماتەتان لێپڕکردبوو هەمیشە هینی تۆ دوو بەش بوو یەکێ بۆ مامت ئەوی تر بۆ خۆت، بە خەندەوە هاتیتە لام وتت: شارەزای مێش بڕینیش بووم، وتم: ئافەریم ڕۆژانی تەنگانە مرۆڤ دەبێ کارامەبێ.

شەو بڕیارماندا زیاتر بڕۆینە نزیك دوژمن و بەرەو خوارتر بڕۆین، بۆ ئەوەی دوژمن شکی لێ نەبێ و کێوماڵ نەمان گرێتەوە، چوینە کونە گورگ لە پشتی کانی بوگەنەو گوندی بلوکێن ڕاست ڕوو بەڕوی ڕەبایەکانی ناو شاری ئاغجەلەر دەردەچووین. بۆ گوندەکان هەروەها چریسکەی تفەنگی جاش و سەربازەکانمان بەدی دەکرد، ئێمە زۆر ڕووبەڕوویان بوین نەمان دەوێرا دەرکەوین...

نیوەڕۆکەی بەسکە خشکێ لێم نزیك بویتەوەو شوشەیەك هەنگوین و دوو کولێرەت دامێ، پاشان مەتارەکەت دایە دەستم قومێ ئاویشم خواردەوە.

بڕیارماندا ناوچەکە جێبهێڵین چونکە ئێمە هەر چەممان هەبوو، چەمیش جگە لەوەی بە تێزاب سوتێندرابوو هێزی زۆریشی لێ مۆڵکرا، ناچار بڕیاری پەڕینەوەماندا بۆ دەشتی کۆیەی ئەنفال کراو. ئەوسا ئاوی دوکان زۆر بەردرابووەوە بۆ ئەوەی ئێمە نەتوانین دەرباز بین. چەند ڕۆژێ لەوەوبەر ناردمان لەشاری سلێمانی ڕێکخراوی کۆمەڵە بزمارو مشارو تەوراس و پلایس و هەندێ کەرەسەی ترو چوار چوپی شۆڤڵ و کەڵەکێکمان هەڵبەستاو هەر ئەو شەوە پەڕینەوە بەری کۆیە. بەڵام ژیان لەبەری کۆیە بۆ ئێمە ئاسان نەبوو، چونکە شارەزای تەواومان نەبوو، ناوچەکەش زۆر دەشت بوو. ئەوەبوو پاش دوو ڕۆژ بەبن شاری کۆیەو لە کانەبەردەکانەوە سەرکەوتینە سەر کانی بی و لەوێوە ئاودیوی ئەودیو بوین.

ئەو شەوە من زۆر هیلاك بووم، قاچەكانم لە دووم نەدەهاتن، چەك و نان و مەتارەش لای تۆبوو، ناو ناوە ڕادەكشام بەدەستە نەرمۆڵەكانت قاچەكانت بۆ دەشێلام.

ئاومان پێنەمابوو پێش ئەوەی بگەینە سەر كانی بییەكە كە گۆلاوێكی باراناوی تێدابوو كە هەر ئاو نەبوو هەموو شتێكی تر بوو. بینیمان پێوەنا پڕبوو لە قەوزەو بۆق و سەرە مێكوتەو قنگەلاشكەی وەشكەوەبوو ڕزیوو تەڕ؟ بەلام تامی ئاوی لێنەدەهات، تۆ نەت دەوێرا كەچی لە تونێتیدا ئاخری بەشداریت كردین.

گەیشتینە پیر ئەلیاس لەوێ دڵنیا بووین ناوچەی ناوڕاستی پێشمەرگەو ڕژێمە، پشوماندا، چەند سەعاتێ خەوتین. ناردمان لە كوێیەوە كەباب و گۆشت و خەیارو تەماتەمان بۆ هات خۆمان تۆزێ تەڕكردەوە، هەناومان كەمێ فێنكی تێكەوت، ئەوجا چوینە گوندی سكتان لەوێش پشوماندا.

ئا لەوێ بۆ ڕاگەیاندنی شەڕ ڕاوەستانی عێراق و ئێران كراو ئەژنۆی پێشمەرگە شكا، هاتیتە لامەوە پرسیارت كردو وتت: مامە ئەم ڕێكەوتنە لەسەر لاشەی كورد نییەو مانای ئەوە نییە ئێمە دەر دەپەڕێنن، زۆرم هەوڵدا دڵت ڕاگرم و وات تێبگەیەنم چونكە ئێمە سیاسەتی پشتبەست بەخۆمان پیادە دەكەین و ڕێككەوتنی ئەوان ئەوەندە كار لەسەر ئێمە ناكا، بەدەست خۆت نەبوو باوەڕت پێ نەبوو زۆری لێ ئەترسای.

بەیانی چوینە گوندی چێوە لەوێش جارێكی تر بروسكەمان دایە شەهید حەسەن كوێستانی و شەهید عەبدول ڕەزاق كەركوكی، ئۆتۆمبێلیان بۆ هێناین و زۆر بەڕێزەوە بردیانین بۆ مەكتەبی عەسكەری و مەڵبەندی سێ ئەوسا كاك عومەر عەبدوڵلاو كاك كۆسرەت لەوێ بوون. كاك حەسەن كوێستانی چەند ڕۆژێك میوانداریيان لێكردین، هەندێ پرس و ڕایان كرد لەبابەت هێزێكی ناردن بۆ جەماوەر بۆ شوێنی ئێمە ئێمەش ڕاو بۆچونی خۆمان وت و پاشان ئێمەیان بەڕێكرد بۆ سەركردایەتی و بنكەكانی گوێزێی قەندیل..

لە گوندی سورە دێی بناری قەندیل پشوماندا، تۆ مایتەوە ئامۆژن و ئامۆزاكانت دەرباز بكەی كە بڕیار بوو بێنە ئەوێ، تۆپ باران لەسەر ئەوێ چڕبوو تۆپەكان لە نزیكت دەكەوتنەوە. هەر بە سوتفە شەهید نەدەبوی كەچی ڕاهاتبووی

هیچ مەترسیت نەبوو، ئەتوت: زۆر دەمێکە لە ناو شەڕو شۆڕدایت.

بنکەکانی قەندیلمان بڕی، چووینە شاری سەقز بۆ چارەسەری نەخۆشی و ماوەیەکیش لەوێ ئارامت گرت، ویستت بخوێنی و هەوڵیشتدا بەڵام دڵت هەر لای سەنگەرو خاکەکەت بوو.

ڕۆژگار بۆ ئێمە خراپ سوڕان بەرەو پاکستان و بارەگای ( U.N ) رەومان کرد، کەبەداخەوە ئەوەی ئێمە ویستمان وەهانەبوو هەرچەندە ئاوارەش بوین هەرچیت دەکرد ڕام نەدەبوی لەگەڵ ئەو بارودۆخە نا لەبارەدا، تۆش چاوەڕێی دەرفەتێك بویت.... تا هەلت بۆ ڕەخسا کە ڕاپەڕینی جەماوەری خەڵکی کوردستان بڵێسەی بەرزبۆوەو ئاگری ڕق و کینەو تۆڵەی خەڵکی ئەشکەنجە دراوی کوردستان لاشەی داگیرکەرانی سوتاندو داروبەردی بەسەریەکدادا. هێزی جەماوەری گەلەکەمان دەسەلاتی گرتە دەست، تۆ زۆرت پەلەبوو حەزت دەکرد کات ژمێر زووتر بگەڕێتەوەو نەت دەزانی چۆن هەڵفڕی و لەسەر لوتکەی پیرەمەگروون و چەم و دۆڵی چەمی ڕەزان بنیشیتەوەو یادی ڕۆژانی ئەنفالە بەد ناوەکە بکەیتەوە.... وەکو مار هەر گێنگڵت ئەدا، خۆت سازکردو بەڕێ کەوتی قوڵپی گریان قورگی گرتبووی دەستت کردە ملم ماڵئاوایی یەکجاریت لێ کردم. ئەژنۆم نەهات بەدوامدا بێم لەوێستگەی شەمەندەفەر بەڕێت بکەم، تەنها بە یەك ماچ و لێوچێ فرمێسك ماڵ ئاوایم لێکردی...

گەیشتیتەوە گەرمیان و کوێستانی کوردستان، دوای چەند هەفتەیەك زیندانی لە قۆناغەکانی گەڕانەوە نامەت بۆ ناردین لەسەر وەزعی سیاسی و ئابوری و کۆمەلایەتی کوردستان. شتت بۆ نوسیبوین زۆر دڵت خۆشکردم، پێموابوو دڵم لە کوردستان خەبات دەکاو جەستەیشم لە پاکستان بەندە، پێم خۆشبوو کە زەماوەندیشت کردو ناوی نەوەکەشت بەجێ هێشت بەناوی ( مەردین )...

بەڵێ پاش خۆشت مەردین چاوی بەڕۆژگاری کوردستاندا هەڵ هێنا، بەلام تۆی نەبینی و ئەویش وەك ئەو هەزاران ڕۆڵەی کوردەی باوکیان لە پێناوی کوردستاندا شەهید بوون و ئێستایش چاوەڕوانی بەرهەمی خوێنی باوکیانن کە بریتییە لە کوردستانێکی ئازادو ژیانێکی خۆش بۆ هەمووان.

تۆش هەڵۆ ئاسا بویت و بۆ مەرگیش ئاوا بە پەلە بویت و لە تەمەنی ( ٢٣ ) ساڵیتدا لە ڕێکەوتی ( ٧/ ٦ / ١٩٩٤ ) بە نارنجۆکێك دڵە هیوا دارە گەشەکەت لە

لێدان کەوت و ئێمەیشت جێهێشت.

زۆرت لێ ڕازی بووم، نە ئەبوو وەها زوو مەیدانی تێکۆشان جێ بهێڵی، پەلەت کردو ڕۆیشتی گەردنت ئازاد بێ، سەد هەزار جار سڵاو لە گیانی پاك و وەفاداری و دڵسۆزیت بێ، تکایە سڵاومان لەگەڵ خۆت بەرە بۆ بارەگای شەهیدانی ڕێگای ئازادی کوردستان و مرۆڤ دۆستان.

دەبنوو چاوەکانت لێك بنێ، خەوی خێرتبێ، منیش هەر کاتێ هەڵۆیەکم لەکاتی فڕیندا ببینی دێتەوە یادم کەتۆش هەڵۆ بوویت.

## کارەکتەرەکان

١)حیکایەتخوان

٢)مستەجوون

٣)مستە ئیڤان

٤)دەنگی ئازادی

٥)کەسی یەکەم

٦)کەسی دووەم

٧)کەسی سێیەم

٨)کەسی چوارەم

٩)پاسەوانی یەکەم

١٠)پاسەوانی دووەم

١١)پاسەوانی سێهەم

١٢)پاسەوانی چوارەم

# شەهید مەریوان لەچەند دێڕێکدا

لەبەهاری ساڵی (١٩٧٢) لەگەڕەکی جوت قاوەی شاری کەرکوك، چاوی بەدنیای پڕ لەکێشمەکێش و ئازارو خەبات و فیداکاری هەڵهێنا.

لەتەمەنی شەش ساڵی واتە ساڵی (١٩٧٨) نێردرایە قوتابخانە لە (امام قاسم)ی سەرەتایی.

لەساڵی (١٩٧٩) بەهۆی پاڵەپەستۆی دوژمنەوە، بۆسەر خێزانەکەیان،ماڵیان لەهەناوی کوردستان شاری کەرکوکەوە گواستیانەوە بۆ گوندی (عەسکەر) شوێنی لەدایکبوونی باوك و باپیرانی.

بۆ بەردەوام بوونی لەسەر خوێندن ڕێگای دوو سەعات بەپێ ڕۆیشتنی دەبڕی، لەگەڵ منداڵانی گوندەکەیان بۆ شارۆچکەی ئاغجەلەرو چەند ساڵێکیش لەوێ خوێندی تا سیخوڕەکان لەوێش تەنگیان پێهەڵچنی، بەهۆی جموجووڵی پێشمەرگەوە لەدەوروبەری خۆی و ناوچەکەیان.

لەساڵی ١٩٨٤ بەنهێنی نێردرایە شاری سلێمانی و لەماڵە خزمانیدا ژیانی بەسەر دەبردو، ڕۆژانەش دەچووە قوتابخانەی ناوەندی و پۆلی یەکەمی تەواوکرد. لەناوەڕاستی ساڵی خوێندنی پۆلی دووەمی ناوەندی بواری پێنەدرا خوێندن تەواو بکات، بۆیە بۆ دواجار بەناچاری سلێمانی بەجێهێشت و بەرەو شاخ هاتەوە.

لەساڵی ١٩٨٦ بوو بەپێشمەرگەو کۆششی کرد ببێتە جێگای بڕوای خەڵکی و بڕوانامەی دڵسۆزی ئەوان وەربگرێ.

لەهێرشە کاولکارییەکانی بەناوی(ئەنفال) بۆ سەر ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستان، مەریوان لەگەڵ سەد پێشمەرگەدا لەچەمی ڕەزاندا ئابلۆقەدران کەزیاتر لە(١٥ـ ٢٠) هەزار جاش و سەربازی دوژمن بوون.

حەفتاو پێنج ڕۆژ زیاتر لەچەمو لەدۆڵ و کاوە شاخ و لوتکەی پیرەمەگروونی سەرکەشدا ژیانیان بردەسەرو، لەو باردۆخە سەخت و دوژارەدا، مەریوان توانی بڕوانامەی پێشمەرگایەتی بەدەست بهێنێ، ببووە جێگای ڕەزامەندی برادەرەکانی.

لەبەرچاکی و دڵسۆزی کرایە عدد جیهازی راکاڵ کەلەو ڕۆژانەدا زۆر گرنگ و

پێویست بوو، بۆ پارێزگاری نهێنی، چونکە لەهەموو دەشتەکانی شوانو سالەییو شێخ بزێنیو قەلاسێوکەو سورداوو بازیاندا بەدەگمەن پێشمەرگەی تێدامابوو.

مەریوان سەرەڕای ئەوەش سەرپەرشتی جیهازە هۆکی تۆکیەکانیشی گرتبووە ئەستۆو، لەڕۆژێکا چەندجار بەلوتکەی بالابەرزا هەلدەکشا بۆ چاودێری جموجوولی هێزەکانی دوژمن لەهەر چوارلاوە.

بۆیەکەمجار لەشەڕی رۆژی ١٩٨٨/٧/١٤لەگوندی کەلەشێرەی چەمی رەزاندا، بەشداری شەڕی کردو دەورێکی ئازایانەی بینیو گورجو گۆلانە هەوالی قۆلە جیاجیاکانی شەڕی بەیەکتری دەگەیاند.

بەهۆی ئاشکرا بوونیان لەناوچەی چەمی رەزان، هێزەکانی دوژمن زیاتر کۆبوونەوەو تەنگیان پێهەلچنینو بەناچاری بەرەو بەری کۆیە بەنێوانی سەدان مۆلگاو سەنگەری دوژمندا، بەزێی گەورەدا پەڕینەوە بەرەو مەلبەندی سێ.

لە ١٩٨٨/٧/٢٠ بەبڕیاری سەرکردایەتی لەگوندی(توتمێ)وە بەرەو بنکەکانی سەرکردایەتی لەقەندیل رۆیشتینو ماوەی سالێك لەبنکەی گوێزێو نۆکانو قاسمەڕەش مایەوە.

سالی ١٩٨٩ بۆ ماوەی چەند مانگێ لەزانکۆیەکی شاری سەقز کەدەکەوێتە گەڕەکی بلوارەوە خوێندی... هەر لەو سالەشدا لەسەقز بڕوانامەی شۆفێری وەرگرت... هەروەها هەر لەشاری سەقز لەشانۆگەری (نێرگزو مەرگی هەلەبجە)شدا بەشداریکرد لەرۆلی "دکتۆر ئۆهانا".

لە٢٠/٥/١٩٩٠ بەهۆی هەندێ گیروگرفتەوە روویکردە پاکستانو لەبارەگای (UNHCR) بوو بەپەنابەر، لەوماوەیەدا توانی تایپ فێر ببێتو بڕوانامەی پێدرا. لەگەلێ ئەوەشدا دوو کۆرسی ئینگلیزی خوێند لەشاری کوێتەی لوجستان.

لەسالی ١٩٩٠ لەگەلێ ئەو هەموو پەژارەو دوورە ولاتی بێ کەسو کارییەدا توانی شانۆگەری (ئازادی ولاتی دەوێ) بنوسێت.

لەسالی ١٩٩١ پاش ئەوەی راپەڕینەکان دەستی پێکرد، ئەویش بەپەرۆشو دلسۆزییەوە گەڕایەوە کوردستان بۆ بەشداری کردنو شانۆگەرییەکەیشی وەکو نۆبەرە بۆ ئێمە بەجێهێشت.

لەماوەیەکی کەمدا دەکرێ بەلێپرسراوی سیاسی ناوچەی چەمچەمالێو لێپرسراوی رێکخستنی پاسۆك لەشاری کەرکوك.

لەسوپای نوێی حکومەتو پەرلەمانی کوردیدا لەهێزی (وحدە القتال) دەکرێ بە(مقدم) هەر لەو ماوانەدا سەرپەرشتی ئیزگەی پارتی دەکاو هەندێ وتاری سیاسی دەنوسێ.

پێش شەڕە ناوخۆییەکەی (١٩٩٤/٥/١) بەچەند مانگێ زەماوەندی ژنهێنان دەگێڕێو لەگەرمەی شەڕە ناوخۆییەکاندا خۆی پەنا ئەدا بۆئەوەی بەشداری تێدا نەکات.

لەرۆژی ١٩٩٤/٦/٧ لەشاری سلێمانی بەنارنجۆکێك دڵە گەورەکەی بەسۆزی کوردایەتی دەپێکرێو دەچێتە ریزی شەهیدانی گەلەکەمانەوە.

# ئازادی وڵاتی دەوێت

حیکایەت خوان: بەڕێزان خۆشەویستان ئازیزان خۆش هاتن سەرچاوان، بۆ بینینی دراماکەمان ئەزانن و نایزانن ئەبیستن و نەبیستراوە... دراماکەمان لەبابەت ئازادی گەلە ستەم دیدەکەمانەوەیە... باسەرتان نەیەشێنم چاکتر وایە خۆتان بچنە ناو ڕووداوەکانەوە، دووبارە بەخێربێن بۆ شانۆگەری (ئازادی وڵاتی دەوێ)... شانۆگەرییەکەمان لەسەر ڕێبازی شانۆی هەژار پێشکەشدەکرێت ئێستایش ئێوەو شانۆگەری ئازادی وڵاتی ئەوێت.

ئیڤان: (لەسەر کورسییەك دانیشتووە، زۆر بەسەرگەرمی خەریکی خواردنەوەیە، دەستێ جلی خۆرهەڵاتی لەبەردایە. مێزێکی لەبەردەمەوەو گۆیەکی نەخشەی جیهانی لەبەردەستایەو خەریکیەتی.. مستەر جون دێتە ژوورەوە، زۆر شادمانە بەگەرمی چاکو چۆنی لەگەڵ ئیڤان دەکات).

جون: هەلەو مستەر ئیڤان وەزعت چۆنە؟

ئیڤان: باشە (سەری شۆڕدەکات و چەناگەی لەسنگی گیر دەکات).

جون: چیە چاك نات بینم.. خۆ هیچ ڕوونەداوە؟ دونیا بەگەورەیی خۆی بەرمن و تۆ کەوتوە، ئیتر چیت ئەوێ مستەر ئیڤان.؟ ئەگەر هەڵیە بۆ ئاسمان دەکەی بابزانم بۆ ئەوەی بێبەش نەبم؟

ئیڤان: (بەساردییەوە لەشوێنی خۆی هەڵدەستێ) ئای مستەر جون چەند بێ ئاگایت تۆ ئاگات لەچییە مستەر جون.

جون: بۆ..؟! هیچ ڕوویداوە کەمن نەم زانیبێ؟

ئیڤان: بەڵێ: لەگەشتەکەی دوێنێمدا کەوتم بەسەر جەنجاڵێکدا، سەرەتا نەمزانی چییە، بەڵام پاشان بۆم ڕوون بووەوە کەمیلەتێکن ناویان کوردە.

جون: کورد... بەڵام بۆ؟ ئێمە نەمان زانیوە ئاە.. لەوانەیە لەم لاولا هەندێك لەخۆیانەوە کۆ بوبێتنەوە بڵێن: ئێمەیش میللەتین.

ئیڤان: مستە جون پێناچێ تازەبن، ئەمانە زۆر کۆنن شوێنەواریشیان دیارە،

لەوانەیە لەپێش ئێمەیشدا هەبووبن بەس دوورە پەرێزن.

جون: ئێ مستەر ئیڤان، قسەت لەگەڵیانکرد یان نە؟

ئیڤان: بەڵێ (فلاش باگ بۆ گەشتەکەی ئیڤان)

دیمەنی دووەم

چوار ئەکتەر لەسەر شانۆ روو لەیەك، پشت لەجەماوەر لەشوێنی خۆیان وەستاون، ئەکتەرەکان سەروقات جلی کوردیان لەبەردایە. مستە ئیڤان دێتە ژوورەوەو زۆر بەوردی سەیری هەرچواریان دەکات و لەبەرخۆیەوە دەڵێت:

ئیڤان: ئەها.. ئەمانە چین و کێن چەند بەهێزن! چۆن یەکیان گرتووە!!!!

باشە بۆچی تاکو ئێستاکە ئێمە نەمان زانیوە هەن.؟ تازەش نین نەخێر... ئێ خۆ ئێمەش وەکو ئەوان واین کەچی گشت جیهان کرنوشمان بۆ دەبەن، ئەگەر بیربکەنەوە ئەوا ژیانمان لەمەترسی دایە، جگەلەوەش لەساماندار دەچن، نازانم بۆچی هیچ سوودێکیان لێوەرنەگرتووە.؟ باشە من چیبکەم کارێکی وا بکەم بیان کەم بەلایەنگری خۆم و هەرچی سامان و خێرو بێریشیان هەیە بگەڕێتەوە ناو گیرفانی خۆم.؟ مستەجون ئەوسا باهەر ئاسنی سارد بکوتێ، خۆ ئەگەر بەتەنیا بۆم چارنەکرا ئەوسا چارنییەو (جونی)ش شەریکدەکەم و پیلانیان بۆ ساز دەدەین بەڵام نا.. نا.. نا پێموایە ساویلکەن، پێویستم بەجون نابێ نا.. دەبابڕۆم خۆم تاقی بکەمەوە) (ئیڤان نزیك چوار ئەکتەرەکە ئەبێتەوە) رۆژ باش.

هەرچوار ئەکتەرەکە بەیەك دەنگە وەڵامی ئەدەنەوە: رۆژباش بەخێر بێیت.

ئیڤان: حەز ئەکەم هەندێك پرسیارتان ئاراستە بکەم ئەتوانن وەڵامم بدەنەوە.

ئەکتەرەکان: بەڵێ.

ئیڤان: هاتووم بزانم ئێوەکێن و چین.

ك١/ بۆ نامان ناسی؟! (کەمێك بێدەنگی)

(بەتوڕەییەوە) چۆن ئەبێ نەمان ناسی!

پێویستە لەسەر هەموو کەس بزانێ ئێمە کێین.

ك٢/ ئێمە کوردین.

ئیڤان: (لەبەرخۆیەوە) کورد... باشە خۆشحاڵبووم، پێم خۆش بوو هەندێ مێژووتان بزانم، ئایا هیچ یاداشتێکی مێژوویتان هەیە کەبتوانم بیخوێنمەوە؟

ك٣/ پێویست ناکات مێژوو خۆمان بینوسین، چونکە نەنگە، پێویستە خەڵك

بۆمان بنوسیّ خراپەمان نییە چاکەشمان شورەییە، خۆمان باسی بکەین، پێوانەی زەویش هەر کەسێك ئەیەویّ بابێتو بیپێویّت.

ئیڤان: باشە ئەتوانن شتێکیتر!

ك٢/ فەرموو بزانین ئەمەیان چییە.

ئیڤان: وەرن هاوکاریم بکەن.. دیارە ئێوە زۆر شتتان هەیە بیدەن بەمن، منیش بەپێی توانا کارتان بۆ دەکەم، یەکێکیش بەگژما هات ئێوە بەگژیا بچن. یارمەتیم بدەنو هەرکەس وتی: سەربەکێن بڵێن: ئیڤان چونکە من زۆر کەس لێم ئەترسیّ.

ك٢/نەخێر ئێمە قەت تێکەڵی کەس نابین، کاری خۆمان ئەکەین، تابتوانین یەکێکیش زیانی بۆمان نەبوو زیانمان بۆی نابیّ.

ئیڤان: راستەکەی بەڵام نەوەکو چاو چنۆكو هەلپەرستێك بوونو نەبوونتان زەوت بکا.

ك٤: کەس نییە بەزۆر سوود لەئێمە وەربگرێت، ئەگەر ئێمە سوود وەرنەگرین هەرگیز رێگا نادەین کەس قسە بکات.

ئیڤان: (بەتوورەییەوە) بەڵیّ سوود وەرئەگرنو ئەوکاتەش ناچار ملیان بۆ کەچ ئەکەن.

ك٤/ (زۆر لەوتورەتر) ئێمە خاوەنی قەندیلو هەڵگوردو ئاش داغین، ئەوانە قەت مل کەچ ناکەن، ئێمەیش تاماوین چاو لەوان ئەکەین.

ك١/ بۆ ئێمە ئەکەن بەخەڵکی ترو ئەتانەویّ دامان نێنو سەرتان بۆ شۆڕکەین، هەرچییش بڵێن ملکەچی فەرمانەکانتان بینو هەرچیشمان هەیە بیبەن.

ئیڤان: (کەمیّ ترس ئەکەوێتە بەریو لەبەرخۆیەوە) ئەمانە زۆر کەللەرەقن، بەڵیّ... بەڵیّ راست دەکەن قسەی ئێوە وایە، بەڵام من وەك برا پێتانم وت ئێستاش ئەڕۆم لای ئێوەم خۆش.

ئەکتەرەکان ـ خواحافیز( دەست ئەکەن بەسوڕانەوە، یەك لەدوای یەك ئەچنە پشت کەوالیسەوە، سەر شانۆ خاڵی دەبیّ).

حیکایەت خوان: بەڕێزان خۆشەویستان لەخۆبایی بوونو خۆبەزلزان چرای بیرکردنەوە ئەکوژێنێتەوە، گویّ لەکەس نەگرتنو دڵسافی تووشی هەزاران هەڵدێرمان دەکات.

(کۆتایی فلاش باگ هەر بەردەوامن لەگفتوگۆ)

ئیڤان: مستەر جون قسەکردن بێسوودبوو لەگەڵیان، چونکە زۆر کەللەڕەقن، هەرچەند ئەملاولامکرد لەگەڵیاندا بەلاّم هەربێ سوودبوو.

جون: (بەپێکەنینەوە) ئینجا چیت بۆ بکرێ هەر لەئەمڕۆ زووتر نییە ئەچین و دەستیان تێوەر ئەدەین، تکام وایە بەهیچ جۆرێك خۆت سەغڵەت مەکە.

ئیڤان: ئەوە تۆ ئەڵێ چی.؟ وابەئاسانی دەستەمۆ ناکرێن، چونکە وەك من بینیمن نازانم تاکو ئێستا قسەم لەگەڵ کردبێ بەو جۆرە نەبووە.

جون: ئەتوانم بیانبینم؟

ئیڤان: ئا بەلاّم بێسوودە.

جون: مستەر ئیڤان چاوەکەم تۆ وا زوو ساردمەبەوە، ئەگەر نەهاتنە ژێربار ئەوە دوو چەپۆکیان بەسە.

ئیڤان: چی چی.؟ چاك بزانە هیچ کامێکمان وەك ئەواننین، چونکە زۆر بەهێز دیارن، باوەڕیشت بێ ئەوانەنین کەلەوەوپێش دیوتن.

جون: باشە مستەر ئیڤان وەك چەك چیان هەیە... ها؟

ئیڤان: ئەم پرسی زانیاریشم لەسەریان نییە، چونکە مۆڵەتیان نەدام، بەلاّم بەقسەکانیان وادیارە کەچەکی وایان هەبێ منۆتۆ لەخەویشدا نەمان دیبی.

جون: (ترس دەکەوێتە بەری و ڕەنگی تێکدەچێ) باشە ئەگەر وابێ ئەبێ فریایی خۆمان بکەوین، ئەگەر فریای خۆمان نەکەوین وەزعمان زۆر خراپ دەبێت.

ئیڤان: ئێباشە چۆن بیر لەم گیرو گرفتە ئەکەیتەوە؟!

جون: وەکو تۆ باسی دەکەی من سەرم لێهاتۆتەوە یەك، هیچم لانییە، بەلاّم تۆ بینوتن چ زانیاریەکت لەسەریان هەیە من ناتوانم هیچ بڕیارێك بدەم.

ئیڤان: من پێموایە بەهەراو هوریا هیچمان بۆ ناکرێ لەگەڵیاندا.

جون: ئەی چی بکەین باشە؟

ئیڤان: چاك وایە بیرێك بکەینەوە(تۆزێك رامان)بەپارە هیچمان بۆ ناکرێ؟ بەلاّم لەوەش چاکتر ئەوەیە زۆر سادەو دڵساف دیاربوون گەر کارێکی وابکەین بەڕامیاری لەیەکیان دابڕین.

جون: دەکاکە گیان بۆ ئەوەی زیاتر زانیاریمان لەسەریان هەبێ بڕۆ بگەڕێ، هەرچیت دەستکەوت دەربارەیان کۆی کەرەوە، منیش خۆم لای خۆمەوە هەوڵئەدەم.

دیمەنی سێهەم

(جون لەسەر کورسییەك دانیشتووە، مێزێك لەبەردەمیەتی خەریکی پکشنینی پەڕە کاغەزەکانی بەردەمیەتی، ئیڤان بەخێرایی خۆی دەکا بەژووردا)

ئیڤان: هەلەو مستەر جون.

جون: هەلەو مستەر ئیڤان، چیت کرد هیچن دەستکەوت.؟

ئیڤان: براگیان زۆر گەڕام بەڵام هیچم دەستنەکەوت.

جون: منیش هیچم دەستنەکەوت، بەڵام بابچین بۆ لایان.

ئیڤان: بابچین بەڵام دەزانم هەر بێسوودە.

جون: تۆ بابڕۆین خۆ هیچمان لەکیس ناچێ.

ئیڤان: بەس بۆ ئاگاداریت زۆر ساویلکەن ئەبێ لەزمانیان بزانی.

حیکایەت خوان: بەڕێزان کوردپەروەران بەسوودوەرگرتن لەدڵسافی و خۆش باوەڕی ئێمە دەیانەوێ کەڵبەی ژەهراویان گیرکەن لەسینەی ناسکی وڵاتە خنجیلانەکەمان، بەدوای هەزارو یەك تەڵەکەی جۆراوجۆردا دەگەڕێن.

دەنگی ئازادی: (یەکە یەکە بەسەر هەرچوار ئەکتەرەکەدا دەگەڕێ، بەرگێکی فریشتە ئاسای فشی لەبەردایەو ریشێکی سپی درێژی هەیە، پاشان وردە وردە ئەڕواتە پشتی شانۆ جون و ئیڤانیش لەلایەکیترەوە دێنە سەر شانۆ)

جون و ئیڤان: (جون و ئیڤان نزیکی چوار ئەکتەرەکە ئەبنەوە) رۆژتان باش.

چوار ئەکتەرەکە: (هەریەك بەدەنگێکی جیاوازو نەشاز رۆژتان باش

ك٣/فەرموو چیتان ئەوێت.

جون: تەنیا حەزمانکرد ئێوە ببینین، چونکە حەز بەهاوکاریتان دەکەین، ئێوەمان خۆشدەوێ.

ك٣/ئەوەی ئێمەی خۆش بوێت لەسەر چاوانمان دایئەنێین فەرموون.

جون(لەخۆشیانا وەختە شاگەشکەبێت، پێی زەوی ناگرێ بەئاسایی خۆی لەئیڤان نزیك دەکاتەوە) لەوانەیە قسەکەی تۆ بێت چونکە ئاسایی و دڵساف هاتنە پێشەوە.

ك١/(لەجون نزیك دەبێتەوە) ئێوە چیتان هەیە بۆنی خۆش بێت؟

جون: وەك چی قوربان؟

ك١/وەك گوڵ، ئێستا من هەموو کات بۆنم خۆشە، چونکە زۆر رەنگ و جۆری

گوڵم هەیە، بەتایبەت نێرگزم لاخۆشترە چونکە کاتێ بۆنی دەکەم گیانیشم سەوزە.

جون/بەڵێ...بەڵێ قوربان ئەوە راستییەکە ناشاردرێتەوە، کەئێوە زۆر شتی نایاب و جوانتان هەیە، ئەو شتانە لای ئێمە دەستناکەوێ.

ئیڤان: باشە ئەوانی تریش گوڵیان هەیە، یا بۆنیان وەکو تۆ خۆشە؟ من پێموایە گوڵەکانی تۆ بۆنیان لەوانیتر هەر زۆر زۆر خۆشترە.

ك١/بەڵێ گوڵیان هەیە بەڵام ئەوەی من رەنگی جوانترو بۆنیشی خۆشترە.

ك٢/(گوێی لێدەبێ و نزیك دەبێتەوە) نەخێر وانییە نێرگزی جوان لای من هەیە.

ك٣/ساڵی پار گوڵی من لەگشتی جوانتربوو، ئەم ساڵیش هەروادەبێ.

ك٤/نەخێر ئەبێ گوڵی من لەگشتی جوانتربێ، چونکە ساڵی پار هات و رۆیشت خزمەتم کرد.

دەنگی ئازادی: (هاوار ئەکات) نەخێر وانییە، بۆ وا لەخۆتان ئەکەن.؟ گوڵتان وەك یەك وایە، نێرگزتان بۆنی وەك یەکە. یەك رەنگی هەیە، هەموو لەیەك خاك رواوە، لەیەك سەرچاوە ئاودراوە، پارچە پارچەی مەکەن سیس و ژاکاوی مەکەن.

چوار ئەکتەرەکان: (دەست بەسەریانەوە دەگرن و مۆسیقایەکی جارسکەر دەبیسترێ، نیشانەی گێژبوونە، دەخولێنەوە بەدەوری خۆیاندا جون و ئیڤان ئەرۆن)

حیکایەت خوان: بەڕێزان فێڵبازو چاوچنۆك لەهەموو لایەکەوە چاوی تەماحیان بڕیەوتە ولاتەکەمان، تاکە چەکی دەستیشیان ناکۆکی و دووبەرەکییە لەریزەکانماندا بیچێنن.

دیمەنی پێنجەم

(ئیڤان و جون خەریکی قسەکردنن)

ئیڤان: مستە جون وەك پێم وتی: زۆر ساویلکەن وانەبوو؟

جون: بەڵێ منیش ئەزانم، بەڵام چارچییە منیش چاوم پێیان کەوت هەمان رای تۆم هەیە، بەڵام.

ئیڤان: بەڵام چی مستەر جون.؟

ك٢: لەئیڤان نزیك ئەبێتەوە ئەوە چییە؟

ئیڤان:(بەتوندی ئاوڕێکی لێئەداتەوە)

ئەڵێ: من بۆنم لەگشتی خۆشترە واتە لەتۆش.

ك٢:(بەتوڕەییەوە) چۆن قسەی وادەكات من رازی نابم.

ك٣:(هاوار ئەكات) كەس نییە بۆنی لەمن خۆشتربێ (هەریەك لەئاستی خۆیەوەو لەبەرخۆیەوە باسی جوانی خۆی ئەكا، ئیڤان و جونیش هەرخەریكی پیلان گێڕانن. بەبن گوێی ئەكتەرەكانا فسكە فسكیانە، چوار ئەكتەرەكە لەیەك نزیك ئەبنەوەو پەلاماری یەكتر ئەدەن)

ئیڤان: نا.. بووەستن (هەموویان دەوەستن و بێدەنگ دەبن) ئێوە راستە بۆنتان خۆشە، بەڵام هەیە زیاتر، هەیە كەمتر (روویان تێئەكا) وانییە؟

ك ١: من بۆنم زۆر خۆشە.

ك: كەس نییە بۆنی وەك من خۆش بێت.

ك٣: من لەهەمووتان بۆنم خۆشترە.

ك٤: ئێ خۆ بەدەمی خۆتان نابێ.

جون: زۆر چاكە من جێگاتان بۆ دیاری دەكەم، هەركەس لەجێگای خۆی بێت( ئیڤان قسەكەی پێ دەبڕێ و دەڵێ)

ئیڤان: مستەر جون راستەكات، چونكە هەر چوارتان كەبەیەكەوەبن بۆن خۆشی كەستان دەرناكەوێ.

جون: بەڵێ وایە، دووەم ئەمانەوێ بزانین كامتان زیاتر بۆنی خۆشترەو جوانترە، ها ئەڵێن چی؟

چوار ئەكتەرەكە بەڵێ رازین.

جون:(لەخۆشیدا بەشۆكابوو، هەر بەدەوری خۆیدا ئەهات) دەباشە بادەست پێبكەین، بۆ ئەوەی ئێوە بەزووترین كات لەم گیروگرفتە رزگار بكەین و هەرچەندە ماندووش دەبین، بەڵام بۆ ئێوە بەخەسار ناچێ. بەڵام شتێكی تر ئەگەر چەك و شتی واتان هەیە بماندەنێ چونكە بارووت كار لەبۆن خۆشیتان دەكا.

ك١: وەڵا چاك بوو باستانكرد من یەك دوو دەمانچەم هەیە.

ئیڤان: (بەپەلە روودەكاتە ئەوانیتر) ئەی ئێوە؟

ك٢: من یەك ساچمەزەنم هەیە.

ك٣: منیش حەوت تیرێكم هەیە.

ك٤: منیش هەمە بەڵام نازانم لەكوێیە.

جون: چییە زۆر گەورەیە؟ چەند مەتر ئەڕوات؟ لەكوێ دروستتكرد؟

ك٤: نازانم، بەلاّم ماوەیەکی زۆر شکارمان پێدەکرد، ئێستا زۆر بێکەڵکبووە، ژەنگی هێناوەو منیش ئەوەندە گوێم پێنەداوە، ئێستا نازانم هەر لەکوێیشە.

جون: (تێگەیشت کەهیچ نییە) دەباشە گرنگ نییە.

ك١: چۆن خراپ نییە بۆمان؟

ئیڤان: نا ئەوەندە زیانبەخش نییە لەوێش بێت ئاسانە.

جوون: باشە ئێمە باوەڕت پیٚ بکەین؟

ك٤: بەلٚیٚ قوربان، بەلٚیٚ دلٚنیابە ئێمە هەرگیز شت لەکەس ناشارینەوە.

جون: باشە بادەس پێبکەین (پارچە گەچێك دەردەکاتو چوار هێلٚ ئەکێشێت) ئێستا کارمان تەواو، ئێمە ئەڕۆین ئێوەش لەشوێنی خۆتان نەجولێن بۆئەوەی بزانین کامتان بۆنی خۆشترە.

حیکایەتخوان: بەڕێزان کار لەکارترازا، میلەتەکەمان تووشی زامێکی قووڵبوو، زامی لەیەك دابڕین، بەتیغی تیژی دووژمن پارچە پارچەکرا، بەلاّم داخم ناچیٚ بەبیٚ ئەوەی بەخۆمان بزانین...

(دیمەنی حەوتەم)

(چوار ئەکتەرەکە لەشوێنی خۆیان گفتوگۆیانە)

ك٣: من وەك وتم: کەس بۆنی لەمن خۆشتر نییە.

ك٤: وەلّلاٚ (ئەیەوی جوابی بداتەوە ك١ نزیکی خەتەکەی ئەبێتەوەو قسەکەی ئەبڕیٚ) بڕۆ ئەولاوە نەیەیتە سەر خەتی من، ئەمە سنووری خۆمە تێگەیشتی.!

ك: وەلّلاٚ خەتەکەی من زۆر جوان کێشراوە (ئیڤانو جون دێنە ژوورەوەو چوارکەسیان لەگەڵدایە)

جون: (بەدەنگی بەرز) بۆئەوەی بزانین کێتان بۆنی خۆشترە کەس فێلٚ لەویتر نەکات، هەریەك خاوەنی خۆتان ئەدەینیٚ ئەمانە ئەتان پارێزنو ئەشتوانن بەمانی بسپێرن خۆتان هەردانیشن.

ك٣: زۆرچاکە (لەپڕ دەنگی ئازادی هاواردەکات بەپەشۆکاوی دێتە سەر شانۆ بەدەوریانا ئەسوڕێتەوەو دەڕواتەوە پشت کەوالیس... دەستیٚ جلی رەشی لەبەردایە).

(دیمەنی هەشت)

(شانۆ رووناکە چوار ئەکتەرەکە سەریان داگرتووە هەریەکە پاسەوانێکی

بەدیارەوەیە)

ك١: (سەرهەڵدەبڕیٚ‌و نزیکی ك٤ ئەبێتەوە)

چۆن بدوێیت؟ بۆنت خۆش نەبوو؟ (ك٤ سەرهەڵدەبڕیٚ)

ك٢: (بەئاگادێتەوەو ڕوودەکاتە ك٤و دەڵیٚ )بۆ دەهێڵی بێتە خاکتەوە، ئەوە ئەیەویٚ بۆن خۆشییەکەی تۆ بۆخۆی بەریٚ وادیارە زۆر لەتۆ ئازاترە.

ك٤: (تورە ئەبێت‌و پاڵێك بە ك١ ەوە ئەنێت) بڕۆ جارێکیتر نەیەیتە سەرخاکم تێگەشتی.! (پاسەوانەکان دەم ئەهێننە لای گوێی یەکتردا تەگبیر دەکەن) پ١ دارێك ئەدا بەپشتی ك١ دا) جوان دانیشە مەجوڵێرەوە (ئەوانیتر هەڵئەستن لەسەر کەسی ١ بکەنەوە واتا ك٤ ٣ ٢ پاسەوانەکان دەستیان ئەگرن‌و ئەڵێن).

پ٣: ئێوە دانیشنەوە ئەزانن بۆ لێی ئەدا؟

ك٢٣٤ (هەر یەکێك بەدەنگێك) نەخێر بۆ لێی ئەدا؟

پ٣: لەبەرئەوەی لەژێرەوە هەر قسەی ناشیرین بەئێوە دەڵیٚ، هەر باسی جوانی و ئازایەتی خۆی ئەکات.

ك٤ ٣ ٢ یارەبی دەستان خۆش بێت ( تێکڕا دائەنیشنەوە) (پاسەوانەکانی تریش دەچن‌و لێی ئەدەن ئیتر لەو ڕۆژەوە دەبێتە پیشەو هەر ڕۆژە لەیەکێکیان ئەدەن و ئەوانیتر پێی پێدەکەنن).

(دیمەنی نۆهەم)

پ١: زۆر چاکە ئێستا وامان لێکردوون زۆریان ڕق لەیەکە.

پ٢: لەوە سەیرتر گیانی یەکێکیان بکشیت ئەوانیتر پێی پێئەکەنن.

پ٣: جیا جیا زۆر قسەی گەورەو سیاسیانەش ئەکەن، ئەگەر بهاتبایەو یەك بونایەو وا دانەئەنیشتن، زۆرجاریش گۆرانی ئەڵێن. بەڵام سەیرە پێئەچیٚ زمانی خۆیان لاخۆش نەبیٚ. هەر زمانەکانی ئێمە؟ بەکاردێنن وابزانم یەکێکیان زمانی لەبیرماوە ئەویش فێری زمانەکان نەبووە، ئازایەتی خۆی نییە. باشە بۆنایەی تاقیان بکەینەوە، بزانین کامیان زمانی خۆیان لەبیرماوە یابەکاری دێنیٚ. بەزمێکیان پیٚ دەگێڕین دەی بابڕۆین.

دیمەنی دەهەم

(چوار ئەکتەرەکە دادەنیشن، پاسەوانەکان دێن تەسجیلێکیان بەدەستەوەیە)

پ٣: براینە ئەمانەویٚ ئاهەنگێکتان بۆ بگێڕین، هەروەها ئەمانەوێت بەڕێزتان

بەشداری تێدا بکەن.

چوار ئەکتەرەکە هەریەکە چەپڵە لێئەداو یەکێك چەقەنە هەموویان بەشادمانیەوە وتیان: ئێمە ئامادەین.

پ٣: (تەسجیلەکە ئەباتە بەردەستی چوار، گۆرانییەکی تورکی ئەخاتە سەری دەسئەکا بەسەماکردن، بەدەوری خۆیدا ك٣ گۆرانیەکەی عەرەبی، بەهەمان شێوە دەست دەکا بەسەما ك١ گۆرانیەکی کوردی ئەخاتە سەر، بەلآم زوو ئەی کوژێنێتەوە)

ك٢ ٣ ٤ (بەدەنگێکی بەرز پێی پێدەکەنن)

ك٤ : بەخوا دواکەوتووە: نەمدی رۆژێك کەمێك لەشوێنی خۆی بجولێتەوە، ئێمەیشی شەرمەزارکردووە بەخۆیەوە.

دیمەنی یازدەهەم

(پاسەوانەکان دانیشتوون خەریکی مەی خواردنەوەن)

پ١: زۆر چاکە زۆر بەباشی مێشکیانمان شۆردۆتەوە.

پ٢: ئیتر کاتی ئەوە هاتووە کەبەیەکجاری بیانکوتین، بۆ ئەوەی خەمی پارێزگاریشمان نەبێ.

پ٣: جا پارێزگاری بۆ چییە.! خۆیان لەوێ بن بەسە بۆ خۆیان، ئەگەر بێت یەکێکیان بیەوێ رابکات سیانن، سیانی تریش قەرز ئەکەن و پای ئەگرن.

پ٤: (دەس ئەکا بەپێکەنین) بەس تۆ ئەیان ناسی رەحمەت لەباوکت (پێکەکانیان هەڵئەگرن و لەیەکی ئەدەن).

(دیمەنی دوازەدەهەم

(چوارئەکتەرەکە لەژێر ئەشکەنجەو لێداندان، گشت گانیان شکاوە، هەر هاواردەکەن، لەپڕ یەکێکیان واتە کەسی یەکەم رادەکات بۆ لای پ٤)

ك١: بەقوربانت بم هانام بۆت هێنا، هیچ چارێکم نییە شەوو رۆژ لێم ئەدا.

پ٤: زۆرباشە بەخێر بێیت، حەزمدەکرد لەپێشا قسەم لەگەڵتا بکردایا، بەلآم تاکو زۆرت بۆ نەهات نەهاتی و ئێستایش یارمەتیت ئەدەم، تۆش ئەبێ یارمەتیم بدەی هەروەها من مەرجم هەیە.

ك١: فەرموو مەرجت چییە؟

پ٤: یەك مەرجم هەیە ئەویش ئەوەیە، ئەمەی لام زۆر بزێوە هەموو کارێکی لێ

تێکداوم، تۆ ئەبێ لەجیاتی من بچی بەگژیا، بیکوژە زەرەری لێبدەو لاوازی بکە. فەرمانەکانی من جێبەجێبکە ئەوکاتە چیم بۆ بکریٚو چی لەبەرژەوەندی خۆم دەرنەچیٚ بۆتی دەکەم.

ك١: (کەمێك رادەمێنیٚ) ئاخر قوربان نازانم بڵێم چی.

پ٤: بۆ نازانی بڵێی چی "نەك دوژمنی منە بەڵکوو دوژمنی سەرەکی تۆیە، ئەگەر لەدەست من رزگاری بێت، ئەوکاتە بەیەکجاری تۆ لەناو دەبات و ئەگەر بتەویٚ بمێنیٚو ژیانت بپارێزم هەر ئەوە چارەیە.

ك١: بەڵێ باشە چارچییە.

پ٤: دەباشە هەر ئێستا ئەمەویٚ پەلاماری بدەیت دەی بزانم چیم بۆ دەکەیت.

ك١: (یەکسەر پەلاماری ك٤ ئەدات و ئەبێتە شەڕیان ك٤ لاواز ئەبێت و ئەکەوێت ك١ وازی لیٚ ئەمێنیٚو ئەچێتە لای پ٤)

پ٤: هابیٚ هێزت کرد؟

پ١: بەڵێ قوربان ئەوەتا ئەی بینیت.

پ٤: دەباشە بڕۆوە شوێنەکەی خۆت ئەزێتمان مەدە.

ك١: ئیٚ قوربان شوێنی خۆم کوێیە ئاخر ئەم کوژیٚ.

پ٤: منیش ئەوەم ئەوێت کەبتکوژیٚ، چونکە تۆو ئەو بۆ من وەك یەکن، ئێستا من ئیشم نەماوە...

پێم بڵیٚ تۆ چیت ئەویٚ بۆ ناڕۆیت.؟

ك١: باشە پەیمانی منو تۆ لەسەرچی بوو، ئەی من چیم بۆت نەکرد؟

پ٤: زۆر لەسەری مەڕۆ (یەکسەر دەستی ئەگرێت و ئەیدا بە پ١ ئەویش زۆر زۆری لیٚ ئەدات)

(لەوکاتەدا جونو ئیڤان بەلایاند تێپەرئەبنو سەیریان ئەکەن. ك١ لەپڕ پەلاماری ئیڤان ئەدات)

ك١: بەقوربانت بم رزگارمکە، پەنامان هەر ئێوەن، کاری مرۆڤانەی خۆتان دەربخەن. ئێوە وتتان بزانین کێتان بۆنتان خۆشترە کەچی واگیانیشمان رزی.

ئیڤان: بەڵیٚ منیش ئێستا ئەزانم بۆنتان خۆشە یان نا!!

جون: (بەگاڵتە پێکردنەوە)مستەر جون من ئەمەویٚ بزانم ئێستا چۆنو تاقیان بکەمەوە.. خۆ هیچیان بۆناکەم. جون: زۆر چاکە ئارەزووی خۆتە.

ئیڤان: (ڕوودەکاتە ك١ دەڵێ) باشە رزگارتان دەکەم، چونکە ئێمە هەمیشە پاڵپشتی هەژارانین (لەپڕ ك٣ رادەکات بۆلای ئیڤان)

ك٢: قوربان درۆئەکات وەزعی زۆر خۆشە، تۆ وەرە سەیری ئێمە بکە ئەو هیچ ناخۆشییەکی نییە.

ئیڤان: مستەر جون ئەم شوێنە بۆ ئەمان نەبێ بۆ کەس دەس نادات.

دەنگی ئازادی: (دێتە ژوورەوە لەسەر سەری ك٤ دەوەستێ و دەڵێ) هەستە بەخەبەربێ... کەمێك بیربکەوە... دەبا بەس بێت، هەستە تۆ دەس بکە ملی هاورێکانت... داوای لێبوردن لەیەك بکەن، هەمووتان داوای یەکگرتنەوە بکەن دەهەستە دەهەستە... دەهەستە.

ك٤: (لەگەڵ دەنگی ئازادی هەڵدەستێ و تورەیی بەدەمو چاوییەوە دیارە) ئەمەوێ قسەیەك بکەم، پێویستە گوێم لێبگرن... تاکو ئێستە ئێمە لەیەك ئەخوێنین، ئێسقانی یەکتر ئەشکێنین. وەرن بابیربکەینەوە، تاکو ئێستا چی کاری خراپمان کردووە لەمەوبەر با چاوپۆشی لێ بکەین... با لاپەرەیەکی سپی هەڵدەینەوە... لەبیرتان دێت کەلەپێشدا هەموو یەك بووین... چۆن ئەهاتن و ئەپارانەوە بەدەورمانا ئەهاتن، دەی با دەست لەملی یەك بکەین و بادەست لەناودەستی یەك کەین... دەی براینە دەست لەناو دەستی یەك بکەین (سێ ئەکتەرەکەیتر هەر لەدوورەوە وەستاون هیچ قسە ناکەن بێ جوڵان)

دەنگی ئازادی: (لەپڕ هاوار دەکات) بەس بەس چاوەڕوانی چیتانە دەی دەست لەملی یەککەن، دەست لەناو دەستی یەك کەن. هەر چاوەڕوانتان بووم کەچی هیچ، زۆر سستن زۆر لاوازن. پیرتان کردم چاوتان کزکردم، پشتتان شکاندم، هەموو شازادەیەك لەولاتەکەی خۆی بەڕوو سووری ئەژێت، تەنیا من ماوم بەڕوو زەردی. ئێستا لای هاورێکانم رووم زەردە! پرسیارم لێئەکەن ناتوانم وەڵامیان بدەمەوە، چونکە ئێوە رێکنین. بەس گۆشتی یەکتر ئەخۆن، بۆ براکوشتن لاتان ئاسان بێت و یەکێتیتان لا گران بێت؟ بۆنتان ئاوها خۆش نییە، کاتێك بۆنتان خۆشە کەهەمووتان یەك چەپك بن و بۆنتان بڕوا. بەتەنیایی بۆنتان خۆش نییە، گوڵتان جوان نییە، من وائەڕۆم نایەمەوە، تاوەکو نەبن بەیەك. شوێن بۆ من نەکەنەوە ئەگەر نە بن بەیەك هەر ئەوە جێتانە، منیش مەحاڵە بێمەوە، ئەبێ هەر ئاهم بۆ هەڵکێشن. هەستن دەست بکەنە ناودەستی یەك، ئەگەر سەرکەوتن ئەوا منیش

بەسەربەستی دێمەوە ناوتان. من وا ئەڕۆم (کەمێك ئەڕوات لەپێش کەوالیسەکەوە ئەکەوێتو دوای ماوەیەك هەڵ ئەسێتەوە، بەپەلە ئەچێتە ئەودیو (مۆسیقایەکی غەمگین ئەبیسترێ، چوار ئەکتەرەکە بەچاو سەیری یەکتر ئەکەن، دەست ئەنێنە سەر دەستییەك)

ك٣: راستە تێگەیشتم ئیتر ئەبێت خۆمان مێژووی خۆمان بنوسین، چونکە کەس نییە وەك خۆمان مێژوومان بۆ بنوسێتەوە بەبێ غەلوغەش، ئیتر پێویستە خۆمان پێوانەی زەمین بکەین، چونکە هەرکەس بۆمان بپێوێت ئەبێت لێی بدزێت ـ هەروەها دەبێ ئیتر خراپەکانمان بنوسین چونکە چاکەمان لەناوخۆماندا نەبووە.

ك٤: وابکەین ئیتر بۆنمان هەر خۆش بێت، دەرکەوت بەتەنیا هیچمان بۆنمان خۆش نییە، ناشێت بهێڵین ئیتر بۆنمان بکەن.

ك١: وتمان: نابین بەخەڵکی ترو سەرمان پێ شۆڕکەن، بووین بەوڵاغو سواریشمان بوون... وتمان: رازی نابین رازی بووینو رازیشیان کردین، بەڵام ئەبێت ئیتر هوشیار بین کەرازیمان نەکەن بۆکاری خراپە.

ك٣: وتمان تێکەڵی کەس نابین، بەڵام دووره پەرێزیو خۆ بەزلگرتن ئەمەی بەسەرمان هێنا.

ك٤: وتمان خاوەندی قەندیلو هەڵگوردو ئاشداغین، ئەوانە هەرگیز ملکەچ ناکەن، ئێمەش وەك ئەوانین، بەڵام ملیان پێکەچ کردین. ئیتر ئەبێ ئاگامان لەوان بێت، ملیان پێکەچ دەکەن (لەم قسانەدا ئیڤانو جون دینە ژوورەوە).

جون: (بەتوڕەییەوە) هەر کەسە بۆ شوێنی خۆی خەتەکانتان کاڵ مەکەنەوە، مەیسڕنەوە (چوار ئەکترەکە پەلاماریان ئەدەنو هەر کەسێ لەشوێنی دەستی بۆ درێژ دەکات).

ك١: ئەو خەتانەی کێشاوتانە بیسڕنەوە، چونکە رێگای لەبۆن خۆشیمان گرتووە... (ئیڤانو جون لەترسا بەبۆین باخەکانیان خەتەکان ئەسڕنەوە، چوار ئەکتەرەکە باوەش بەیەکدا ئەکەن).

چوار ئەکتەرەکە . الله ـ چەند خۆشە بۆنمان، دووبارە پەیمان تازە ئەکەینەوە (دەست ئەکەنە ناودەستی یەکەوە، ئەچنە دووری خەتەکان دەوەستن، کەدوور لەئیڤانو جون لەگەڵ چوار پاسەوانەکە لەسەر خەتێکیان ئەوەستن)

دەنگی ئازادی: (لەپڕ دێتە ژوورەوە کراسە سپییەکەی لەبەردایە، ئاڵایەکی

کوردستانی بەدەستەوەیەو ئەڵێ) کوڕەکانم چاوەکانم گەشبوونەوە، وانەبوایە قەت نەئەهاتمەوە ناوتانو هەرگیزاو هەرگیز بۆنتان خۆش نەئەبوو... تکام وایە هەرواش بن ئەوا منیش روزەردییەکەم لاچوو.. الله چەند خۆشە ئازادی وڵاتی هەبێت.

کوڕەکانم وەکو هەموو میللەتانی دنیا، ئەم ئاڵایەمان ئەوێت پێویستە هەمیشە رێزی لێبگرین، لەسەر سەرمان هەمیشە بشەکێتەوە... ژیانی بێ ئاڵایی و بێ وڵاتی چەند ناخۆشە (ئاڵاکە بەرز ئەکەنەوەو سرودێکی نیشتمانی گونجاو ئەبیسترێت)

## کۆتایی

پێشکەشە بە:

ئامۆزا شەهیدەکانم

(عومەر ـ عوسمان ـ نوری ـ غەریب ) کەلە رێگای ئازادی کوردستاندا گیانیان بەخشیوە.

## لەکوێوە دەست پێبکەم؟!!

وائـەزانم دوێنـێ بـوو، لەدووهـەمی هەفتاکانـدابوو کـەعێراق لەهـەوڵی خۆراتەکاندنو خۆماڵیکردنی بیرە نەوتەکاندابوو، لەدەست مۆنۆپۆڵە بێگانەکان، جـەماوەریش سـەرگەرمی بەخۆداچوونەوەو خۆسـازدانو خۆرێکخسـتن بـوون... ئێمەی هەژاریش عەودالی تیکەیەك نان بووین بۆئەوەی بژینو نەمرین.

لەناو هەناوی رەنجدەرانی کوردستانیشدا(رەوتـی) تـەوژمی خۆپـەروەردەکردنو وشـیارکردنەوەو سـازدانو رێکخسـتنی هـەژاران لـەئارادابوو، بەگـەرمیو بـەو هیوایـەی ئێمـەی کـوردیش بتـوانین بەرنامـەی کـاری خۆرزگـارکردن دابرێژینـەوە سـەرلەنوێ. کاکیشـم واتـە بـاوکی(مـەریوان) رۆژ تـا ئێـوارە پـاڵی ئـەنا بەعەرەبانـە دەستییەکەیەوە کەمیوەی رۆژانەی فرۆشگای گشتی تێدا دەسختە سەریو لەئیمام قاسمـەوە بـەرەو تسـعین شـۆردەبووەوە. کـاتێ ئێـوارە کەدەگەرایـەوە بـەرەو مـاڵ دەسـتی دەکـرد بەباخەڵیـداو رۆژانـەی ئـەدا بەمنداڵـەکانیو بەشـی نـانو پێخـۆری رۆژانەشی ئەدایـە دەسـت کابـانوی مـاڵ، واتـە گـەر رۆژانـە کـاری نەکردایـە نەمنـداڵ رۆژانەی هەبوو، نەکابانوش ماڵی پێ بەرێوەدەبرا لەبەر بێدەرامەتی.

گوزەرانمـان وەهـابوو لەلایـەك سـەرگەرمی بەدەسـت هێنـانێکی بـژێوی مـەڕیو مەمرەییو لەلایەکی تریش خەریکی گۆشکـردنی ماڵو منداڵو خەڵکانی هـەژاریش بەگیانی نیشتمان پەروەرێتیو هەوڵدان بۆ خۆسازدانو خەڵك راپەراندن.

ئـەم کوانـووە بچـکۆلانە جـۆش خـواردووە بەبـەردەوامی لەجوولانـدا بـوو، ئەمـە لەکاتێکـدا دەرامـەتی رۆژانـەی ماڵمـان لـە(٢٥٠)فلـس تێنەدەپـەری کەبـەرەنجی ماندوێتی کاکم تەواودەبوو، لەوکاتەدا مەریوان چاوی بەدنیای رۆشن هەڵهێنا.

رۆژگار دەهات و دەڕۆی، خۆماندوکردن بۆ بەدەستهێنانی ژیانی کوللەمەرگی و پەلەکردن بۆ کۆکردنەوەی زۆربەی ڕەش و رووت و زەحمەتکێشانیش لەژێر ئالأی رێکخستنی کۆمەڵەی (مارکسی - لینینی) کوردستانیدا لەوباروذۆخەدا وەهای کردبوو نەمان زانی چۆن مەریوان کەوتە سەرپێ و گڕوگرتن بەشوێنماندا بۆ دەرەوەی ماڵەوە!!

هێشتا سێ ساڵەی بەڕێ نەکردبوو، تووشی نەخۆشییەکی زۆر کوشندەی (خەناق) خنکێنەر هات، لەوکاتەشدا خێزانەکەمان لەکۆنترین دیکۆری هۆدەیەکی سەردەمی عوسمانیەکانی قەڵای شاری کەرکوکدا ئەژیاین، کەدیوی ناوەوەی زۆر لەتوونی حەمام رەشتربوو...

دەرگاشی نەبوو بەبەتانیەکی ڕەشی کۆنی سەربازی دادەپۆشراو حەوشەکەشمان زبڵخانەی گەڕەکەکەبوو، شەوان مرەمڕی پشیلەو وەڕینی سەگ زەندەقی خۆمانی دەبرد، نەك مەریوانی بچکۆلەی نەخۆخشی دەردەدار.

نەخۆشییەکەی تینی بۆهێنابوو خرەخڕی سینەی لەدووری (٣٠) هەنگاوەوە هەست پێدەکرا.. هیچ پارەمان نەبوو، نەماندەزانی چۆنی بەرینە لای دۆکتۆر، زۆریشمان خۆش دەویست. چونکە پێش ئەم مەریوانە برایەکی تریشی ناومان لێنابوو مەریوان، ئەویش بەنەخۆخشییەکی سادە بێچارەکردن مردبوو، ناسۆری کەساسی و چارەسەرنەکردنی ئەو مەریوان، سۆزێکی زۆری ئەم مەریوانەی خستبووە دەروونی دوابەیەکمانەوە. هەر بۆیە خۆمان پێنەدەگیرا لەبەردەمی مەرگدا، ناچار سەلامم لەچەند کەسێکداکرد، هەرچۆنێك بوو پێنج دینارم قەرزکردو بەتەنها گرتم بەسەر سنگمەوەو بەپێی پەتی بردمە سەرجادەی سلێمانی کەرکوك لە(حەسیرەکە)و تەکسیەکم گرت و بەرەولای دکتۆر (خەلیل تەها) بردم. پاش شەڕو هەرا سەرەم گرت و بردمە ژوورەوە، من زۆرم پەلەبوو دوکتۆر باش بۆم سەیر بکات و دەوام بۆ بنوسێ، بەڵکو زوو دەوای بەدەمیّ و کەمێ هەناسەی ئاسایی بێتەوە، چونکە لەخنکانەوە زۆر نزیکببووەوە. دوکتۆر سەماعەکەی خستەسەری و هەندێ ئەم دیودیوی کرد، وەرەقەیەکی هێناو شتێکی بەنابەدڵی نووسی و (٥٠٠)فلسەکەی لێوەرگرتم. وتم: دوکتۆر گیان ئەڵێی چی؟ وتی انشاو الله چاکدەبێ، وتم: دوکتۆر گیان تۆ دوکتۆری راستم پێ بڵێ چییەتی ئەژی یان ئەمرێ.؟ هەرچی کردم هەرئەوەندەی وت: خوا دەزانێ! شەڕیشم لەگەڵ کردو وتم:

بمزانیایە ئەم برد بۆسەر گۆڕی حەزرەتی عەباس، بەڵام ئەم دەهێنا بۆ لای تۆ کەدوکتۆری‌و بە انشاو الله و ماشاو الله ئەتەویٚ چاری بکەی... بەدڵشکاوی گەڕامەوە بۆ ماڵ‌و دەواکانم بۆ کڕی، شەو لەژورە تاریکەکەماندا کەخۆشم تەنگە نەفەسدەبووم، مەریوان سیخەی سینگی خراپتر بوو، هاواری لێهەڵساو خۆی هەڵدایە سەر سنگم، خۆم پێنەگیراو بەو شەوە خستمە باوەشم‌و بردم بۆ نەخۆشخانەی کۆماری. لەهۆڵی چاوەڕوانی راوەستابووم مەریوانم بەسەر سنگەوەبوو، سیخەی سنگی ئەوەندە توندبوو خەڵکی قاوشەکە خۆیان پێنەگیراو نۆرە بڕێیان دامی‌و بردەمە لای دوکتۆر. بەپەلەو دڵسۆزانە پشکنینیان بۆکرد، دەرزییەکیان لێدا، زۆر دڵم خۆشبوو چونکە ئارامی کردەوەو کەمیٚ هێوربووەوە.

وەرەقەیەکیان دامیٚ لەگەڵ سەیارەیەکی فریاگوزاری بۆیان نوسی بوو لەنەخۆشخانەی (عزل)لەگەڕەکی قەسابخانە بخەوێندرێت بۆ هەفتەیەك. بردمان بۆئەویٚ هەر ئەوشەوە (١٢) دەرزیان لێدا، هەستمکرد کەبەرەو باشتر ئەڕوات.

پاش هەفتەیەك کەئازارو نەخۆشییەکەی چاکبووەوەو بردمانە ماڵەوە، زۆر لەجاران شیرینتر ببوو لای بنەماڵەکەمان.

رۆژگارمان تێپەڕاند، مەریوان پێنج ساڵی پڕکردەوە قۆڵی خەباتمان پێهەڵکردو کردمانە هاوڕێی خەباتی "مارکسی. لینینییەکانی) کوردستان.

لەکاتێکدا بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەمان دەبرد بۆ بەشەکانی رێکخستن بۆ (رەحیم ئاوا، تەپەی مەلا عەبدوڵلاٚ عەرەسە، حەمام عەلی بەگ، قۆریە، شۆڕیجە، جینگلاٚوا، شاترلو، بەرتەکیٚ، ئیمام قاسم، عاشور، زێویٚ، ئیسکان، ئازادی، تسعین‌و رێگای بەغدا) دەمانخستە باخەڵی کاکە مەریوان‌و جلەشڕەکانیمان توند دەپێچاو لەسەر پاسکیل لەبەردەم دامان دەنا، هەندێکجار دەشگلاین بەیەکەوەو هەموو سەروچاوی زامداردەبوو، جگە لەوەی خۆڵاوی‌و تۆزاویمان دەکرد کەچی هەر ئارەزووی ئەوەی دەکرد لەگەڵماندابێت... مەریوان نامەبەرەو نامەهێنەرو هاوبەشی خەباتمان بوو.

شەڕدەستی پێکردەوە، ئێمە دامانەوە شاخ، مەریوان پەیوەندی نەما لەگەڵمان، پا چەند ساڵ زوڵم‌و زۆر داری رژێم وەهایکرد جێگای بەمەریوانیش لێژبیٚ‌و لەگەڵ باوك‌و دایك‌و براکانیدا هاتە گوندی باپیرانی واتا "عەسکەر"و لەویٚ ژیانی جوتیاری ئەژیان.

ئەنفال یەك‌و دوو سیٚ هات ناوچەکانی جافەتی‌و کەرکوك‌و سلێمانی گرتەوە،

رۆژانە هەڕەشەی مەرگ لەسەدان هەزار کورد دەکرا. مەریوان هاتە لامو داوای کرد ڕێگای بدەم ببێ بەپێشمەرگە، هەرچەندە هێشتا تەمەنی هی ئەوەنەبوو بتوانێ پێشمەرگایەتی بکات، توانای دەویست داواکەی قبوڵ بکەم، بەلأم رۆژگار فەرزیکرد. مەریوان هاتە دەستەکەی خۆمەوەو کەوتینە بەرشەپۆلی ئەنفالی سێ‌و لەگەڵ سەد پێشمەرگەی ئازاو دڵسۆزدا ئابلۆقە دراین. لەچەمی رەزان لەماوەی دوو مانگو نیو لەو ئابلۆقەیە رزگار نەبووین، لەکاتێکدا لەگەڵ مەریوان گەلآدارمان لەخۆمان دەبەستو ئەچووینە نزیك رەبایەکانی دەوروبەرمان، ئەمان رووانی لەسەدان گوندەوە باریکە دووکەڵی خانووە سوتاوەکان بەرەو ئاسمان پێچاو پێچ هەڵدەکشی‌و زرمەو تەقەش هەموو شوێنێکی پرکردبووەوە.

لەماوەیەکی کەمدا مەریوان بەکارهێنانی جهازی راکاڵ فێربوو، راستەوخۆ هەواڵەکانی ئەدا بەبنکەکانی سەرکردایەتی، چونکە ئێمە دابڕابووینو لەهەموو ناوچەی شوانو شێخ بزێنی‌و سورداشو قەڵاسێوکەو بەری کۆیە تەنها ئێمە ئەو سەد(پ ـ م)ە مابووین. مەرگ دەباری، هەموو چرکەیەك نزیکبوو بمانکوژن، جاشو سەرباز رۆژانە دەهاتنە دەورمان. بەملوێن فیشەکیان دەتەقاندە دەوروبەرمان... فرۆکەکان دەهاتنە سەرمان. ترسەکە ئەوەندە زۆربوو کەبەبرادەرێکت دەوت: برۆ کاتژمێرێ چاودێری بکەو بزانە دوژمن رووەو ئێمە دەجوڵێ، زۆر ئاسان نەبوو بڵێ بەڵێ. بەلأم کەدەموت: مەریوان برۆ بەجیهاز هۆکی تۆکییەکە لەگەڵ کەرتی فلأن قسەبکە، یەکسەر مەتارە ئاوەکەی هەڵدەگرت، جیهازەکەی دەگرت بەدەستییەوەو تفەنگەکەی دەکردە شانی‌و بڕێ گەلأی داربەڕووی بەسەر خۆیدا شۆڕدەکردەوەو ئەڕۆی کارەکەی ئەنجام ئەداو ئەهاتەوە.

ئێستایش نەمزانی ئەم منداڵە چۆن وەها ئازابوو، چۆن وەها ژیربوو.؟ بۆ وەها زوو گەورەبوو؟! بڕوا بکەن عەقڵی بەدەساڵیش پێش تەمەنی کەوتبوو!!

هەرچی باسی مەریوان بکەم ناتوانم تەواوی بکەم، بەهۆی هەندێ گیروگرفتەوە بەرەو پاکستان کۆچمان کرد. لەکوردستانی خۆشەویست دابڕامو مەریوانو برایەکی بەو هۆیەوە لەکوردستان دابڕان.

لەشاری کوێتەی بەلوجستان، رۆژێك هاتە لام وتی: (مامە شتێکم نوسیوە حەزدەکەم سەرنجی بدەی، بەلأم تکادەکەم راستم پێ بڵێ‌و چاوپۆشی لێمەکە.)

وتم :چییە بابەتەکە.؟ وتی: شانۆگەرییە بەناوی: (ئازادی ولأتی دەوێت) هەندێ

دەمەتەقەمان لەسەر ناوەکەیکرد، وتی: بۆچوونی من وایە ئازادی کاتێ شتە کەولاتی هەبێ، ئەگەر ولاتی نەبوو... ئازادی هیچ ناهێنێ.. لێم وەرگرن راستە شانۆنوس و نووسەریش نیم ناچار جار جارە شتێ بنوسم) سەرنجی باسەکەیمدا ئەو لەمن باشتری لێ تێدەگەی... بەش بەحالی خۆم بەباسەکەی رازیبووم و زۆریش دلم خۆشبوو کەمەریوان توانیویەتی لەسەر مەسەلەی نەتەوەکەمان شتی وەها بنووسێ. هەروەها زۆر وردبین بوو، ئەوەتا پاش سێ سالێ بەسەر نووسینەکەی ئەودا یەکێك لەقسەکانی ئەو راست دەرچوو کە (ئیڤان ئەلێ: ئەگەر خۆشمان دەرەقەتیان نەهاتین... کارێ دەکەین بەیەکتر بەکوشتیان دەدەین) واتە مەریوان زۆر ژیرو لێزان بوو ئەیزانی دوژمنان چۆن پیلانمان بۆ دائەنێن و لەناومان ئەبەن.

تازە سالێك دەبوو ببوین بەپەنابەر لەلای (UN)ی پاکستان، کەراپەرینە پڕ لەقارەمانییەکەی جەماوەری گەلەکەمان لەسەرتاسەری کوردستانی خواروودا روویدا، دوا بەدوای بەرپابوونی جەنگی کەنداو، مقۆ مقۆ کەوتە ناو پەنابەرانی کورد لەکوێتە پاکستان، هەمووومان رۆژانە گوێمان لەرادیۆکانی کوردستان دەگرت و دەمانزانی رووداوەکان چۆن دەچێتە پێشەوەو چۆن هەندێکجار بەپاشەو پاش دەگەڕێتەوە. گەڕاینەوە بەرەو کوردستان زۆر خۆش ببوو، بۆ هەندێکیش نەدەلوا، ئالەوکات و ساتەدا، مەریوان پێشوتر لەگەلێ کاکی و پاشان هاتنە لای من و مەسەلەی گەڕانەوەی مەریوانیان بۆ کوردستان پێشنیارکرد، لەراستیدا من پێم باشبوو بمێنێتەوە لەگەلماندا، چونکە مەریوان خەمڕەوێنی هەردوولامان بوو، کۆلەکەو بڕبڕەپشتی منیش بوو، بەلام دیاربوو مەریوان زۆر پەرۆشی گەڕانەوەبوو، بۆیە ناچار پێشنیارەکەم پەسەندکردو لەگەلێ دووهەم پۆستەی گەڕانەوەی پەنابەر بۆ کوردستان مەریوانیشمان بەفرمێسکەوە بەرێکرد.

پاش ماوەیەك گەیشتنەوە کوردستان، نامەی بۆ نووسیتی،ن باسی رووداوەکانی کوردستان و خۆشی و ئازادی و رزگاری کوردستان، برسێتی و دەردەسەری خەلك ، ئەوجا باسێکی تێرو تەسەلی لەسەر چۆنێتی گەڕانەوەی خۆی و بوونی بەپێشمەرگە لەلای پارتی سۆسیالیستی کورد (پاسۆك) نووسیبوو... تێیدا دەلێ: (مامە خۆت چاك دەزانی من کوردستانیم و لێرەش بەچاکم زانی لەگەلێ پاسۆك کار بکەم و بەرنامەکەیانم بەدلەو خۆشت ئەزانی ئەو

شانۆگەریەی کەنوسیشم ئەوەی دەگەیاند).

لەدێڕێکیدا دەنوسێ: (ئای مامە... ئازادی چەند خۆشە کەیادتان دەکەم کروزەم لێوەدێ، چونکە ئێوە بەدرێژی تەمەنتان خەوتان بەئازادی کوردستانەوە دەبینی..ماڵی مام عبدول رەحمانیشم هەموویان بەو ئاواتەوە سەریان نایەوەو شەهیدبوون... زۆر بەداخم کەئێستا لێی دوورو بێبەشن.)

خوێنەری بەڕێز ئەوەی لەسەر ئێمەبوو ئەم کورتە باسەی جوانە مەرگ کاکە مەریوان و پێشکەشکردنی شانۆگەریەکەیەتی، لەژێر ناوی (ئازادی وڵاتی دەوێ) جائێوەو بەرهەمەکەو هیوادارین کاکە مەریوان توانیبێتی بەم نۆبەرەیی خزمەتێکی بەهونەری گەلەکەمان کردبێ.

عەلی بچکۆل

١٩٩٤/٧/٩

# هەرگیز لەیادم ناچێ

سەروقژی تۆزاوی ماندوو... ئارەق بەلا رومەتو بەسەر تەنکە ریشەکەیدا قەتارەی بەستبوو، بێ لەتاقم و تفەنگەکەی تورەکەیەکی نانو کولێرە بەڕۆنی بەلاشانەوەو بێتەلێکی راکالێ بەکۆڵیەوە. سەرەتای پشکوتووی گوڵێ خونچەی ژیانیو تافی هەرزەکاری بوو، هەرلەئێوارەوە بەرێکەوتبوو لەگەڵێ پۆلە (پ ـ م) کانی هاوڕێی... لەدارستانی چڕوپڕی چەمی رەزان بەرەو بنارو لوتکە سەر کەشەکەی پیرەمەگروون.

تاریکو روونی بەیان بوو، کازیوە بەرەنگە زەردەکەی وەك چرایەکی کزۆڵە دری بەتاریکی شەو دەدا... ئەم پۆلە هەڵۆیەش بەبیروباوەڕێکی بەتینو تاوەوە بۆ بەرەنگاری دوژمنی میللەتەکەیانو چقڵی چاوی هێزەکەی دوژمن هەر لەبن لوتیان بوون.

مەریوانی تازە لاو بەکۆڵێ هیواو ئاواتەوە، دەیروانی بۆ ژیان... ژیانی خۆشدەویست، بەڵام مەرگی خۆی پێخۆشتربوو بۆ خۆشکردنی ژیانی خەڵك.

هەرکە گەیشتە ناو کاوو دۆڵێ پیرەمەگروون (پ ـ م)ەکان لەبن بەردو تاوێر دانیشتن بۆ پشوودان، بەڵام ئەو وەك هەڵۆ هەڵدەفڕییە سەر گردێکی بەرزو فەرمانەکەی خۆی جێبەجێدەکرد... جێگایەکی چاکی بۆ بێتەلەکەی دەدۆزییەوەو سەرێکی هەواییەکەی لەتیکەبەردێكو سەرەکەی کەشی لەدەوەنێك گیردەکرد... پاشان دادەنیشت بۆ پشوودان.

لەش سووکی لەخۆبوردوویی وای لێکردبوو ببووە جێگای رێزو خۆشەویستی گشت هاوڕێکانی، رێگەی نزیکیان (٨ـ١٠) کاتژمێربوو، بەڵام ئەوەی مەریوان نەیدەزانی ماندوبوون بوو.

ئەوەی زۆر کات ئازاری دەدا ئەو ئێوارەیەبوو کەهەرگیز لەیادی نەدەچوو، فڕۆکەی دوژمن گوندەکانیانی بەگازی کیمیایی بۆمبارانکرد. هەرگیز لەیادم ناچێ تا ناوقەدی تەڕببوو ئازای گیانی ئاو بوو، گورگو گوڵو بەپەرۆش بوو بۆ خەڵکە رەشو رووتەکە... هێشتا بۆنی گازەکە نەڕەوی بووەوە لەرووبارەکە ئاوی دەرهێناو سەروچاوی منداڵو گەورەی بریندای گازی دەشۆری. هەرگیز لەیادم

ناچێ لەنامۆیو دووره ولاَتی تاقه هاوڕێو بڕام بووی، ڕۆژانی ڕەشو دووره ولاَتیم، ڕۆژانی دووره خاكو دووره كەسوكار... ئای كەڕۆژێكی تاڵبوو ماڵئاوایمان لێكرد، تۆ بەرەو ولاَت، منیش لەنامۆی فرمێسكەكان دەرگای بەربەستی چاوانیان شكاندم.

لەوێستگەی شەمەندەفەرەكە بەدەستە خەپەكانت ماڵئاوایی یەكجاریت كرد... یادگارییەكانت هەموو دەمو كاتێ لەبەرچاوم و لەگوێمدا دەزرنگێتەوە. لەپاكستانەوە گەڕایتەوە بەرەو كوردستانی ئازاد، تاهەوای سەربەستی هەڵمژی، دەردی دووری كەسوكار هەڵڕێژی. هێشتا تێر نەببووی تازه زاوابووی، چرۆی سەوزی بەهاریت بەناهەق هەڵوەری، ئێستایش لەژێر گڵكۆی سارددا بەئارامی چاوەگەشەكانت لێنكاوە، ئاواتە مەزنەكەت لەگەڵ خۆت بردە ژێر خۆڵی گردەكەی شەهیدان.

بەكر عەبدوڵلا
پاكستان
١٩٩٤/٧/١٧

## کورتەیەکی ژیانم

ناوم عەلی محەمەد قادرە لە (١٩٤٣\٧\١) لە گوندی عەسکەر سەر بە ناحییەی ئاغجەلەر لەخێزانێکی هەژاری گوندی عەسکەر لەدایکبووم.

دوای منداڵێکی زۆر بێمراد کەوتوومەتە بەر ئازارەکانی ژیان.

مێردمنداڵیم بە شوانیی و بەرخداریی و دارهێنانیی و رەزاڵەتەکانی تر بردۆتەسەر.

لاوێتیم بەشاخەو شاخ و سەنگەر و ناوچەکان و بەشێکی بە زیندانەکانەوە بردۆتە سەرو هەروەها ئاوارەیش نیوەی عومری بردووم.

لە (١٩٦١\٩\١١) بەشداری گرتنی دەرەبندی بازیانم لە حکومەتی عەبدولکەریم قاسم کردووە.

لە (١٩٦٢\٣\٣) بۆیەکەمجار بووم بەپێشمەرگە، کە ئەوسا بە پێشمەرگە دەوترا کۆمەڵەکان. تا هەرەسی شۆڕی ئەیلول پێڵاوی پێشمەرگانەم دانەناوەو هەر لەوبوارەشدا هەموو جۆرە ئەرکێکی شۆڕشم بینیوە هەر لە چا لێنانەوە بۆ لێپرسراوی گەورەو فەرماندەی دەستە، فەرماندەی کەرت، لێپرسراوی کۆمیتەی رێکخستن، جێگری بەتالیۆن، جێگر هێز.

لەسەرتای (١٩٧١) بوومەتە ئەندامی کۆمەڵەی مارکسی لینینی بیروباوەڕی ماوتیستۆنگ، لە کۆمەڵەشدا ئەندامی سەرکردایەتی بووم.

لەساڵانی سەرەتای دامەزراندنی یەکێتی نیشتیمانیشدا بۆ دامەزراندن و گەشە کردنی بە دڵ تێکۆشام و پلەی ئەندامی سەرکردایەتی و ئەندامەتی دەزگای پێشمەرگایەتی گەیشتووم. لە ئەیلولی (١٩٧٩) لە شۆڕشی نوێدا بەشدارم کردووە پاش ئازادبوونم لە زیندانی عیراق.

فەرماندەی هەرێمی دوو بووم. هەروەها لە دامەزراندنی مەڵبەندەکانی یەکێتی نیشتیمانی لە چوار مەڵبەند من لێپرسراوی مەڵبەندی دوو بووم، کە (١١) تیپ لە ژێر کۆنترۆڵی دابووە لە تیپە ئازاکانی گەرمیان.

چوار ساڵ لە عیراق زیندان بووم، چوار مانگ لە ئێران زیندان بووم، لەگەڵ شەهیدان خاڵە شەهاب و جەعفەرو تێکۆشەرەکانی تری کۆمەڵەی رەنجدەران.

زیاتر لە چوار مانگ لە پاکستان زیندان بووم، لەسەر داوای سەفەر پێکردنمان لەڕێگەی (یو ئێن) بۆ ئەو وڵاتانەی معاهەدەی وەرگرتنی پەنابەریان هەیە لە (یوئێن). لەبیرمان نەچێ لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلولیشدا خەڵکیان بەمن ترساندو (٥) رۆژ لە چەمی رەزانو لە ئەشکەوتدا زیندان بووم. ساڵێك ئاوارەی هەمەدان بووم.

٩ ساڵ لە گێژەنی پاکستان ئاوارەو لە گۆڕەوشار دابووین لەگەڵماڵو منداڵدا.

٩ ساڵیش لە بەهەشتی نیوزلەندە ئەژین ژیانێکی مرۆڤانە، بەڵام ئاوارەینو هەر شوێنێك چەند جوانو خۆشیش بێت ناگاتە وڵاتی خۆم.

زۆر سوپاس بۆ:

١- بەڕێز شێخ محەمەد سۆڵەیی

٢- جەبار سابیر کەئەرکی پیاچونەوەو هەڵەبڕی ئەم کتێبەی گرتە ئەستۆ.



نەورۆزی ١٩٦٧
چەمچەماڵ



شەهید مامەریشەو شەهید خەباتە بچکۆل



عەلی بچکۆل، کافیە سلێمان، سەبیحەخانی هاوسەری شەهید جەبار فەرمان قەرەداغ



مزگەوتی سەرگەلو ساڵی ١٩٨٤



جەبار فەرمان‌و هاوسەرەکەی، عەلی بچکۆڵ‌و هاوسەرەکەی

١٩٨٠



حاکم ئیبراهیم، عەلی بچکۆڵ، کافییە سلێمان، شوکرییەی خێزانی حاکم ئیبراهیم، سەبیحەخان

١٩٨٤ قەرەداغ



مریەم خانی هاوسەری دکتۆر عەلی، پاکیزە خانی هاوسەری فەرەیدون
عەبدولقادر، رووناك خانی هاوسەری عەلی بچکۆل
ناوزەنگ سەرەتای هەشتاکان



فاتح شوانی، جەبار فەرمان، عەلی بچکۆل، شێخ فەرهاد



فاتح شوانی، جەبار فەرمان، عەلی بچکۆل، شێخ فەرهاد
شێخ ڕەوف
قەڵاسێوکە ١٩٨١



سەرگەڵو ١٩٨٣



قەڵاسێوکە تیپی ٢١ی کەرکوک



لەگەڵ شێرکۆ بێکەس
بەرگەڵو ١٩٨٥



**هەمەدان ١٩٦٤**



**هەمەدان ١٩٦٤**

**لەکاتی مەشقی سەربازیدا**



لەگەڵ مام جەلال
سەرگەڵو ١٩٨٤





عەلی بچکۆل، مام جەلال، سەبیحە خانی هاوسەری جەبار فەرمان

هەڵەدن ١٩٨٤




لەگەڵ مام جەلال

سەرگەڵو ١٩٨٤



**عەلی بچکۆڵو رووناك خانی هاوسەری**

**یەکەم رۆژی بووکێنی**



چەمی ڕێزان
٢٠٠٣



عەلی بچکۆڵو هاوسەرو منداڵەکانی
٢٠٠٧ چەمی ڕێزان




عەلی بچکۆل، ئاسۆی شێخ نوری، عوسمان عەسکەری



لەگەڵ کاروانی کوڕی

ئۆکلاند ڕۆژی تەواوکردنی کۆلیژی یاسا

٢٠٠٤



شەهید مەریوان و عەلی بچکۆل
پاکستان، ١٩٩٣



شەهید مەریوان



ئەشكەوت دووكون، چەمی ڕێزان



دۆڵەبی بپیرەمەگرون
١٩٨٨

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

سکرتێری گشتی

الاتحاد الوطني الكردستاني

الأمين العام



Patriotic Union of Kurdistan
Secretary General

بەڕێز گیان و هەڤاڵی دێرین کاک عەلی بچکۆلی خۆشەویست

بە سڵاوێکی گەرمەوە ، چاوەکانی خۆشەویستت و منداڵەکانیشت ماچ دەکەم.
پڕ بە دڵ ئاوات دەخوازم کە ساخ و سەلامەت و سەرفراز بیت.
ببورە ئەوەندە ئەمتوانی زووتر قسە لەگەڵ بکەم چونکە قورگم پڕ بوو بوو
لەگریان ! خۆت دەمناسیت من قەت نەگریاوم بۆ زۆرداری دنیا هێنا
وهەمیشە هەموو شتێکم بە واقیعبینانە و مەوضوعی وەرگرتووە ، بەڵام
دوورخستنەوەی ناڕەوای تۆ و دوورکەوتنەوەی ناڕاستی خۆشەویست
لە سەرێکی گەورەیە لە سەر دڵم : هەمیشە تۆم لەبیرە ، خۆشم
بە کەمتر مەزانە ، دەزانم لە ئاستی ڕۆڵەیەکی جوامێر و دلێر
وەک عەلی بچکۆلی خۆشەویستی دێرینیا خۆم بە کەم هیوادارم
بەڵگەی پێویستییانە خۆت بە شەقشیت و دڵنیاشت بیت
کە هەمیشە لە ناخی دەروونم دا جێگەی تایبەتی و دیارت
هەبووە و هەیە و هیوادارم هەر بمێنێت.
هەر چۆنێ بێت ئێستە وا بە دەر بەدەری لە دوورترین وڵاتدا
ئاوارە و پەناهەندە بیت. بەڵام دڵنیام – هەر وا شتە تێدا دەبینم –
کە دوورە و دوژمنت وەک چاران جارانی لە بیرت دەکەون بەرزتر و قایمتر بە
خۆیاری ئەوەندەش دوور نیە کە بە دیدارت شاد ببینەوە
و لەسەر خاکی پیرۆزی کوردستان بێت ببینینەوە. لەئێستە

